# تاڤگەی هەقیقەت

(بەشێک لە بەرهەمەکانی دوکتور قاسملوو)

بەرگی یەکەم

کۆکردنەوەی: کاوە بەهرامی

- **ناوی کتێب:** تاڤگەی هەقیقەت
- **کۆکردنەوەی:** کاوە بەهرامی
- **پێداچوونەوە:** عیرفان رەهنموون، کەریم پەرویزی
- **رووبەرگ:** کەریم پەرویزی
- **پیتچنین و مونتاژ:** ئومید مەندۆمی

پێشکەشە بە:

سێزدەیەمین کۆنگرەی حیزبی دێموکراتی کـوردستـانی ئێرانو

هەموو رێیـــــــــــــوارانی رێـــــــگای ئازادیی کوردستـان

# پێڕست

# پێشەکی

شۆڕشی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بە ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، لە سەدەی رابردوودا، مێژوویەکی خوێناویو پڕ لە کارەساتی بە خۆیەوە بینیوە، لەگەڵ زۆردارترین ڕێژیمەکانی سەردەم کە بۆ کپکردنی دەنگی ئازادیخوازانو سەرکوتکردنی ئەم بزووتنەوەیە، لە هیچ زوڵمو زۆرو جینایەتێك دەستیان نەپاراستوە بەرەوڕوو بووە. ڕێژیمی گەندەڵی پاشایەتی بە تایبەتمەندیی شۆڤێنیستیو دژیگەلی بوونی خۆیەوە، بە مەبەستی سەرکوتی "کۆماری کوردستان"و خەباتو بەرخودانی گەلەکەمان، دەستی یارمەتیی بۆ وڵاتە زلهێزەکان درێژ کردو بۆشی گرنگ نەبوو کە ئەم دەست پانکردنەوەیە، بە قیمەتی دانی چ ئیمتیازاتو وادەو بەڵێنییەك تەواو دەبێت. ئامانج بۆ ئەوان، پاراستنی دەسەڵاتو تواندنەوەی شۆڕشی گەلی کوردو نەگەیشتنی ئەم گەلە بە کەمترین مافە نەتەوایەتییەکانی بوو. لە درێژەی ئەم سیاسەتەدا پاش رووخاندنی کۆماری کوردستان، ڕێبەری لێوەشاوەمان "قازی محەممەد" یەکەمین سەرکۆماری کوردیان لە سێدارە دا بەو خەیاڵەی کە خەڵکی کورد چاوترسێن دەبیو چیدیکە شۆڕش لە کوردستان سەر هەڵنادا تەوە، بەڵام خەڵکی شۆڕشگێڕو لاوانی ئازادیخوازی گەلی کورد، ئامۆژگارییەکانی پێشەوای شەهیدیان کردە ڕێنوێنو ڕێنیشاندەری ڕێگای پڕ کەندو لەندی شۆڕش.

دوای پێشەوا قازی محەممەد، دوکتور قاسملووی زاناو بلیمەت بوو بە سەرقافڵەی کاروانی خەباتو بە لێوەشاوەییەکی سەرنجڕاکێشەوە ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتی

کوردستانی وەئەستۆ گرتو توانی گڕو تینێکی کەمڕوێنه بــه خـەباتی ئازادیخوازانــەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران ببەخشێ. حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئـێران لــه جەرەیانی شۆڕشی دژی رێژیمی پاشایەتیدا، واته شۆڕشی گەلانی ئێران، به شێوازێکی کاریگەرو چالاك بەشدارییی کردو پاش سەرکەوتنی ئەم شۆڕشەشە بــۆ وەدەســتهێنانی مافه دێموکراتیكو نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد، خەباتی سیاسیی ئاشــکرای خـۆی دەست پێکردەوە. ئەم حیزبە کە زۆر باش لە ماهییەتی دژیگەلیی نـیزامی کۆمـاری ئیسلامی تێگەیشتبوو، دەنگی پێ نەدا. حــیزبی دێموکـراتو بــه تایبــەت دوکتــور قاسملووی نەمر لە رێگای وتووێژی ئاشتیخوازانەوە داخوازەکانی گەلی کوردی خســته بەردەم دەوڵەتی کاتیی ئەو سەردەمە، بەلام ویستو داخوازەکان لە لایەن رێژیمی تــازە بەدەسەلات گەیشتوو (کۆماری ئیسلامی) بە فەرمانی جیهادی خومەینیو بە ئــاگرو ئاسن وەلام درایەوە، کۆنەپەرستی لە هەموو شارو ناوچەکانی کوردستان دەستی دایــه جینایەتو ئاژاوەگێڕیو، سەرنجڕاکێش ئەوە بوو کە حــیزبی دێموکـراتو تێکۆشــەرە سیاسییەکانیان بە ئاژاوەگێڕو دژی شــۆڕش لــه قەڵــەم ئــەدا. زانــاییو لێوەشــاوەیی دوکتور قاسملوو بۆ بەڕیوەبەرانی دژیگەلیی کۆماری ئیسلامی بوو بە مەترســییەکی گەورەو هەڵوێستەکانی حیزبی دێموکرات کە هەڵقولاوی فیکری رێبــەری شــەهیدمان بوون، لەگەڵ سیاسەتو فیکرو بۆچوونی دواکەوتووانەو دزێوی رێژیمــی خومــەینی لــه دژایــەتیدا بــوون. هەرچــەند حــیزبی دێموکــرات حــیزبێکی ناوچــەیی بــوو، بـــەلام لێکدانەوەکانی ئەوکاتەی رێبەری حیزب سەبارەت بە داهــاتووی سیســتمی کۆمــاری ئیسلامی بەرەبەرە وەڕاست گەڕان. دوژمن کە لە لەقاودانی بەرنامەو پیلانەکانی دژی گەلی کــوردو بــاقی گــەلانی ئــێران لــه لایــەن حــیزبی دێموکراتــەوە، هــەروەها لــه لێوەشاوەیی دوکتور قــاسملوو ترســی لێنیشــتبوو، بــه کــەڵکی خــراپ وەرگرتــن لــه نیازپاکیی حیزبی دێموکرات بۆ بە ئاشتی چارەســەرکردنی کێشــەی کــورد، لــه ســەر مێزی وتووێژ لە ناو دڵی ئورووپای پێشکەوتوو و دێموکراتیــكدا، بــۆ هــەتا هەتایــه گەلی کوردو بەتەنگەوەبووانی ئازادیو دیموکراسییان لە بوونی کەڵەپیاوێکی ژیرو بــه بیرو زانای وەك دوکتور عــەبدولڕەحمان قــاسملوو بێبــەش کــرد، بــەو هیوایــه دەنگــی جوولانەوەی کورد کپو خامۆش بکرێت.

دوکتور قاسملوو لە کاتی بە دەستەوە گرتنی ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکراتەوە، گرنگی زۆری دەدا بە کادری لێوەشاوەو بەئەزموونو لە پێگەیاندنو پەروەردەکردنیاندا بیٚوچان تیٚدەکۆشا، هەر بۆیەش کە بە شەهید کرانی کاک دوکتور سەعیدیش، ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکراتو شۆڕشی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران تووشی قەیران نەبوو. سیاسەتو ئامۆژگاری‌یەکانی دوکتور قاسملوو بوون بە ڕێنوێنی ریبەریی حیزب، بۆیە حیزبی دێموکرات بەردەوام بوو،و ئێستاش حیزبی پێشڕەوی کۆمەلأنی بەرینی خەڵکی کوردستانی ئێرانە.

ئەم هۆیانەو زۆر هۆی دیکە منیان هاندا کە زیندوو راگرتنو پاراستنی فکری دوکتور قاسملوو کە لە بەرهەمەکانی‌دا رەنگ دەداتەوە دەتوانیٚ ببێتە ڕێنوێنو ڕووناککەرەوەی ڕێگای خەبات بۆ نەسڵی ئێستاو نەسڵەکانی داهاتوو و هەرچی باشتر بەڕێوەبردنی کاروباری کوردستانو ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدانی کۆمەڵی کوردەواری. بۆیە دەستم دایە ئەو ئەرکە، بەلاّم کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی دوکتور پێویستی بە کاتێکی زۆرو تێکۆشانی بەردەوام هەبوو.

ساڵی ١٣٧٤ی هەتاوی، لەگەڵ چەند کەس لە هاوکارانم، بیرۆکەی کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی کاک دوکتور قاسملووم هێنایە بەرباس، وەك چاوەڕوانیم دەکرد لەگەڵ ڕەزامەندیو هاوکاریی ئەوان بەرەوڕوو بووم. پاش چەند ڕۆژ، تیمێکی ٤کەسیمان بۆ ئەو کارە دیاری کرد، کە بریتی بوون لە: شەهیدان کاك "عەلی ئەمینی"و کاك "غەفوور مەهدی‌زادە"و بەڕێزان "مەهدی مێهرپەروەر"و "کۆسار فەتاحی". پاشان لەگەڵ هاوڕێی بەڕێز کاك "مستەفا هیجری" کە ئەو کات جێگری سکرتێری گشتیی حیزبو بەرپرسی کومیسیونی چاپەمەنیی حیزب بوو، باسم کرد. بەڕێزی ئەمەی بە کارێکی پیرۆز داناو بەڵێنی هاوکاریی پیٚدایەن. بە دوای ئەمەدا هەوڵمان دا بۆ کۆکردنەوەی سەرچاوەکان، بە زەحمەتێکی زۆر کۆمەڵێك سەرچاوەمان کۆکردەوەو خەریکی دابەش‌کردنو ڕێكوپێك کردنیان بووین، کە لەو سەروبەندەدا بە هۆی تەقینەوەی بۆمبێکی دەستکردی بەکرێگیراوانی کۆماری ئیسلامی، لە شوێنی کارەکەمان، هاوڕێیان کاك "عەلی ئەمینی"و کاك "غەفوور مەهدی‌زادە"و پێشمەرگەیەکی دیکەشمان شەهید بوونو هەموو سەرچاوەو کۆکراوەکانیشمان لە نێو کڵپەی ئاگری تەقینەوەکەدا سووتان. ئەو بۆمبە لە سەر ڕێگای هاتوچۆی هاوڕێیانی

حیزبیمان دانرابۆوەو پاش ئاشکرا بوونـــی ، بـۆ پووچەڵکردنـەوەی ناردیانـە فێرگـەی سیاسی ـ نیزامی. شەهید "غەفووری مەهدیزادە"ش کە وەك مامۆستای "تەخریبو تەقەمەنییەکان" لە فێرگە دەرسی دەگوتەوە، بەداخەوە لـە کـاتی پووچەڵکردنـەوەی بۆمبەکەدا، لە دەستیدا تەقیەوەو بەداخەوە ئەو کارەساتە دڵتەزێنەی لیٚکەوتەوە.

بە دوای ئەو رووداوەدا بڕیارم دا ئەو کـارە سـەر لـەنوێ دەسـت پـێ بکەمـەوە.ساڵێکی پیٚچوو، لەگەڵ بەڕێز مامۆسـتا "عبداللـە حسـنزادە" سـکرتێری گشـتیی ئەوکاتی حیزب باسم کردو داوای هاوکاریم لیٚکرد. لە ئۆرگانە تەبلیغییەکانی حـیزب وەك رادیۆو چاپەمەنی کە نووسراوەو وتووێژە رادیۆییەکانی دوکتور قاسملوویـان لای خۆیان پاراستبوو، داوای هاوکاری بۆ کردم کە زۆر گرینگو بەکەڵك بوو. لـە رەوتـی نووسینەوەو کۆکردنەوەو پێداچوونەوەی بابەتەکاندا بەو ئاکامە گەیشتین کە پێویسـتە پێشتر ژیاننامەکەی کاك دوکتور بخەینە بەر دەستی خوێنەر.

لە بەر ئەوەی دوکتور قاسملوو ماوەیەکی زۆریش لە دەرەوەی وڵات ژیاوەو لـە زۆر گۆڤارو رۆژنامەو بڵاوکراوەکانی دیکەش بە زمانەکانی ئورووپایی بابـەتی نووسـیوە، دەیان وتووێژی رادیۆیی پێکهێناوە کە زۆربەیان بە دەستی ئێمە نەگەیشتوون. ئەمەی لە بەر دەستتان دایە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەیە، بەرگی دووهەمیش ئامادەی بـڵاو کردنەوەیە. هیوادارین بە زوویی چاپ بکرێو بکەوێتـە بـەر دەسـتی ئۆگرانـی بـیری دوکتور قاسملوو.

هیوادارم خوێنەری بەڕێز لە هەر جێگایەك نەواری وتووێژ یـا نووسـراوەو بابـەتی دوکتور قاسملوویان لە لایە، بۆمان بەرێ بکـەنو بـەم چەشـنە لـەم ئەرکـە پـیرۆزەدا، بەشدار بن. ئەگەریش لە زمانەکانی بێگانەوە بۆمان بە کوردی یان فارسی تەرجومـە کەنەوە جێگای پیٚزانینە.

پێشەکی جێی خۆیەتی سپاسی بەڕێز مامۆستا "عبدالله حسنزادە" بکەم، کە لە هێندێك بواردا هاوکاری کردم. هەروەها کۆمەڵێك لە کـادرو پێشـمەرگەکانی حـیزب کـە بـە جۆرێـك یارمـەتیان داوم، دەستخۆشـیان لیٚدەکـەم، وەك کـاك "کـاوە بهشتیزادە"، کە هەر لە سەرەتای کارەکەوە زۆر باش هاوکاری کردم، بـەڕێزان کـاك "حەسەنی سەلیمی"، کاك "عەباس کاکەخانی"، کـاك "کۆسـار فـەتتاحی"و کـاك "شەفیع رەوشەنی"، هـەروەها سوپاسـی زەحمـەتو مـاندوو بوونـی هاوڕێیـان کـاك

"عیرفان رەهنموون"، کاك "کەریم پەرویزی"و کاك "ئومید مـەندۆمی" دەکـەم کـە ئەوەندەی لە دەستیان هات لە تەرتیب کردنو تـایپو پێداچوونـەوەی نووسـراوەکاندا درێغی‌یان نەکردووە.

جێـی خۆیـەتی کـە سوپاسـی بـە ڕێـزان کـاك "خوسـرەو بـەهرامی" و کـاك " صالح ولی‌زادە" بکەم کە لەبورای ماڵی‌یەوە بۆ لـەچاپدانی ئـەم کتێبـە هاوکاریـان کردم.

**کاوە بەهرامی**
**پووشپەڕی ۱۳۸۳ی هەتاوی**

## بیرو ئەندێشەی دوكتور قاسملوو،

## چرای ڕێگای خەباتمانە

بیرمەندانو هزروانانی هەر نەتەوەیەك سامانی ئەو نەتەوەیەنو، بیرو ئەندێشەی ئەوان چرای ڕێگای ژیانو خەباتی سەردەمن. ئەوان ڕێگای چۆنیەتی ژیانو بیری سەردەم بە نەوەكان نیشان دەدەنو، هەنگاوبەهەنگاو كۆمەڵگای خۆیانو مرۆڤایەتی بەرەو پێش دەبەن.

لە نێو نەتەوەی كورددا ژمارەی ئەم چەشنە بیرمەندانە زۆر نین. هۆیەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ كۆمەڵێك گرێو ئاستەنگ كە زۆردارانی نێوخۆ یان دەرەكی هەمیشە لە سەر ڕێگای ئەو كەسانە پێكیان هێناوە بۆ ئەوەی ئەو گەلە لە نەزانیو دواكەوتوویی‌دا ڕابگرنو بە قازانجی خۆیان كەڵكیان لیٚوەربگرن. بێجگە لەوە بە هۆی نەخوێندەواریی خەڵك، نەناسرانی ئەندێشەی ئەو كەسانە لە سەردەمی خۆیاندا، ژێردەستە بوونی كوردو زۆر هۆی دیكە ئەندێشەی ئەو بیرمەندانە نەهاتۆتە سەر كاغەزو دوای مردنیان بەرەبەرە لەبیر چوونەتەوە، یان ئەگەر ئەو تێفكرینانە نووسرابنەوەش لە بەر كەمتەرخەمی دوای ماوەیەك لە ناو چوون، بۆیە ئێستا ناوی زۆرێك لە ناودارانی كورد لە بەر دەستدایە كە زانیاری زۆر كەم لە سەر بۆچوونو فكری ئەوان بە نووسراوە هەیە، ئەندێشەو زانایی هێندێك لەو كەسانەش تێكەڵاٚو بووە لەگەڵ كۆمەڵێك بیروبۆچونی لاوەكی كە فڕی بە سەر فكرو ئەندێشەی ئەوانەوە نیەو، لێك هەڵاٚواردنی بۆچوونو قسەی خۆیانو لاوەكی‌یەكان زۆر دژوارە، بۆیە هەڵكەوتوە كە بیرمەندێكی كوردی نیشتمانپەروەرو پێشكەوتوو بە كەسێكی دژی

کوردو کۆنەپەرست ناسرا بیٚ. بە تایبەت ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو راستی‌یەی کە لە نێو نەتەوە دواکەوتووەکانو یەك لەوان نەتەوەی کورددا، مێژوو بە دڵی زۆرداران نووسراوەتەوە، بەشێك لە هۆیەکانی شێواویی مێژووی ئەو کەسانەمان باشتر بۆ روون دەبێتەوە.

لەو گۆشەنیگایەوە، گرنگیی ئەركو تێکۆشانی ئەو کەسانەمان بۆ دەردەکەویٚ کە تیٚدەکۆشن وتەکان، نووسراوەکان، وتووێژەکانو بەگشتی هەموو ئەو بابەتانە کە بە چەشنێك رەنگدانەوەی راستەقینەی فکرو ئەندێشەی ئەو بیرمەندانە بیٚ، کۆ بکەنەوەو بیخەنە بەردەستی کۆمەلاٚنی خەلٚكو بەم چەشنە لە فەوتانو دەستێوەردانی نەیاران رزگاریان بکەن.

بیٚگومان، دوکتور قاسملوو یەکێك لەو بیرمەندانەیە کە لە نێو نەتەوەی کورددا نموونەیان زۆر کەمن. ئەو تەنیا رێبەری حیزبی دێموکرات نەبوو، بەلٚکوو بەرینایی بینینی سیاسیی وی بۆ داهاتووی کوردو کۆمەلٚگای بەشەری لەو ناوچەیەی کە ئێمەی تێیدا دەژین، تەنانەت لێکدانەوەی ئەو پیاوە ناوادارە لە سەر پرسە ئالۆزو تێکەلاٚوەکانی جیهان لە کاتی خۆیدا، سەرنجی هەر بیسەرێکی بۆ لای خۆی رادەکێشاو، دۆستو دوژمن بەلایانەوە گرینگ بوو کە لێکدانەوەکانی ئەو شەهیدە لە سەر رووداوەکانی گرینگی جیهان ببیسن.

هاورێی بەرێزم کاك کاوەی بەهرامی کە دەستی داوەتە کۆکردنەوەو چاپو بلاٚوکردنەوەی بەشێك لە کارەکانی ئەو رێبەرە پایەبەرزەو لەو پێناوەدا زەحمەتی زۆری کێشاوە، کارێکی گرنگو پڕبایەخی دەستپێکردوە، چونکە بەو کارەی توانیویەتی یارمەتی بدا بە هەموو ئەو کەسانەی کە تینووی خوێندنەوەی نووسراوەو وتەکانی دوکتوری شەهیدنو، لە لایەکی دیکەشەوە ئەوان لە فەوتان بپارێزیٚ. لەو ئەرکە پیرۆزەدا داوای سەرکەوتنی بۆدەکەم.

**مستەفا هیجری**

**بانەمەڕی ١٣٨٣ی هەتاوی**

# کورتەباسێك لە سەر سۆسیالیزم

لە بەرنامەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، فەسڵی یەکەم؛ ئامانجە گشتییەکاندا هاتووە کە: ئامانجی دوارۆژی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران پێکهێنانی کۆمەڵێکی سۆسیالیستییە کە وەڵامدەری هەلومەرجی تایبەتیی وڵاتەکەمان بێ.

**دەمانەوێ لێرەدا چەند مەسەلەی ئەساسی روون بکەینەوە:**

**یەکەم ـ** بۆچی ئێمە لە بەرنامەکەماندا بە پێویستمان زانیوە باسی سۆسیالیزم بکەین؟

**دووهەم ـ** ئەو سۆسیالیزمەی کە ئێمە دەمانەوێ وەك ئامانجی دوارۆژی حیزبەکەمان پێکی بێنین چ سۆسیالیزمێکەو بۆچی بەو شێوەیە لە بەرنامەکەماندا هاتووە؟

**سێهەم ـ** پێوەندیی حیزبی ئێمە لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی بە گشتیو یەکیەتیی سۆڤیەتی بە تایبەتی دەبێ چۆن بێ؟

## ١ ـ سۆسیالیزم "ئامانجی دوارۆژی حیزبەکەمان".

### مەسەلەی "نەتەوەیی"و "کۆمەلایەتی":

یەکەم پرسیار کە دێتە پێش ئەمەیە کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران (ح.د.ك.ئـ) کە حیزبێکی "مارکسیست" یان "مارکسیست ـ لنینیست" یان "کومۆنیست"و بەگشتی حیزبی چینی کرێکار نیە، بۆچی باسی سۆسیالیزم دەکا؟

وەلاٌمی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە: ح.د.ك.ئـــ. هەرچـەند حـیزبێکی دێموکراتــی ـ میللی‌یە بەلاٌم هەر لەو کاتەدا حیزبێکی پێشڕەوە. حیزبی پێشــڕەو بـەو مانایــە کـە دەیهــەوێ هــاوڕێ لەگــەلٌ چارەســەرکردنی مەســەلەی نەتــەوەییو وەرگرتنــی مــافی نەتەوەیی گەلەکەمان، مەسەلەی کۆمەلاٌیەتیش چارەسەر بکا. لە دیــاریکردنی ئــەو ئامانجەدا ئێمە نەك تەنیا ئەزموونی نەتەوەکانی دیکەی جیهان، بــەلٌکوو ئــەزموونی رابردووی نەتەوەی کوردیشمان بە تایبەتی لە بەرچاو گرتووە.

ئەو ئەزموونە چیە؟ ئەو ئەزموونە کە مێژووی جوولاٌنەوەی گــەلی کــورد نیشــانی داوە ئەوەیە کە: ئەو حیزبەی دەیهەوێ جوولاٌنەوەی گەلی کورد بەڕێوە بــەرێ، ئەگــەر حیزبێکی ناسیۆنالٌیستیی (نەتەوەیی) تەواو بێ، واتە تەنیا چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەیی لە بــەرچاو بگــرێ، ئاکــامی ئــەوە دەبــێ کــە لــە لایــەك گیروگرفتــەکانی کۆمەلاٌیەتی بە بێ چارەسەرکردن هــەروا دەهێلٌێتــەوەو بــەم جــۆرە وەرگرتنــی مــافی نەتەوەیی کارێکی بێ‌ســوود دەبــێ؛ لــە لایــەکی دیکــە چوونکــە نــاکرێ گــیروگرفتی کۆمەلاٌیەتی لە بیر بچێتەوە، بە ناچار حیزبێکی دیکە پەیدا دەبێ کە تەکیــە دەکاتــە سەر جێبەجێ کردنی ئەو گیروگرفتانەو بەم هۆیەوە بەشــێکی زۆر لــە زەحمەتکێشــانی کوردستان بۆ لای خۆی رادەکێشێ.

بۆ نموونە لە کوردستانی عێراق پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووز (ژووئیــە) لــە ســالٌی ١٩٥٨دا، دوو جەرەیانی بەهێز پەرەیان گرت:

**یەکــەم ـ** پــارتی دێموکراتــی کوردســتانی عــێراق، کــە تەکیــەی دەکــردە ســــەر مەسەلەکانی نەتەوەییو بۆ ئەم مەبەســتە حــازر بــوو لەگــەلٌ پاشــکەوتووترین چــینو توێژەکانی کۆمەلٌی کوردســتانی عــێراق هاوکــاری بکــاو لــە هــەر شــێوەیەك کــەلٌك وەرگرێو لەگەلٌ هەر کەسێك دۆستایەتی بکا ... .

**دووهەم ـ** حــیزبی شــیوعی (کومۆنیســت)ی عــێراق کــە تەکیــەی دەکــردە ســەر گیروگرفتەکانی کۆمەلاٌیەتی بە مەبەستی راکێشانی زەحمەتکێشان بۆ لای خۆی.

بەلاٌم لە ئاخردا بە تەواوی دەرکەوت کە هیچکام لەو دووانە نــاتوانن ســەرکەونو، بە باشی روون بۆوە کە چ ئەو حیزبەی زیاتر بە گیروگرفتەکانی نەتەوەیی بایــەخ دەداو مەسەلەکانی کۆمەلاٌیەتی کەمو زیاد لە بیر دەباتەوەو، چ ئەو حیزبەی تەنیا مەسەلەی کۆمەلاٌیەتی لە بەر چاو دەگرێو مەسەلەی نەتەوەیی گەلی کورد کــە لــەم قۆناغــەدا

مەسەلەیەکی بنەڕەتی‌یە لە بیر دەباتەوە، یان بایەخێکی کەمتری بۆ دادەنێ، نـاتوانن لە قۆناغی ئێستای خەباتدا بەڕێوەبەرایەتیی جوولانەوەی گەلی کورد بەدەست بگرن‌و بیگەیەننە پلەی ئاخری سەرکەوتن.

ح.د.ك.ئـ. هەر لە سەرەتاوە بە پێویستی زانیوە بەرنامەیەکی ئـەوتۆ دابنـێ کـە هەم بە شێوەیەکی ئوســوولی‌و هـەتا سـەر مەســەلەی نەتـەوەیی حـەل بکـاو، هـەم گیروگرفتەکانی کۆمەلایەتیش بخاتە بـەرچاوو بـۆ چارەسـەرکردنیان تێبکۆشـێ. ئـەم حیزبە لە کاتی پێکهاتنیەوە، واتە لە سالی ١٣٢٤ (١٩٤٥)ەوە حیزبێکی نەتـەوەیی پێشڕەو بوەو لە سالی ١٣٥٠ (١٩٧١)ەوە هەتا ئێستا، بەرنامەکەی بە تایبـەتی لـە سەر ئەساسی چارەسەرکردنی ئـەو دوو مەسـەلەیەی "نەتـەوەیی"و "کۆمەلایـەتی" دانراوە.

لـە بـاری مەسـەلەی نەتەوەیی‌یـەوە، نێوەڕۆکـی ئـەم مەسـەلەیە لـە راسـتی‌دا ئەستاندنی "مافی دانانی چارەنووس"ە. ئەم مافە دەکرێ بـە چـەند شـێوە جێبـەجێ بکرێ:

**یەکەم:** "سەربەخۆیی" ("استقلال") کە شێوەی هەرە بەناوبانگیەتی. نەتەوەیـەك کە سەربەخۆیی وەردەگرێ، مافی چارەنووسی خۆی بە تەواوی دابین دەکا.

**دووهەم:** شێوەی "فیدرالیزم" واتـە وەرگرتنـی مـافی نەتـەوەیی لـە چوارچێـوەی حکوومەتێکی "فیدرال"دا.

**سێهەم:** خودموختاری.

ئێمە بە لە نەزەر گرتنی وەزعـی کوردسـتانی ئـێران‌و وەزعـی تایبـەتیی ئـێران‌و وەزعی گشتیی گەلی کورد لە رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا، خودموختاریمان هەلبژاردووەو، پێمان وایە بە وەدەستهێنانی خودموختاری، مەسەلەی نەتەوایەتیی گـەلی کـورد لـە ئـێراندا چارەسـەر دەکـرێ‌و، ئـەو کاتـە رێگـا خـۆش دەبـێ بـــۆ چارەســەرکردنی گیروگرفتەکانی کۆمەلایەتی‌و لە نێو بردنی پاشکەوتوویی گشتیی ولاتەکەمان.

بەلام لە باری مەسەلەی کۆمەلایەتی‌یەوە، بە بڕوای ئێمە رێگـای چارەسـەرکردنی مەسەلەی کۆمەلایەتی بە شێوەیەکی بنەڕەتی، پێکـهێنانی سۆسـیالیزمە. ئەساسـی سۆسیالیزم لە راستی‌دا لە نێو بردنی چەوساندنەوەی ئینسانە. ح.د.ك.ئـــ. دەیهـەوێ چەوسـاندنەوە لـە کۆمـەلدا بەتـەواوی لەبـەین بچـێ‌و، لـە بـەر ئـەوە پێکــهێنانی

سۆسیالیزمی وەك ئامانجێکی دوارۆژ بۆ کۆمەڵی خۆمان لە بەرچاوە. کەوابوو، قسەی هێندێك تاقمو دەستە کە دەڵێن دروشمی حیزبی دێموکرات وەرگرتنی خودموختارییەو لە پاشان کارێکی دیکەی نامێنیو دەبێ هەڵوەشێو مەیدانی خەبات چۆڵ بکا، ئەگەر غەرەزی تێدا نەبێ نیشانەی نەزانینە؛ چونکە پاش وەرگرتنی خودموختاری، تازە دەبێ دەست بکەین بە پیادەکردنی بەرنامەکەمان کە ئاخرەکەی دامەزراندنی سۆسیالیزمە.

## سۆسیالیزم لەبەر چی ئامانجی دوارۆژە؟

لە پێشدا ئەوە بزانین کە بۆ گەیشتن بە ئامانج، دەبێ قۆناغ بە قۆناغ بەرەوپێش بچینو بۆ هەر قۆناغەی دروشمی تایبەتیمان هەبێ.
بە گشتی حیزبێکی سیاسی ٣ جۆر دروشمی هەیە:

**یەکەم:** "دروشمی رۆژ" کە دەکرێ لە سەر مەسەلەیەکی دیاریکراوی زۆر بچووك بێ. بۆ نموونە ئەگەر لە شارەکان "نان" یان "نەوت" وەدەست نەکەوت، دەتوانین خەڵك هان بدەین بۆ ئەوەی کۆ ببنەوەو خۆپێشاندان پێك بێننو داوای "نان" یان "نەوت" بکەن. شاگردی مەدرەسە دەتوانین هان بدەین بۆ ئەوەی بە کۆمەڵ وەرێ کەونو داوا بکەن: "مامۆستاکانیان تەبعید نەکرێن"و دروشمی دیکەی ئاوا... .

**دووهەم:** درێژتر لە دروشمی رۆژ، دروشمی "تاکتیکی"یە. ئەگەر سەرنج بدەینە تێکۆشانی حیزب، دەبینین کە لە پاش شۆڕشی ئێرانەوە هەتا ئێستا، حیزب چەند جار تاکتیکی خۆی گۆڕیوە: لە سەرەتادا تاکتیکمان هاوکاری لەگەڵ رێژیمێك بوو کە بەدوای شۆڕشدا هاتبووە سەر کار. ئێمە پشتیوانیمان لە بەڕێوەبەرایەتیی خومەینیو لە رێژیمەکەی دەکردو مەسەلەی خەباتی چەکداری لە گۆڕێدا نەبوو. لە شەڕی ٣ مانگەدا دەستمان کرد بە خەباتی چەکدارانە. پاش سەرکەوتن لە شەڕی ٣ مانگەدا، سەرلەنوێ تاکتیکی خۆمان گۆڕی. بەڵام ئەمجارە لە جیاتی پشتیوانی لە رێژیمی خومەینی، دەمانەویست بۆ دیتنەوەی رێگاچارەیەك بۆ مەسەلەی کوردستان، لەگەڵ دەوڵەت وتووێژ بکەین. تاکتیکی "وتووێژ"یش زۆر درێژەی نەکێشاو سەرلەنوێ شەڕی چەکداری دەستی پێکرایەوە. بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین، دەبینین کە تاکتیکی شەڕی چەکداریی ئێستامان لەگەڵ تاکتیکی شەڕی چەکداریی ٣ مانگەدا فەرقی

هەیە: ئەو کاتە ئێمە شەڕمان دەکرد بۆ ئەوەی ڕێژیم ناچار بە وتوویژ بکەین، بەلاّم ئێستا شەڕ دەکەین بۆ ئەوەی ڕێژیم بڕووخێنین؛ چونکە لەم بڕوایەداین کە هیچکام لە داخوازەکانی خەڵکی کوردستانو گەلانی ئێران، لە چوارچێوەی ڕێژیمی خومەینیدا وەدی نایە. واتە دروشمی ئێستای ئێمە: "ڕووخاندنی ڕێژیمی خومەینی"یە. بەم جۆرە دەبینین کە لەو ماوەیەدا چەند قۆناغ هاتۆتە پێشو، بە پێی هەرکامیان، تاکتیکمان گۆڕیوەو دروشمی تایبەتیمان داوە.

سێهەم: لە تاکتیك درێژتر "ستراتێژی"یە. قۆناغی ستراتێژیك ماوەیەکە کە، چەند قۆناغی تاکتیکی دەگرێتەوە. ئێمە هەروەك ئیشارەمان پێکرد، لە چەند ساڵی ڕابردوودا تاکتیکی خۆمان چەند جار گۆڕیوە، بەلاّم دروشمی ستراتێژیمان کە بریتی بووە لە: "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستانی ئێران" چ ئەو کاتەی پشتیوانیمان لە ڕێژیمی خومەینی دەکرد، چ لە وەختی شەڕی ٣ مانگەدا، چ ئەودەمەی لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت خەریکی وتوویژ بووینو، چ ئێستا کە دروشمی ڕووخانی ڕێژیمان هەڵگرتووە، هەر لە جێگای خۆی بووەو هەیە... .

کەوابوو، قۆناغی ستراتێژیك درێژترەو مومکینە ٥ ـ ١٠ یان تەنانەت ٢٥ ساڵو زیاتریش بکێشێ. ئەوە بەستراوەتەوە بە زۆر هۆو بە تایبەتی بەوە کە تا چ ڕادەیەك لە قۆناغێکی تاکتیکیی تایبەتیدا سەرکەوتوو بووینو، تا چ ڕادەیەك تاکتیکی باشمان بەکار هێناوە. بەرنامەی سیاسیی هەر حیزبێك، بەگشتی بۆ قۆناغێکی ستراتێژیك دانراوەو بەرنامەی حیزبی ئێمەش هەروایە.

بەلاّم بێجگە لەوانەی گوترا، هەر حیزبێکی شۆڕشگێڕ پێڕەوی لە هێندێك ئوسووڵیش دەکا کە بۆ دابینکردنی هەرکام لەو ئەسلاّنە، مومکینە بە چەندین قۆناغی ستراتێژیکدا تێپەڕێ. بۆ ئێمە، دامەزرانی سۆسیالیزم ئەسڵێکی زۆر گرینگە. بۆ گەیشتن بەو ئەسڵەش، ئێستا لە ئاسۆی خەباتی گەلی کورددا، ٣ قۆناغی ستراتێژیکمان لە بەرچاوە:

قۆناغی یەکەم؛ وەدەستهێنانی خودموختارییە.

پاش وەدەستهێنانی خودموختاری، هەتا پێکهێنانی هەلومەرجی پیادە کردنی سۆسیالیزم، دەبێتە قۆناغی دووەم. ئەگەر ح.د.ك.ئـ. بتوانێ ئەو بەرنامەیەی ئێستا هەیەتی، پاش وەرگرتنی خودموختاری لە ماوەی ٢٥ ساڵدا جێبەجێ بکا،

سەرکەوتنێکی مێژوویی یەکجار گەورەی وەدەست هێناوە. ٢٥ ساڵ ئەگەرچی بە نیسبەت ژیانی یەك ئینسان ماوەیەکی زۆر دێتە بەرچاو، لە مێژووی نەتەوەیەکدا ماوەیەکی زۆر کەمە.

بە دوای جێبەجێ بوونی بەرنامەکەمان، دەست دەکەین بە دانانی بەرنامەیەکی تازە بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم. ئەوە قۆناغی سێهەمە.

دامەزراندنی سۆسیالیزم بۆخۆی ماوەیەکی زۆری دەوێ؛ لەوانەیە ژیانی ٢ یان ٣ نەسڵی بۆ تەرخان بکرێ. وڵاتی زۆر پێشکەوتوو لە ئۆرووپای رۆژهەڵاتدا، وەك "ئاڵمانی دێموکراتی" یان "چێکۆسلۆواکی" کاتێك دەستیان کرد بە دامەزراندنی سۆسیالیزم، لە باری ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە بە سەدان ساڵ لە ئێمە لە پێشتر بوون، بەڵام هێشتا ناڵێن کە لە وڵاتی ئەواندا سۆسیالیزمی تەواو، واتە ئەوەی پێی دەگوترێ "سۆسیالیزمی پێشکەوتوو"، پیادە کراوە. کەوابوو جێبەجێکردنی ئەسڵێکی گرینگ وەك دامەزراندنی سۆسیالیزم کە بۆ خۆمان دیاری کردووەو بڕوامان پێی هەیە، ٣ قۆناغی ستراتێژیکی پێویستە.

بە کورتی، ئێمە لە ئێستاوە هەم دروشمی رۆژمان کە بەشێکە لە تاکتیکمانو، هەم دروشمی تاکتیکیمان کە بەشێکە لە ستراتێژیەکەمانو، هەم دروشمی ستراتێژیکمان کە لە سەر ئەسڵێکی پیرۆز دانراوە، بە روونی دیاری کردووە.

دامەزراندنی سۆسیالیزم، چارەسەرکردنی بنەڕەتیی مەسەلەی کۆمەڵایەتیە. بەڵام ئەوە ئامانجی دوارۆژەو لە قۆناغی ئێستای خەباتدا ناتوانێ ببێ بە دروشمی رۆژ. تەنانەت مەسەلەی دامەزراندنی سۆسیالیزم، بەو وەزعە ئابووریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیەی ئێستا لە کوردستاندا هەیە، ناتوانێ نەك تەنیا دروشمی رۆژ بێ، بەڵکوو لە راستیدا بۆ قۆناغێکی تاکتیکییش ناکرێ باسی لە سەر بکرێ... . بەڵام هەر ئەوە کە لە ئێستاوە رادەگەیەنین: "ئامانجی دوارۆژی حیزبەکەمان سۆسیالیزمە"، رێبازی گشتیی حیزبەکەمان بۆ دوارۆژ دیاری کردووەو ئاسۆی سیاسەتو تێکۆشانەکەمان روون کردۆتەوە. ئەوەشمان دیاری کردوە کە لە کۆمەڵی کوردەواریدا، کێ پشتیوانمانە، لەگەڵ کام چینو توێژێك دەبێو دەتوانین بچینە پێش. هەروەها روونمان کردۆتەوە کە لە ئێرانو لە دنیادا دۆستو هاوپەیمانەکانمان کێن؟.

## ٢ـ سۆسیالیزم چیە؟

تا ئێرە وەك سەرەتایەك روونمان كردەوە كە هۆی هێنانە گۆڕی سۆسیالیزم لە بەرنامەكەماندا چ بووەو، گوتمان كە: ئێمە وەك حیزبێكی پێشڕەو سۆسیالیزممان بۆیە هەڵنەبژاردووە چوونكە وەك دروشمێك خەڵك پێیان خۆشە، یان فلاَن دەستەو تاقم پێمان دەڵێن: "پێشكەوتوو"! ئێمە سۆسیالیزممان لە پاش بیركردنەوەیەكی زۆرو لێكدانەوەیەكی قووڵ هەڵبژاردوە.

ئێمە وەك حیزبێكی شۆڕشگێڕی واقیعبین، تێدەكۆشین بە گشتیی زۆرداری نەتەوەیی لابەینو گەلەكەمان هەست بەوە بكا كە خاوەنی چارەنووسی خۆیەتیو دەتوانێ فەرهەنگی نەتەوەیی خۆی پەرە پێ بدا. بەلاَم هەر لەو كاتەشدا، هەوڵ دەدەین لە پێش هەمووان‌دا، زەحمەتكێشانی كوردستان كە زۆربەی گەلی كوردن، بە ئاواتە ئابووریو كۆمەلاَیەتیەكانی خۆیان بگەیەنین كە رێگای وەدیهاتنی ئەو ئاواتەش، دامەزراندنی سۆسیالیزمە.

**سۆسیالیزمو سەرمایەداری:**

سۆسیالیزم وەك نیزامێك كە دژی سەرمایەداریە هاتۆتە مەیدانو، كاتێك دەڵێین: "سۆسیالیزممان دەوێ" ئەوە بەو مانایەیە كە سەرمایەداری رەت دەكەینەوەو، بڕوامان بەوە هێناوە كە سەرمایەداری وەك نیزامێكی كۆمەلاَیەتی، لە لایەن مێژووەوە مەحكوومە.

لەم قسەیە بە هاسانی دەردەكەوێ كە دروشمی رووخانی سەرمایەداری، كاتێك دەبێ هەڵبگیرێ كە ئیمكانی دامەزراندنی سۆسیالیزم وەك ئەركێكی هەرە نێزیك پێك هاتبێ. ئەمە وەلاَمی هێندێك دەستەو تاقمە كە جارجار رەخنەمان لێدەگرن بۆچی ئێمە لە دروشمەكانی ئێستاماندا دروشمی دژی سەرمایەداری ناگونجێنین؟

دیارە ئێمە كاتێك دەڵێین: "بمرێ ئیمپریالیزم" لە راستیدا بەدژی سەرمایەداری دروشممان هەڵگرتووە؛ چونكە ئیمپریالیزم سیستمی جیهانی قۆناغی ئێستای سەرمایەداریە. بەلاَم ئەگەر بێینە سەر باری نێوخۆی كوردستان، مەسەلەكە دەبێ بە جۆرێكی دیكە لە بەرچاو بگیرێ؛ واتە لەپێشدا دەبێ بپرسین كە ئێمە لە كوردستاندا بە دژی كام سەرمایەداری دەبێ دروشم هەڵبگرین؟ ئەو سەرمایەداریە لە كوێیە؟!

مومکینە ئاوا زانرابێ کە، هەرکەس بۆ نموونە میلیۆنێك تمەنی پارە هەبێ سەرمایەدارە! بەڵام لە باری عیلمیەوە، سەرمایەداری مانایەکی دیکەی هەیە. "مارکس" کە لە شیکردنەوەی سەرمایەداریدا هیچ کەس نایگاتێ، دەڵێ: "سەرمایەداری پێوەندییەکی کۆمەڵایەتیە." ئەم تەعریفە رەنگە لە بەرچاوی ئەو کەسانە کە هەر باسی سەرمایە کرا، فەوری گیرفانی پڕ لە دراوو ملکوماڵیان وەبیر دێتەوە، هێندێك سەیر بێ. بەڵام لە راستیدا، تەنیا ئەوکاتە دەتوانین باسی سەرمایەداری بکەین کە پێوەندییەکی کۆمەڵایەتیی تایبەتی پێك هاتبێ. واتە، لە لایەك سەرمایەدار هەبێو، لە لایەکی دیکە کرێکارو، لە بەینی ئەو دووانەدا پێوندیی چەوساندنەوە دامەزرابێ. چەوساندنەوە لە بەر ئەوە کە کرێکار خاوەنی ئامرازی بەرهەمهێنان ("وسایل تولید") نیەو، بە ناچار هێزی کاری خۆی دەفرۆشێ.

کەوابوو دەوڵەمەندو سەرمایەدار لێك جیان. هەر سەرمایەدارێ دەوڵەمەندە، بەڵام هەر دەوڵەمەندێك سەرمایەدار نیە. جا ئەگەر لە روانگەیەکی ئاوا بڕوانینە کوردستانی ئێران، دەبینین کە ئێستا لە کوردستاندا دەوڵەمەند هەیە، بەڵام سەرمایەدارێکی ئەوتۆ وەبەرچاو ناکەوێ.

لە بەر ئەوە، لە کوردستانی ئێستادا هەڵگرتنی دروشمی دژی سەرمایەداری پێویست ناکا. بە تایبەتی کە قۆناغی ئێستای خەبات قۆناغی میللی ـ دێموکراتییەو، سەرمایەداری لە کوردستان لە چینێکی یەکگرتوو رێکخراوەدا خۆی نەنواندووە کە بەرامبەر بە داخوازی میللی ـ دێموکراتیی ئێمە رابوەستێ. تەنانەت بە پێچەوانەی ئەوە، بورژوازیو وردەبورژوازی بە تایبەتی لە شاردا کە زۆرتر بازاڕیو بازرگانە، بۆخۆی یارمەتیی خەباتی گەلی کورد دەداو تێیدا بەشدارە.

**سۆسیالیزمو کار:**

ئێمە سۆسیالیزممان بۆیە هەڵبژاردووە کە چەوساندنەوە لەبەین بەرین. واتە ئەو ئەسڵە وەدی بێنین کە لە نووسراوەی بەناوبانگی: "رەخنە لە پرۆگرامی گۆتا" لە ساڵی ١٨٧٥ بۆ یەکەم جار لە لایەن "مارکس"و "ئەنگێلس"ەوە بە کورتیو بە روونی بەیان کراوە؛ ئەویش ئەمەیە کە:

لە سۆسیالیزمدا، مەعیاری مافی ئینسان، لەگەڵ ئەو مەعیارە لە سەرمایەداریدا فەرقی هەیە. هەتا پێکهاتنی کۆمەڵی سۆسیالیستی، یەکێك کە دراو، کارخانە،

زەوی‌و شتی وای هەیە، وەزعی باشترەو باشتر دەژی؛ بەلاّم لە کۆمەڵی سۆسیالیستی‌دا، ئەو ئیمتیازانە هەموو بەرەبەرە وەلا دەچن‌و تەنیا یەك مەعیار دەمێنێتەوە کە ئەویش "کار"ە. واتە: هەرکەس بە پێی لێهاتووی کاری پێ دەسپێردرێ‌و هەرکەسیش بە پێی کارەکەی، حەقی خۆی لە کۆمەڵ وەردەگرێ.

کەوابوو، ئیمتیازی نەژادی، چینایەتی، ئێرسی، عەشیرەتی، ئایینی‌و... هەموویان لە سۆسیالیزم‌دا لەبەین دەچن. ئێمەش سۆسیالیزمان هەر بۆیە هەڵبژاردووە کە ئەو ئیمتیازانە نەمێنن‌و، تەنیا "کار" ببێتە مەعیار؛ چونکە ئەوەی زۆر بە عادلانەترو ئینسانی‌تر دەزانین.

بەلاّم ئەوەش وەبیر بێنینەوە کە مەعیاربوونی کار بەو مانایە نیە کە تەنیا دەبێ ئەندازەی کار لە نەزەر بگیرێ. بۆ ئەوەی کار ببێتە مەعیار، دەبێ ٣ شت لە بەرچاو بێ:

**یەکەم ـ رادەو چەندی کار**

**دووهەم ـ چۆنیەتی کار**

**سێهەم ـ گرینگیی کارەکە بۆ کۆمەڵ**

بۆ نموونە: کاری دوکتورێك لە باری چۆنیەتییەوە لە کاری کرێکارێکی سادە بەرزترە؛ کاری ئەو کرێکارەی کە لە بن عەرز خەڵووز دەردێنێ، لە کاری کەسێك کە رۆژنامە دەفرۆشێ، بۆ کۆمەڵ گرینگترە؛ هەروەهایە سەبارەت بە کاری بەرپرسێك کە ئۆرگانێکی ولاّتەکەی بەرێوە دەبا؛ یان کەسێك کە کارخانەیەکی گەورە بۆ ولاّتەکەی هەڵدەسوورێنێ؛ یان زانایەك کە لێکۆڵینەوەی زانستی دەکا، ئەوانە دەبێ یارمەتی زیاتریان پێ بدرێ‌و ئیمکاناتی پێویست بۆ بەرێوەبردنی کارەکەیان بۆ پێك بێ.

**سۆسیالیزم‌و ئابووری:**

ئێستا بزانین لەباری ئابووری‌یەوە بۆچی سۆسیالیزمان هەڵبژاردوە؟

کوردستانی ئێران بە گشتی، ناوچەیەکی پاشکەوتوو لە ولاّتێکی پاشکەوتوودایە. لە بەر ئەوە کە سۆسیالیزم گیروگرفتەکانی ئابووری زووترو باشتر چارەسەر دەکا، ئێمە بۆ لە نێو بردنی پاشکەوتووی ولاّتەکەمان، سۆسیالیزمان هەڵبژارد.

سۆسیالیزم ئیمکانی ئەوە دەدا کە داهاتی نەتەوەیی ("درآمد ملّی") وەك گرینگترین نیشاندەری وەزعی ئابووریی هەر ولاّتێك، خێراتر پەرە بستێنێ‌و ئەو

داهاتە عادلانەتر دابەش بکرێ. ئەگەر لە ولاتانی سۆسیالیستیدا ئەو سۆسیالیزمەی کە پێی دەڵێن "سۆسیالیزمی مەوجوود" یان "پیادە کراو" بخەینە بەرچاو، بۆمان دەردەکەوێ کە بێجگە لە هێندێك حاڵەتی تاك تاك، بە گشتی نیسبەتی داهاتی خەڵك نزیکەی یەك بە دەیە. واتە ئەگەر کەمترین رادەی داهاتی خەڵك لە مانگدا هەزار تمەن بگرین، ٩٥٪ی خەڵك لە هەزار تا دەهەزار تمەن لە مانگدا وەردەگرن؛ یان بە جۆرێکی دیکە بڵێین: لەم ولاتانەدا، داهاتی زۆربەی خەڵك لە مانگدا، لە هەزارتمەن کەمترو لە دەهەزار تمەنیش زیاتر نیە. لە حاڵێکدا لە ولاتانی سەرمایەداری، ئەو نیسبەتە زۆر جار دەگاتە یەك بە هەزار واتە هیوا هەیە کە بۆ نموونە لە مانگدا ٣٠٠ دۆلاری داهاتەو، هیواش هەیە کە لە بەرامبەردا مانگەی ٣٠٠هەزار دۆلاری دەسکەوت دەبیو، ژمارەی هەر دوو دەستە، لە کۆمەڵدا زۆرە. کەوابوو، لە ولاتی سۆسیالیستیدا فەرق هێندە نیە؛ ئەگەریش ببێ رۆژ بە رۆژ کەمتر دەبێتەوەو، ئەگەر وای لیبێ کە رۆژێك ئەو فەرقە بگاتە یەك بە پێنج، ئەودەم بەراستی لە باری داهاتەوە جیاوازییەکی ئەوتۆ نامێنێ.

دیارە نابێ لە بیرمان بچێ کە ئەو کارە لە سۆسیالیزمدا، بەرەبەرە جێبەجێ دەبێ. چونکە ئەگەر نەکاو بێ، زەرەرێکی زۆر دەگەیەنیو، لە راستیدا ئەوەی کە پێی دەڵێن "یەکسانی" (ئێگالیتاریسم)، لە سەرەتادا وەزعێکی وا پێك دێنێ کە مانیعی هاندانی خەڵك دەبێ بۆ ئەوەی کە هەموو لێوەشاوەییو ئیمکاناتی خۆیان وەکار بخەن.

هەر لە سەر مەسەلەی داهات، ئیشارە بە یەك دوو خاڵی بچووکی دیکەش بێکەڵك نیە:

**یەکەم:** ئێستاش لە ولاتانی سۆسیالیستیدا، هێندێك حاڵەتی تایبەتی، جار جار دەبینرێ. بۆ نموونە، ئیمکانی هەیە، لە ولاتێکی سۆسیالیستیدا یەك لە رێگای دزی، یان قاچاغچیەتییەوە چەند میلیۆن وەدەست بخا؛ بەلام ئەمە هێندە گرینگ نیە، چونکە لە لایەك بۆ ئەو چەشنە کارانە سزای زۆر توند دانراوەو، لە لایەکی دیکەشەوە ئەوە حاڵەتێکی ئاسایی ئابووری نیەو ئەساسی پێوەندییەکانی ئابووریی نیزام ناگۆڕێ.

**دووهەم:** دەبێ پێ لەوە بنێین کە جاری وا هەیە لە ولاتی سۆسیالیستیشدا هێندێ ناعەدالەتیی ئابووری دێتە بەرچاو. بۆ نموونە، ئەگەر کرێکارێك لەگەڵ ژنەکەی

هەردووك كار بكەن، هەردووكیان یارمەتی وەردەگرن. ژنو پیاوێكی كرێكاری دیكەش ئەگەر هەر لەو حاڵەدا بن بەو فەرقە كە منداڵێكی زۆریان هەبێ، دیارە بۆ منداڵەكانیان هێندێك یارمەتیی زیادی وەردەگرن، بەلاّم ئەو یارمەتیە زیادەیە هێندە نیەو لە نەتیجەدا، ئەو داهاتە كە بە گشتی بە سەر حەوت هەشت كەسدا دابەش دەكرێ، كەمتر دەبێ لەوە كە تەنیا بە سەر دوو كەسدا دابەش بكرێو ئەوە هێندێك ناعەداڵەتی پێش دێنێ.

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش كە: ئەی كەنگێ كۆمەڵ یان نیزام بە تەواوی عادلانە دەبێ؟

وەلاّم ئەوەیە كە: ئەو كاتەی "هەر كەس بە پێی لێهاتوویی خۆی كار بكاو بە پێی پێداویستییەكانی یارمەتی وەربگرێ". بەلاّم ئەو نیزامە جارێ زۆر دوورە... .

بە گشتی، ئەگەر رادەی هەڵدانی داهاتی نەتەویی لە ولاّتەكانی سۆسیالیستیو لە ولاّتانی سەرمایەداریدا پێكەوە هەڵسەنگێنین، دەبینین كە لە ولاّتانی سەرمایەداریدا ئەم هەڵدانە لە ماوەی بیستو پێنج ساڵدا سەدی سێیە؛ بەلاّم لە ولاّتانی سۆسیالیستیدا سەدی هەشت زیاترە. هۆی ئەو فەرقە ئەوەیە كە سۆسیالیزم دەتوانێ، بە تایبەتی لە سەرەتای دامەزرانیدا تەواوی هێزی ئینسانیو ماددیی ولاّت وەگەڕ بخاو؛ لە بەر ئەوە كە چەوساندنەوە نامێنێو خەڵك لە راستیدا بۆ خۆیان كار دەكەنو دڵگەرمیو تێكۆشانیان زیاترە، بوحرانی ئابوورییش كە لە تایبەتییەكانی سەرمایەداریە، لە سۆسیالیزمدا نامێنێو نابێتە كۆسپو، لە ئاكامدا هەموو كارێك خێراترو زووتر بەرەو پێش دەچێ.

## ٣ـ سۆسیالیزمی مەوجوود:

بە راشكاوی دەبێ پێ لەوە بنێنین كە شێوەی هەڵدانی سۆسیالیزمی مەوجوود لە ولاّتانی سۆسیالیستیدا بە تەواوی جێگای رەزامەندی نیەو، هێندێك هەڵە لەم بارەوە كراون كە زۆربەیان لە هەلومەرجی تایبەتیو عەینییەوە سەرچاوەیان گرتووە. بزانین ئەو هەلانە هۆی رووداونیان چیە؟

**سۆسیالیزم لە یەكیەتیی سۆڤیەتیدا:**

"مارکس"و "ئەنگێلس" لە مانیفێستی حیزبی کومۆنیستدا دەڵێن: "پرۆلێتاریا نیشتمانی نیە؛ نیشتمانی پرۆلێتاریا هەموو جیهانە."

سۆسیالیزمیش هەرگیز دیاردەیەکی نەتەوەیی نەبوەو سیستمێکی جیهانی‌یە. "مارکس"و "ئەنگێلس" پێشبینییان دەکرد کە سۆسیالیزم دەبێ لە پێشدا لە وڵاتی هەرە پێشکەوتووی سەرمایەداریو ئەویش لە چەند وڵاتدا سەرکەوێ، بۆ ئەوەی ببێتە سیستمێکی جیهانی.

بەڵام مێژوو قانوونی تایبەتیی خۆی هەیە. تیئۆریەك بۆ بەرەو پێشچوونی کۆمەڵ دادەنرێ، بەڵام رەورەوەی مێژوو کۆمەڵ بەرەو جێگایەکی دیکە دەبا، ئەمجا تیئۆری ناچارە خۆی لەگەڵ واقعییەت رێك بخا.

هەڵکەوتی مێژوو ئەوە بوو کە ئیمکانی دامەزرانی سۆسیالیزم لە پێشدا، لە وڵاتێکی غەیری ئەوە پێك بێ کە مارکسو ئەنگێلس پێشبینییان دەکرد؛ واتە لە رووسیەدا کە لە باری ئابووریو کۆمەڵایەتی‌یەوە بە هیچ جۆر ئامادەیی بۆ دامەزرانی سۆسیالیزم نەبوو. بێجگە لەوەش، لە باری حکوومەتیەوە سەرەڕۆترین وڵاتی ئۆروپا بوو و لە تەواوی مێژووی خۆیدا، رۆژێك ئازادیو دیموکراسیی بەخۆیەوە نەدیبوو. جا لە وڵاتێکی ئاوادا، شۆڕشی ئۆکتۆبر پێکهاتو بۆ "لنین"و مارکسیستەکانی دیکە، مەسەلەی دامەزرانی سۆسیالیزم بە کردەوە هاتە گۆڕێ.

ئەوان، دوو رێگایان لە پێش بوو: یان دەبوا بە قسەی هێندێك لە ئەندامانی بەڕێوەبەری حیزبی بولشویك بکەن کە دەیانگوت دەبێ جارێ واز لە دروست کردنی سۆسیالیزم لە رووسیەدا بێنینو، هەتا پێکهاتنی ئیمکانی دامەزرانی لە چەند وڵاتی دیکەش، دەست رابگرین؛ یان وەك لنینو لایەنگرەکانی، تێبکۆشن سۆسیالیزم لەو وڵاتەدا دابمەزرێننو ئەو وڵاتە بکەنە بنکە بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم لە وڵاتانی دیکەدا... .

بەڵام هەر وەك گوتمان، ئەو وڵاتە واتە رووسیە، بە هیچ جۆر ئامادەیی بۆ دامەزرانی سۆسیالیزم نەبوو. چونکە هێندێك گیروگرفتی هەبوون کە سەرمایەداری لە چەند وڵاتی ئۆرووپاییو لە ئامریکای شیمالی‌دا لە مێژ بوو تا رادەیەکی زۆر چارەسەری کردبوونو، لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبر، لنینو هاورێکانی، تازە دەبوا لە رووسیەدا چارەسەریان بکەن. وەك: مەسەلەی سەنعەتی کردنی وڵات، مەسەلەی

زەوی‌و زار، مەسەلەی نەتەوەیی، مەسەلەی جیاکردنەوەی دەوڵەت لە دین، مەسەلەی خوێندەوار کردنی کۆمەلانی خەڵك‌و، زۆر مەسەلەی دیکە ... .

با لە سەر هێندێك لەو مەسەلانەو رێگای چارەسەر کردنیان‌و بەرهەمی ئەو رێگاچارانە کەمێك درێژتر قسە بکەین:

نووسراوەکانی "لنین" لە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبر، بە باشی نیشان دەدەن کە لنین لە سەرەتادا بە هیچ چەشنێك نەزەری ئەوە نەبوو کە تاقە حیزبێك دەسەلات بەدەستەوە بگرێ‌و، هەتا ساڵی ١٩١٨ش لەو بڕوایەدا بوو کە حیزبی بولشویك دەبێ لەگەڵ حیزبەکانی دیکە هاوکاری بکاو، بە هاوکاری هەمووی ئەوانەی سۆسیالیزمیان مەبەست بوو، کۆمەڵێکی سۆسیالیستی دابمەزرێنێ. بەلام هێندێك گیروگرفت هەر لە سەرەتاوە پێش‌هاتن کە بۆ بەربەرەکانی‌و چارەسەر کردنیان، وایان بە باش زانی بەرەبەرە سیستمی تاقە حیزبی دابمەزرێنن. یەکێك لەو گیروگرفتانە مەسەلەی زەوی‌و زار بوو:

کاتێك شۆڕشی ئۆکتۆبر سەرکەوت، دانیشتووانی لادێ لە رووسیە واتە "موژیك"، وەك کۆیلە وابوون‌و لەگەڵ زەوی دەفرۆشران. ئەم کارە بە "سێرواژ" ناوی دەرکردبوو. لە راستی‌دا ماوەیەك پێش شۆڕشی ئۆکتۆبر، "سێرواژ" بە رەسمی هەڵوەشێنرابوو، بەلام شوێنەواری هەر مابوو. لە ساڵی ١٩١٨دا، ئەوانەی کە پێیان دەگوتن: "سوسیال ریوۆلوسیۆنێر" (سۆسیالیستی شۆڕشگێڕ) یان زۆر بە کورتی: ئێس ـ ئێڕ (S.R)، بەرامبەر بە بولشویکەکان راوەستان. ئەوانە بە پێی نووسراوەکانی لنین نفووزێکی زۆریان لە نێو جووتیاراندا هەبوو. رۆژنامەنووسی ئامریکایی بە ناوی "جان رید"یش لە کتێبە بەناوبانگەکەی بە ناوی "ئەو دە ڕۆژەی دنیایان وەلەرزە خست"دا، ئەم راستی‌یەی بە جوانی باس کردوە.

لنین بە تایبەتی بە مەبەستی راکێشانی جووتیاران‌و بەشداركردنیان لە حکوومەتدا، یەکیەتیی حیزبی بولشویك لەگەڵ "ئێس ـ ئێڕ"ەکانی هێنایە گۆڕێ. کە وابوو، دروشمی "یەکیەتیی کرێکاران لەگەڵ جووتیاران" کە بوو بە ئەسلێکی پەسند کراو لە لایەن حیزبی بولشویکەوە لە جەرەیانی شۆڕشی ئۆکتۆبردا هاتە گۆڕێ. لە زەمانی "مارکس"و "ئەنگێلس"دا باسی ئەم یەکیەتیە بەم شێوەیە نەبوو. دروشمی وان بریتی بوو لە : "پڕۆلێتێرەکانی جیهان یەك بگرن!".

بە هەر حاڵ "ئێس ـ ئێڕ"ەکان لە ئاخردا نەچوونە ژێر باری ئەو یەکیەتیەو تاریخ دەریخستووە کە تەنانەت خەریك بوون کودێتا بکەنو بۆخۆیان دەسەڵاتی سیاسی بەدەستەوە بگرن، کە بولشویکەکان پێیان زانیو زووتر جووڵانەوە. "ئێس ـ ئێڕ"ەکان دەیانگوت کە لە ئۆکتۆبری ١٩١٧شدا، بولشویکەکان کودێتایان کردووە نەك شۆڕش. ئەوەیان بە تایبەتی بۆیە دەگوت کە لە سەرەتادا، شۆڕش بە دانی کوژراوێکی زۆر کەم سەرکەوتو تەنانەت لە گرتنی کۆشکی زستانییشدا زیاتر لە چەندسەد کەس نەکووژران. لە پاشان "ئێس ـ ئێڕ"ەکان داوایان کرد سەربازو جووتیارەکان کە چەکدار ببوون، بە دژی بولشویکەکان راپەڕنو ئەو کاتە بوو کە هەروەك گوتمان، حیزبی بولشویکیش ناچار بوو سەرکوتیان بکاو دەسەڵات بە تەواوی بە دەستەوە بگرێ. بەم جۆرە، بەرەبەرە مەسەلەی زاڵ بوونی تاقە حیزبێكو دامەزراندنی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا لە عەمەلدا هاتە گۆڕێ.

هۆیەکی دیکە کە جەرەیانی سەقامگیر بوونی دەسەڵاتی تاقە حیزبی خێراتر کرد، گەمارۆدانی رووسیەی سۆڤیەتی لە لایەن وڵاتانی سەرمایەدارییەوە بوو. رووسیەی سۆڤیەتی هەتا ساڵی ١٩٢٠ لە لایەن چاردە دەوڵەتی سەرمایەداریی رۆژئاواوە بە یارمەتیی دژی شۆڕشی نێوخۆ، گەمارۆ درابوو. تەنیا پاش دوو ساڵ شەڕو لەخۆبوردوویی گەورە بوو کە بولشویکەکان توانییان سەرکەون. دوو ساڵ پاشتر واتە لە ساڵی ١٩٢٢دا، جەمهووریەکانی رووسیەی سۆڤیەتی یەکیان گرتو یەکیەتیی سۆڤیەتییان پێكهێناو بەم جۆرە، ئیمکانی دامەزراندنی سۆسیالیزم لە یەك وڵاتدا پێكهات.

بەڵام هەروەك لە پێشوودا گوتمان، ئەم کۆڵەبارە، قورسایی چەندسەد ساڵ وەپاشکەوتوویی ئیمپراتۆریی رووسیەشی لەگەڵ بوو. سۆسیالیزم دەبوا لە پێشدا مەسەلەی سەنعەتی کردن، مەسەلەی نەخوێندەواری، مەسەلەی ئەرزی، مەسەلەی میللیو زۆر گیروگرفتی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیو ئابووریی دیکەش چارەسەر بکا کە لە هێندێك وڵاتی سەرمایەداریدا تا رادەیەکی زۆر چارەسەر کرابوون. هەر بۆیەش، دامەزراندنی سۆسیالیزم زۆر بە زەحمەت بەرەوپێش دەچوو. بۆ نموونە تەنیا لە ساڵی ١٩٢٩ واتە دوازدە ساڵ پاش شۆڕشی ئۆکتۆبردا بوو کە یەکەم نەخشەی ئابووریی پێنج ساڵە دەستی پێکرد.

پاش کۆچی دوایی لنین لە ساڵی ١٩٢٤دا، بەرەبەرە وەزع لە یەکیەتی سۆڤیەتو بە تایبەتی لە نێو حیزبی کومۆنیست (حیزبی بولشویك)دا گۆڕا. "ستالین" کە دەسەڵاتی بە دەستەوە گرتبوو، لە جیاتی دێموکراسی لە نێو حیزبو لە نێو وڵاتدا، لە ژێر ناوی دیکتاتۆری پرۆلێتاریادا، دیکتاتۆریەتی شەخسی خۆی جێگیر کرد. ئەمە لادانێکی زۆر گرینگ لە ڕێبازی راستەقینەی حیزبی بولشویك بوو کە هەتا ئێستاش شوێنی خۆی لە یەکیەتیی سۆڤیەتی‌دا بەجیٚ‌هێشتوە.

بە گشتی، لە ژێرپێنانی دێموکراسی یەکێك لە دیاردەکانی زەمانی ستالینە. لە زەمانی ستالین‌دا بوو کە گرینگی‌دانی لە رادەبەدەر بە نەخشی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا، هەروەك ئیشارەمان پیٚ‌کرد بەرە بەرە بوو بە دیکتاتۆریی حیزبو، دیکتاتۆریی حیزبیش بوو بە دیکتاتۆریی سکرتێری حیزب واتە ستالین، کە حیزبی بولشویکی بە تەواوی خستبوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

یەکێك لە دیاردەکانی نەمانی دێموکراسی، نەگیرانی کۆنگرەی حیزبی بوو. لە ساڵی ١٩١٧وە کە شۆڕشی ئۆکتۆبر پێك‌هات، هەتا ساڵی ١٩٢٤ کە لنین زیندوو بوو، هەموو ساڵێك کۆنگرەی حیزبی بولشویك گیراوە. لەو کونگرانەدا راپۆرتی کومیتەی ناوەندی پێشکەش کراوە، لە سەر گیروگرفتەکان باس کراوە، هەموو کەس بە ئازادی نەزەری خۆی داوە. بەڵام پاش کۆچی دوایی لنین، بەرە بەرە ماوەی نێوان دوو کۆنگرە زیاتر بوو هەتا وای لێهات کە ئاخر کۆنگرەی زەمانی ستالین واتە کۆنگرەی ١٩، لەگەڵ کۆنگرەی ١٨، سێزدە ساڵیان بەین بوو!. دیارە ساز بوونی شەڕی دووهەمی جیهانییش لەو کارەدا بیٚ ئەسەر نەبوو، بەڵام راستی ئەوەیە کە ڕێزدانان بۆ پێڕەوی نێوخۆی حیزب، بۆ ستالین بێگانە بوو.

لە زەمانی دەسەڵاتداریی ستالین‌دا، زۆربەی ئەوانەی کە لەگەڵ شێوەی بەڕێوەبەریی ستالین موافیق نەبوون، وەلانرانو پاك کرانەوە. نموونەی زۆر بەرچاوی ئەو کارە، کومیتەی حیزبی بولشویك لە "لنین‌گراد" بوو کە هەموو ئەندامەکانی لەبەین بران.

لە مەیدانی ئابووریی‌ش‌دا، لەنێوچوونی دێموکراسیو پەرەگرتنی دەسەڵاتی شەخسیی ستالین، بوو بە هۆی زۆر هەڵەو کەمو کوڕی. بۆ نموونە باسی پێکهێنانی

"کەڵخوز"ەکان دەکەین کە ئەو کارە لە سەر ئـەمری سـتالین ئـەنجام دراو شـوێنێکی گەورەی لە سەر وەزعی ئابووریی یەکیەتیی سۆڤیەتی دانا.

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبر، نەزەر ئەوە بوو کـە زەویـش وەك کارخانـەکان میللی بکرێ. بەڵام لە دواییدا دەرکەوت کە لە وڵاتێکی پاشکەوتووی وەك رووسیەدا کە لە باری تێکنیکی کشتوکاڵەوە زۆر لە پاش بوو، ئەو کارە سەرناکەوێ. لە جیاتی ئەوە، بێجگە لە هێندێـك جێگـا کـە ئیمکـانی میللـی کردنـی زەوی‌و پێکـهێنانی شیرکەتی دەوڵەتی بە ناوی "سەڵخۆز" هەبوو، باشتر ئەوە بوو لـە پێـشدا زەوەی لـە نێو جووتیاراندا بەش بکرێ‌و، لە پاشان ئەم جووتیارانە بـەرە بـەرە هـان بدرێـن بـۆ ئەوەی شیرکەتی تەعاوەنی (کەڵخۆز) پێك بێنن. ئەسڵ ئەوە بوو کە جووتیـاران هـان بدرێن بۆ ئەوەی بە مەیلی خۆیان‌و لە سەر داخوازی خۆیان بن بە ئـەندامی کـەڵخۆز، ئەوەش کاتێك دەبێ کە باوەڕ بەوە بێنـن کـە ئەگـەر بچنـە نێـو کـەڵخۆز، وەزعـی ئابوورییان باشتر دەبێ‌و داهاتێکی زیاتریان لەوە کە لە سەر زەویی تایبەتیی خۆیان بە تەنیایی کار بکەن وەدەست دەکەوێ.

بەڵام بە پێچەوانەی ئەو ئەسـڵە، سـتالین جووتیـارانی بـە زۆری ناچـار کـرد کـە زەویـەکانیان بخەنـە سـەریەك‌و کـەڵخوز دروسـت بکـەن. ئـەم کردەوەیـە ئێسـتاش شـوێنەواری هـەر مـاوەو، حکوومـەتی سـۆڤیەتی هێشـتا نـەیتوانیوە گـیروگرفت‌و پێوەندیەکانی کشتوکاڵ بە قازانجی سۆسیالیزم چارەسەر بکا. تەواوی ئـەو کەسـانەی لە تاریخدا ئاگاداریان هەیە، دەزانن کە زەمانێك "ئۆکراین" بە عەمباری گەنمی دنیا دەناسرا؛ بەڵام ئێستا یەکیەتیی سۆڤیەتی ناچارە هەموو سـاڵێك گـەنم لـە ئـەمریکا بکڕێ... . چونکە ئەگەر لە ئابووری وڵاتێکدا شێوە هەڵسووڕانێك جێگیر بوو، هەروا بە سووك‌و هاسانی لە بەین ناچێ‌و دانانی شێوەیەکی تازە، خـەباتێکی دوورو درێـژی پێویستە.

مەبەست لەم باسە هەروەك لـە هـەوەڵدا گوتـرا، ئـەوە بـوو کـە نیشـان بدەیـن دامەزرانی سۆسیالیزم لە وڵاتێکدا کە هەلومەرجی تێدا ئامادە نیە، تووشـی چـەندە تەنگو چەڵەمە دەبێ‌و بەرهەمی چەندە خراپی لێ پەیدا دەبـێ... . ئەگـەر کەسـێك وەك ستالین توانی هەموو دەسەڵاتێك لـە یەکیـەتیی سـۆڤیەتی بەدەسـتەوە بگـرێ‌و دێموکراسی ئاوا لە ژێر پێ بنێ، هۆیەکەی هەر دەکەوێتە سەر ئەو تەنگو چەڵەمانە؛

ئەگینا لنین بۆ خۆیشی تا رادەیەکی زۆر ستالینی ناسیبوو لە نامەیەك کە لە پێش کۆچی دواییدا بۆ کومیتەی ناوەندیی نووسیبوو گوتوویە: بۆ سکرتێری حیزب یەکێك پەیدا بکەن کە هەموو تایبەتیەکانی ستالینی لە باری کارەوە هەبێ، بەلاّم وەك ئەو توندوتیژ نەبێ! (لەم نامەیەدا کە ئەندامانی حیزب هەر نەشیاندەزانی هەیەو بە دەستووری ستالین شاردرابۆوە هەتا لە زەمانی "خرۆشچۆف"دا بلاّو کرایەوە، لنین بە تاریخی ٥ی مانگی مارسی ١٩٢٣ دەڵێ: "... بۆیە پێشنیار دەکەم هاوڕێیان رێگایەك ببیننەوە بۆ ئەوەی ستالین لەو مەقامە هەڵبگرنو کەسێکی دیکەی لە جێگا دابنێن...".

سەرەڕای هەموو ئەوانە، چاوخشاندنێك لە سەرکەوتنە مەزنەکانی سۆڤیەتی، زۆر باش دەتوانێ نیشاندەری سەرکەوتنەکانی بێوێنەی سۆسیالیزم بێ. چونکە لە سەر ئەو هەموو پاشکەوتووییەی رووسیەو، لە سەر ئەو هەموو تەنگو چەڵەمەیە، لە ئەنجامی لەخۆبوردوویيو تێکۆشانو هەستی شۆڕشگێڕانەی زەحمەتکێشانی ولاّتی سۆڤیەت، یەکیەتیی سۆڤیەتی توانیویەتی بگاتە ئەو جێگا مەزنەی کە دەیبینین!

...

## سۆسیالیزم لە ولاّتانی ئۆرووپای رۆژهەلاّتدا:

پاش شەڕی دووهەمی جیهانی، لە ئۆرووپای رۆژهەلاّتدا، بێجگە لە "یووگوسلاڤی"و "ئالّبانی"، دەسەلاّتی سۆسیالیستی بە هاتنی ئۆردووی سوور دامەزرا.

"یووگوسلاڤی"و "ئالّبانی" بە بێ یارمەتی راستەوخۆی ئۆردووی سوور، خۆیان رزگار کرد. "چێکۆسلّوواکی"ش ئەگەرچی بە هۆی ئۆردووی سوور، ئازاد کرا، بەلاّم ئۆردووی سوور لە پاشان بۆخۆی کشاوەو بە دوای ئەودا، حیزبی کومۆنیست لە نەتیجەی هەڵبژاردنێکی ئازاد، زۆربەی دەنگی هێناوەو دەوڵەتی پێكهێنا. "چێکۆسلّوواکی" تەنیا ولاّتی ئۆرووپای رۆژهەلاّت بوو کە لەوێدا حیزبی کومۆنیست لە ماوەی نێوان دوو شەڕی جیهانیدا، نفووزێکی زۆری هەبوو و بە ئاشکرا وەك حیزبێکی قانوونی تێدەکۆشا. بەلاّم لە "رۆمانی"دا، ئەو وەختەی بە دەستی ئۆردووی سوور ئازاد کرا، ژمارەی ئەندامانی حیزبی کومۆنیست نەدەگەیشتە هەزار کەس. مەجارستانیش هەروا بوو.

لەو ولاَتانەدا، کاتێك مەسەلەی دامەزراندنی سۆسیالیزم هاتە گۆڕێ، هێنایان ئەوەی لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا کرابوو، وەك تەنیا نموونەی سۆسیالیزم کەڵکیان لێوەرگرت، بێ ئەوەی هەلومەرجی تایبەتیی فەرهەنگی، کۆمەلاَیەتی، ئابووریو مێژوویی ئەو ولاَتە لە بەرچاو بگرن. ئەم چەشنە دامەزراندنەی سۆسیالیزم بوو بە هۆی هێندێك گیروگرفت کە چەند نموونەیەك لەوان باس دەکەین:

کاتێك یەکیەتیی سۆڤیەتی دەستی بە دامەزراندنی سۆسیالیزم کرد، ژمارەی دانیشتووانی ولاَتەکەی لە سەدو حەفتا میلیۆن کەس تێدەپەڕی. بەلاَم ئەو دەمەی کە دەسەلاَتی سۆسیالیستی لە مەجارستاندا سەرکەوت، ئەم ولاَتە ٩ میلیۆن کەس دانیشتووی هەبوو. ولاَتێکی سەدوحەفتا میلیۆنی، ئیمکانی ئەوەی هەیە کە هەموو سەنعەتێکی قورس وەك سەنعەتی ئاسنو پۆلاَ تواندنەوە، پێترۆشیمی، ئەلەکترۆنیكو تەنانەت سەنعەتی ئەتۆمیش بۆخۆی دروست بکا. بە تایبەتی کە ولاَتی سۆڤیەتی ئەو کاتە تەنیا بوو و لە لایەن ولاَتانی سەرمایەداریشەوە گەمارۆی ئابووری درابوو. بەلاَم ئاشکرایە کە ولاَتێکی ٩ میلیۆنیی وەك مەجارستان، نەیدەتوانی ئەو هەموو سەنعەتە قورسە دروست بکا. چونکە نە ئیمکانی ژێرزەویی خاکەکەیو، نە هێزی ئینسانیو، نە سەرمایەکەی، ئیجازەی ئەو کارەی پێنادا. سەرەڕای ئەوە، لە رووی نموونەی یەکیەتیی سۆڤیەتیەوە مەجارستانیش دەستی کرد بەوە کە سەنعەتی قورس درووست بکاو، چەند گەلاَڵەی لەم بارەوە دەست پێکرد کە هەرکامە چەندین میلیارد خەرجی هەڵگرتو، هەموو ئیعتیباری ماڵیی ولاَتی بە خۆیەوە گرتو یەکێك لە ئاکامەکانی ئەو کارە ئەوە بوو کە، خەڵك بۆ پێداویستییە سەرەتاییەکانی خۆیان کەوتنە تەنگانەوە.

باسی مەجارستان بۆیە بۆ نموونە هات چونکە لە چاو ولاَتانی دیکە ولاَتێکی پاشکەوتوو بوو. بەلاَم لە راستیدا هەروەك لە هەوەڵەوە گوترا، هەموو ولاَتانی ئۆرووپای رۆژهەلاَت، هەرکام بە چەشنێك تووشی تەنگانە هاتن. نموونەیەکیش لە ولاَتێکی پێشکەوتووی وەك چێکۆسلۆواکی بێنینەوە: ئەم ولاَتە لە باری کەوش دروست کردنەوە، پێشکەوتووترین ولاَتو بە تایبەت زۆر پێشکەوتووتر لە یەکیەتیی سۆڤیەتی بوو. ـ "باتیا" کە لە کوردستانی خۆمان بە "پاتە" ناوی دەرکردبوو، کابرایەکی خەڵکی چێکۆسلۆواکی بوو کە کارخانەیەکی گەورەی کەوش دروستکردنی

لــەو ولاّتــە دامــەزراندبوو. ـ بــەلاّم لــە ســەرەتای ســالّەکانی ٥٠دا، هەیئــەتێك لــە چێکۆسلۆواکیڕا چوون بۆ "مۆسکۆ" بۆ ئەوەی بزانن لە یەکیەتیی سـۆڤیەتی کـەوش چۆن دروست دەکەن، هەتا ئەوانیش لــە ولاّتــی خۆیــاندا هــەر ئــاوا کــەوش دروســت بکەن!. تەنانەت لەوەش سەیرتر، چوون نیمکەتی مەدرەسەیان لە یەکیەتیی سۆڤیەتی ئەندازە گرتو هاتن لە چێکۆسلۆواکیش هەر بەو ئەندازەیە نیمکەتیان دروست کــرد، بەلاّم لە دواییدا، دەرکەوت کە منداڵانــی چێکۆســلۆواکی لــە منداڵانــی ســۆڤیەتی هێندێك کەلّەگەتترو پانوپۆڕترنو لەو نیمکەتانەی یەکیەتیی سۆڤیەتیدا بە تــەواوی جێگایان نەدەبۆوەو، بە ناچار ئەندازەکانیان گۆڕی.

مەبەست لەو نموونانە ئەوە بوو کە نیشان بدەین لە لاسا کردنــەوەی سۆســیالیزمی سۆڤیەتیدا گەیشــتبوونە چ جێگایــەك!!. لــە بــاری سیاسیشــەوە، دەســتتێوەردانی یەکیەتیی سۆڤیەتیی زەمانی ســتالین، لــە کاروبــاری نێوخۆیــی ئــەو ولاّتانــەدا، لــە رادەبەدەر بوو. "بێریا" کە لە زەمانی ستالیندا بەرپرسی "ك.گ.ب" بوو، بە تاوانبار کــردنو ئێعــدام کردنــی زۆر کــەس، بــەزمێکی وای بــە ســەر خــەڵکی ولاّتــەکانی سۆسیالیســتیدا هێنــاو، وەزعێکــی پۆلیســیی وا نالــەباری لــە نێــو حیزبــە کومۆنیستەکانی ئەو ولاتانەدا زالّ کرد، کە بەراســتی دژی ســەرەتاییترین ئوســوولّی سۆسیالیزم بوو. لە بولّغارستان: "کۆستۆف" (ئەندامی دەفتــەری سیاســیو جێگــری سەرکۆمار)، لە مەجارستان: "رایك" (سکرتێری حیزب لە زەمانی شــەڕداو وەزیــری کاروباری دەرەوە)، لە چێکۆسلۆواکی: "سلانسکی" (سکرتێری گشتی حیزب) ئیعدام کــران. ســکرتێرە گشــتییەکانی ئێســتای حیزبــە کومۆنیســتەکانی چێکۆســلۆواکیو مەجارستان "هوسناك"و "کادار" هەردووکیان لە زەمانی ستالیندا لە زینداندا بوون.

ئەو چەشنە گیروگرفتانە بوون بە هۆی پێکهاتنی ناتەبایی زۆر گەورە لــە ولاّتــانی سۆسیالیستیدا، کە لــە رێگــای پێشــکەوتنی سۆســیالیزمدا بــوون بــە کۆســپ. لــە مەجارستان، لە ساڵی ١٩٥٦دا، شەڕو ناکۆکیو کوشتار ساز بــوو، ئەگــەر لەشــکری سوور دەخالّەتی نــەکردبا، شــوێنەوارێك لــە سۆســیالیزم لــەو ولاّتــەدا نــەدەما. لــە لەهستانیش هەر لەو ساڵەدا ئالۆزییەکی گەورە پێكهــاتو بــە زۆری پێشــگیری لــە خوێنڕشتن کرا، لە پاشان بۆ چارەسەر کردنی ئەو گیروگرفتە، چوون "گۆمۆلگا"یان کە لە زینداندا بوو هێنا دەریو وەك قارەمــانی میللــی کردیــان بــە ســکرتێری حــیزب،

ماوەیەکی زۆریشیان ئیمکان پیّدا کە ولاّت بەڕێوە بەریّ، بەلاّم هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێناو بە پێچەوانە وەزعەکەی بە تەواوی ئالّۆز کرد، چونکە هەر لە سەر شێوەی بەڕێوەبردنی پێش ساڵی ١٩٥٦، واتە زەمانی ستالین دەڕۆیی. تەنگو چەلّەمەی ئێستای "لەهستان"یش هەر بەرهەمی ئەو وەزعە نالەبارەیە کە لە درێژەی ئەو سالاّنەدا پێکهاتووە... .

لێرەدا جێگایەتی کە دیسانیش ئەم راستییە دووپات بکەینەوە کە، ناکریّ تاوانی ئەو هەموو هەڵەیە بە تەنیا بخەینە سەر شانی ستالین. بەلّکوو هەروەك گوترا، سەرچاوەی پێکهاتنی ئەو وەزعە، لە پێشدا ئامادە نەبوونی هەلومەرجی ئابووریو کۆمەلاّیەتیو فەرهەنگی، بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم لە رووسیەدا بوو، کە شەخسییەتی پڕ لە ناتەبایی ستالینیش، خۆی یەکێك لە بەرهەمەکانی بوو... .

**ولاّتانی سۆسیالیستیو دێموکراسی:**

ئەوەی کە لە سەر گیروگرفت لە ولاّتانی سۆسیالیستیدا گوترا، بەو مانایە نیە کە سۆسیالیزم لەو ولاّتانەدا هیچ سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، یان سۆسیالیزم توانای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی نیە، یان لە ولاّتانی دیکەدا گیروگرفت نیە. هەروەك لە سەر یەکیەتیی سۆڤیەتی باس کرا، سۆسیالیزم لەو ولاّتانە کە دامەزراوە سەرکەوتنی زۆر گەورەی وەدەست هێناوە. بەلاّم ئەگەر هەلومەرجی تایبەتیی ئەو ولاّتە لە نەزەر بگیرایەو لاساکردنەوەی تێدا نەبوایە، سەرکەوتن زۆرتر دەبوو و گیروگرفتیش کەمتر.

هیچ گومان لەوەدا نیە کە هەرکام لە ولاّتانی سۆسیالیستی، لێوەشاوەیی ئەوەیان هەیە تەنگو چەلّەمەکانی دامەزرانی سۆسیالیزم لەنێو بەرن. بەلاّم بۆ ئەم کارە بەشداری هەموو خەلّك پێویستەو هەوەلّ هەنگاو ئەوەیە کە بە خەلّك رێگا بدریّ بە ئازادی نەزەری خۆی لە سەر گیروگرفتەکان دەربڕیو بیروڕا ئالّوگۆڕ بکا. لێرەدایە کە مەسەلەیەکی زۆر ئەساسی واتە "دێموکراسی" دێتە گۆڕیّ.

بۆ سادە کردنەوەی ئەم باسە باشترە کە چەند بەشی دێموکراسی لێك جیا بکەینەوە، هەرچەند کە دێموکراسی لە ئەساسدا بەش ناکریّو هەموو بەشەکانی پێوەندیی دیالێکتیکیان پێکەوە هەیە. بەلاّم بۆ تێگەیشتن لە ئەسلّی باسەکە، ئەم

بەشکردنە پێویستە، کە ئێمە ناونیان دەنێین: دیموکراسیی کۆمەلآیەتی، دیموکراسیی ئابووریو دیموکراسیی سیاسی.

لە سەر دیموکراسیی ئابووری پێشتر باسمان کردووە. ئەو دێموکراسی‌یە بە گشتی لە ولآتانی سۆسیالیستی‌دا لە ولآتانی سەرمایەداری زیاترە، چونکە داهاتی نەتەوەیی عادلآنەتر دابەش دەکرێ. دیارە ئەو داهاتە مومکینە کەم یان زۆر بێ. راستە کە کرێکاری نیوەنجیی سۆڤیەتی، ئێستاش پایەی ژیانی ئابووری لە کرێکاری نێوەنجیی ولآتانی سەرمایەداری پێشکەوتوو نزمترە، کە ئەمە خۆی هۆی مێژوویی هەیە؛ بەلآم ئەوەندەی کە هەیە، عادلآنەتر دابەش دەکرێو ئەوە بە تەواوی روونە.

لە باری دیموکراسیی کۆمەلآیەتیش‌دا، وەزع هەر بەم جۆرەیە. چونکە ئەو یارمەتی‌یەی کە دەوڵەت لە ولآتانی سۆسیالیستی‌دا بۆ پەروەردە کردنو بارهێنانو لەش‌ساغیو بنەماڵەی کەم‌داهاتو بنکەی گشتیی فەرهەنگیو هونەریو شتی وا تەرخانی دەکا، بەڕاستی شتێکی بەرچاوەو کۆمەڵی سۆسیالیستی لەم بارەوە، زۆر ئیمتیازی ناعادلآنەی لەبەین بردوە کە لەگەڵ کۆمەڵی سەرمایەداری‌دا جێگای هەڵسەنگاندن نیە.

بەلآم کە دەگەینە سەر باسی دیموکراسیی سیاسی، وەزعەکە فەرق دەکا. لێرەش‌دا بۆ روون‌کردنەوەی باسەکە، باشترە دیموکراسیی سیاسیش بە دووبەش بکەین: یەکێکیان دیموکراسیی فەردی‌یە؛ واتە ئەوەی کە هەرکەس بتوانێ ژیانی تایبەتیی خۆی بەو جۆرەی پێی خۆشە بەڕێوەبەرێ. بۆ نموونە، لە جمهووریی ئیسلامی‌دا، ئەم جۆرە دێموکراسی‌یە ئەوەندە مەحدوودە کە تەنانەت شێوەی جل لەبەرکردنیش دیاری‌کراوە. لەم بارەوە لە ولآتانی سۆسیالیستی‌دا بە گشتی ئەم چەشنە مەحدوودکردنانەیان نیەو، یان ئەگەریش هەبێ زۆر کەمە. لە زەمانی شۆڕشی فەرهەنگی لە چین‌دا، هێندێك لەو مەحدوودیەتانە هەبوونو بۆ نموونە، بەستنی کراوات قەدەغە کرابوو. هەروەها برادەرێکی ئێرانی کە لایەنگری ئالبانی بوو، دەگێڕێتەوە کە چەند ساڵ لەمەوپێش، بە پێی دەعوەتێك لە ولآتێکی رۆژئاواڕا دەچێ بۆ ئالبانی. کاتێك دەگاتە فرۆکەخانەی "تیرانا" پایتەختی ئالبانی، لەپێش هەموو شتێك‌دا، لە سەر درێژ بوونی مووی سەری، بەهانەی پێ‌دەگرنو سەری دەتاشن!.

رەنگە ئێستا ئەم جۆرە مەحدوودیەتانە کە پێوەندی بە ژیانی فەردیو شەخسی ئینسان هەیە، زۆر کەم بووبێ... .

کەوابوو، ئەوەی جێگای باسە، دیموکراسیی سیاسیی گشتییە کە پێوەندیی بە هەڵوێستی فەرد سەبارەت بە رێژیم، بە دەوڵەتو، بە حاکمییەتەوە هەیە. ئایا لە وڵاتانی سۆسیالیستیدا، فەرد دەتوانێ نەزەری خۆی لە سەر سیاسەتی حکوومەت بداو ئەم نەزەرە لە کۆمەڵدا بڵاو بکاتەوە؟ ئایا هیچکەس دەتوانێ لە چاپەمەنیو رادیۆو تەلەویزیۆندا رەخنە لە حکوومەت بگرێو، لە باری سیاسییەوە بە دژی دەوڵەت رابوەستێ؟ بەداخەوە، دەبێ پێ لەوە بنێین کە ئەو دیموکراسیە لە وڵاتانی سۆسیالیستیدا، بێجگە لە یووگوسلاڤی کە هێندێك ئازادیی تێدا هەیەو، تا رادەیەکیش مەجارستان، وجوودی نیە، لە حاڵێکدا لە وڵاتانی سەرمایەداریدا، ئەم ئازادییە هەیە.

با هەر لە ئێستاوە روونی بکەینەوە کە لە وڵاتانی سەرمایەداریدا، ئەو ئازادیو دیموکراسیە بە گشتی کاناڵیزە کراوەو، زۆر جاریش هەر لە تیئۆریدا هەیەو بە کردەوە پیادەکردنی هاسان نیە. بۆ نموونە، بە پێی قانوون، هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە رۆژنامە بڵاو بکاتەوەو لە راستیشدا لەم بارەوە کەس پێشی پێناگرێ؛ بەڵام دەرکردنی رۆژنامە، پارەیەکی زۆری پێویستە کە بە هەموو کەس پەیدا نابێو، تەنانەت رێکخراوو سازمانی سیاسیی زۆر گەورەش، بە زەحمەت دەتوانن رۆژنامەی خۆیان بە رێکوپێکی دەربکەن. سەرەڕای ئەوە، هێندێك ئازادیی سیاسی، بەڕاستی هەیە. لە هەڵبژاردندا، هەرکەس دەتوانێ بە ئازادی دەنگی خۆی بدا، نەزەری خۆی لە رۆژنامەو کتێبدا بڵاو بکاتەوە، لە رێکخراوی سیاسیو سەندیکای جێگای پەسندی خۆی ببێتە ئەندام، ئازادیی هاتوچۆی بۆ وڵاتەکانی دەرەوەو پێوەندی گرتن لەگەڵ رێکخراوە سیاسییەکانی وڵاتانی دیکەی هەیەو، بۆ ئەم جۆرە کارانە، ناخرێتە ژێر چاوەدێریو زیندانی ناکرێو مەحکووم نابێ... .

رەنگ بێ ئەو پرسیارە بێتەپێش کە ئەگەر ئەندامانی حیزب لە وڵاتانی سۆسیالیستیدا رەخنەکانی خۆیان بە راشکاوی بڵێن چ دەبێ؟ وەڵام ئەوەیە کە لە نەزەر زۆربەی ئەو ئەندامانە، ئەم کارە وەك سەر لە دیواردان وایەو، بە تاقیکردنەوە دەزانن کە، ئەگەرچی مومکینە لە هەوەڵدا بە رەواڵەت پێیان بڵێن کە ئەو رەخنەو

رەخنە گرتنە مافی خۆیانە، بەلاّم لە یەکەم هەلّکەوتدا بیانوویان پیّدەگرنو سزایان دەدەن.

هەروەك ئیشارەمان پیّکرد، ئیّستا لە نیّو ولاّتانی سۆسیالیستیدا لەم بارەوە فەرق هەیە. لە یووگوسلاڤیو مەجارستاندا، تا رادەیەك وەزع باشترەو ریّژیم سەبارەت بە رەخنەگران ئەوەندە توندو تیژی نیشان نادا. هیچ گومان لەوەدا نیە کە ئەگەر ئیمکان بدریّ خەلّك بە ئازادی نەزەری خۆیان دەربڕن، گیروگرفتەکانی ولاّتانی سۆسیالیستی باشتر چارەسەر دەکریّنو، سۆسیالیزم نەك تەنیا لە مەترسی ناکەویّ، بەلّکوو زۆریش قازانج دەکا. لە راپۆرتی کومیتەی ناوەندیی حیزبی کومۆنیستی فەرانسە بۆ کۆنگرەی بیستو چوارەمی ئەو حیزبەدا هاتووە کە: "بۆ ولاّتانی سۆسیالیستیی ئۆرووپا، بەرەوپیّش چوون، بۆتە هۆی پەیدا بوونی گیروگرفتو ناتەبایی. ئەو ولاّتانە پیّویستییان بە پیّشڕەفتی کۆمەلاّیەتی هەیە کە ئەوەش بۆخۆی دەبیّتە هۆی پەیدا بوونی پیّداویستیی تازەو جۆربەجۆری خەلّکەکەیان؛ هەروەها پیّویستییان بە دیّموکراسی هەیە کە لە هەموو باریّکەوە دەتوانیّ ریّگای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی مەوجوود بیّ. دیّموکراسی مەسەلەی ئەساسی بۆ بەرەوپیّش چوونە. ئەوەش تەنیا بە هیّندیّك بڕیاری ئیداری جیّبەجیّ نابیّ کە لەو ولاّتانەدا لە جیاتی خەباتی سیاسیو ئیدئۆلۆژیکی بەکار دەهیّنریّو، ئیّمە بە تەواوی دژایەتی خۆمانیان لەگەلّ دەردەبڕین. بەلّکوو دەبیّ هەموو ژیانی کۆمەلاّیەتی ئالّوگۆڕیّکی زۆر قوولّی دیّموکراتیی بەسەردا بیّ... ."

بیّجگە لەوانەی گوترا، لە ولاّتانی سۆسیالیستیدا، هیّندیّك ئیمتیازی بیّجیّ بۆ ئەندامانی پایەبەرزی حیزبیو دەولّەتی هەیە کە لەگەلّ ئوسوولّی سۆسیالیزم ریّك ناکەویّو دەبیّتە هۆی پەیدا بوونی کەموکووڕی. یەکیّك لە کەموکووڕیە ئەساسیەکان ئەوەیە کە بەرپرسانو کادرە بەرزەکانی حیزب، پیّوەندیی راستەوخۆیان لەگەلّ خەلّك زۆر کەمە. نەتیجەی ئەو وەزعە، دوورکەوتنەوە لە خەلّکەو، ئەوە تا رادەیەك گەیشتووە کە جاری وا هەیە کادرەکان بە شیّوەی تایبەتی خۆیان قسە دەکەن کە خەلّکی ئاسایی عادەتی پیّنەگرتووە. ئاشکرایە کە ئەو دوورکەوتنەوە لە خەلّکی ئاسایی ئەگەر دریّژەی هەبیّ، کاربەدەستان بەرەبەرە سەبارەت بە بیروبڕواو داخوازەکانی گەل بیّگانە دەکا.

## ٤. سۆسیالیزمو هەلومەرجی ولاتەکەمان:

هەتا ئێرە، هەم لە باری تیئۆرییەوەو هەم لە باری عەمەلییەوە باسی بارە باشەکانی سۆسیالیزممان کرد، هێندێك گیروگرفتی سۆسیالیزمی مەوجوودو هۆی ئەو گیروگرفتانەشمان خستە بەرچاوو، لە ئاخردا هاتینە سەر ئەوە کە گیروگرفتی ئەساسی لە سۆسیالیزمی مەوجووددا، نەبوون یان مەحدوود بوونی دیموکراسیی سیاسییە.

ئێستا دەتوانین بێینە سەر باسی ئەو مەسەلە گرینگە کە ئەو سۆسیالیزمەی ئێمە دەمانەوێ دایمەزرێنین، چ جۆر سۆسیالیزمێکە؟ یان باشتر ئەوەیە کە پرسیار بکەین: ئایا ئەو سۆسیالیزمەی ئێمە دەمانەوێ دروستی بکەین، بە تەواوی عەینی ئەوە دەبێ کە لە ولاتانی سۆسیالیستیدا دامەزراوە؟

وەلامی ئەو پرسیارە زۆر بە راشکاوی ئەوەیە کە: نا! ئەوە لەگەڵ وەزعی ولاتەکەماندا ناگونجێ. چونکە راستە کە کۆمەڵی کوردەواری پێی ناوەتە قۆناغی سەرمایەداری، بەلام هێشتا خۆی بە تەواوی لە پێوەندییەکانی سەردەمی دەرەبەگایەتی رزگار نەکردوە. تەرکیبی کۆمەلایەتیی ولاتەکەمانو، تەرکیبی چینایەتیی کۆمەڵی ئێمە، جیاوازییەکی تەواوی لەگەڵ کۆمەڵێکی سەرمایەداریدا هەیە. فەرهەنگو سوننەتی گەلەکەشمان تایبەتینو، لەگەڵ فەرهەنگو سوننەتی گەلانی دیکە فەرقی هەیە. هەر بۆیە زۆر روونە کە ئەو سۆسیالیزمەی ئێمە دەمانهەوێ دایمەزرێنین، دەبێ لەگەڵ سۆسیالیزمی یەکیەتیی سۆڤیەتی، یان فەرانسە، یان ویەتنام، یان هەر جێگایەکی دیکە فەرقی هەبێ.

بە لەبەرچاو گرتنی هەمووی ئەوانەیە کە ئێمە دەمانهەوێ سۆسیالیزمێك دامەزرێنین کە لەگەڵ هەلومەرجی تایبەتیی ولاتەکەماندا رێكبکەوێ. بە گوتنی ئەو قسەیە، ئێمە نەك تەنیا تاوانێکمان نەکردوە، بەڵکوو شتێکی زۆر جوانو زۆر ئاساییمان گوتوەو، دەبێ لەم بارەوە هەموو ئەندامانو لایەنگرانی حیزبی ئێمە روون بکرێنەوەو پێیان بسەلمێندرێ کە ئەوە نەك هیچ لادانێکی لە ئوسوول تێدا نیە، بەڵکوو درێژە پێدان بە خەباتی ئوسوولیی حیزبەکەمانو گەلەکەمانە.

حیزبی کومۆنیستی فەرانسە لە کۆنگرەی بیستوچوارەمی خۆی لە زستانی ساڵی ۱۹۸۲دا تەنیا یەك دروشمی هەبوو، ئەویش: "دروست کردنی سۆسیالیزم بە رەنگی

فەرانسەیی"!. واتە حیزبێك كە لە نێو گەورەترین حیزبە كومۆنیستەكانی ئۆرووپای رۆژئاوادا لە هەمووان زیاتر لە حیزبی كومۆنیستی یەكیەتیی سۆڤیەتی نزیكترە، دەیهەوێ سۆسیالیزمێك دروست بكا كە لەگەلّ هەلومەرجی تایبەتیی فەرانسە رێكبكەوێ.

مەسەلەیەكی زۆر ئەساسی كە لە سۆسیالیزمی دامەزراو بە پێی هەلومەرجی تایبەتیی ولاّتەكەمان، دەبێ لەبەرچاو بێ، مەسەلەی دێموكراسیو ئازادییە. گەلانی ئێرانو نەتەوەی كورد بە سەدان سالّ لە ژێر رێژیمی ئیستبدادیدا ژیاون. بۆیە زۆریان پێویستی بە ئازادیو دێموكراسی هەیەو، دەیانهەوێ ئازاد بنو بە ئازادی بژین. سۆسیالیزم، نانی دەداتێ، خانووی دەداتێ، خوێندنو لەشساغیی دەداتێ، بەلاّم ئینسان تەنیا بە نان ناژی. كەوابوو لە بەرامبەر ئەوانەدا، نەك تەنیا نابێ ئازادییەكەی لێبستێنێ، بەلّكوو بە پێچەوانە دەبێ زۆر زیاتریشی لە سەردەمی سەرمایەداری بداتێ. ئێمە دەبێ سۆسیالیزمێك درووست بكەین كە نەك تەنیا دێموكراسی مەحدوود ناكا، بەلّكوو پەرەشی پێدەدا. "ماركس"و "ئەنگێلس" لە مانیفێستی حیزبی كومۆنیستدا دەلّێن: "لە جێگای كۆمەلّی كۆنی بورژوایی بە چینەكانو ناتەباییە چینایەتیەكانیەوە، ئێمە كۆمەلّێكمان دەبێ كە لەودا گەشەكردنی ئازادانەی هەركەس، شەرتی گەشەكردنی ئازادانەی هەموانە."

لە پێوەندی لەگەلّ ئەم ئەسلّەدایە كە دەبێ بلّێین: لایەنگری لە "دیكتاتۆری پرۆلێتاریا" كە جارجار لە لایەن هێندێك لە ئەندامانی حیزبی دێموكراتەوە دەبینرێ، كارێكی بێقاعیدەو بێجێیە. چونكە لە لایەك، لایەنگری لە دیكتاتۆریی پرۆلێتاریا بۆ ئەندامی حیزبێكی دێموكراتی ـ میللی وەك حیزبی ئێمە بێمانایەو، لە لایەكی دیكەش، تەنانەت ئەگەر وەك ماركسیستێكیش چاو لە مەسەلەكە بكەین، بە هیچ جۆر لایەنگری لە دیكتاتۆریی پرۆلێتاریا وەك ئەسلّێكی بێ ئەملاو ئەولا نابێ چاو لێبكرێ.

حیزبێكی كومۆنیستی گەورەی وەك حیزبی كومۆنیستی فەرانسە، چەندین سالّە بە رەسمی دیكتاتۆریی پرۆلێتاریای رەد كردۆتەوەو، لە كۆنگرەی بیستوچوارەمی خۆیدا كە لە سەرەوە باسمان كرد، دیسانیش لە سەر ئەو رەدكردنەوەیەو مەحكووم كردنی ستالینیزم بە روونیو تێكڕایی رۆیشتووە. بێجگە لە حیزبی كومۆنیستی

فەرانسە، زۆر حیزبی کومۆنیستی دیکەش هەن هەر لەو بڕوایەدان. جا ئەگەر بەو حاڵە، ئەندامێکی حیزبی دێموکراتی ـ میللی لایەنگری لە دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا بکا، ئەوە ناوی "کاسەی گەرمتر لە ئاش" نیە؟!.

تەنانەت ئێستا لە یەکیەتیی سۆڤیەتیو لە ولاتە سۆسیالیستەکانی دیکەشدا، باسی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا نەماوە. هەر لە سەرەتاشەوە، "مارکس" دیکتاتۆریی پرۆلێتاریای بە ئامانج دانەناوە، بەڵکوو بە قۆناغێکی تێپەڕبوونی زانیوە کە ئەنجامی: "لەنێوچوونی هەموو چینەکانو پێكهاتنی کۆمەڵێکی بێچین دەبێ." (نامەی مارکس بۆ "یوزیف وایت میلیر" ٥ی مارسی ١٨٥٢). لە مانیفێستی حیزبی کومۆنیستیشدا کە لە ساڵی ١٨٤٨ بڵاو کراوەتەوە، "مارکس"و "ئەنگێلس" نووسیویانە: ".... هەنگاوی یەکەمی شۆڕشی چینی کرێکار، گەیاندنی پرۆلێتاریا بە مەقامی چینی دەسەڵاتدارە، بۆ ئەوەی لە خەبات لە ڕێگای دێموکراسیدا سەرکەوێ." هەروەها مارکس لە نووسراوەیەك لە سەر "کۆمۆنی پاریس"دا دەڵێ: "خەباتی گەورەی شۆڕشگێڕی بریتیە لە ئەسپاردنەوەی دەسەڵاتی حکوومەت بە کۆمەڵ، بۆ ئەوەی ئەو دەسەڵاتە ببێتە هێزێکی زیندوو و ئەساسیی کۆمەڵ؛ لەجیاتی ئەوەی کە ببێ بە هێزێك کە وەك کەڵەوە بە سەر ملیدا بێ." لەو قسانە، ئەو ڕاستیە دەردەکەوێ کە بۆ دانەرانی مارکسیزم، نێوەڕۆکی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا سەرەڕۆیی نیە، بەڵکوو دێموکراسیە.

لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کومۆنیستی یەکیەتیی سۆڤیەتیدا، باسی حاکمییەتی گشتی گەلی کراوەو ئەم نەزەرە تا ئێستاش ڕەد نەکراوەتەوە. لە چیندا "مائۆ تسە دۆنگ" لە یەکەم ڕۆژەوە، لە جیاتی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا، باسی "دیکتاتۆریی دێموکراسی" دەکرد. لە کتێبە بەناوبانگەکەی بە ناوی "دیکتاتۆریی دیموکراسیی گەلی"دا زۆر بە کورتی دەڵێ: "دیکتاتۆری دژی دوژمنانی گەلو، دێموکراسی بۆ گەل". ئێستاش لە چین، زیاتر باسی دیموکراسیی سۆسیالیستی دەکرێ تا دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا.

کەوابوو، ئێمە دەبێ سۆسیالیزمێك دابمەزرێنین کە دێموکراتیك بێ. ئەوە هەم بە مانای کەڵك وەرگرتن لە دەسکەوتەکانی ئابووریو کۆمەڵایەتیەو، هەم بە مانای کەڵك وەرگرتن لە ئازادیی فەردیو سیاسیو بەشدارکردنی ڕاستەوخۆی کۆمەڵانی

خەڵك لە هەڵسووڕاندنی کاروباری وڵاتدایە. لە سۆسیالیزمی دێموکراتیدا، فەرد نە لە باری ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە دەچەوسێتەوە نە لە باری سیاسییەوە. هاونیشتمانانی وڵاتێك کە سۆسیالیزمی دێموکراتی تێدا پێکهاتوە، هاونیشتمانێکی ئازادەو بە ئازادی دەژی.

لێرەدا پێویستە کە هەڵەیەکیش لە بارەی "سۆسیالیزمی دێموکراتی"دا راست بکەینەوە؛ چونکە هێندێك کەس لە مانای سۆسیالیزمی دێموکراتی نەگەیشتوون. ئەو راست کردنەوەش ئەمەیە کە: "سۆسیالیزمی دێموکراتی" لەگەڵ "سوسیال دێموکراسی" فەرقی هەیە. سوسیال دێموکراسی رێبازێکی رێفۆرمیستیە کە بە ناوی سۆسیالیزم، سەرمایەداری دەپارێزێو هەڵی دەسووڕێنێ؛ بە ناوی سۆسیالیزم کرێکاران هان دەدا بۆ ئەوەی سەرمایەداری قبوول بکەنو، بە کورتی، دەیهەوێ کە گیروگرفتەکانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریی کرێکاران لە چوارچێوەی سەرمایەداریدا چارەسەر بکا، بێ ئەوەی ئەو چوارچێوەیە تێك بدا؛ لە حاڵێکدا سۆسیالیزم بە مانای رووخاندنی سەرمایەداری بە تەواویو، پێکهێنانی کۆمەڵێکی نوێیە.

بێجگە لەوە، سۆسیالیزم بە نیزامو کۆمەڵ دەگوترێو، سوسیال دێموکراسی رێبازی حیزبێکی سیاسییە. لە راستیدا، وێکچوونی وشەی "سۆسیالیزمی دێموکراتی"و "سوسیال دێموکراسی" وەك وێکچوونی وشەی "ئابووریی سیاسی"و "سیاسەتی ئابووری"یە. "ئابووریی سیاسی" بە زانستی ئابووری دەڵێن کە لە قانوونەکانی گشتی ئابووری دەکۆڵێتەوە. لە حاڵێکدا "سیاسەتی ئابووری" سیاسەتی دیاریکراوی حیزبێك یان دەوڵەتێك لە مەیدانی ئابووری دایە.

ئێمە کاتێك دەڵێین: سۆسیالیزمان دەوێ، ئەوە خۆی بە مانای رەدکردنەوەی سەرمایەداریو، لە نەتیجەدا رەدکردنەوەی سوسیال دێموکراسییە. بەڵام ئەگەر گوتمان: "سۆسیالیزمی دێموکراتی"مان دەوێ، مانای ئەوەیە کە دیسان هەر سۆسیالیزمان دەوێ، بەڵام سۆسیالیزمێك کە دیموکراسیشی لەگەڵ بێو پەرەی پێبدا. راپۆرتی کومیتەی ناوەندیی حیزبی کومۆنیستی فەرانسە بۆ کۆنگرەی بیستوچوارەم کە تا ئێستا چەند جار ئیشارەمان پێکردوە، لەم بارەوە دەڵێ: "بەرەوپێش چوونێکی

دێموکراتی بەرەو سۆسیالیزمێکی دێموکراتی، کە بە تەواوی لەگەڵ واقعییاتی وڵاتی ئێمەو واقعییاتی دنیای ئیمڕۆ ڕێك بکەوێ. ئەمەیە ئامانجی گەورەی حیزبی ئێمە!."

دیارە لە دامەزراندنی سۆسیالیزمدا، بێجگە لەوە کە هەلومەرجی تایبەتیی هەر وڵاتێك دەبێ بخرێتە بەرچاو، هێندێك ئوسووڵی گشتیش پێویستە لە نەزەر بگیرێ: یەکەم ـ هەروەك گوتمان، سۆسیالیزم بە مانای لەنێو بردنی چەوساندنەوەو پێکهێنانی نیزامێکە کە لەودا "کار"ی ئینسان ئەرزشی ئەساسیە. دووهەم ـ سۆسیالیزم ئەزموونێکی مێژوویی‌یە. هەر بۆیە دەبێ لە دامەزراندنی‌دا، لە ئەزموونی هەموو وڵاتێك کەڵك وەربگیرێ بێ ئەوەی هیچ وڵاتێك بە تەواوی ببێتە نموونەو هەروەها بێ ئەوەی ئەزموونی بەنرخی هیچ وڵاتێك بکەوێتە پشت گوێ. بۆ نموونە، ئێستا لە فەرانسە تاقیکردنەوەیەکی تازە دەست پێکراوە. دیارە جارێ ناتوانین چاوەڕوان بین کە بەم زووانە کۆمەڵی فەرانسە لە بنەڕەتەوە تووشی گۆڕان بێ؛ بەڵام ئێستا حکوومەتی سۆسیالیستیی فەرانسە، لە باری ئابووریو کۆمەڵایەتیەوە راست ئەوەی دەکا کە نەزەری حیزبی کومۆنیستی فەرانسەیە... . هەروەك گوترا تاقیکردنەوەی فەرانسە هەم تازەیەو هەم ماوەیەکی کەمە دەست پێکراوە؛ هەر بۆیە ناکرێ جارێ لە سەری حیساب بکەین. تەنیا یەك مەسەلە لەم تاقیکردنەوەیەدا بۆ ئێمە جێگای سەرنجەو ئەویش ئەمەیە کە: ئەگەر سەرکەوێ، دەبێتە نموونەیەك لە سۆسیالیزمی دێموکراتی... .

لە دامەزراندنی سۆسیالیزمدا، بێگومان ئەزموونی یەکیەتیی سۆڤیەتیو وڵاتانی ئۆرووپای ڕۆژهەڵاتو چین وەك ئەزموونێکی زۆر بەنرخ لە بەرچاو بگیرێ؛ نەك تەنیا لەم بارەوە کە سۆسیالیزم دەبێ چۆن دابمەزرێ، بەڵکوو لەم بارەشەوە کە چۆن نابێ دابمەزرێ. ئێمە دەبێ هەم لە ئاکامە لەبارەکانی ئەم ئەزموونە مێژووییە کە گەورەترینو گرنگترین ئەزموونی کۆمەڵی ئادەمیزادە کەڵك وەرگرینو هەم لە هەڵەکانی خۆ بپارێزین... .

## ٥ـ هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر بە وڵاتانی سۆسیالیستی

بەر لەوە کە بچینە سەر ئەسڵی باسەکە، پێویستە ئاوڕێك لە مێژووی جووڵانەوەی کرێکاریی جیهان بدەینەوە:

ئەنتێرناسیۆناڵی دووهەم وەك ڕێكخراوی كرێكارانی جیهان، لە ساڵی ١٨٩٤ لە زەمانی ئەنگێلسدا پێكهات. لە سەردەمی شەڕی یەكەمی جیهانی لە ساڵەكانی ١٩١٤ هەتا ١٩١٨دا، ئەنتێرناسیۆناڵی دووهەم لە ڕێبازی ڕاستەقینەی خۆی، واتە لە ڕێبازی دیفاع لە قازانجی زەحمەتكێشانی جیهان لای داو، نیشانی دا كە بەڕاستی ئەنتێرناسیۆناڵی كرێكاران نیە. چوونكە كاتێك شەڕ هەڵایسا، زۆر لە حیزبە سۆسیالیستەكان كە ئەندامی ئەنتێرناسیۆناڵی دووهەم بوون، دەستیان كرد بە پشتیوانی لە بورژوازیی خۆماڵیو، دەنگدان بۆ بوودجەی شەڕ لە وڵاتی خۆیاندا. لە حاڵێكدا بولشویكەكانو ئەنتێرناسیۆناڵیستەكانی ڕاستەقینە نەزەریان ئەوە بوو كە چینی كرێكاری هەر وڵاتێك دەبێ بە دژی ڕێژیمی سەرمایەداریی خۆماڵی خەبات بكاو، بۆ ڕووخاندنی تێبكۆشێ؛ نەك ئەوەی كە پشتیوانی لە شۆوینیزمو مەزنیخوازیو شەڕخوازیی بورژوازیی وڵاتی خۆی بكا... . ئەم جیاوازیە، بوو بە هۆی ئەوە كە حیزبی بولشویك لە ئەنتێرناسیۆناڵ بێتە دەرو، بەم جۆرە ئەنتێرناسیۆناڵی دووهەم بە كردەوە هەڵوەشا.

لە پاش سەركەوتنی شۆڕشی ئۆكتۆبر، لنین پێشنیاری پێكهاتنی ئەنتێرناسیۆناڵی سێهەم واتە ئەنتێرناسیۆناڵی كومۆنیستیی كرد كە لە ساڵی ١٩١٩دا دامەزراو، بوو بە جێگای كۆبوونەوەی حیزبە كومۆنیستەكان. مەبەستی لنین لە پێكهێنانی ئەنتێرناسیۆناڵی سێهەم ئەوە بوو كە حیزبە كومۆنیستەكان لە تاقە ڕێكخراوێكی جیهانیدا كۆ بكاتەوە بۆ ئەوەی یەكگرتوو و یەكپارچە بنو هەروەها بۆ ئەوەی كە دیفاع لە حاكمییەتی سۆڤیەتی بكەن كە كەوتبووە بەر پەلاماری وڵاتانی سەرمایەداری.

ئەنتێرناسیۆناڵی سێهەم ڕێكخراوێك بوو لە بەرە (جەبهە) زیاترو، پتر وەك یەك حیزب دەچوو. ئەو ئەنتێرناسیۆناڵە، بیستو یەك ئەسڵی هەبوو كە هەر حیزبێك دەبوو بە ئەندام، ناچار بوو ئەم بیستو یەك ئەسڵەش بە تەواوی قبووڵ بكاو پێڕەوییان لێبكا. یەكێك لەو ئەسڵانە كە ناوبانگی دەركردبوو ئەوەبوو كە: "مەعیاری ئەنتێرناسیۆناڵیزم، چۆنیەتیی هەڵوێست گرتن بەرامبەر بە وڵاتی سۆڤیەتیە". واتە ئەگەر حیزبێك سیاسەتی وڵاتی سۆڤیەتی ـ كە ئەوكاتە تەنیا وڵاتی سۆسیالیستیی دنیا بوو ـ پەسند كردباو، بێ ئەملاو ئەولا دیفاعو پێڕەویی لێكردبا،

ئەنتێرناسیۆناڵیست بوو؛ لە غەیری ئەوەدا، واتە ئەگەر رەخنەی هەبا، ئەنتێرناسیۆناڵیست بە حیساب نەدەهات.

ئەم وەزعە هەتا ساڵی ١٩٤٣ کە ئەنتێرناسیۆناڵی سێهەم هەڵوەشا، هەر بەردەوام بوو. بەلاّم لەو ساڵەدا راگەیەندرا کە بەهۆی لەگۆڕێدا بوونی شەڕ، هەر حیزبێکی کومۆنیست دەتوانێ سیاسەتی خۆی سەربەخۆ دیاری بکا. لە پاش شەڕی دووهەمی جیهانییش، "ئەنفۆرم بورۆ" یا "دەفتەری گۆڕینەوەی دەنگوباس" لە نێو حیزبە کومۆنیستەکاندا پێكهات کە ئەویش بە دوای رووداوەکانی ساڵی١٩٥٦دا هەڵوەشاوە.

بەم جۆرە، ئێستا ماوەیەکی درێژە کە هەر حیزبێکی کومۆنیست مافی ئەوەی هەیە سیاسەتی خۆی سەربەخۆ دیاری بکاو، نەزەری خۆی لە سەر گیروگرفتەکانی جیهانو ولاّتی خۆی دەربڕێ؛ بە تایبەتی حیزبە کومۆنیستەکانی ئۆرووپای رۆژئاوا، وەك حیزبی کومۆنیستی ئیتالیاو فەرانسەو ئیسپانیا کە لە سەر زۆر گیروگرفت لەگەڵ ولاّتانی سۆسیالیستیو یەکیەتیی سۆڤیەتی نەزەری جیایان هەیەو، ئەم نەزەرانەیان لە چاپەمەنیەکانی خۆیاندا بلاّو دەکەنەوە.

جا ئەگەر حیزبێکی کومۆنیست مافی ئەوەی هەبێ کە نەزەری لەگەڵ حیزبی کومۆنیستی یەکیەتیی سۆڤیەتی لە سەر هەموو شتێك یەك نەبێ، دیارە ئێمە کە حیزبی دێموکراتی ـ میللین، ئەو مافەمان بە تەواوی هەیەو، دەتوانین لە سەر دامەزراندنی سۆسیالیزمو لە سەر سیاسەتی جیهانی، نەزەری تایبەتیی خۆمان هەبێ.

ئاشکرایە کە یەکیەتیی سۆڤیەتی، سیاسەتی دەرەوەی خۆی هەیەو لەسەری دەڕوا؛ بەلاّم ئایا رێبازی ئەو سیاسەتە هەموو کاتێك لەگەڵ بیروبڕوای زۆربەی کۆمەلاّنی خەڵکی ئێران یەك دەگرێتەوە؟ بۆ نموونە: ئێستا هەموو کەس دەزانێ کە یەکیەتیی سۆڤیەتی، بێجگە لە کامیۆنو ماشێنو کەلوپەلی دیکە، چەکی وەك "ئار.بی.جی"و "کاتیوشا"و زۆر چەكو تەقەمەنی دیکەی بە رێژیمی شا فرۆشتبوو. ئەگەر رێژیمی شا، کە رێژیمێکی سەرەڕۆو پۆلیسی بوو، ئەم چەکانەی لە نێو ولاّتدا بەکار هێنابا، ئەوە دژی ئازادیو داخوازە رەواکانی گەلانی ئێران بوو؛ ئەگەر لە دەرەوەی ئێرانیش بەکاری هێنابا، لەبەر ئەوە کە رێژیمێکی سەر بە ئیمپریالیزم بوو، ببووە ژاندارمی ناوچەی رۆژهەلاّتی نێوەڕاست، ئەوە دیسان دژی ئازادیو ئازادیخوازیی گەلانی ناوچە بوو

(هەروەکوو شا، ئـەو چەکانـەی لـە "زورفـار" بـەکار هێنـا!). جـا ئایـا ئێمـە وەك ئێرانی‌یەکی ئازادیخواز، حەقمان نەبوو کە بڵێین فرۆشتنی ئەو چەکانە بە رێژیمـی شـا، دژی قازانجی گەلانی ئێران بوو؟

ئەرکی سەرشانی ئێمە ئەوەیە کە لە پێـشدا لـە قـازانجی گـەلی خۆمـان دیفـاع بکەین؛ هەروەها کە یەکیەتیی سۆڤیەتیش لە پێـشدا دیفـاع لـە قـازانجی گەلەکـەی دەکا. ئێمە لە یەکیەتیی سۆڤیەتی چاوەڕوانی ئەوە ناکەین کە ئەو کارەی ئێمە دەبـێ بۆخۆمان بیکەین، بۆمان ئەجام بدا... .

بەداخـەوە لـە رابـردوودا، زۆر لـە تێکۆشـەرانی کوردسـتان ئـەو چاوەڕوانیـەیان هەبووەو، وا فێرکرابوون کە سۆڤیەتیەکان دەبێ بێن‌و ئازادمان کـەن. ئێـستا حـیزبی ئێمە، ئەو راستیەی بۆ ئەندامانی خۆی‌و، گەلی کوردو، گـەلانی دیکـەی ئـێران روون کردۆتەوە کە ئێمە خۆمان دەبێ وڵاتەکەمان ئازاد بکەین؛ نابێ چاوەڕوانی ئەوە بین کە یەکیەتیی سۆڤیەتی یا هەرکەس‌و هەر جێگایەکی دیکە لە دەرەوەڕا بێ‌و دێموکراسی‌و خودموختاریمان بۆ وەربگرێ؛ نابێ پێمان وابێ کە یەکیەتیی سۆڤیەتی هـەرچی ئێمـە پێمان گوت بە قسەمان بکا؛ لە بەرامبەریشدا هیچ دۆستێکیش نابێ چاوەڕوانی ئەوە بێ کە هەرچی ئەو گوتی، ئێمە بە قسەی بکەین.

با سیاسەتی دەرەوەی یەکیـەتیی سـۆڤیەتی سـەبارەت بـە ئـێرانی "خومـەینی" بخەینە بەرچاو: بەگشتی لە روانگەی سۆڤیەتیەکانەوە، لە مـاوەی چـوار سـاڵی پـاش سەرکەوتنی شۆڕش، سیاسەتیان بەرامبەر بە رێژیمی خومەینی سیاسـەتێکی راسـت‌و ئوسووڵی بوو؛ بەڵام لە روانگەی ئێمەوە کە دژی رێژیمی خومـەینی خـەبات دەکـەین، هەر سیاسەتێك پشتیوانی لەم رێژیمە بکا، نادروست‌و ناخۆش‌و غەیر ئوسووڵی بوو.

دەلیلی سۆڤیەتیەکان بۆ ئەو سیاسەتە چیە؟ ئەوان دەڵێن کە رێژیمی شا، رێژیمێـك بوو دژی سۆڤیەتی‌و سەر بە ئەمریکا؛ رێژیمی خومەینیش، راستە کـە دژی سـۆڤیەتی بوو، بەڵام هەر لەو کاتەدا دژی ئەمریکاش بوو (یـان لانـی کـەم وەك شـا سـەر بـە ئەمریکا نەبوو)؛ کەوابوو پلەیەك لە رێژیمی شا باشترەو، بۆ یەکیەتیی سـۆڤیەتی، زۆر جێگای پەسندە.

لە باری سیاسەتی نێونەتەوەیی‌یەوە، رەنگ بێ ئەم سیاسەتە راست بێ، بەڵام ئایا بۆ ئێمەش مەسەلەکە هەر ئاوا چاو لێدەکرێ؟ بۆ گەلی کورد کە ماوەی چـەند سـاڵە

خەریکی خەباتێکی توندو دوورو درێژ بە دژی رێژیمی خومەینییەو، هەموو رۆژێك چەندین شەهید لەم رێگایەدا دەدا، ئایا سیاسەتی پشتیوانی لەو رێژیمە جێگای پەسندە؟ ئاشکرایە کە نا!.

کەوابوو، نە یەکیەتیی سۆڤیەتی دەتوانین لە جێگای خۆمان دابنێینو داوای لیٚبکەین هەڵوێستی وەك ئێمە بیٚو، نە خۆمان دەتوانین لە جیاتی یەکیەتیی سۆڤیەتی دابنێینو سیاسەتمان وەك ئەو بیٚ... .

هەروەها با ئەوەش رابگەیەنین کە ئێمە نەك تەنیا دژی پەرەئەستاندنی پێوەندیی بازرگانیو فەرهەنگیی ئێران لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤیەتیو ولاٚتانی سۆسیالیستی دیکە نین بەڵکوو پێمان وایە هەر رێژیمێك لە ئێراندا لە سەر کار بیٚ، دەبیٚ ئەو پێوەندیانە بە تایبەتی لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤیەتی کە ولاٚتی گەورەی دراوسێی ئێرانە، پەرە پیٚبدا. ئێران وەك ولاٚتێکی کشتوکاڵی، دەتوانیٚ زۆر کەرەستەی خاو بە یەکیەتیی سۆڤیەتی بفرۆشیٚو زۆر شتومەکی سەنعەتیی لیٚ بکریٚ. هەروەها ئێران دەتوانیٚ لە رێگای ترانزیتیی یەکیەتیی سۆڤیەتی کەڵك وەربگریٚو شتومەکی خۆی زۆر هەرزانتر بە ئۆرووپا بگەینیٚو لە ئۆرووپارا بۆ ئێران بێنیٚ. گازی سووتاندنیش هەروەها، ئەوکەسانەی پێیان وایە ناردنی تیمی فووتباڵ لە یەکیەتیی سۆڤیەتیرا بۆ ئێران، یان بەشدار بوون لە موسابەقەی شەترەنج لەگەڵ تیمی ئێران، یارمەتی بە رێژیمی شا بوە، بە هەڵە دەچنو لە پێوەندیەکانی نێونەتەوەیی باش حاڵی نەبوون.

کەوابوو، دووپاتی دەکەینەوە کە ئێمە دژی پێوەندیی ئابووریو فەرهەنگیی ولاٚتەکانی سۆسیالیستی لەگەڵ رێژیمی خومەینی نین؛ بەلاٚم پشتیوانیی سیاسیمان لەو رێژیمە پیٚناخۆشە؛ هەروەك لە زەمانی شاشدا ئەو پێشوازیە بیٚوێنانەی کە لە ولاٚتانی سۆسیالیستی لە شا دەکرا، بۆ ئێمە زۆر جێگای نارەحەتی بوونو، نەماندەتوانی خۆمان رازی بکەین کە ولاٚتێکی وەك رۆمانی، دوکتورای زانستەکانی کۆمەلاٚیەتی ("علوم اجتماعی") بە حەمەرەزاشا بدا لە حاڵێکدا دەزانین کە بناغەی هەموو زانستەکانی کۆمەلاٚیەتی لە ولاٚتانی سۆسیالیستیدا: مارکسیزم ـ لنینیزمە!

ئێستا بە لەبەرچاوگرتنی هەمووی ئەوانەی کە گوترا، حیزبی ئێمە دەبیٚ پێوەندیی لەگەڵ ولاٚتانی سۆسیالیستی چۆن بی؟

وەلاّم ئەوەیە کە ئەو پێوەندیە دەبـــێ "دۆسـتانە" بـێ. واتـە نـە دوژمنانـە وەك هێندێك دەستەو تاقم کە یەکیەتیی سۆڤیەت بە "سوسـیال ئیمپریالیسـت" یـان بـە ئیمپریالیستی تەواو دادەنێنو نە پێڕەوی بێ ئـەملاو ئـەولا وەك حـیزبی تـوودە کـە هەرچی لە یەکیەتیی سۆڤیەتیدا رووبداو، هــەر سیاسـەتێك لـە لایـەن حکوومـەتی سۆڤیەتیەوە بەڕێوە بچێ، فەوری قبوولّی دەکەنو تەپڵی بۆهەڵدەگرن!

دۆستایەتی لە روانگەی ئێمەوە ئەوە نیە کە هەرچی دۆستەکەمان گوتـی، بلێـین: "بەچاوان!". دیارە ئێمە ئەگەر نەزەری جیاوازیشمان لەگەڵ سۆڤیەت هەبێ، هــەرگیز دوژمنایەتی ئەو وڵاتە ناکەین؛ بەلاّم مافی رەخنەگرتن بۆخۆمان هەر رادەگرین. ئایـا هەرچی حیزبی دێموکرات دەیکا، بۆ حیزبی کومۆنیستی یەکیەتیی سۆڤیەتی جێگای پەسندە، هەتا ئێمەش هەرچی دەوڵەتی سۆڤیەتی گوتی، قبوولّی بکەین؟

هەموو کەس دەزانێ کە یەکیەتیی سۆڤیەتی دەوڵـەتێکی زۆر گـەورەو بـەنفووزە؛ ئێمەش جیزبێکی بچووکی نەتەوەیەکی بچووکین. بەلاّم ئایا ئەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە ئێمە پێوەندیمان لە سەر ئەوە دابنێین کە هەرچی رادیۆ "مۆسکۆ" گوتی، ئێمە بلێـین: باشە؟! ئەگەر حیزبو رێکخراوەی ئەوتۆ هەن (بەتایبەت لە رۆژهەلاّتدا) وەك حیزبی توودەی ئێران، کە هێشتا هەر پێیان وایە هەرچی رادیۆ "مۆسـکۆ" بلّـێ، ئـەوانیش دەبێ فەوری دووپاتی بکەنەوە، ئەوە نیشانەی کزیو لاوازیو سەربەخۆ نـەبوونی ئـەو حیزبانەیە.

نـابێ لـەبیرمان بچـێ کـە حـیزبی دێموکراتـی کوردسـتانی ئـێران، خـاوەنی سەرمایەیەکی گەورەیە؛ ئەویش هەر ئەو سیاسەتە سەربەخۆیەیە کە گرتوویەتە پێش. یەکێك لە رەمزەکانی سەرکەوتنی ئێمە هەتا ئێستا، هەر ئەم سیاسـەتە سـەربەخۆیە بوە. ئەو سیاسەتە چەوت بووبێو راست بووبێ، دەسکردی خۆمان بوە. چونکە پێمـان وایە هیچکەس بە ئەندازەی خۆمان لە واقعییاتی کۆمەڵی کوردسـتان شـارەزا نیـەو، هەر بۆیە هیچکەس لێوەشاوەیی بڕیاردانی لە جیاتی ئێمە نیە. هیچ ئۆرگانێك چ هی وڵاتێکی تایبەتیو چ نێونەتەوەیی، حەقی ئەوەی نیە کە لەبارەی ئێمەدا بە بێ ئێمـە بڕیار بدا؛ هەروەك ئێمەش ئەو حەقە بە خۆمان نادەین کە لـە سـەر وڵاتێکـی دیکـە بڕیار بدەین. نابێ قازانجی هیـچ وڵاتێـكو هیـچ حـیزبێکی دیکـە، بـۆ ئێمـە ببێتـە مەعیار. تەنیا مەعیار بۆ ئێمە، دەبێ قازانجی گەلانی ئێرانو گەلی کورد بێو بــەس؛

هیچکەسیش لە خودی گەلانی ئێرانو گەلی کورد باشتر نـاتوانێ ئـەم قازانجـە دیـاری بکا... .

مەسـەلەیەکی دیکـە کـە دەبـێ روون ببێتـەوە، ئەوەیـە کـە ئێمـە وەك حـیزبی دێموکـرات نـابێ خۆمـان لەگـەڵ ناکۆکیـەکانو گیروگرفتـەکانی نێوخـۆی وڵاتـانی سۆسیالیستی تێکەڵ بکەینو، بۆ نموونە: بە رەسمی لە بەرامبەر چیندا لایـەنگری لـە یەکیەتیی سۆڤیەتی بکەین، یان "ئالبانی" بۆخۆمان بکەینـە نموونـەو شـتی وا... . بەڵام ئەگەر جارجار هاوڕێیەکی ئێمە لە هێندێك شتی سیاسەتی دەرەوەی یەکیەتیی سۆڤیەتی رەخنەیەکی گرت یان هێندێك باری ئەو سۆسیالیزمەی کە ئێسـتا لـەوێدا هەیە بەدڵ نەبوو، ئەوە نابێ بە مانای "ئانتی سۆڤیەتیزم" (دژی سۆڤیەتی بوون) یان "ئانتی کومۆنیزم" (دژی کومۆنیزم بوون) بگیرێ. ئەو دوو شتە لـەمێژە لـە حـیزبی ئێمەدا مەحکووم کراوە. هەروەها ئەگەر کەسێکیش لە نێو حیزبدا لە هێندێك باری سیاسەتی سۆڤیەتی دیفاعی کرد، نابێ بەوە تاوانبار بکـرێ کـە توودەیـیو لادەر لـە خەتی حیزبی ئێمەیە. ئەمجۆرە مۆرپێوەنانو بوختان پێ هەڵبەستنانە، شێوەیەکە کـە بەداخەوە لە لایەن حیزبی توودەوە بۆتە باو!

زۆربەی ئەو نـەزەرە نادروسـتانە کـە بـە تایبـەتی دەرخـواردی لاوان دراونو، لـە هێندێك لەو لاوانەدا بەداخەوە ئالۆزیی فیکریان پێکهێنـاوە، هـی بەڕێوەبەرایـەتیی حیزبی توودەن. ئەدەبیاتێکی سیاسی لاڕێ کە لە مێشکی بەڕێوەبەرانی حیزبی توودە هاتۆتـە دەرو هـەموو نیشـانەی "ماکیـاوێلیزم"و "ئۆپۆرتۆنـیزم"و هەڵپەرسـتی‌یە، بەداخەوە لەبەر ئەوە کە لە ئێراندا دەست پێڕاگەیشتن بە ئەدەبیاتی رەسەنی سیاسیی دیکە زۆر زەحمەتە، لە سەر بیروباوەڕی یەك نەسلی تەواو لە لاوانـی ئـێران کاریگـەر بووە.

بۆ ئەوەی ئەم بیروباوەڕە ئۆپۆرتۆنیستی‌یە خاشەبڕ بکرێ، لە لایەك ئێمە دەبێ لەم بارەوە ئەرکی خۆمان بەجێ بگەیەنینو، لە لایەکی دیکەش، دەبێ هاوڕێیانمـان حـاڵی بکەین کە ئەگەر دەیانهەوێ لەگەڵ مارکسیزمی راستەقینە ئاشنا بن، دەبێ فـێر بـن کە حیسابی کتێبو نووسراوەکانی ئەسڵیی خودی "مارکس"و "ئەنگێلس"و "لنـین" لە بیروباوەڕی چەوتی بەڕێوەبەرانی حیزبی توودەو هێندێك دەسـتەو تـاقمی بچووکـی سەرلێشێواو، جیا بکەنەوە. ئەگەر کەسێك بیروباوەڕی عیلمیـی هـەبێ، دەزانـێ کـە

تیئۆریی عیلمی هەرگیز لە یەك جێگـا راناوەسـتیٚو رۆژ لەگـەڵ رۆژ پەرەدەسـتێنیٚ. دانەرانی مارکسیزمیش، قەت لەو بڕوایەدا نەبوون کە ئەوەی ئـەوان دایانناوە، وەك ئایەتی قورئان وایەو نابیٚ دەستی لیٚبدریٚ! ئەوان بە ئاشکرا گوتوویانە کە مارکسیزم تەنیا رێنوێنی بۆ کردەوەیە، بە دایمیش لە گەشەکردن دایە.

فەرقی ئێمە لەگەڵ زۆربەی ئەو دەستەو تاقمانە ئەوەیە کـە، ئـەوان هـەوڵ دەدەن واقعییـاتی وڵاتەکـەمان لەگـەڵ تیئۆریەکـەیان رێـك بخـەن‌و، ئێمـە بـە پێچەوانـە، دەمانهەویٚ بە کەڵك وەرگرتن لە تیئۆری‌و ئەزموونی شۆڕشگێڕانەی وڵاتەکانی دیکەو دەرسەکانی جووڵانەوەی مێژوویی گەلی کورد، تیئۆریەکە بە جۆرێك رێکوپێك بکەین کە وەڵامدەری واقعییەتی هەڵقولاٚو لە وڵاتەکەمان‌و گەلەکەماندا بیٚ. لەم رێگایـەدا لە بەرچەسپ لێدانیش نابیٚ بترسین. حیزبی ئێمە تا ئێستا نیشانی داوە کە بەرچەسپ لێدان‌و بوختان پیٚهەڵبەستن لە سەر سیاسـەت‌و رێو شـوێنەکەی ئەسـەر ناکـاو، لـە داهاتووشدا دەبیٚ هەر بەو سیاسەتە درێژە بدا.... .

بـە کورتـی: حـیزبی دێموکراتـی کوردسـتانی ئـێران، لایـەنگری زۆر شـێلگیری سۆسیالیزمەو بۆ دامەزرانی سۆسیالیزم خەبات دەکا؛ بەلاٚم:

**یەکەم ـ** دامەزرانی سۆسیالیزم، ئێستا بۆ ئێمە ئەرکی رۆژ نیە.

**دووهەم ـ** ئەو سۆسیالیزمەی‌ئێمە دەمانهەویٚ دایبمـەزرێنین، سۆسـیالیزمێکە کـە لەگەڵ هەلومەرجی تایبەتیی وڵاتەکەمان رێك دەکـەویٚ. ئەگـەر غـەیری ئـەوە بـیٚ، سۆسیالیزمێکی دەسکردو واریداتی بیٚ، خـەللاق نـابیٚو لەوانەیـە جێگـای پەسـندی کۆمەڵی کوردەواری نەبیٚ.

**سێهەم ـ** پێوەندیی ئێمە لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی، پێوەندی‌یەکی دۆسـتانەیە. "دۆستانە" بە مانای: نە دوژمنایـەتی نـە پـێڕەوی کردنـی بـیٚ ئەم‌لاوئـەولا. ئێمـە سیاسەتی خۆمان بۆخۆمان دیاری دەکەین، چونکە حـیزبێکی سـەربەخۆین؛ چ چـووك بین‌و چ گەورە، چ بیٚهێز بین‌و چ بەهێز، سیاسەتی سەربەخۆیی خۆمان ناگۆڕین.

ئێمە نابیٚ لەوەدا شکمان هەبیٚ کە وڵاتانی سۆسیالیستی لـە ئەسـڵدا پشـتیوانی ئێمەن‌و هەر دەبیٚ پشتیوانی ئێمە بن؛ چونکە ئێمـە لـە مـافی ئینسـانی‌و نەتـەوەیی خۆمان دیفاع دەکەین. ئەگەر ئیمڕۆ ئەم پشـتیوانیە زۆر بـەرچاو نیـە، بێگومـان لـە دوارۆژدا دەبێتـە پشـتیوانی‌یەکی زۆر کاریگـەر. چونکـە بەڕاسـتی لـە رۆژهـەڵاتی

نێوەڕاستدا یەك هێزی شۆڕگێڕ هەیە کە تا ئێستا پشتیوانیەکی ئەوتۆی لێ نەکراوەو، ئەویش، جوولانەوەی نەتەوەی کورد بەگشتیو، جوولانەوەی میللی دێموکراتیی کوردستانی ئێران بە تایبەتیە. ئەم راستیە بەداخەوە هێشتا بە تەواوی دەرنەکەوتووە، بەلام بێگومان لە داهاتوودا دەردەکەویو سەرنجی هەموو ئازادیخوازانی جیهان بۆلای خۆی رادەکێشیو، لە سیاسەتی رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا شوێنێکی ئەساسی دادەنێ.

ئێمە لە خەباتی درێژخایەنی نەتەوەکەماندا، یەکیەتیی سۆڤیەتی بە دۆستو هاوپەیمانی ستراتێژیکی خۆمان دەزانینو هەر لە سەر ئەو رێبازە دەڕۆین. تەنانەت ئەگەر حیزبێکی ناسیۆنالیستیی تەواویش بوینایە (کە نین!)، لە وەزعی "ژێئۆپۆلیتیکی" (جوغرافیایی ـ سیاسی) ولاتی ئێمەدا، هەر دەبوا دۆستایەتیمان لەگەل یەکیەتیی سۆڤیەتی وەك ئەسلێك لە بەرچاو بێ.

کەوابوو، ئێمە ئێستا دەبێ خەتی سیاسیو دروستی خۆمان کە خەبات لە رێگای وەدەستهێنانی دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستانی ئێرانە، درێژە بدەینو، ئەو نفووزەی ئێستا لە ئێراندا بە دەستمان هێناوە، زیاتر بکەین. ئەو کاتە دلنیاین نەك هەر ولاتانی سۆسیالیستی، بەلکوو هەموو رێکخراوە پێشکەوتووەکانی جیهانو هەموو ئازادیخوازانی ولاتانی دیکە، بە شێلگیری پشتیوانیمان لێ دەکەن.

# شیکردنەوەی کورتەباس*

زەروورەتی باسکردن لەسەر "کورتەباس" لەوەڕا هاتوە کە پاش کۆنگرەی شەشەم بۆمان دەرکەوت کە "کورتەباس" بۆتە بەشێکی گرنگ لە ڕێبازی حیزبەکەمانو بەتایبەتی ئەوە کە پێوەندی بە سۆسیالیزمی دێموکراتیکەوە هەیە، بۆتە بەندێك لە بەرنامەی حیزب. وەزعی پاش کۆنگرە ئەو زەروورەتەی پێك هێناوە کە ئەم ڕێبازە بە شێوەیەکی دێموکراتیكو ئوسوولی بچێتە نێو بەدەنەی حیزبو کادرەکانی حیزبیو هێزی پێشمەرگەو ئەندامانی حیزبو دیارە کۆمەلآنی خەلْکیش. پاش کۆنگرە دەرکەوت کە راستە کۆنگرە کورتەباسی پەسند کردوە، راستە کە بەرنامەکە تەقریبەن بە تێکڕایی دەنگ پەسند کراوە، بەلآم جارێ بەو شێوەیە کە پێویستە بەدەنەی حیزب لەو ڕێبازە تازەیە حالّی نەبووە. بۆیە پێویستە جارێکی دیکە بە شێوەیەکی ڕێکوپێکترو دوورودرێژتر هەموو ئەو گیروگرفتانە هەم لە کومیتەی ناوەندیدا باس بکرێنو هەم بچنە نێو ریزەکانی حیزب، بۆ ئەوە ئەم ڕێبازە راستو دروستە، پەسند کراوە، لەلایەن ئەندامانو کادرەکانو پێشمەرگەکانەوەو هەروەها لەلایەن کۆمەلآنی خەلْکیشەوە هەزم بکرێ. چونکە ئەوەی کە ئێمە لە بەرنامەماندا هێناومانە، تەنیا بۆ حیزب نیە. ئێمە دەلّێین دەمانەوێ کۆمەلّێکی دێموکراتیکی سۆسیالیستی دروست بکەین. کەوابوو هێنانە دیی ئەم مەبەستە پێوەندیی بە کۆمەلّی کوردەواریو هەموو خەلْکی کوردستانەوە هەیە، لەپاشان باسی ئەوەش دەکەین کە مەربووت بە هەموو گەلانی ئێرانیش دەبێ.

هۆیەکی دیکە کە زەروورەتی ئەو باسەی هێناوەتە گۆڕێ، مەسەلەی سنووردانان بۆ ئەوەیە کێ دێموکراتە، کێ دێموکرات نیە؟ "کورتەباس" ئەو قازانجەی هەبوو کە بۆتە هۆی باسێکی پانو بەرین لە نێو حیزبی ئێمەدا. بە تایبەتی پێویستیی ئەوەی پێك هێناوە کە حیزبی ئێمە مەرزبەندییەکی لەگەڵ هەموو رێکخراوەکانی دیکە هەبێو ئەندامی حیزبی دێموکرات بە بیروباوەڕی بناسرێ.

ئێمە دەبێ نیشان بدەین کە لەو کەسانە دوورین کە بۆچوونیان نیسبەت بە سۆسیالیزم لە رووی هێزی ئەسڵی وشكو دوگمەوەیە. دەبێ نیشان بدەین کە سۆسیالیزم ئەوە نیە کە هێندێ دوگمی لە پێشدا ئامادە کراو بێنینو لە کۆمەڵدا تەتبیق بکەین. ئێمە لایەنگری ئەو خەتە نین. هەروەها ئێمە لەگەڵ ئەو خەتەش نین کە ئەوەی لە چەرخی بیستەمدا بۆ سۆسیالیزم کراوە هیچ بایی بۆ دانانێو ئەو سۆسیالیزمەی کە لە هێندێ وڵاتدا هاتۆتە دی بە سۆسیالیزم نازانێو نەفیی تەواوی ئەو سۆسیالیزمە دەکا کە مەوجوودە. ئێمە نەزەرمان ئەوەیە کە سۆسیالیزم هەیەو مەوجوودەو پیادە کراوە. بەڵام ئێمە دەبێ لەو سۆسیالیزمەو لە تاقیکردنەوەکانی چ موسبەت بێ، چ مەنفی دەرس وەرگرینو سۆسیالیزمێك پیادە بکەین کە لەگەڵ هەلومەرجی وڵاتەکەمان رێك کەوێو بە تایبەتی هەروەها کە لە پاشان بە تەفسیل باسی دەکەین، سۆسیالیزمێك پیادە بکەین کە نەفیی دێموکراسی نەکاو ئازادییە دێموکراتییەکان تێیدا پەرە بستێنن، نەك هەر ئەو ئازادییانە کە ئێستا لە هێندێ وڵاتی رۆژئاوادا هەن، بەڵکوو دەبێ لەوەش زیاتر پەرە بە هەموو ئازادییە دێموکراتییەکان بدا.

لە کۆنگرەی چوارەمدا پەسند کرا کە ئەندامی حیزبی دێموکرات دەبێ سیمای دێموکراتی هەبێ. زۆر جار لە باسەکانی ئێمەدا هاوڕێیان ئیشارەیان بەوە کردوە کە سنوورێك نیەو جاری وا هەیە ئەندامی حیزبی دێموکرات لە باری بیروباوەڕەوە بەتەواوی موشەخەس نەکراوە کە ئامانجی چیەو بۆ چی تێدەکۆشێ. راستە حیزبی ئێمە بەرنامەی هەیەو ئەگەر لەخۆبایی بوون نەبێ، دەتوانین بڵێین کە بەرنامەی حیزبی ئێمە رێکوپێکترینو باشترین بەرنامەیە، نەك هەر لە چوارچێوەی کوردستانی ئێران، بەڵکوو لە سەرانسەری ئێرانیشدا.

بەلاّم لەگەڵ ئەوەدا، ئەم بەرنامەیە جارێ بەو شێوەیە کە پێویستە هەزم نەکراوە، نەچۆتە نێو کۆمەلاّنی خەڵكو تەنانەت بە تەواوی نەچۆتە نێو ئەندامانی حیزبیش. یەکێك لە نیشانەکانی سیمای ئینسانێکی دێموکرات، ئەندامێکی حیزبی دێموکرات ئەوەیە کە لە "کورتەباس"دا هاتوە، سنوور دادەنێ لە بەینی حیزبی ئێمەو لەبەینی زۆر لە هێزەکانی دیکەدا، چ لە باری بۆچوونمان نیسبەت بە دروستکردنی سۆسیالیزمو بۆ پێکهێنانی ئەو کۆمەڵە کە لە ولاّتەکەماندا دەبێ پێك بێو چ لە باری پێوەندیمان لەگەڵ هێزەکانی دەرەوەو بەتایبەتی هێزەکانی سۆسیالیستیو ولاّتانی سۆسیالیستیدا.

کورتەباسمان کە ئامادە کردو لە کومیتەی ناوەندیدا باسمان لەسەر کردو لە پاشان بلاّومان کردەوەو هەر لە سەرەتاوە هێندی کۆسپی هاتە سەر ڕێ. پێمان خۆشە ئەو کۆسپانە باس بکرێن. یەکەم ئەوە بوو کە ئەو فیکرە، فیکرێکی تازە بوو. لە ئێراندا سیستمێکی فیکریی تایبەتی لە لایەن حیزبی توودەو هێندێ ڕێکخراوی دیکەوە تەحویلی لاوان درابوو و واش درابوو کە هەر دەرچوونێك لە چوارچێوەی ئەو سیستمە فیکرییە، زیددی سۆسیالیستییە. بەلاّم ئەو سیستمە فیکرییە وشكو دوگماتیکە سیتمێکی فیکریی ئەوتۆیە کە ڕێگای فیکرکردنەوەی خەللاق بە هیچ کەس نادا. کە سیستمەکەت قبووڵ کرد دەبێ بێ ئەملاو ئەولا پەیڕەوی لێ بکەی. "کورتەباس" بەڕاستی لەو بارەشەوە تازە بوو کە گیروگرفتەکانی دروستکردنی سۆسیالیزمو گیروگرفتەکانی ئێستای ولاّتەکانی سۆسیالیستی بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی واقیعبینانە باس دەکا، نە لە روانگەی ئەوانەوە کە هەرچی لەو ولاّتانە کراوە، دەبێ بێ ئەملاو ئەولا قبووڵ بکرێ، نە لە روانگەی ئەوانەشەوە کە دەڵێن هەرچی لەو ولاّتانە کراوە خراپەو هیچ نرخێکی بۆ دواڕۆژ نیە. کورتەباس بە شێوەیەکی واقیعبینانە هەم دەسکەوتەکانی سۆسیالیزم لەو ولاّتانەدا باس دەکاو هەم بارە مەنفییەکانی. باسی هێندێ دیاردە دەکا کە لەگەڵ سۆسیالیزم ناتەباییان هەیە، بەلاّم ئێستا بوون بە زەمیمەی سۆسیالیزمی مەوجوودو لەو بارەوە کورتەباس شتی تازەی تێدایەو دەبێ بگوترێ ئازایەتییە کە بەم شێوەیە بۆ یەکەمجار لە ولاّتی ئێمەدا باسی سۆسیالیزم دەکرێ. بەلاّم لە بارێکی دیکەوە کورتەباس هیچی تازەی تێدا نیە. ئەوە لەو کورتەباسەدا لەسەر دێموکراسی هاتوە، بۆ حیزبی دێموکرات تازە نیە. چونکە

حیزبی دێموکرات بە تیئۆری‌و بەکردەوەش لەو چەند ساڵەدا نیشانی داوە کە دێموکراتە، ئیمانێکی قووڵی بە دێموکراسی هەیە. ئایا حیزبێك کە ئەو ئیمانە قووڵەی بە دێموکراسی هەبێ‌و شیعاری ستراتیژیشی بریتی بێ لە: "دێموکراسی بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ کوردستان"، حیزبێکی ئەوتۆ لە دوارۆژدا کە دەیەوێ کۆمەڵێکی باشتر دروست بکا، دەتوانێ واز لە دێموکراسی بێنێ؟ بۆیە شێلگیربوون لەسەر دێموکراسی، تا سەربردنی دێموکراسی، دابیکردنی لە کۆمەڵی سۆسیالیستییش‌دا ئەرکی مێژوویی حیزبی دێموکراتە. ئەمە تازە نیە. ئەمە تەنیا درێژەپێدانی ئەو سیاسەتەیە کە حیزبی دێموکرات هەر ئێستاش بەرێوەی دەبا. درێژەپێدانی رێبازی دێموکراتی تا گەیشتن بە سۆسیالیزم‌و دروستکردنی کۆمەڵی سۆسیالیستی‌یە.

کەوابوو هەڵوێستی حیزبی ئێمە نیسبەت بە وڵاتەکانی سۆسیالیستی نە دژایەتی‌و نە پەیرەوی کردنی بێ ئەم‌لا و ئەولایە، بەڵکوو هەڵوێستێکی دۆستانە‌و هەر لەو کاتەش‌دا رەخنەگرانەیە. حیزبی ئێمە بە چاوێکی رەخنەگرانە تەماشای سۆسیالیزمی مەوجوود دەکا، لە هەموو بارە موسبەتەکانی کەڵك وەردەگرێ‌و هەموو بارە مەنفی‌یەکانی وەلا دەنێ. دیارە هەر تیئۆری یا نەزەرێکی تازە کە بێتە مەیدان، وا بە هاسانی هەزم ناکرێ. فیکرەکە تا رادەیەك تازە بوو، لەبەر ئەوەش زوو وەرنەگیرا. بەڵام با رەخنەیەکیش لە خۆمان بگرین. ئەگەر ئەو "کورتەباس"ە لە وڵاتێکی ئۆرووپای رۆژئاوا یان لەوەش زیاتر لە وڵاتێکی سۆسیالیستی‌دا نووسرابا‌و لە دەرەوەرا بۆ ئێمە هاتبا، رەنگ بوو باشتر وەربگیرێ تا ئەوە کە ئێمە بۆ خۆمان وەك کورد نووسیومانە. چونکە بەداخەوە یەکێك لە شوێنەوارە ناخۆشەکانی مێژووی نەتەوەکەمان ئەوەیە کە شتێك هی خۆمان بێ بە چووکی دادەنێین‌و بە گرنگی نازانین. بەداخەوە خۆ چووکبینی تا رادەی بێگانە پتر لە خۆماڵی خۆش ویستن لە نێو کوردەواری‌دا باوە. لەوانەیە ئەگەر "کورتەباس" لە لایەن هێزێکی دیکە، تەنانەت وەك حیزبی توودەشەوە نووسرابا کە هەموومان دەزانین لە لای کۆمەڵانی خەڵك چەند ناخۆشەویستە، رەنگ بوو وەربگیرێ، چونکە کورد بە داخەوە بڕوای بە خۆی هەر کەمە. هەتا ئێستا بە تەواوی فێری ئەو بڕوا بەخۆکردنە نەبووە. تەکیەکردن لەسەر

هێزی خۆمان، لەسەر فیکری خۆمان تازەیەو چونکە تازەیە وەرگرتنو هەزم کردنی هاسان نیە.

کۆسپی دووهەم لەسەر ئەو "کورتەباس"ە، بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕێکی چەوتە لەسەر سۆسیالیزم لە ئێراندا. ساڵەهای ساڵ ئەدەبیاتی سۆسیالیستی لە ئێراندا ـ ئەگەر موبالەغە نەبێ ـ سەدی نەوەدی هی بەڕێوەبەرانی حیزبی توودەیە کە پڕە لە بیروباوەڕی ناڕاستو چەوت. دەرهێنانی ئەو ئەدەبیاتە چەوتە لە مێشکی لاوان کە هێندێ لە ئەندامانی حیزبی خۆشمان لەگەڵنو ئەوانیش بیروباوەڕی سۆسیالیستی‌یان هەر لە رێگای ئەدەبیاتی توودەیی‌یەوە وەرگرتوە، کارێکی زۆری دەوێ. دەرهێنانی هێندێ بیروباوەڕ کە وەك شتێکی سابیتو ئیددەیەکی فیکس لە مێشکیاندا جێگیر بوەو دانانی بیروباوەڕێکی تازە لە جێگای‌دا کارێکی وا هاسان نیە.

ئەوەش یەکێك لە کۆسپەکانە کە تەنیا ناگەڕێتەوە سەر کوردستان، بەڵکوو دەگەڕێتەوە سەر هەموو ئێران. لە نێو رێکخراوەکانی لایەنگری سۆسیالیزم لە سەرانسەری ئێراندا ئەو فیکرە کە لە "کورتەباس"دا هاتوە تازەیەو بۆ ئەوەی کە فیکرێکی تازە جێگیر بێ، هیچ رێگای دیکەی نیە. دەبێ فیکرە کۆنەکە وەدەر بنێیو چونکە ساڵەهای ساڵە فیکرە کونەکە جێگیر بووە وەدەرەنانی بەو هاسانی‌یە نیە.

کۆسپی سێهەم دەگەڕێتەوە سەر حیزبی خۆمان. لە حیزبی ئێمەدا لەگەڵ ئەوە کە لەمێژە لەباری تەشکیلاتیو سیاسی‌یەوە خۆمان لە ژێر نفووزی حیزبی توودە رزگار کردوەو لەگەڵ ئەوەی کە لەباری فیکریشەوە دژی بیروباوەڕی چەوتی حیزبی توودەو تاقمی حەوت کەسی کە خەیانەتیان بە حیزب کرد خەباتمان کردوە، دیسانیش پاشماوەی شێوە فیکرکردنەوەیەکی توودەئیستی لە حیزبی ئێمەدا هەر هەیە. ئەمە خۆی لە کۆسپی دووهەمڕا سەرچاوە دەگرێ. بێجگە لەوە بەداخەوە دەرکەوت کە هێندێك لەو کەسانە کە لەنێو حیزبی ئێمەدا بیروباوەڕی توودەئیستی بڵاو دەکەنەوە، وەك فراکسیۆنێك رێکخرابوونو پێکەوە دەیانویست ئەو توودەئیزمە بەهێزتریش بکەن. ئەم وەزعە بەردەوام بوو و ئەم کۆسپانە لە نێو ریزەکانی حیزبدا لەسەر رێگای کورتەباس هەبوون تا کۆنگرەی شەشەمی حیزب پێك هات. لە کۆنگرەی شەشەمدا "کورتەباس" دانرابوو کە بەتایبەتی باسی لەسەر بکرێ. جارێك زیاتر لە ساڵێك لەمەوبەر لە کومیتەی ناوەندیی پێشوودا بەشێوەی ئەمجارە باس کرا، هاوڕێیان

نەزەریان لەسەر دا. بەڵام هەتا بە نموونە یەك نەفەریش موخالیفی نەبوو. پاش ئەوە "کورتەباس" زەبت کراو پیادە کراو هاتە سەرکاغەزو بڵاو بۆوە، جارێکی دیکە کومیتەی ناوەندی کۆ بۆوە"کورتەباس" بە نووسراوە درا بە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی کە موتالیعەی بکەنو نەزەری خۆیان لەسەر بدەن. ئایا موتالیعەیان کردوە یان نەیانکرد، هەر چۆنێك بێ ئەو باسەی لەسەری کرا لە بارەی یەك دوو مەسەلەی چووك نەبێ، هیچ چەشنە موخالیفەتێك لەگەڵ "کورتەباس" نەکراو کومیتەی ناوەندی "کورتەباس"ی پەسند کرد. بۆیە کارێکی زۆر مەنتیقی بوو کە پاش ئەوەی کورتەباس لە لایەن کومیتەی ناوەندییەوە پەسند کرا بچێ بۆ کۆنگرەی حیزب. لە کۆنگرەشدا چاوەڕوان دەکرا "کورتەباس" لە لایەن ئەندامانی کومیتەی ناوەندییەوە پشتیوانیی لێ بکرێ. هەروەها بە شێوەیەکی مەنتیقیش وا دانرابوو کە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی "کورتەباس"یان لە جێگای دیکە باس کردوەو دیفاعیان لێ کردوەو گیروگرفتەکانیان روون کردۆتەوەو وەڵامی پرسیارەکانی ئەندامانی حیزبیان داوەتەوە. کەچی لە کۆنگرەی شەشەمدا نەك هەر دەرکەوت ئەم کارە نەکراوە، بەڵکوو زۆر کەس لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە کۆنگرەدا موخالیفەتیان لەگەڵ "کورتەباس" کردو موخالیفەتەکەشیان زۆر چالاکانە بوو. هێندێکیشان کە بێلایەن بوون، هەڵوێستیان نەگرتو بێدەنگ بوون. ئەوانەش کە موافق بوون بێجگە لە چەند نەفەرێك قسەیەکیان نەکرد. بەڵام بە پێچەوانە ئەوانەی کە یەککگرتوو بوونو زیددی "کورتەباس" بوون، واتە توودەئیستەکان توانیان ئەو قسەیە لە کۆنگرەدا بڵاو بکەنەوە کە گۆیا "کورتەباس" لە لایەن دوو سێ نەفەرەوە پەسند کراوە. بەڕاستیش ئەوانەی دیفاعێکی جیددییان لە "کورتەباس" کرد، دوو سێ نەفەر زیاتر نەبوون، لە حاڵێکدا ئەوانەی کە موخالیفی کورتەباس قسەیان کرد سێ هێندەی ئەوانە بوون کە دیفاعیان لێ کرد. کەوابوو وەزعێکی وا پێك هات کە وا دەهاتە بەرچاو کە بەراستی "کورتەباس" پەسندی کومیتەی ناوەندی نیە، بەڵکوو هی دوو سێ نەفەرە، چونکە لە زمانی هێندێ لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندیی پێشووش ئەو قسەیە بیسترابوو و ئەم باوەڕە لە کۆنگرەدا بەهێزتر بوو. بۆیە جارێکی دیکە تیکراری دەکەینەوە کە کومیتەیەکی ناوەندیی مەسئوول نابێ لە دوارۆژدا رێگا بدا وەزعێکی ئەوتۆ پێك بێ. هەر مەسەلەیەك دێتە کومیتەی ناوەندیو باس دەکرێ، ئەگەر

کومیتەی ناوەندی موخالیفە، دەبێ موخالیفەتی خۆی بە قاتعییەتەوە دەربخاو بە شێوەیەکی دێموکراتی کە شێوەی حیزبی دێموکراتە، رەدی بکاتەوە. زۆر مەسەلە هەیە هاتۆتە کومیتەی ناوەندیو کومیتەی ناوەندی پەسند نەکردوە، بۆیە نە چۆتە کۆنگرەو نە کەسیش باسی کردوە. بەلاّم هەموو کومیتەی ناوەندی دەزانێ کە مەسەلەکە بەم شێوەیە نەبوو کە دوو سێ نەفەر بیانەوێ "کورتەباس" بە سەر کۆنگرەدا تەحمیل بکەن. ئێمە لە دەفتەری سیاسیدا بمانزانیبا بۆچوونی هێندێ لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە کۆنگرەدا ئەوە دەبێ کە بە چاوی خۆمان دیتمان، بە هیچ جۆرێك حازر نەدەبووین "کورتەباس" بەرینە کۆنگرە. چونکە ئەو وەزعە کە لە کۆنگرەدا لەسەر "کورتەباس" پێش هات، شایستەی کۆنگرەیەکی حیزبی دێموکرات نەبوو. کەوابوو "کورتەباس" کوتوپڕو لە نەکاو نەچوو بۆ کۆنگرە. هێندێ لە هاوڕێیان دوێنێ لەباسی خۆیاندا وایان نواند کە دەفتەری سیاسی بەبێ هێنانەگۆڕی پێشەکی، "کورتەباس"ی بردە کۆنگرە. نەخێر، هەروەها کە ئیشارەی پێ کرا سالێك زیاتر بوو "کورتەباس" باسی لەسەر دەکراو بلاّو ببۆوە.

موخالیفەکانی "کورتەباس" سێ دەستە بوون: دەستەیەك یەکگرتوو بوون. ئەوانە بوون کە بیروباوەڕی توودەئیستییان لە حیزبی ئێمەدا بلاّو دەکردەوە. هیچ پێویست نیە ئەوانە سەر بە جێگایەك بووبن، هیچ پێویست نیە رێکخراوی تایبەتیی خۆیان هەبووبێ. بەلاّم بە شێوەیەکی سیستماتیكو رێکوپێك بیروباوەڕی توودەئیستییان لە نێو حیزبی ئێمەدا بلاّو دەکردەوە. ئەوانە لە پێش کۆنگرەشدا کاریان دەکردو دژی بیروباوەڕی "کورتەباس" تێدەکۆشان. لە جەرەیانی کۆنگرەشدا بە شێوەیەکی بەرنامەیی عەمەلیان دەکرد.

جەوی کۆنگرەش لە جەرەیانی هەلّبژاردنی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە کۆنگرەدا شاهیدی ئەوە بوو کە ئەوانە پێشتر بەرنامەی خۆیان داناوە. لێرە ئیشارەی پێ کرا کە موخالیفو موافیقی "کورتەباس" هەردوو لا جەوسازییان دەکرد. ئێمە ئەوە بە تەواوی رەد دەکەینەوە. موافیقەکانی "کورتەباس" جەبهەگیرییان نەکرد. ئەوە موخالیفەکان بوون، ئەوانەی کە بەرنامەیان دانابوو بە شێوەیەکی سیستماتیك جەبهەگیرییان دەکردو ژمارەیەکی دیکەش لەگەلّ ئەوان رێك کەوتن. ئەم رێککەوتنە

ئاگاهانە بێ یا نائاگاهانە گرنگ نیە. بە کردەوە ڕێك کەوتن، لەو جەبهەگیرییەدا بەشدارییان کردو جەوێکی ناسالمیشیان پێك هێنا.

ئەوانە کە بەرنامەریزییان کردبوو، مەبەستیان زۆر روون بوو. مەبەستیان ئەوە بوو کە "کورتەباس" رەد بکرێتەوە. نەتیجەی رەدبوونەوەی "کورتەباس" رەد بوونەوەی رێبازێك بوو کە حیزبی ئێمە ساڵەهای ساڵە پەیڕەوی لێ دەکا. رەدبوونەوەی "کورتەباس" بێ ئەملاو ئەولا هەنگاوێك بوو بەرەو توودەئیزم. چونکە سنووربەندییەکە تێك دەچوو. ئەگەر ئێمە مەبەستمان لە دانانی "کورتەباس" ئەوە بوو بەینی حیزبی دێموکراتو حیزبی توودە سنوور دابنێین، بۆ ئەوەی لاوان پاش ماوەیەك موتالیعە نەچن بۆ لای حیزبی توودە، موخالیفینی "کورتەباس" مەبەستیان ئەوە بوو کە سنوورەکە هەڵوەشێننەوەو لە نەتیجەدا لەنێو حیزبی دێموکراتدا رێگا بۆ توودەئیزم خۆش بکەن. ئەوە مانای شکستی بەڕێوەبەریی حیزب بەگشتی بوو و هی سکرتێر بەتایبەتی. چونکە توودەئیستەکان وایان دەنواند کە تەنیا سکرتێری حیزبەکەمانە کە ئەو کورتەباسەی هێناوە. ئەو جار دوو رێگا بۆ بەڕێوەبەرییو سکرتێر دەمایەوە، یان ئەوە کە دەبوا لە بەڕێوەبەریو سکرتێری لابچن کە بەو خسووسییەتەی سکرتێر هەیەتی حەتمەن لادەچوو، بێگومان هێندێ لە ئەندامانی بەڕێوەبەریش هەر ئەو کارەیان دەکرد. یان ئەوە کە دەبوا تەسلیمی ئەو رێبازە بن کە رێگا بۆ توودەئیزم خۆش دەکا. لە هەردوو حاڵدا نەتیجە تێکچوونی ریزەکانی حیزبی ئێمە بوو. رەنگە ئێستا کە ئەو باسە دەکرێ، هێندێ لە هاوڕێیان تێبگەن کە ئەو وەختە مەسەلەکە بەم شێوەیە نەدەهاتە بەرچاویان. هەر چۆنێك بێ بێتەفاوەتیی زۆر لە هاوڕێیانو بە گرنگ نەگرتنی ئەو مەسەلەیە بە نەزەری ئێمە کەمتەرخەمییەکی یەکجار زۆر گەورەیە. چونکە بەڕاستی ئەگەر "کورتەباس" رەد کرابایەوە، حیزبەکەمان تووشی تەنگو چەڵەمەیەکی زۆر دەبوو. مەبەستی ئەو کەسانەش هەر ئەوە بوو کە "کورتەباس" رەد بکرێتەوە بۆ ئەوە ریزەکانی حیزبی دێموکرات تێك بچن. ناڵێین ئەوان مەربووتن بە جمهووریی ئیسلامییەوە، بەلام بە خۆڕاییش نەبووە کە کاربەدستانی جمهووریی ئیسلام، چاوەڕوانی ئەوە بوون کە لە کۆنگرەی شەشەمی حیزبدا دووبەرکیو ئینشعاب پێك بێ. زۆر جاریش ئەوەیان ئیعلام کردو ئەو دەنگو باسەی کە بە دەفتەری سیاسی دەگەیشت، نیشاندەری ئەم

راستی‌یە بوو. کەوابوو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە دوارۆژدا نابێ مەسەلەی ئەوەندە گرنگ بە چووك دابنێن، دەبێ ئەوەندە بە گرنگی دابنێن کە بۆ دوارۆژی حیزب موهیمە.

بە داخەوە دەتوانین بڵێین ئێستاش تا رادەیەك هێندێ لە هاورێیانی کومیتەی ناوەندی باس لە سەر "کورتەباس"یان ئەوەندە بە گرنگ نەگرتوە. چونکە باسی دوێنێ نیشانی دەدا کە بێجگە لە هێندێ هاورێ، ئەوانی دیکە ئێستاش دانەنیشتوون وەختێکی زۆر دابنێن‌و بە وردی موتالیعەی "کورتەباس" بکەن. "کورتەباس" بەڵگەیەکە کە بەشێك لە رێبازی حیزبی ئێمە لە دوارۆژدا دیاری دەکا. ناکرێ وەك نامیلکەیەك لە ئاخر دەقیقەکانی پێش کۆبوونەوەدا سەیری بکەین‌و وەرەقی لێ بدەین بزانین چی تێدایە. ئەوە بەڵگەیەکە دەبێ بە جیددی موتالیعە بکرێ، موخالیفی دەبین یا موافیقی، ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە. دوێنێ هێندێ لە هاورێیان لێرەدا گوتیان ئەوانەی کە لە کۆنگرەدا لەگەڵ "کورتەباس" موافیق بوون، هێندێکیان نائاگاهانەو فورسەت تەڵەبانە دەنگیان بۆ دا. بە پێچەوانە ئەوانە کە موافیق بوون نائاگایان کەم تێدا بوو، چونکە ئەوانە هەموو لایەنگری دێموکراسی بوون. لایەنگری دێموکراسی نابێ نائاگا بێ. بەڵام هێندێ لەو کەسانە کە باش لە مەسەلەکە تێنەگەیشتبوون، دەنگیان بۆ "کورتەباس"دا بۆ ئەوە دڵنیایی خۆیان بە بەرێوەبەری نیشان بدەن یانی ئەگەر ئاگاداری‌یەکی زۆریان لە "کورتەباس" نەبوو، بەڵام لەو بڕوایەدا بوون کە ئەوە بەرێوەبەری‌یە کە "کورتەباس"ی هێناوە حەتمەن لێی دەزانێ. بۆیە دەنگی خۆیان داوە بە ئیمانی خۆیان بە بەرێوەبەری‌و ئەوە لە خەباتی سیاسی حیزبێکی شۆڕشگێڕدا دیاردەیەکی تازە نیە. ئێمە دەبێ سوپاسی ئەو هاورێیانە بکەین، مەمنوونیان بین کە هەم ئیمانی خۆیان بە رێبازی حیزبەکەیان نیشان داو هەم یارمەتیشیان دا بۆ ئەوە کە "کورتەباس" پەسند بکرێ.

با بێینەوە سەر خودی "کورتەباس". "کورتەباس" وەڵامی سێ پرسیاری ئەساسیی دەداتەوە.

**یەکەم:** بۆچی حیزبی ئێمە سۆسیالیزمی دەوێ؟

**دووهەم:** چ سۆسیالیزمێکی دەوێ.

**سێهەم:** پێوەندیی حیزبی ئێمە لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی دەبێ چۆن بێ؟

ئەو سێ مەسەلەیە تازە نین. ساڵەهای ساڵە ئەو سێ مەسەلەیە بۆ حیزبی ئێمە لەگۆڕێ دان. لە کۆنگرەی سێهەمەوە کە گوتراوە ئامانجی دوارۆژی حیزب سۆسیالیزمە، تا دوو ساڵ لەمەوبەر نە گوتراوەو نە روون کراوەتەوە بۆچی سۆسیالیزممان دەوێ‌و چ سۆسیالیزمێکمان دەوێ؟ هەر لە مەقالەیەکدا لە جێگایەك ئیشارەمان کردوە کە دەمانەوێ لە ئێستاوە خەتی خۆمان دیاری بکەین بۆچی سۆسیالیزممان دەوێ. پاشان چ سۆسیالیزمێکمان دەوێ، ئەویشمان روون نەکردۆتەوە. لەوبارەشەوە لە بەرنامەی پەسندکراوی کۆنگرەی سێهەمدا گوتراوە سۆسیالیزمی دادپەروەرانەمان دەوێ، لە هی کۆنگرەی پێنجەمدا هاتوە، سۆسیالیزمێکمان دەوێ کە لەگەڵ هەلومەرجی وڵاتەکەمان رێك کەوێ تا کۆنگرەی شەشەم کە سۆسیالیزمی دێموکراتیکی پەسند کردوە. بۆ ئاگاداری کومیتەی ناوەندی دەبێ بڵێین کە سۆسیالیزمی دێموکراتی ساڵی ١٣٥٢ هەر لە کۆنگرەی سێهەمدا پێشنیار کراوە. بەڵام هەر لەبەر ئەو هۆیانە کە لە کۆنگرەی شەشەمدا تووشیان بووین، رەد کرایەوە. مەبەست هەر ئەو سیستمە فیکرییە تووددەئیستییەیە. بەڵام چونکە تازە سەرتای یەکگرتنەوەی حیزب بوو، ئەوانەی کە لایەنگری سۆسیالیزمی دێموکراتی بوون، زۆر ئیسراریان لەسەر پێشنیاری خۆیان نەکردو بە وشەی دادپەروەرانە رازی بوون.

کەوابوو مەسەلەکە تازە نیە، مەسەلەکە ١٠ ساڵ زیاترە دەستی پێ کردوە. خۆی باس لە سەر سۆسیالیزم پرۆسەیەکی بەسەردا هاتوە تا گەیشتۆتە کۆنگرەی شەشەم. ئەو سێ پرسیارە کە "کورتەباس" وەڵامیان دەداتەوە زۆر گرنگن، چونکە ئەگەر بڵێین سۆسیالیزممان دەوێ، کۆمەڵێکی سۆسیالیستیمان دەوێ، ئەوە پێوەندی بە چارەنووسی میللەتەکەمان لە دوارۆژداو تەنانەت چارەنووسی چەند پشتی داهاتووەوە هەیە. بۆیە مەسەلەیەکی زۆر ئەساسییەو، پاشان وەڵامدانەوە بەو پرسیارە کە چ سۆسیالیزمێکیشمان دەوێ، ئەویش زۆر ئەساسییە. ئایا ئەو سۆسیالیزمەی کە مەوجوودە دەمانەوێ یا سۆسیالیزمێکی دیکە؟ ئەگەر سۆسیالیزمێکی دیکەیە، چ سۆسیالیزمێکە؟ هەروەها ئایا دەمانەوێ سەربەخۆیی حیزبەکەمان‌و سەربەخۆیی وڵاتەکەمان تا سەر بپارێزین‌و دەشمانەوێ هەر لەو کاتەشدا دۆستی وڵاتەکانی سۆسیالیستی بین؟ ئەو سێ مەسەلەیە گشتیان ئەساسین‌و لێك جیا ناکرێنەوە یانی وەڵامی ئەو سێ پرسیارە بە شێوەیەکی ئۆرگانیك پێکەوە پێوەندییان هەیە. ناکرێ

ئێمە دیاری بکەین چ چەشنە سۆسیالیزمێکمان دەوێو باسی سەربەخۆیی حیزبەکـەو لە دوارۆژیشدا ولاتەکەمان نەکەین. مەسـەلەن ئەگـەر سۆسـیالیزمی مـەوجوودمان هەڵبژارد بە پێی تیئۆری "حاکمییەتی مەحدوود" کە پەسند کـراوەو بـە کـردەوەش یەکیەتیی سۆڤیەتی بە سەر ولاتانی سۆسیالیستیدا سەپاندوویەتی، مانای ئەوەیە کە مەحدوود کردنی سەربەخۆیی حیزبو ولاتەکەشمان کردوە.

ئەسڵەن حیزبی دێموکرات بۆ داوای سۆسیالیزم دەکا؟ هەروەها کە لـە بەرنامـەی حیزبو لە "کورتەباس"یشدا هاتوە، ئێمە حیزبێکی شۆڕشگێڕینو دەمانەوێ هەر لە ئێستاوە ڕێبازی خۆمان دیاری بکەین. بۆ کوێ دەڕۆینو لەگەڵ کێـین؟ هـەم لـە نێـو کۆمـەڵی کـوردەواریداو هـەم لـە دەرەوەی کۆمـەڵی کـوردەواری. دەڵێـین حـیزبی کرێکارانو جووتیارانو ڕووناکبیرانی شۆڕشگێڕین. ئەو دوو چینو یەك توێـژە پێکـەوە دەتوانن تا سۆسیالیزم بڕۆن. چونکە جووتیارو کرێکارو ڕووناکبیری شۆڕشگێڕ دەتوانن سۆسیالیزم دروست بکەن. کەوابوو لە نێو کۆمەڵدا ئێمە حیزبی ئـەو کەسـانەین کـە هیچ کۆسپیان لە سەر ڕێگا نیە تا سۆسیالیزم بڕۆن. لـە دەرەوەش پێویسـتە دۆسـتی ئەو هێزانە بین کە ئەوانیش دژی ئەوە نین کە ولاتەکەمان بەرەو سۆسیالیزم بڕوا. بۆیە ولاتـانی سۆسیالیسـتی، حیزبـەکانی سۆسیالیسـتو کومۆنیسـت، جوولانـەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلانی زۆرلێکراو هەموو ئـەو هێزانـەن کـە بـە دۆسـتیان دادەنێـین. سۆسیالیزم لە پاوانی هیچ کەسدا نیە. سۆسیالیزم دیاردەیەکی مێژوویییە کە زۆر لە پێش مارکسو ئێنگلس باسی کراوە. ئەوان هـاتوون سۆسـیالیزمیان خسـتۆتە سـەر بناخەیەکی زانستی، دەنا زۆر لە پێشی ئـەواندا سۆسـیالیزم وەك ئامـانجێك هاتۆتـە گۆڕێ. بەلام چونکە بناخەی زانستیی نەبوو و زیاتر خەیاڵو ئـارەزوو بـووە بـە نـاوی سۆسیالیزمی "ئۆتۆپیك" ناوبانگی دەرکردوە. "تۆماس مـۆر" هـاتوە "ئۆتۆپیـا"ی نووسیوە. ئۆتۆپیا شارێکە لەوێدا هەموو کەس کار دەکا، هەموو کەس پێکـەوە بـە ئاشتی دەژی، هیچ کەس مالکییەتی نیـە، هـەموو حاڵیـان باشـە، یـانی شـارێکی خەیاڵییە کە سۆسیالیزمی تێدا وەدی هاتوە. مارکسو ئێنگلس هاتوونو نیشـانیان داوە بە خەیاڵ سۆسیالیزم دروست ناکرێ، دەبێ خەباتی بۆ بکـرێ. دیـارە حـیزبێکی دێموکرات کە بۆ کۆمەڵێکی دادپەروەرانە خـەبات دەکـا، حـیزبێکی دێموکـرات کـە کۆمەڵی سۆسیالیستیی وەك ئامـانجی دوارۆژ هـەڵبژاردوە، هیـچ پێویسـت نیـە کـە

حەتمەن حیزبێکی سۆسیالیست یان کومۆنیست بێ. دەکرێ ناوی هەر حیزبی دێموکرات بێو بۆ سۆسیالیزمیش خەبات بکا. تەنانەت پاش دروست کردنی سۆسیالیزمیش دەکرێ ناوی هەر حیزبی دێموکرات بمێنێتەوە. لێرەدا هیچ ناتەبایی‌یەك بەدی ناکرێ. گرنگ ئەوەیە کە حیزبێکی شۆڕشگێڕی دێموکرات وەك حیزبی ئێمە چ بەرنامەیەکی هەیەو بە کردەوە بۆچی تێدەکۆشێ؟ ئێمە پێمان وایە هەر حیزبێکی مارکسیستی کە پەیڕەوی لە مارکسیزمی خەللاق بکاو واقعییەتی کوردستان بخاتە بەرچاو، ناتوانێ بەرنامەیەکی پێشکەوتووتر لە بەرنامەی حیزبی دێموکرات کە ڕێگا بۆ دروست کردنی سۆسیالیزم خۆش دەکا، دابنێ. ئەوە ڕاستی‌یەکە کە هەموو ئەو کەسانە کە خاوەن نەزەرو واقێعبینن، قبوولیانە. بەرنامەی حیزبی ئێمە لە کوردستاندا بەرنامەی ئوپتیمۆمە، واتە باشترین بەرنامەی گونجاو لە هەلومەرجی ئێستا دایە. ئەوە نەزەرێکی نادروستە، دوگمێکی کۆنە کە گۆیا چونکە ناوی حیزبی ئێمە دێموکراتە، مافی ئەوەی نیە سۆسیالیزم دروست بکا. ئەمە تەنیا قسەیەو زیاتریش وەك شیعار دەچێ.

بزانین ئەسڵەن حیزبی دێموکرات بۆچی خەبات دەکاو بۆچی تێدەکۆشێ؟ حیزبی دێموکرات بۆ وەدیهێنانی سێ ئامانجی گەورە پێك هاتووەو خەباتیشیان بۆ دەکا. یەکەم لابردنی ستەمی نەتەوایەتی‌یە. دووهەم لابردنی ستەمی چینایەتی یانی چەوساندنەوەی ئادەمیزادە. حیزبی ئێمە بۆ لابردنی هەموو چەشنە زۆرداری‌یەك تێدەکۆشێ. چەوساندنەوەش، ستەمی چینایەتیش بەشێکە لە زۆرداری. هەر بۆیەش لە بەرنامەی حیزبی ئێمەدا هاتوە کە بۆ لابردنی چەوساندنەوە خەبات دەکەین. بۆ ئەوە کە هەموو چەوساندنەوەیەك واتە چەوساندنەوەی چینایەتیش لە بەین بچێ. ئێستا وا دابنێین کە ئێمە هاتین‌و کۆمەڵێکی ئەوتۆمان دروست کرد کە گەلی کورد بە مافی نەتەوەیی خۆی گەیشت‌و چەوساندنەوەش نەما، یانی نە سەرمایەدارو سەرمایەداری ماوە، نە مالکییەتی خسووسیی گەورەی ئەرزو بەگشتی مالکییەتی خسووسی ئامرازی ئەساسی بەرهەمهێنان نەماوە. ئایا ئەو کاتە ئەو کۆمەڵە ئیدەئالی ئێمەیە؟ نەخێر، ئیدەئال نیە. یەکێك لە نووسەرانی سۆڤیەتی کتێبێکی نووسیوە کە ناوی ئەوەیە: "ئینسان تەنیا بە نان ناژی". تەنیا نان بۆ ژیانی شایستەی ئادەمیزاد کافی نیە. دەبێ ئازادیشی لەگەڵ بێ. بۆیە ئێمە هەر لە سەرەتاوە بۆ

ئازادی خەبات دەکەین. باشە، ئەگەر خەڵك نەچەوسێندرێتەوە، نانی هەبێ، بە زمانی خۆی بخوێنێ، بەڵام ئازادیی نەبێ بەو زمانــەی خــۆی نــەزەری خــۆی لەســەر وەزعــی وڵاتەکەی دەرببڕێ، مانای ئەوەیە ستەمێك ماوە کە ستەمی سیاسی‌یە. حیزبی ئێمــە خەبات دەکا بۆ ئەوە ئەو ستەمە سیاسی‌یەش نەمێنێ. ستەمی نەتەوایەتی‌و ستەمی چینایەتی‌و ستەمی سیاســی هــەر ســێکیان لەبــەین بچــن. لەبــەین بردنــی ســتەمی نەتەوایەتی‌و ستەمی چینایەتی‌و دابــین کردنــی دێموکراســی‌و ئــازادی. ئەوەیــە ئــەو کۆمەڵە کە حیزبی دێموکرات خەباتی بۆ دەکا. نەتیجەی ساڵەهای ســاڵ موتالیعــەو تاقیکردنەوە لە سەر وەزعی کوردستان ئەوەیە کە تێکۆشانی حــیزبێکی کومۆنیســت کە خۆی بە حــیزبی چینــی کرێکــار دادەنــێ‌و تــەنیا خــەباتی چینایــەتی دەکــا، لــە کوردستاندا سەرکەوتوو نابێ. ئەوە کە کۆمەڵە لە کوردستاندا سەرکەوتوو نــەبووەوە، رێکەوت نیە. حیزبی کومۆنیستی عێراق کە رابردوویــەکی درێــژی هــەبوو، لــە نێــو خەڵكدا بەراســتی نفــووزی هــەبوو، لــە پــاش شۆڕشــی ١٩٥٨ تەنانــەت دەیتوانــی دەسەڵاتی سیاسیی وڵات بەدەستەوە بگرێ، ئێستا بۆتە وەها حیزبێکی بچووك‌و کــەم نفووز. چونکە ئەوەندە کە پێویست بوو بایەخی نە بە خەبات بــۆ هــەقی نەتەوایــەتی داوە نە بە خەبات بۆ ئازادی. لە لایەکی دیکەش حیزبێکی بە تەواوی ناسیونالیســت وەك "پارتی"ش کە "کوردایەتی"ی رووتی دەکرد، دۆست‌و دوژمنی دیاری نــەکردبوو و لەگەڵ شەیتانیش دۆستایەتی دەکردو لە نێو وڵاتیشدا هیچ خەباتێکی بۆ گۆڕێنــی تــەرکیبی کۆمــەڵی کــوردەواری بــەرێوە نــەدەبرد، بــەڵکوو بــاری عەشــیرەتی‌و دەرەبەگایەتیشی بەهێزتر دەکردو بەرێوەبەرانی پارتی بــە هیــچ جۆرێــك نــە لــە نێــو پارتی‌داو نە لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا چووکترین ئیمانیان بە دێموکراســی نــەبوو، لــە توانای‌دا نەبوو ئامانجەکانی گەلی کورد جێبەجێ بکا. بە کردەوەش نەتیجــەی کــاری پارتی ئاشبەتاڵێکی ئابڕووبەرانە بــوو. بــۆ ئــەوە حــیزبێکی سیاســی لــە کوردســتان سەرکەوێ دەبێ هەم حیزبێکی دێموکرات‌و هەم حیزبێکی شۆڕشگێڕ بێ. هەم بتوانــێ گیروگرفتی نەتەوایەتی چارەســەر بکــاو ســتەمی نەتەوایــەتی لــە نێــو بــەرێ‌و هــەم گیروگرفتی کۆمەڵایەتی چارەسەر بکاو ستەمی چینایەتی لەنێو بــەرێ. بــەڵام دەبــێ حیزبێکی واقیعبین بێ‌و تێبگا کامە ستەم لە کامە قۆناخدا ئەساسی‌یە. لــە قۆنــاخی ئێستای خەباتی ئێمەدا ستەمی نەتەوایەتی ئەساسی‌یە، لە قۆناخی پــاش وەرگرتنــی

خودموختاری، واتە پاش دابینکردنی مافی نەتەوایەتیدا، ستەمی چینایەتی خۆی وەدەر دەخاو خەبات دژی ئەو ستەمە ئەساسیتر دەبێ. بەلاّم ئەوەی بۆ حیزبی ئێمە هەموو وەختێك لە هەموان ئەساسیترە، چ لە نێو حیزبداو چ لە دەرەوەی حیزب، خەبات بۆ دێموکراسییە. ئەو خەباتە دەبێ بێوچانو بێپسانەوە بکرێ.

هەرگیز خەبات بۆ دێموکراسی نابێ بچێتە ژێر سێبەری خەبات بۆ مافی نەتەوایەتی یا خەباتی چینایەتی. چونکە ئەوە هۆی بنەڕەتیی پێکهێنانی حیزبی دێموکراتەو تا حیزبی دێموکرات ماوە، دێموکراسی مەبەستو ئامانجیەتی.

ڕەنگە کەسێك بڵێ ئەگەر لە سۆسیالیزمدا خەڵك خانوویان هەیەو ترومبیلیان هەیەو ناچەوسێندرێنەوە، بە زمانی خۆیان دەخوێننو دەنووسن، ئیدی ئازادییان بۆ چیە؟ هیچ نیعمەتێك لە جیهاندا لە ئازادی بەنرختر نیە. ئازادی کەرامەتو شەخسییەت دەدا بە ئینسانو ڕێگا نادا بکرێ بە مۆرە. دامەزرێنەرانی سۆسیالیزمی زانستییش لایەنگری کۆمەڵێك بوون کە لەوێدا گەشەکردنی ئازادانەی هەر کەس شەرتی گەشەکردنی ئازادانەی هەمووان بێ. واتە قابلییەتو لێزانیی هەر فەردێك لە خزمەت کۆمەڵ دایە. کۆمەڵیش لە خزمەت پشکوتنی قابلییەتو لێزانیی فەرد دایە. لە روانگەی دامەزرێنەرانی سۆسیالیزمی زانستییەوە کۆمەڵی دواڕۆژ ئازادترینو بەختیارترین کۆمەڵ کە بە قسەی مارکس هەموو کەس هەم نانی دەبێ هەم گوڵی سوور. کورتی دەکەینەوە، سەرمایەداریی سەنعەتی، ئینسانی کردوە بە مۆرەو بە ئالەت. ئینسان دەبێ لە حالەتی مۆرە بێتە دەر، ببێتە شەخسییەت، ببێتە فەردێکی زیندوو و چالاکی کۆمەڵ. دەنا گەر ئینسان هەروەك مۆرە بمێنێتەوە، دیارە ئەودەم سۆسیالیزم شتێکی تازەی نەهێناوە، واتە سۆسیالیزم بە سەر سەرمایەداریدا سەرنەکەوتووە.

بزانین حیزبی دێموکرات وەك حیزبی ئێمە دەتوانێ سۆسیالیزم دروست بکاو ئایا سۆسیالیزم هەر بەو شێوەیە کە گوتراوەو ئێستا یەکێك لە دوگمەکانە، دادەمەزرێ کە گۆیا پێشڕەوی چینی کرێکار دێ زۆربەی زەحمەتکێشان لە دەوری خۆیدا کۆ دەکاتەوەو شۆڕشی سۆسیالیستی دەکاو دەسەلاّتی سیاسی بە دەستەوە دەگرێ؟ لە واقیعدا هیچ شۆڕشێك بەو شێوە کلاسیکییە نەبووە. شۆڕشی ئوکتۆبر کە بە شۆڕشی سۆسیالیستی ناسراوە، بە هیچ جۆر بەو شێوەیە نەبووە. جەرەیانی پاش شۆڕشی

ئوکتۆبر نیشانی دا کە خودی ئەم شۆڕشە بە کردەوە چەند لەو تیئۆرییە کلاسیکییە دوور کەوتۆتەوە. با جارێ باسی دوو نموونە لە ولاّتانی دیکە بکەین. لە ساڵی ۱۹۲۱دا بە یارمەتیی یەکیەتیی سۆڤیەتی لە مەغوولستانی دەرەوەدا کە لە ساڵی ۱۳۲٤ەوە بۆتە کۆماری گەلی مەغوولستان، شۆڕشێك بەرپا بوو و بە بەڕێوەبەریی سووخە باتۆر ڕێژێمێکی گەلیی لایەنگری شوانو کۆچەرە زەحمەتکێشەکانو دۆستی یەکیەتیی سۆڤیەتی هاتە سەر کار. (مەغوولستان ولاّتێکی پانو گەورەیە، بەلاّم ژمارەی دانیشتووانی هەر سێ میلیۆنە). لە زەمانی سەرکەوتنی شۆڕشی گەلیدا، مەغوولستان نەك هەر چینی کرێکاری لێ نەبوو، بەڵکوو بە نموونە یەك کارگەشی لێ نەبوو. هەموو شوانو کۆچەر بوون. ئەو کاتە باسێکی ئاوا هاتە پێش. چۆن مومکینە سۆسیالیزم لە ولاّتێکی ئەوتۆ دروست بکرێ کە هەموو شوانو کۆچەرنو کرێکاری تێدا نیە. هێندێ کەس نەزەریان ئەوە بوو کە مەغوولستان دەبێ لە پێشدا بەرەو سەرمایەداری بڕوا، پرۆلێتاریای تێدا پێك بێ، جا ئەو دەم حیزبی پێشڕەوی خۆی پێك بێنێو شۆڕشی سۆسیالیستی بکاو ببێتە ولاّتێکی سۆسیالیستی. هێندێ دیکەو لە سەرەوەی هەمووان لنین، نەزەریان ئەوە بوو کە سەرمایەداری لە بەینی ئەو نیزامانەی لە مێژوودا ناسراون، نیزامێك نیە ئیجباری بێ. نیزامێکە دەکرێ بە سەریدا باز ببەی، بە شەرتێك ولاّتێکی دیکەی سۆسیالیستی هەبێ یارمەتیی دەسەلاّتی سیاسی لەم ولاّتەدا بدا. ئەو کاتە ئەم ولاّتە بۆ خۆی دەتوانێ بەرەو سۆسیالیزم بڕوا. مێژوو نیشانی دا کە ئەم بۆچوونە دروست بوو. ئەگەر ئەم بۆچوونە لە مەغوولستان سەرکەوت، نە حیزبی چینی کرێکاری لێ بووو نە تەنانەت حیزبێکی وەك حیزبی دێموکراتو نە ئەسڵەن هیچ ڕێکخراوێکی سیاسیی دیکەو ئەگەر ئێستا مەغوولستان بۆتە ولاّتێکی سۆسیالیستی، مانای ئەوەیە مێژوو ئەو دوگمەی ڕەد کردۆتەوە کە هێندێ لاوی ناشارەزا دووپاتی دەکەنەوە. نموونەی باشتر لەوەش هەیە: لە ساڵی ۱۹٥۹دا شۆڕشی کووبا بە سەرۆکایەتیی فیدل کاسترۆ سەرکەوت. ئەم شۆڕشە لە لایەن هیچ حیزبێکی چینی کرێکارەوە ڕێك نەخرابوو. نەك هەر ئەوە، فیدل کاسترۆ لە ساڵی ۱۹٥۹و ۱۹٦۰دا دژی کومۆنیستو دژی یەکیەتیی سۆڤیەتی ولاّتەکانی سۆسیالیستی بوو. شۆڕشی کووبا کە دەستی پێ کرد لە سەرەتاوە تا سەرکەوتن، حیزبی کومۆنیستی کووبا ئەو وەختە ناوی حیزبی

سۆسیالیستی یەکگرتوو بوو لەگەڵی موخالیف بوو. پاش سەرکەوتنی شۆڕش لە کووبا بەڕێوەبەرانی حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتوو، پێشنیاریان کرد کە ئەم حیزبە وەك حیزبی کومۆنیست بمێنێتەوە. فیدل کاسترۆش کە ئیدی ئەو وەختە نەزەری نسیبەت بە کۆمونیزمو یەکیەتیی سۆڤیەتی گۆڕابوو، ببێ بە سەرۆکی ئەو حیزبە. یانی لە واقیعدا مەقامێکی تەشریفاتی هەبێو دەسەڵاتی نەبێو بەکردەوە حیزبەکە هەر بە دەست بەڕێوەبەرانی پێشووی حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کووباوە بێ. فیدل کاسترۆ ئەو پێشنیارەی رەد کردەوەو خۆی حیزبی کومۆنیستی دروست کردو خۆشی بوو بە سکرتێرو بەشێك لە ئەندامانی حیزبی سۆسیالیستی وەرگرتو ئەم حیزبەی هەڵوەشاندەوە. واتە لە واقیعدا حیزبی کومۆنیست، (حیزبی چینی کرێکار) لە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی کووبا پێك هات. کاتێك فیدل کاسترۆ دەستی کرد بە شۆڕش، نە رێکخراوی هەبوو، نە حیزبی پێشڕەوی هەبوو و نە نوێنەری چینی کرێکار بوو. ئەگەر وا دابنێین کە حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتوو نوێنەری چینی کرێکار بوو، کاسترۆ دژی ئەم حیزبە بوو و ئەم حیزبەش موخالیفی شۆڕش بوو. ئێستا ٢٥ساڵ لە سەرکەوتنی شۆڕشی کووبا تێدەپەڕێو کووباش وەك وڵاتێکی سۆسیالیستی چاو لێ دەکرێ. کەوابوو ئەو دوگمە بە یەکجاری فڕێ بدەین کە شۆڕشی سۆسیالیستی حەتمەن دەبێ حیزبێك سەرکردایەتیی بکا کە ناوی حیزبی چینی کرێکارەو سەرکەوتنی شۆڕشی سۆسیالیستیو بەرەو سۆسیالیزم رۆیشتن، بێ حیزبێك کە خۆی بە پێشڕەوی چینی کرێکار دادەنێ، ناگونجێ. ئەو دوو نموونەیە نیشانەی ئەوەن کە دەکرێ وڵاتێك بێ حیزبی چینی کرێکار وەك کووباو بێ چینی کرێکار وەك مەغوولستان، بەرەو سۆسیالیزم بڕواو بەرە بەرە سۆسیالیزم درووست بکا. لە کۆنگرەی شەشەمدا ئەوانەی دژی "کورتەباس" بوون دەیانگوت چۆن تازە ٢٥ ساڵ پاش وەرگرتنی خودموختاری دەست دەکەین بە درووستکردنی سۆسیالیزم؟ دیارە مەبەست ئەوە نیە کە بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەی ئێستای حیزب دروست ٢٥ ساڵ پێویستە، مەبەست ماوەی پێکهاتنی نەسڵێکە کە بەینی ٢٠ تا ٢٥ ساڵە. هەرچەند کوردستانی ئێستا لەباری کۆمەڵایەتیو ئابووریيەوە لە مەغوولستانی ساڵی ١٣٢٤ لە پێشترە، بەڵام پاش ٦٠ ساڵ هێشتا کەس ناڵێ کە سۆسیالیزم بە تەواوی لە مەغوولستان سەرکەوتوە. کە لە "کورتەباس"دا باسی ٢٥ ساڵ دەکرێ، گاڵتە نیە. حیزبی ئێمە مەسئوولییەتی هەیە

کە راستی بە گەلی کورد بلێو وەعدەی خۆڕاییی پێ نەدا. باسی مەغوولستانمان کرد کە بەڕاستی زۆر پاشکەوتوو بوو. باسی ولاتێکی پێشکەوتوو بکەین. چێکۆسلوواکی یەکێك لە پێشکەوتووترین ولاتەکانی سەرمایەداری لە ئۆرووپا بوو کە ئەوەی دەبێ ئێمە لە دوارۆژدا دروست بکەین واتە ژێرخانی ئابووریو کۆمەلایەتیو سەنعەتیی پێشکەوتوو، هەمووی پێش دەسەلاتی سۆسیالیستی هەبوو. چێکۆسلوواکی کە پێش شەڕی دووهەمی جیهانی وەك ولاتێکی سەرمایەداریی پێشکەوتوو لە ئێراندا پردی دروست دەکرد، کارخانەی سیمانو قەندی دروست دەکرد.

شکۆدا ئەو کاتەش هەر لە ئێراندا بەناوبانگ بوو. بەلام ئێستا پاش **٣٩** سالان کە دەسەلاتی سۆسیالیستی لەو ولاتەدا دامەزراوە، خۆیان جارێ نالێن پرۆسەی دروست کردنی سۆسیالیزم کۆتایی هاتووە. هێندێ هاوڕێ دەپرسنو دەلێن، باشە مەسەلەی هەژموونی چی لێدێ کە ئێمە بتوانین سۆسیالیزم بێ چینی کرێکار دروست بکەینو چینی کرێکار خۆی لە جەرەیانی دروست کردنی سۆسیالیزمدا پێك بێ، ئەو کاتە لە جەرەیانی وەدەستهێنانی دەسەلاتی سیاسیدا هەژموونی پرۆلێتاریا هەر مانای نیە. مەسەلەن ئەگەر حیزبی دێموکرات بە پشتیوانیی خەلکی کوردستان دەسەلاتی سیاسی لە کوردستاندا بە دەستەوە بگریو رێگا بۆ دروستکردنی سۆسیالیزم خۆش بکا، ئایا بۆ ئەم هەنگاوە هەژموونیی پرۆلێتاریا پێویستە؟

ئەوەی لە کووبا هاتە دی، بوو بە سەرچاوەی نووسینی کتێبە بە ناوبانگەکەی "رێژیس دنێبری" بەناوی "شۆڕش لە نێو شۆڕشدا". مەبەست لە شۆڕش لە نێو شۆڕشدا ئەوە بوو کە بێ سەرکردایەتیی چینی کرێکارو حیزبی کومۆنیست، واتە بێ پێڕەوی کردن لەو دوگمە کلاسیکیە، شۆڕشی کووبا سەرکەوت. جا ئایا گوناهە کوردیش رێگای تایبەتیی خۆی هەبێ کە نە رێگای سۆڤیەتی، نە رێگای مەغوولستانو نە رێگای کووبایە؟ ئایا هەموو کەسی دیکە مافی ئەوەی هەیە رێگای تایبەتیی خۆی بگرێتە پێش بەو شێوەیە کە خۆی بە مەسلەحەت دەزانێ، بەلام کورد هەقی نیە ئەو کارە بکا؟ "کورتەباس" هیچ گوناهێکی دیکەی نیە جگە لەوە کە دەلێ دەکرێ رێگایەکی واش هەبێ کە لەگەل هەلومەرجی کوردستان باشتر رێك کەوێ. نەك هەر تاوان نیە حیزبی دێموکرات شتێکی تازە بلێو هەر چاوی لە خەلك نەبێ، بەلکوو ئێمە دەبێ شانازی بەوە بکەین کە حیزبی ئێمە یەکەم رێکخراوە

که ئەم مەسەلەیەی بەو شێوەیە لە ئێراندا هێناوەتە گۆڕێ. دروستو نادروست بوونی نەزەرێکی تازە لە جەرەیانی خەباتدا دەردەکەوێ، دەکرێ پاشان ئیسلاح بکرێو کەمو زیاد بکرێو بە دەرس وەرگرتن لە تاقیکردنەوەی خەبات، نەزەرەکە دەوڵەمەندتر بکرێو وردتر فورمووڵە بکرێ. خودی "کورتەباس" لە دوو ساڵی رابردوودا کە باسی لە سەر کراوەو دەستی لێ دراوە، زۆر باشتر بووەو زۆر باریشی ئێستا باشتر روون کراوەتەوە. حیزبێکی دێموکرات کە بە شەرتێك شۆڕشگێڕ بێ، بە شەرتێك بەرنامەی سۆسیالیستیی هەبێ کە حیزبی ئێمە نیشانی داوە کە شۆڕشگێڕیشەو بەرنامەی سۆسیالیستیشی هەیە کە دەتوانێ بەرەو سۆسیالیزم بڕواو سۆسیالیزمیش دروست بکا. جاران ئەو فکرە هەبوو کە ئەگەر خودموختاریمان وەرگرتو پاشان بەرەو سۆسیالیزم رۆیشتین، ئایا دەبێ ناوی حیزبەکەمان بگۆڕینو ئەگەر بیگۆڕین، چ ناوێکی بۆ دابنێین. بەڵام ئێستا ئەو فکرە بە تەواوی لاچووە. هەر حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەتوانێ تا گەیشتن بە ئامانجی دوارۆژی کە سۆسیالیزمە، کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەڕێوە بەرێ. دەکرێ ناوەکەیشی هەر لە سەر خۆی بێو هیچ ناتەباییش لە بەینی ئەم ناوەو سۆسیالیزمدا بەرچاو ناکەوێ. بەتایبەت ئێستا کە دروستکردنی کۆمەڵی دێموکراتیکی سۆسیالیستی لەبەرنامەی حیزبدا هاتووە. ناوی حیزبەکەمان کە دێموکراتەو لەگەڵ سۆسیالیزمێك کە دەمانەوێ دایمەزرێنینو سۆسیالیزمی دێموکراتییە، تەبایی تەواوی هەیە.

لە "کورتەباس"دا کە حیزبی ئێمە سۆسیالیزمی هەڵبژاردووەو لەبەر ئەوە کۆمەڵێکە دادپەروەرانەتر لە کۆمەڵی سەرمایەداری، داهاتی نەتەوەیی لێرەدا عادڵانەتر دابەش دەکرێ. دووهەم ئەو کۆمەڵەو ئەوە بە تایبەتی بۆ ئێمە گرنگە "چونکە لە وڵاتێکی پاشکەوتوودا دەژین" خێراتر دەچێتە پێشێ، کۆسپی سیاسی، کۆمەڵایەتیو ئابووری لادەچنو هێزەکانی بەرهەمهێنان، دیارە ئادەمیزادیش ئەگەر ئازادیی هەبێ، رێگای پشکوتنی ئیستعدادو قابلییەتی ئاوەڵا دەبێ. لە وڵاتەکانی سۆسیالیستیش کە لە سەرەتادا ئازادی هەبوو، کۆمەڵانی خەڵك بە شوورو هەیەجانەوە کاریان دەکرد. جا ئەگەر ئەو ئازادییە دابین بێو خەڵك بە دایمیو بە دڵەوەو بە خۆشحاڵییەوە کار بکەن، سۆسیالیزم خێراتر دەچێتە پێشو کۆمەل زۆرتر دەتوانێ گیروگرفتە ئابووریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگییەکانی خۆی چارەسەر بکا.

تاقیکردنەوەی نزیکەی ٧٠ ساڵ مەوجوودییەتی سۆسیالیزم نیشانی داوە کە خـێرایی هەڵدانی ئابووری لـە سۆسـیالیزمدا، لـە سـەرمایەداری زیـاترە. نـاڵێین سۆسـیالیزم بوحرانی تێدا نیە، ناڵێین تەنگ‌و چەڵەمەی ئابووری نایەتە پێش، بەڵام لە سەر یـەك ڕێگای بۆ پێشەوە چوون خـۆش کـراوەو کۆمـەڵ خـۆی لـە چوارچێـوە تەنگانـەکانی ئابووریی سەرمایەداری دەرباز کردوە. ئابووریی سۆسیالیستی باشـتر هەڵدەسووڕێ، چونکە چەوساندنەوە نەماوە، چونکە سەرخانی سیاسی، واتە دەسـەڵاتی سـەرمایەکە کە کۆسپی پەرەئەستاندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان بوو لە نێو چوون‌و کۆمەڵ دەتوانێ نەخشە دابنێ‌و بەرنامە دابڕێژێ‌و لە رووی بەرنامەوە ئابووری بەڕێوە بەرێ. مەسەلەن وا دابنێین کە ئێستا دەوڵەتی ئەمریکا دەیەوێ نەخشەی ئابووری دابنێ‌و بەرنامەی بۆ دابڕێژێ. ئەگەر ئەو بەرنامە ئابووری‌یە لەگەڵ قازانجی مونوپۆلە گەورەکان مەسـەلەن یەکێکی وەك مونوپۆلەکانی نەوتی یا ئوتۆمبیل‌سازی‌دا ڕێك نەکـەوت، چـی بەسـەر دێ؟ دیارە ئەو مونوپۆلانە بەرنامەکە ڕەد دەکەنەوە. دەوڵەتیش ئامرازی ئەوتۆی بـە دەستەوە نیە ئەم بەرنامەیەی بـە سـەریاندا بسـەپێنێ. چونکـە ئـەمریکا وڵاتێکـی سەرمایەداری‌یەو سەرمایەو قازانجی سەرمایە ڕێزیـان هەیـە. قـانوون دەیانپـارێزێ، کەوابوو تەنانەت ئەگـەر دەوڵـەتی ئـەمریکا لـە ئەهرومـە ئابووری‌یـەکانیش کـەڵك وەربگرێ، ناتوانێ نەخشەیەکی ٥ ساڵە بۆ ئابووریی ئەمریکا دابنێ.

بە کورتی مەبەست ئەوەیە کە وەختێـك سـەرمایە زاڵ نـەبوو، ئیمکـانی دانـانی بەرنامەی گشتیی ئابووری پێك دێ. بۆیە ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەکی سادە لە بـاری ئابووری‌یەوە فەرقی ئەساسی لـە بـەینی وڵاتێکـی سۆسیالیسـتی‌و سـەرمایەداری‌دا دیاری بکەین، دەکرێ بڵێین هـەم لـە سۆسـیالیزم‌و هـەم لـە سـەرمایەداری‌دا پـلان‌و بەرنامە هەیەو لە هێندێ وڵاتی سەرمایەداری‌دا لە مێژە بەرنامەی ئـابووری دارِشـتن باوە، بە تایبەتی لەو وڵاتانەدا کـە سـەرمایەداریی دەوڵـەتی تێیـاندا بـەهێزە. وەك فەرانسە کە پێش هاتنە سـەرکاری حـیزبی سۆسیالیسـتیش هـەر پـلان‌و بەرنامـەی ئابووری هەبوو. تەنانەت خەتە گشتی‌یەکانی پلانێکی درێژخایەنیش دانرابـوو. بـەڵام پلان لە سەرمایەداری‌دا گشـتی نیـە، هـەموو بارەکـانی ژیـانی کۆمـەڵ، ئـابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و فەرهەنگی ناگرێتەوە. هەروەها کـە گوتـرا جێبـەجێ کردنـی پلانیـش دژوارە. چونکە ئەگەر لەگەڵ قازانجی سەرمایەداران ناتەبایی هەبوو، دەتوانن تەگەرەی

بخەنە پێش. هەروەها دەکرێ بڵێین هەم لە سۆسیالیزمداو هەم لە سەرمایەداریدا بازاڕیش هەیە، دیارە بازاڕی سۆسیالیستی مەحدوودترە چونکە ئامرازی بەرهەمهێنان لەم بازاڕەدا نافرۆشرێن، بەلاّم خەڵك زۆربەی شتومەکی مەسرەفیی خۆیان لە بازاڕ دەکڕن. کەوابوو لە سۆسیالیزمو لە سەرمایەداری، واتە لە هەر دوو سیستمەکاندا هەم پلان هەیەو هەم بازاڕ، بەلاّم یەکێك لە جیاوازییە بنەڕەتییەکانی نێو ئەو دوو سیستمە ئەوەیە کە لە ئابووریی سۆسیالیستیدا بازاڕ تابعی پلانە، لە کاتێکدا لە ئابووریی سەرمایەداریدا پلان تابعی بازاڕە. لە سۆسیالیزمدا عامیلی دیاریکەر هەر پلانە، لە سەرمایەداریدا بازاڕە. یانی لە سەرمایەداریدا لە ئەسڵدا میکانیزمی بازاڕە کە ئابوورییەکە تەنزیم دەکا. لە سۆسیالیزمدا ئەم ئەرکە لە سەر شانی پلانو بەرنامەیە. پلانیش دەکرێ ئەرکەکانی بە تەواوی لە ناوەندەوە دیاری بکرێن، یا بەشێك لەو ئەرکانە لە سەلاحییەتی خودی بنکە سەنعەتییەکاندا بن. مەسەلەی هەر گرنگ ئەوەیە کە ئایا دەکرێ، مەحدوودیەتی بازاڕ لە سۆسیالیزمدا هەڵبگیرێ، بۆ ئەوەی نەخشی زیاتر بێ، بێ ئەوە زەربە لە مالکییەتی سۆسیالیستیی ئامرازی بەرهەمهێنان بدا؟

ئەمە تاقیکردنەوەیەکی مێژوویییە کە دواڕۆژ ئاکامی نیشان دەدا. لە ئابووریی سۆسیالیستیدا دوو شێوە مالکییەتی سۆسیالیستی هەیە: مالکییەتی سۆسیالیستیی گشتیو مالکییەتی سۆسیالیستیی هەرەوەزی. بۆیەش دوو چین هەیە، چینی کرێکار کە پێوەندیی بە مالکییەتی گشتییەوە هەیە، وەك کارخانەکانو ساوخۆزەکانو چینی جووتیار کە پێوەندیی بە مالکییەتی هەرەوەزییەوە هەیە وەك کەڵخۆزەکان. بەرهەمی ئەم دوو شێوە مالکییەتە لە بازاردا پێکەوە ئاڵوگۆڕ دەکرێن. کەڵخۆزەکان بەرهەمی کشتوکاڵی دەبەن بۆ بازاڕو ماشینی کشتوکاڵیو ئامرازی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیو شتومەکی مەسرەفی کە بەرهەمی سەنعەتن دەکڕن. بەم جۆرە لە نێو کەڵخۆزەکانو کارخانەکاندا هێندێ ئامرازی بەرهەمهێنانیش لە ڕێگای بازاڕەوە ئاڵوگۆڕ دەکرێ. بەلاّم لە نێو بەشەکانی خودی مالکییەتی گشتیی سۆسیالیستیدا ئاڵوگۆڕی ئامرازی بەرهەمهێنان وەدی نایە. بۆیە دەڵێین کە لە بازاڕی ئابووریی سۆسیالیستیدا ئاڵوگۆڕی ئامرازی بەرهەمهێنان مەحدوودە.

دیارە لە ئابووریی سۆسیالیستی‌دا کرێکارو جووتیار هیچیان چەوسێنەر نین‌و هەردووکیان بە شێوەی بەرهەمهێنانی سۆسیالیستی‌یەوە بەستراونەتەوە، بۆیەش قازانجی هاوبەشیان هەیە کە بریتی‌یە لە پەرەئەستاندن‌و پێشکەوتنی ئابووریی سۆسیالیستی. بەلاّم چونکە بازاڕێکی ئەوتۆ هەیە کە باس کرا نەك هەر لە باری تیئۆری‌یەوە، بەڵکوو لە باری عەمەلیشەوە کرێکار کە نوێنەری مالکییەتی سۆسیالیستیی گشتی‌یەو جووتیار کە نوێنەری مالکییەتی هەرەوەزیی سۆسیالیستی‌یە، لە بازاڕدا وەك کڕیارو فرۆشیار تووشی یەکتر دەبن. لەو پێوەندی‌یەدا ناتەبایی لە نێو چینی کرێکارو چینی جووتیاریش‌دا هەیە. بێجگە لەو دوو شێوە مالکییەتە سۆسیالیستی‌یە، دوو شێوە مالکییەتی دیکە، تایبەتی‌و شەخسییش هەن. مالکییەتی تایبەتی کە مانای ئەوەیە فەرد خاوەنی بەرهەمهێنانی زۆر کەمە. مەسەلەن کەڵخۆزی‌یەکان لە دەورووبەری ماڵی خۆیاندا پارچە زەوی‌یەکیان هەیە کە سەوزی‌و میوەی تێ‌دا بۆ خۆیان بار دێنن‌و بەرهەمەکەی هی خۆیانەو دەتوانن بی‌فرۆشن. لە شارەکانیش‌دا رەنگە هێندێ دووکانی تایبەتی یا تەعمیرگای چکۆڵە هەبێ کە لە مالکییەتی تایبەتی‌دا بێ. بەلاّم لەسەر یەك هەرچی ئابووریی سۆسیالیستی زیاتر پەرەی ئەستاندبێ، ئەوەندە مالکییەتی تایبەتی مەحدوودترە. مالکییەتی شەخسی لە ئابووریی سۆسیالیستی‌دا مەحدوود ناکرێ. خێزانێکی چوار کەسی دەتوانن چوار ترۆمبێلیان هەبێ بە شەرتێك کە ترومبێلەکان بە مەبەستی شەخسی بەکار بێنن. نەیانکەن بە تاکسی یا باری‌یان پێ نەکێشن. هەر ئەندامێکی کۆمەڵی سۆسیالیستی بەرامبەر بە کاری خۆی کە لە باری چەندی‌و چۆنی‌و گرنگی‌یەوە کرێی دیاری دەکرێ، دراو وەردەگرێ. بەم دراوە لە بازاڕدا شتومەکی مەسرەفیی پێویست دەکڕێ. بەم جۆرە ئەگەر لە بازاڕی سۆسیالیستی‌دا ئامرازی بەرهەمهێنان مەحدوودە، بازاڕی شتومەکی مەسرەفی مەحدوود نیە. بۆیە ئەم بەشەی بازاڕی سۆسیالیستی وەك عاملێکی گرنگ تەئسیر دەکاتە سەر هەموو رەوڕەوەی ئابووریی سۆسیالیستی. بەلاّم هەر لەو کاتەش‌دا پەرەئەستاندنی بازاڕی سۆسیالیستی هەم پێشتر بەرنامەی بۆ دانراوەو هەم لە چوارچێوەی پلانی گشتیی ئابووری‌دا هەڵ دەسووڕێ. جێبەجێ کردنی بەرنامەی ئابووری لە لێکدانەوەی دوایی‌دا بە دەست کۆمەلاّنی خەڵك، کرێکاران، جووتیاران‌و رووناکبیرانەوەیەو هەرچی

کۆمەلانی خەلکیش ئازادییان زیاتربیو بەختیارتر بژین، پتر ئامادە دەبن بۆ پێشخستنی کۆمەلی سۆسیالیستی هەول بدەن. بۆیە ئێمە سۆسیالیزمان هەلبژاردوە، چونکە کۆمەلێکی عادلانەترە، خێراتر گەشە دەکاو ئادەمیزاد تێیدا بە ئازادیو بەختیاری دەژی. تاقیکردنەوەی ولاتانی سۆسیالیستی دەخەینە بەرچاو، دێینە سەر ئەو باوەڕە کە سۆسیالیزم لە باری پێکهێنانی ژێرخانی ئابووریو کۆمەلایەتییەوە زۆر چۆتە پێش. بەلام ئەگەر ئازادیی سیاسیشی تیدا بی، ئەوە ئەو کۆمەلەیە کە حیزبی دیموکرات خەباتی بۆ دەکا. لە سۆسیالیزمی مەوجووددا ستەمی چینایەتیو ستەمی نەتەوایەتی لە ئەساسدا لە نێو چووە. دەلێین لە ئەساسدا ستەمی نەتەوایەتی لەنێو چووە، چونکە لە هێندی ولاتانی فرە نەتەوەیی سۆسیالیستیدا گیروگرفت زۆرن، لە خودی یەکیەتیی سۆڤیەتییەوە بگرە تا مەسەلەن ڕۆمانی کە ئەقەلییەتی مەجاری تیدایە، جاری مەسەلەی نەتەوایەتی بە تەواوی چارەسەر نەکراوە. ڕەنگە تەنیا ئاکامی لەبارو باشی ڕووداوەکانی سالی ١٩٦٨ لە چێکۆسلوواکی ئەوە بووبی کە مەسەلەی نەتەوایەتی لەوی زۆر ئوسوولی چارەسەر کراوە.

پاش سالی ١٩٦٨ لە چێکۆسلوواکی فیدراسیۆن بە دوو حکوومەتەوە پێك هات، حکوومەتی بەشی چێكو حکوومەتی بەشی سلوواك. لە چێکۆسلوواکی هەردوو زمانی چێکیو سلوواکی ڕەسمیەتیان هەیەو هیچیان بەسەر هیچیاندا زال نین. تەنانەت دراوی ولاتەکەش "کورون" بە دوو زمان لە سەری نووسراوە. لە هەموو مەدرەسەو ئیدارەیەکی سەرانسەری چێکۆسلوواکیدا هەردوو زمان وەك یەك تەماشا دەکرێن. لە یوگۆسلاڤی کە ٦ کۆماری فیدرالی هەیە، بە شێوەیەکی ئوسوولی مەسەلەی نەتەوایەتی چارەسەر کراوە. دیارە هێندی گیروگرفت دێتە پێش، چونکە دەولەتی ئالبانی، ئالبانییەکانی یوگۆسلاڤی بۆ جیابوونەوە هان دەدا. بەلام چونکە هەموو نەتەوەکانی یوگۆسلاڤی مافی نەتەوایەتیی خۆیان وەرگرتووەو وەك یەکیش تەماشا دەکرێن، یەکیەتیی یوگۆسلاڤی هەر بەردەوامەو بە پێچەوانەی هێندی پێشبینی، پاش مردنی "تیتۆ" تێك نەچوو. پاش تیتۆ لە یوگۆسلاڤیدا شێوەیەکی زۆر تایبەتییان بۆ هەلسووڕانی کاروباری ولات دامەزراندوە. سەرۆك کۆماری بە نۆرەیەو نوێنەری هەرکام لە شەش کۆمار بە نۆرە دەبێتە سەرۆك کۆماری هەموو یوگۆسلاڤی. بۆ ئەم مەبەستە هەلبژاردن ناکری، چونکە ئەو کۆمارە کە ژمارەی

دانیشتووانی زیاترە، ئیمکانی پترە بۆ ئەوە نوێنەری ببێتە سەرکۆماری یوگۆسلاڤی. هەڵسووڕاندنی کاروباری وڵات، بەم شێوەیە بۆ وەك یەك بوونی نەتەوەکانی یوگۆسلاڤی زیاتر رێز دادەنێ‌و دێموکراتی‌ترە.

بەکورتی لە سەریەك، لە وڵاتانی سۆسیالیستی‌دا ستەمی نەتەوایەتی هەڵگیراوەو ستەمی چینایەتیش لە نێو چووە. دیارە هێندێ ئیمتیاز بۆ بەڕێوەبەران هەیە، بەڵام ئەوە ستەمی چینایەتی نیە. ئازادیی سیاسی لەو وڵاتانەدا دابین نەبووە. هەرچەند سۆسیالیزم دەبێ دێموکراسیی لەگەڵ بێ، دێموکراسی‌و سۆسیالیزم لێك جیا ناکرێنەوە. هێندێ لە وڵاتەکانی سۆسیالیستی خۆیان باسی پەرەپێدانی دێموکراسیی سۆسیالیستی دەکەن. ئەوە دوو مانای هەیە: یەکەم پێیان خۆشە دێموکراسی پەرەی پێ بدرێ‌و دووهەم مانای ئەوەیە کە دێموکراسیی سۆسیالیستی جاری بە تەواوی پەرەی پێ نەدراوە، واتە خۆیان هەست بەوە دەکەن کە دێموکراسی نیە یان مەحدوودە. بۆیە باسی دێموکراسی لە سۆسیالیزمدا کردن کارێکی رەوایەو بۆیەش ئیستلاحی سۆسیالیزمی دێموکراتیك دروست‌و بەجێیە.

وەڵامی پرسیاری سێهەم کە چۆنیەتیی پێوەندیی‌یەکانی ئێمە لەگەڵ وڵاتەکانی سۆسیالیستی دیاری دەکا، بە کورتی ئەوەیە: نە پەیرەویی بێ ئەملاو ئەولاو نە دژایەتی، بەڵکوو دۆستایەتی. دیارە ئەو بۆچوونە بەڕاستی نەتیجەی ساڵەها تاقیکردنەوەی حیزبەکەمانە. حیزبی دێموکرات پاش دەرس وەرگرتن لە تاقیکردنەوەی حیزبە کوردستانی‌یەکانی دیکەو دەرس وەرگرتن لە تاقیکردنەوەی حیزبەکانی دیکەی ئێران، هاتۆتە سەر ئەو بڕوایە کە ئەگەر کەسێکی دیکە لە باتی ئەو بڕیار بدا، ئەوەی بە سەر دێ کە بە سەر حیزبی توودەدا هات. دوژمنایەتی لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی هەڵەیە. چونکە ئەو وڵاتانە لە دوو بارەوە دۆستی حیزبی ئێمەن. هەم لەباری ستراتیژیکەوە چونکە وڵاتی سۆسیالیستن‌و ئێمەش سۆسیالیزمان دەوێ‌و بە ئاواتین کە هەتا رێبازی ئێمە لە وڵاتەکەماندا بە تەواوی سەردەکەوێ، دێموکراسیش لە وڵاتانی سۆسیالیستی‌دا پەرە بستێنێ. بۆیە لە دواڕۆژدا زیاتر لێی نزیك دەبینەوە.

بەڵام لە بارێکی دیکەشەو با لەبیرمان نەچێ کە دامەزرانی حیزبی دێموکرات لە ساڵی ١٣٢٤دا دەگەڕێتەوە سەر ئەو هەلومەرجەی کە بە هاتنی لەشکری سوور بۆ ئێران پێك هاتبوو. حیزبی ئێمە دۆستایەتی‌یەکی سوننەتی لەگەڵ یەکیەتیی

سۆڤیەتی‌دا هەیەو چونکە کوردستان دراوسێی یەکیەتیی سۆڤیەتی‌یە، لەباری ژێئۆپۆلیتیکیشەوە ئەم دۆستایەتی‌یە پێویستە. گومانی تێدا نیە کە سیاسەتی دۆستایەتی لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤیەتی رۆژێك لە سەرانسەری ئێراندا سەردەکەوێو زۆر رێکخراوی رەسەن‌و پێشکەوتووی دیکەش رێبازی ئەمڕۆی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەگرنە پێش. ئێمە ئامادەی دۆستایەتین، بەلاّم مێعیار بۆ ئێمە قازانجی حیزبەکەمان‌و گەلی کوردو گەلانی ئێرانە. هێندێ کەس پرسیار دەکەن‌و دەڵێن ئەگەر هات‌و ئەو قازانجە لەگەڵ دۆستایەتی لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤیەتی رێك نەکەوت، ئەو کاتە هەڵوێستمان چ دەبێ؟ دیارە ئێمە هەموو وەختێك مەبەستمان ئەوەیە کە ئەم دۆستایەتی‌یە لەگەڵ قازانجمان رێك کەوێ‌و هەوڵیشی بۆ دەدین. بەلاّم ئەگەر هات‌و لە نێو قازانجی گەلی کوردو دۆستایەتی لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤیەتی یا لەگەڵ هەر ولاّتێکی دیکەدا ناتەبایی پەیدا بوو، زۆر روونە، ئێمە قازانجی گەلی کورد هەڵدەبژێرین.

با بە سەراحەت بگوترێ کە ئێمە بە خاتری دۆستایەتی قەت واز لە سەربەخۆیی خۆمان‌و قازانجی میللەتەکەمان ناهێنین. بەلاّم لەبەر خاتری سەربەخۆیی‌و قازانجی میللەتەکەمان ئەگەر پێویست بوو، واز لە دۆستایەتی دەهێنین. کەوابوو مێعیار بۆ ئێمە قازانجی حیزب‌و گەلی کوردو گەلانی ئێران‌و سەربەخۆیی‌مانە. مێعیاری ئەساسی سەربەخۆیی بڕیاردانە. دۆستایەتی دەکەین، بەلاّم لەگەڵ پاراستنی سەربەخۆیی، ئەگەر پێویست بوو دۆستایەتی‌یەکە فیدای سەربەخۆیی دەکەین، بەلاّم هەرگیز سەربەخۆیی فیدای دۆستایەتی ناکەین. ئەو رابیتە ئورگانیکە کە باسم کرد، لە نێوان دیاریکردنی جەوهەری سۆسیالیزم‌و پاراستنی سەربەخۆیی حیزبەکەمان‌و ولاّتەکەماندا هەیە لێرەدا خۆی دەنوێنێ. ئێمە دەمانەوێ کۆمەڵی سۆسیالیستی خۆمان بە دەستێوەردانی ولاّتانی دیکە، تەنانەت باشترین دۆستیشمان بێ، دروست بکەین. نامانەوێ سۆسیالیزمێك دروست بکەین کە پێویستی بەوە هەبێ کە لەشکری ولاّتێکی دیکە بێ بی‌پارێزێ. سۆسیالیزم بە کۆمەلاّنی خەڵك دروست دەکرێ‌و بەوانیش دەپارێزرێ، نە بە لەشکری ولاّتێکی بێگانە. ولاّتێك کە ئەرتەشی بێگانەی تێدا جێگیر بوو، هەرچەندیش ئەم بێگانەیە دۆست بێ، سەربەخۆیی بڕیاردانی خۆی لەدەست دەدا. بۆ نموونە سەیری ئەفغانستان بکەین. دیارە ئێمە دژی سیاسەتی ئەو

بەناو موجاهیدە ئەفغانیانـەین کـە دەیانـەوێ لـە ئەفغانسـتان جمـهووری ئیسـلامی دابمەزرێنن. بەلاّم بە تاقیکردنەوەی خۆمان باش دەزانین کە ئەگـەر خـەلّك پشـتیوانی نەکا، پارتیزان ناتوانێ شەڕ بکا. ئێستا چەندین ساڵە موجاهیدەکـانی ئـەفغانی دژی دەوڵەتی مەرکەزیو لەشکری سۆڤیەتی شەڕ دەکەنو خەباتیشـیان هـەر بەردەوامـە. مانای ئەوەیە کە بەشێك لە کۆمەلاّنی خەلّك پشتیوانیانە. رەنگـە بگوتـرێ خـەلّکی پاشکەوتوو پشتیوانیانە، بەلاّم ئەوە ئەسڵی مەسەلەکە ناگۆڕێ. بەدبـەختی ئەوانـەی کە لە ئەفغانستان دەسەلاّتیان بە دەستەوەیە، ئەوەیـە کـە بـە پشـتیوانیی لەشـکری سۆڤیەتی دەبێ سۆسیالیزم دروست بکەن. ئەو سۆسیالیزمە نە سەرکەوتوو دەبـێ نـە دێموکراتی.

هەڵوێستی حیزبی دێموکرات بەرامبەر بە مارکسیزم باس کـرا. ئێمـە حـیزبێکی دێموکراتین، خاوەنی تاقە ئیدئۆلۆژییەك نین، ئـەندامانی حـیزبی ئێمـە ئیدئۆلۆژیـی جۆراوجۆریان هەیە، بەلاّم لە ژێر ئـالاّی حـیزبی دێموکـراتدا کـۆ بوونـەوە، چونکـە بەرنامەی سیاسیی ئەم حیزبەیان پەسند کردوە. بۆیە حیزبی ئێمە لە کێشەو ناکۆکیی ئیدئۆلۆژیکی گرووهە مارکسیتییەکاندا دەخالـەت ناکـا. بـەلاّم ئەگـەر مارکسـیزم زانستێکی کۆمەلاّیەتییە، تیئۆرییەکی زانستییە، ئایا گوناهـە حـیزبی دێموکـرات کەلّکی لـێ وەربگرێ؟ زانست لە پاوانی هیچ کەسدا نیە. ئەگەر حـیزبی دێموکـرات زانست تەتبیق بکا، تاوان نیە. لێرەدا تـەنیا شـێوەی کـەلّك وەرگرتـن لـە زانسـتو شێوەی تەتبیقی زانست لەگۆڕێ دایە. زانست دوگم نیە. زانستی کۆمەلاّیەتی پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵ بەرەوپێش دەچێو پەرە دەستێنێ. مەسەلە ئەوەیە کە ئەم زانسـتە بـە شێوەیەکی خەللاقو داهێنەرانـە تـەتبیق دەکـرێ. هـەر ئـەوەندە کـە نـەزەرێك لـە کتێبێکدا نووسرابێ بۆ ئەوە بـەس نیـە کـە پـێڕەویی لـێ بکـەین. کتێبەکـە هـی هەرکـەس بـێ فـەرق ناکـا. کتێبـەکانی مـارکسو لنینیـش جێـی موناقشـەن. بـۆ موسوڵمانێك ئایەی قۆرئان جێی موناقشە نیە. بـەلاّم تیئۆریـی کۆمەلاّیـەتی ئایـەی قورئان نیە، جێی موناقشەیە. ئەگەر تیئۆرییەك لە جەرەیانی تەتبیقدا دەرکەوت کە دروستە، پەسندی دەکەین. ئەگەر دەرکەوت کـە دروسـت نیـەو واقیعییـەت لەگـەڵ تیئۆری رێك ناکەوێ، ئەوکاتە مانای ئەوەیە کە تیئۆرییەکە نادروسـتەو دەبـێ وازی لـێ بێنین. لە تەتبیقی تیئۆریدا دەبێ هەلومەرجی زەمانیو مەکانی بەرچاو بخـەین.

مەسەلەن مارکس لە کتێبی "سەرمایە"دا باسی سەرمایەداری دەکاو لێکۆڵینەوەی مارکس لەم بارەوە بێوێنەیە. بەڵام مارکس باسی سەرمایەداری ١٥٠ ساڵ لەمەوبەر دەکا. ئێستا سەرمایەداری لە زۆر بارەوە گۆڕاوەو بێگومان ئەگەر خودی مارکس ئێستا لە سەر سەرمایەداریی نووسیبایە، بە شێوەیەکی دیکە دەینووسی. بۆیە زۆر شت لە کتێبی سەرمایەدا هاتوە کە لەگەڵ واقعییەتی ئەمڕۆ ڕێك ناکەوێ. لە پاشان هەروەها کە گوترا تیئۆری زانستی لە پاوانی هیچ کەسدا نیە، چونکە لاوازیە فەرانسەیی بووە، مانای ئەوە نیە ئەمڕۆ تەنیا فەرانسەیی مافی ئەوەیان هەیە لە سەر زانستی شیمی حەکەم بن، هەروەها چونکە داروین ئینگلیسی بووە، تەنیا ئینگلسی‌یەکان مافیان هەبێ لە سەر قانوونەکانی پەرەئەستاندنی تەبیعەتو ئادەمیزاد حەکەم بن.

تیئۆری زانستییش هەروایە، دیاردەیەکی جیهانی‌یە. هەموو کەس دەتوانێ پەرەی پێ بداو هەموو کەسیش دەتوانێ تەتبیقی بکاو کەسیش مافی ئەوەی نیە خۆی بکا بە حەکەم. مێعیاری راستی‌و دروستیی تیئۆری کتێب نیە، کردەوەو تاقیکردنەوەیە. تیئۆریی کۆمەڵایەتی لە جەرەیانی تەتبیقدا راستی‌و دروستی خۆی نیشان دەدا. راستە کە واقعییەت سەرچاوەی تیئۆری بووە، بەڵام چونکە واقعییەت هەمیشە لە گۆڕان دایەو هەلومەرجیش لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە فەرق دەکا، تیئوریش دەبێ بگۆڕێ. لە ئاخرەکەیدا مێعیار تیئۆری نیە، مێعیار پراتیكو واقعییەتە. ئەگەر تیئۆری‌یەك لەگەڵ واقعییەت ڕێك نەکەوت، واقیعییەتی رەق بە زۆر ناچێتە ناو چوارچێوەی تیئۆری‌یەوە. هۆی سەرنەکەوتنی بەشێکی زۆر لە ڕێکخراوەکانی چەپ لە ئێراندا هەر ئەوەیە کە هەوڵیان داوە واقعییەت بخەنە نێو چوارچێوەی تیئۆریی کتێبی خۆیانەوە. "سازمان چریکهای فدایی خلق" ڕێکخراوێك بوو کە پاش شۆڕشی ئێران دەی‌توانی نەخشێکی گەورە لە مەیدانی سیاسەتی وڵاتدا بەعۆدە بگرێ، بەڵام هەمووان دەزانن چۆن لەت لەت بووو چی بەسەر هات. لە نووسراوەیەکی نێوخۆیی کۆمەڵەدا هاتوە کە کاتێك کادرێکی کۆمەڵە دەچێت لە مزگەوتی گوندێك بۆ خەڵك قسە دەکا، هەرچەند خوێندەواری زۆرە، بەڵام خەڵك لە قسەکانی حاڵی نابن. لە کاتێکدا کادری حیزبی دێموکرات کە قسە بۆ خەڵك دەکا، خوێندەواریشی کەم بێ، خەڵك لێی حاڵی دەبن. هۆیەکەی زۆر سادەیە، کادری

کۆمەڵە لە چوارچێوەی تیئوریی کتێبی خۆیدا قسە دەکا کە دوورە لە واقعییەت، کادری حیزبی دێموکراتیش بە زمانی خەڵکی لە سەر گیروگرفتەکانی ژیانو خەباتی خەڵك قسە دەکا کە لە دڵی خەڵك نزیکن. کادری کۆمەڵە باسی ئیکونومیزمو پوپولیزمو ئاکسۆنیزمی دەکا. کادری حیزبی دێموکراتیش باسی ئازادیو خودموختاری دەکا. بۆیە زۆر تەبیعی‌یە کە کۆمەلانی خەڵك لە قسەی کادری حیزبی دێموکرات باشتر حاڵی بن.

مەسەلەیەکی دیکە کە لێرەدا باس کراوە دەبێ ئەهەمییەتێکی زیاتری پێ بدرێ، مەسەلەی سۆسیال دێموکراسی‌یە. هەروەها کە لە "کورتەباس"دا هاتوە بە نەزەری ئێمە سۆسیال دێموکراسی وەزیفەی ئەوەیە کە سەرمایەداری ئیدارە بکاو سەرمایەداری بپارێزێ. لە کاتێکدا حیزبی دێموکرات لەو بڕوایە دایە کە دەبێ سەرمایەداری لە نێو بچێ. کەوابوو زۆر مەنتقی‌یە کە حیزبی دێموکرات ڕێگای سۆسیال دێموکراسی نەگرێتە پێش. بەلاّم ئەگەر لەگەڵ ئەوەدا هێندێ کەس کە پێیان وایە زانستی کۆمەڵایەتی بە ناوی ئەوان تاپۆ کراوە، هەر هاوار دەکەن کە سۆسیالیزمی دێموکراتیو سۆسیال دێموکراسی یەکن، دیارە گاڵتە بە خۆیان دەکەنو کەسیش بە جیددییان ناگرێ. با ئەوەش بڵێین کە حیزبە سۆسیال دێموکراتەکان تا شەڕی دووهەمی جیهانی بە حیزبی شۆڕشگێڕ لە قەڵەم دەدران. بەلاّم ئەنتێرناسیۆناڵی دووهەم کە لەم حیزبانە پێك هاتبوو، لە زەمانی شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا (١٩١٨ ـ ١٩١٤) بە سەرۆکایەتیی کائۆتسکی بەرەو ریفورمیزم رۆیشتو زۆربەی حیزبە سۆسیال دێموکراتەکان لە پەرلەماندا دەنگیان دا بە بوودجەی شەڕی ولاّتەکانی خۆیانو پشتیوانییان لە بورژەوازیی ولاّتی خۆیان کرد. لە باتی ئەوە دیفاع لە پرۆلێتاریای جیهانی بکەن، تووشی ناسیۆنالێزم بوونو کۆمەلانی خەڵکی زەحمەتکێشیان هان دەدا دژی یەکتر شەڕ بکەن. حیزبی سۆسیال دێموکراتی رووسیەو چەند حیزبێکی دیکە وەك حیزبی سۆسیال دێموکراتی ئیتالیا ئامادە نەبوون دیفاع لە سیاسەتی شەڕخوازانەی بورژوازیی ولاّتی خۆیان بکەنو لەو بڕوایەدا بوون کە پرۆلێتاریای هەر ولاّتێك دەبێ دژی بورژوازیی خۆی شەڕ بکا. شەڕ بگۆڕێ بە شۆڕش دژی دەسەلاّتی بورژوازیی خۆماڵی. کەوابوو سۆسیال دێموکراسی پێش شەڕی یەکەمی جیهانیو پاش ئەو شەڕە فەرقیان هەیە.

سۆسیال دێموکراسی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی لەگەڵ زەمانی شەڕی دووهەمی جیهانییش فەرقی هەیە. ئەو راستی‌یە دەبێ بگوترێ کە لە شەڕی دووهەمی جیهانی‌دا زۆربەی حیزبە سۆسیال دێموکراتەکان بەرامبەر بە فاشیزم راوەستان‌و لە بەرگریی ولاتی خۆیان‌دا بەشدارییان کرد. بەلاّم ئێستا دیسانەکە سۆسیال دێموکراسی هەر رێبازی ریفۆرمیزم دەڕوا. سۆسیال دێموکراسی دیەوێ سەرمایەداری ئیسلاّح بکا، حیزبی ئێمە دیەوێ سەرمایەداری لە نێو بەرێ. سۆسیال دێموکراسی دەیەوێ هەر لە چوارچێوەی سیستمی سەرمایەداری‌دا وەزعی زەحمەتکێشان باشتر بکا، حیزبی ئێمە وەك حیزبێکی شۆڕشگێڕ پێی وایە بۆ گەیشتن بە ئامانجی دوارۆژی دەبێ ئەو چوارچێوەیە تێك بدەین، دەبێ سەرمایەداری وەك سیستم لە نێو بەرین. حیزبی دێموکرات لە بارێکی دیکەشەوە شۆڕشگێڕە، ئەویش بەڕێوەبردنی خەباتی چەکدارانەیە، سۆسیال دێموکراسی تەنیا لایەنگری خەبات لە رێگای ئاشتی‌یەوەیە. کەوابوو حیزبی ئێمە لە زۆر مەسەلەی ئەساسی‌دا بیروڕای لە سۆسیال دێموکراسی جیاوازە، بەلاّم چونکە سۆسیالیزمی مەوجوود ژێرخانی ئابووری‌و کۆمەلاّیەتیی سۆسیالیستی پێك هێناوە، لە ئامانجی ئێمە نزیکترە. جیاوازی ئێمە لەگەڵ سۆسیالیزمی مەوجوود لە سەر دێموکراسی‌یە. با لە سەر یەك مەسەلە وردتر بین. سۆسیال دێموکراسی هەر ئیسلاّحات دەکا، هەرچی ئیسلاّحاتیش بکا، ئامانجی دوارۆژمان نابێتە یەك‌و ناگەینە یەك. ئەو وەختە دەگەینە یەك کە چوارچێوەی سەرمایەداری تێك بدا کە ئەوە ئامانجی سۆسیال دێموکراسیی ئێستا نیە. بەڕێوەبەری حیزبی سۆسیالیستی ئیسپانیا فیلیپ گۆنزالێس بە سەراحەت دەڵێ کە لە هەلومەرجی ئێستادا سەرمایەداری باشترین سیستمە. ئێمە لە مەسەلەی دێموکراسی‌دا لە حیزبە سۆسیال دێموکراتەکان نزیکین. مەسەلەن لە سوئێد ئازادیی سیاسی زۆرە، بۆیەش هاوکاریی سیاسی لە نێو حیزبی ئێمەو حیزبە سۆسیال دێموکراتەکان لە مەیدانی جیهانی‌دا ئیمکانی هەیە. بەلاّم ئەگەر بمانەوێ لەگەڵ ئەو حیزبانەدا بە تەواوی ببینە یەك خەت، ئەوان دەبێ بێنە سەر ئەوە کە بۆ تێکدانی چوارچێوەی رێژیمی سەرمایەداری هەوڵ بدەن. بەمجۆرە لە کورتخایەن‌داو لە باری دێموکراسی‌یەوە لە حیزبە سۆسیال دێموکراتەکان نزیکترین، بەلاّم لە درێژخایەن‌داو لە باری ستراتیژیکەوە لە ولاتەکانی سۆسیالیستی نزیکترین. چونکە کافی‌یە لەم

ولآتانەدا گۆڕانی ئەوتۆ وەك لە ساڵی ١٩٦٨ لە چیكۆسلوواكیدا هاتە دی، پێك بێ كە سۆسیالیزم هەر لە جێگای خۆی بوو، زەرەبە لە پێوەندییەكانی سۆسیالیستی نەدرابوو، بەڵكوو ئەم پێوەندییانە قایمتریش ببوون، بەلآم دێموكراسی پەرەی گرتبووو ئیمكانی جێگربوونی سۆسیالیزمی دێموكراتی پێك هاتبوو، بۆیە لە دوارۆژدا گۆڕانێكی ئەوتۆ رێگا خۆش دەكا بۆ ئەوە لەگەڵ ئەم ولآتانە ئامانجمان ببێتە یەكو بگەینە یەك. بەتایبەتی كە ئەم چەشنە گۆڕانە لە سۆسیالیزمی مەوجووددا پێویستی بە شۆڕش نیە، پێویستی بە گۆڕانی پێوەندییەكانی ئابووریو كۆمەلآیەتی نیە.

بە جێیە بە مەسەلەیەكی دیكەش ئیشارە بكرێ كە بێگومان لە دابینكردنی دێموكراسی لە ولآتەكانی سۆسیالیستیدا تەئسیرێكی زۆری دەبێ. ئەویش مەسەلەی پەرە ئەستاندنی تیكنۆلۆژیی پێشكەوتوویە. لە نێو هێزەكانی بەرهەمهێناندا كە بریتییە لە ئامرازی بەرهەمهێنانو ئادەمیزادو تاقیكردنەوەی، ئامرازی بەرهەمهێنان لە هەموان خێراتر دەچێتە پێش، لە هەموان شۆڕشگێڕترە. نیزامە ئابوورییەكانی مێژوویی لە رووی بە كارهێنانی ئامرازیانەوە وردترو باشتر دەناسرێن. واتە ئەوە بۆ نیشاندانی رادەی نیزام گرنك نیە كە چی بەرهەم دێنێ، بەڵكو چۆن بەرهەم دێنێ. ئاردی گەنم هەر ئەو ئاردەیە كە سەدانو رەنگە هەزاران ساڵە ئادەمیزاد نانی لێ دروست دەكا. بەلآم ئەگەر ئەو ئاردە بەرهەمی دەستاڕی دەستی بێ نیشانەی نیزامێكەو ئەگەر بەرهەمی ئاشی كارەبایی (بەرقی) بێ، نیشانەی نیزامێكی دیكەیە. تێكنۆلۆژی كە بەشی ئەساسیی ئامرازی بەهەمهێنانە، هەرگیز لە مێژووی ئادەمیزاددا بە خێرایی چەند دەساڵی دوایی نەچۆتە پێش. ولآتەكانی سۆسیالیستیش لەو پێشكەوتنەدا بەشدارن. لەوانیشدا تێكنۆلۆژی بە خێرایی بەرەوپێش دەڕوا كە ئاكامی پێكهێنانی گۆڕان لە گشت هێزەكانی بەرهەمهێنان دایە كە ئادەمیزادو تاقیكردنەوەشی دەگرێتەوە كە خۆی ئەم گۆڕانە لە رێگای پێوەندییەكانی ئابووریو كۆمەلآیەتییەوە دەبێتە هۆی گۆڕانی سەرخان یان رووبەنا. ئاكامی پێشكەوتنی تێكنۆلۆژی ئاخرەكەی ئۆتوماتیكیكردنی بەرهەمهێنانە. ئێستا لە ئەمریكاو لە یەكیەتیی سۆڤیەتیو لە هێندێ لە ولآتەكانی سەرمایەداری وەك فەرانسە، ژاپۆنو ئالمانی رۆژئاوا ئۆتوماتیزەكردن خێرا بەرەوپێش دەڕوا. مەسەلەن كارخانەیەك كە بیست ساڵ لەمەوبەر پێنج هەزار كرێكاری هەبوو، ئێستا پەنجا نەفەر

ئیدارەی دەکا کە هیچیان کرێکاری سادە نین، بەڵکوو هەموویان پسپۆڕو موهەندیسن. ئێستا ئیدی لە ئەمریکا کارخانەی ئۆتوماتیکی وا هەیە کە کارخانەی ئۆتوماتیکی بەرهەم دێنێ. کەڵك وەرگرتن لە دەسکەوتەکانی زانست، پەرە ئەستاندنی بێوێنەی هەڵسووڕاندنی کاروبار بە کامپیوتێر لە هەموو بەشەکانی ژیاندا، شۆڕشێکی تێکنۆلۆژیی لە بەرهەمهێناندا پێك هێناوە کە لە مێژووی رابردووی کۆمەڵی ئادەمیزاددا وێنەی نیە. ئەوە کە لە جێگای ٥ هەزار نەفەر ٥٠ نەفەر کار دەکا، بەرە بەرە تەرکیبی چینی کرێکار دەگۆڕێ. یەکەم، هەروەها کە گوترا ئەم کرێکارانە کە بە کامپیوتێر کارخانەیەکی ئۆتوماتیکی بەڕێوە دەبەن، ئیدی کرێکاری جاران نین، بەڵکوو پسپۆڕو موهەندیسن. کەیفییەتییان گۆڕاوە. لە باری چەندی واتە کەمییەتیشەوە ئەوە گۆڕانێکی گەورەیە کە ٥٠ نەفەر کاری ٥ هەزار نەفەر دەکا. ئەگەر یەکێك لە هۆیەکانی شۆڕشگێڕبوونی چینی کرێکار ئەوە بوو کە ژمارەیەکی زۆر لە کارخانە، واتە لە یەك جێگا کۆ بوونەوە، ئێستا ئەم هۆیە بەرە بەرە لە نێو دەچێ. جا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: ئایا کرێکارێکی پسپۆڕ یا موهەندیسێك کە لە کارخانەیەکی ئۆتوماتیکیدا کاری بە کامپیوتێرەو وەزعی ژیانیشی باشە، هەر ئەو کرێکارەیە کە تفەنگی هەڵگرتو لە ساڵی ١٩١٧دا هێرشی بردە سەر کۆشکی زستانی لە پترۆگراد؟ ئایا چاوەڕوان دەکرێ سەعات سازەکانی سویس ڕاپەڕینی چەکدارانە بکەن؟ دیارە پرۆسەی ئۆتوماتیزەکردن لە یەکیەتیی سۆڤیەتیو وڵاتەکانی سۆسیالیستیدا بە قەد ئەمریکا خێرا ناچێتە پێش. بەڵام لەوێش بەرە بەرە تەرکیبی چینی کرێکار دەگۆڕێو تێکنۆلۆژیی تازە کرێکاری ئەوتۆ لە وڵاتەکانی سۆسیالیستیدا پەروەردە دەکا کە شێوەی فکرکردنەوەی لەگەڵ کرێکاری زەمانی شۆڕشی ئوکتۆبر فەرقێکی زۆری هەیە. لێرەشدا تێکنۆلۆژی کە شۆڕشگێڕترین بەشی ئامرازی بەهەمهێنانە، دەبێتە هۆی گۆڕانی هەموو هێزەکانی بەرهەمهێنانو سەرخانی کۆمەڵیش. بۆیە پێشکەوتنی تێکنۆلۆژی جەوهەری لێك نزیكبوونەوەی ئابووریی سەرمایەداریو سۆسیالیستیی تێدایە. بۆیەش لە تیئۆریی ئابووریدا ئێستاش زۆر جار باسی "کۆنۆێرژانس" (همگرایی) دەکرێ کە دەتوانین بە کوردی پێی بڵێین بەرەو یەکتر رۆیشتن. ئێمە تیئۆری کۆنۆێرژانس بە موتڵەقی قبووڵ ناکەین. ئەو کۆمەڵەی کە لە دواڕۆژدا پێك دێ لەباری تێکنۆلۆژییەوە نەتیجەی

پێشکەوتنی سۆسیالیزمو سەرمایەدارییەو ئەگەر واقیعبین بین، زیاتر هی سەرمایەدارییە تا سۆسیالیزم. بەلاّم پێوەندییەکانی بەرهەمهێنانی ئەو کۆمەلّە دەبێ سۆسیالیستی بن، چونکە خودی تێکنۆلۆژی کۆمەل بەرەو ئەوە دەبا. ناکرێ کارخانەکان ببن بە ئۆتوماتیکی، بە کامپیۆتێر کاریان تێدا بکرێ، بەلاّم هەر لەو کاتەشدا چەوساندنەوە بمێنێتەوە. کەوابوو ئێمە دەست لە تیئۆریی کۆنۆێرژانسی وەر دەدەین، یانی ئەوەندەی لێ زیاد دەکەین کە پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە هەموو بەرەو یەکتر رۆیشتنیشدا دەبنە پێوەندیی سۆسیالیستی. پێوەندییەکانی سۆسیالیستیو سیستمی بوروکراتیکی سۆسیالیزمی مەوجوود یەك نین، ئەم سیستمە کۆسپێکە لە سەر پێشکەوتنی تێکنۆلۆژی، لە کاتێكدا پێوەندییەکانی سۆسیالیستی رێگا بۆ تێکنۆلۆژی خۆش دەکەن. هۆی پاشکەوتنی تێکنۆلۆژی لە سەنعەتو کشتوکاڵی سۆڤیەتیدا پێوەندییەکانی سۆسیالیستی نین، بەلّکوو ئەو سیستمە بوروکراتیكو غەیرە دێموکراتییەیە کە لە یەکیەتیی سۆڤیەتیدا زالّە. تەنیا لێکۆلّینەوە لە سەر ولاّتانی سۆسیالیستی کافی نیە، دەبێ لە کۆمەلّی ولاّتێکی وەك ئەمریکاش کە پێشکەوتووترین ولاّتی سەرمایەدارییە، بکۆلّینەوە.

ئەگەر بە پێی تیئۆریی کلاسیك کۆمەڵ بەرەوپێش چووبا، دەبوو لە مێژبا شۆڕشی سۆسیالیستی لە ئەمریکا سەرکەوتبا. چینی کرێکاری بەهێزو رێکخراو لە سەندیکاکاندا هەیە، بەلاّم داخوازەکانی چینی کرێکار لە چوارچێوەی رێژیمی سەرمایەداری دەرناچن. دەکرێ بلّێین کە سەندیکاکان ریفورمیستن، شۆڕشگێڕ نین. بەلاّم بۆچی سالّەهای سالّە نەبوون بە شۆڕشگێڕو بۆچی ئەو تاقمە چکۆلاّنە کە بەرنامەی شۆڕشگێڕانەیان هەیە، هەروا چکۆلّە ماونەتەوە؟ ئایا هۆی ئەم وەزعە ئەوە نیە کە سەرمایەداری نیشان دەدا کە هێشتا زەخیرەی هەیەو دەتوانێ بژیو پەرە پستێنێو سەرەمەرگی دوورەو چینی کرێکاریش بەگشتی لە چوارچێوەی رێژیمی سەرمایەداریی ئەمریکادا هەست بە رەزامەندی دەکا؟ بەمجۆرە دەر دەکەوێ کە تەتبیقی تیئۆریی وشكو دوگم بەسەر کۆمەلّی سەرمایەداریی ئەمڕۆدا، تیئۆرییەك کە لە سەر سەرمایەداریی ١٥٠ ساڵ یا تەنانەت ٧٠ سال لەمەوبەر گوتراوە، هەلّەیەو کۆمەلّی سەرمایەداریی ئێستا پێداویستیی بە لێکۆلّینەوەی تازە هەیە. بە کورتی دەردەکەوێ کە لە بەر هێندێ هۆو بە تایبەتی دەستتێوەردانی دەولّەت لە

ئابووریی وڵاتدا، بوحرانی ئابووریی وەك هی ساڵەکانی ١٩٣٣ ـ ١٩٢٩ ئێستا لە وڵاتی سەرمایەداریدا بەرچاو ناکەوێ. لە زۆربەی وڵاتەکانی سەرمایەداریدا دەوڵەت ئەوەندە دەخاڵەت لە ئابووریدا دەکاو ئەوەندە تێدەکۆشێ پەرەئەستاندنی ئابووری رێکوپێكو مەوزوون بکا کە لەگەڵ ئەوەی ئەم پەرەئەستاندنە زیگزاگی زۆرە، گیروگرفتی هەیە بەڵام سەرمایەداری توانیویەتی هەتا ئێستا خۆی لە بوحرانی ئابووریی گەورە بپارێزێو ئەم گیروگرفتانە بێ تەقینەوەی کۆمەڵایەتی چارەسەر بکا. هەرچەند ئەوەش راستییەکی حاشا لێ نەکراوە کە زۆر جار سەرمایەداری ئەم گیروگرفتانەی بە زیانی زەحمەتکێشانو لە سەر حیسابی زەحمەتکێشان چارەسەر کردوە.

مەسەلەیەکی دیکە کە زۆر باسی لە سەر دەکرێ مەسەلەی ئولگوو یا نموونەیە. لەم مەسەلەیەشدا ئێمە دەبێ بۆچوونێکی خەلاقمان هەبێ، ئەویش ئەوەیە کە زۆر پێویستە بە بێ بەرچاوتەنگی لە هەموو تاقیکردنەوەیەکی مێژوویی شۆڕشی سۆسیالیستی یا دروستکردنی سۆسیالیزم لە وڵاتەکانی دیکەدا کەڵك وەرگرینو لەم بارەشەوە تەعەسوبمان نەبێ. کەواتە ئەگەر ئێمە لە تاقیکردنەوەی یەکیەتیی سۆڤیەتی، چین، یوگۆسلاڤی، ویتنامو زۆر وڵاتی دیکە دەرس وەرگرین، کارێکی باش دەکەین. هەربۆیەش ناسینی هەموو ئەو وڵاتانە کە سۆسیالیزمیان دروست کردوە، زۆر پێویستە. لەم تاقیکردنەوە کەڵك وەرگرتن، دوو باری هەیە: یەکەم ئەوەیە ئەو کارانە بکەین کە لەو وڵاتانەدا سەرکەوتوو بوون. دووهەم ئەوەیە ئەو کارانە نەکەین کە تێیدا سەرکەوتوو نەبوونو زیانیان هەبووە. بەڵام گرنگ ئەوەیە هیچ کام لەو وڵاتانە کە ئێمە بە سۆسیالیستیان دەزانین، بە ئولگوو دانەنێین. چ یەکیەتیی سۆڤیەتی بێو چ چینو یوگۆسلاڤیو ویتنام بێ یا هەر وڵاتێکی دیکە بێ کە لەمەودوا بەرەو سۆسیالیزم دەڕوا. پێویستە ئوسوولەن خۆمان لە ئولگووسازی بپارێزین. پاش شەڕی دووهەمی جیهانی کە وڵاتەکانی ئۆرووپای رۆژهەڵات دەستیان کرد بە دروستکردنی سۆسیالیزم، یەکێك لە شوعارەکانی هەرە گرنگی تەواوی ئەو وڵاتانە کە لە جێگای هەرە بەرچاو دەنووسرا، ئەوە بوو: "یەکیەتیی سۆڤیەتی بۆ ئێمە نموونەیە". لە باری نەخشەکێشانو بەرنامە داڕشتنەوە یەکیەتیی سۆڤیەتی تەجروبەیەکی زۆری دەست کەوتبوو و بەڕاستی پێویست بوو کە کەڵکی لێ

وەربگیرێ. بەلاّم هەر لەو کاتەدا یەکیەتیی سۆڤیەتی لە بەر هەلومەرجی تایبەتیی خۆی هاتبوو هەموو نەوعە سەنعەتێکی قورسی دامەزراندبوو. ولاّتێك کە ژمارەی دانیشتووانی نزیکەی دووسەد میلیۆن بوو، سەرچاوەی ژێر زەوی وەك نەوت‌و خەلّووزی بەردی هەبوو، دیارە لە وزەی‌دا بوو کە بناخەی هەموو ئەو سەنعەتە قورسانە دابنێ. بەلاّم ئایا ئەم کارە بۆ مەجارستانێکی ٩ میلیۆنیش دروست بوو کە نە سەرچاوەی ژێر زەویی هەبوو و نە ئیمکانی ماددی‌و بەشەری؟ بە داخەوە لە رووی ئولگووسازی‌یەوە ئەم کارە کراو مەجارستان دوو سێ پرۆژەی ئەوتۆی دەست پێ کرد کە زۆربەی زۆری سەرچاوە ماددی‌و بەشەری‌یەکەی قووت داو بەرهەمی کەرەستەی مەسرەفی هاتە خوارێ‌و لە نەتیجەدا وەزعی ئابووریی ولاّتەکە تێك چوو کە ئەمە لە سالّی ١٩٥٦دا یەکێك لە هۆیەکانی تێکچوونی وەزعی مەجارستان بوو کە ئاکامی زۆر ناخۆش‌و خوێناویی هەبوو. تەنانەت ئەگەر چینیش کە ولاّتێکی گەورەیە یەکیەتیی سۆڤیەتی بکا بە ئولگوو، هەر سەرکەوتوو نابێ. لە کاتێك‌دا کە چین بە میلیارد دانیشتووی هەیە، کەلّك وەرگرتن لە هێزی بەشەری لەوێ‌دا جێگایەکی تایبەتیی هەیە. یەکیەتیی سۆڤیەتی ولاّتێکی پانوبەرینە، سیبری هەیە کە دانیشتووی زۆر کەمە. ئەگەر چین لە پێشخستنی ئابووریی خۆی‌دا بایەخ دەدا بە هێزی بەشەری، یەکیەتیی سۆڤیەتی دەبێ زیاتر بایەخ بە تێکنۆلۆژی بدا. باسی فەرانسە زۆر دەکرێ، چونکە لە "کورتەباس"دا ئیشارەی پێ کراوە. کەس نەی‌گوتوە ئێمە فەرانسە بە ئولگوو دابنێین، لە هیچ بارێکەوە فەرانسە وەك ولاّتی ئێمە ناچێ. فەرانسە ولاّتێکی پێشکەوتووی سەنعەتی‌یە، سوننەتێکی مێژوویی دێموکراتیی هەیە، نزیك بە ٢٠٠ سالّ لەمەوبەر شۆڕشی تێ‌دا کراوە. ئێمە گوتمان ئەگەر سۆسیالیزم لە فەرانسەدا سەرکەوت، دەبێتە تاقیکردنەوەیەکی باش لە باری تەتبیقی دێموکراسی‌یەوە. تەنیا لەم بارەوە دەتوانین لە فەرانسە دەرس وەرگرین، دەنا فەرانسەش وەك ولاّتانی دیکە بۆ ئێمە نابێتە ئولگوو، بۆیە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی تایبەتیی هەر ولاّتێك‌و رەدکردنەوەی هەموو ئولگوویەك لە دروستکردنی بناخەی کۆمەلّی سۆسیالیستی‌دا زۆر گرنگە.

لە سەر شۆڕشی ئوکتۆبریش زۆر قسە دەکرێ. لێرەدا نامانەوێ باسی مێژووی شۆڕشی ئوکتۆبر بکەین، لەم بارەیەوە زۆر شت نووسراوەو دەکرێ کەلّکیان لێ

وەربگیرێ، بەڵام هێندێ شتی تایبەتی هەیە کە کەمتر لە کتێبەکانی تاریخدا نووسراون کە بەجێیە ئیشارەیان پێ بکرێ. یەکەم ئەوەیە کە شۆڕشی ئوکتۆبر هەروەها کە لە "کورتەباس"دا هاتوە، لە سەرەتادا شۆڕشێکی زۆر کەم خوێناوی بوو و خەسارەتی گیانیی یەکجار زۆر کەم بوو. لە هێرش بۆ سەر کۆشکی زستانیدا چەندسەد نەفەر زیاتر نەکوژران. ئەوە بارێکی تایبەتیی شۆڕشی ئوکتۆبرە کە زۆر کەس لە بیری دەچێ، لە حاڵێکدا لە چین تا شۆڕش سەرکەوت، چەند میلیون کەس قوربانی درا. لە ویتنام ٣٠ ساڵ شەڕ کراو شۆڕشەکە زۆر خوێناوی بوو. حیزبی بولشویك لە کۆنگرەی شەشەمی خۆی، واتە لە یەکەم کۆنگرەی پاش سەرکەوتنی شۆڕشی مانگی فێوریەو پێش شۆڕشی ئوکتۆبردا ١٧٥ هەزار ئەندامی هەبووە. ئەو وەختە یەکیەتیی سۆڤیەتی ١٤٠ میلیون دانیشتووی هەبوو. یانی حیزبی بولشویك لە نێوخۆی وڵاتدا حیزبێك بوو کە کەمایەتیی خەڵکی لەگەڵ بوو. با نەتیجەی هەڵبژاردنی مەجلیسی موئەسسان بخەینە بەرچاو. حیزبی بولشویك بۆ خۆی قەولی دابوو کە مەجلیسی موئەسسان پێك بێنێ. لە ٢٥ی نوامبری ساڵی ١٩١٧دا، یانی هەژدە رۆژ پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئوکتۆبر کە حیزبی بولشویك دەسەڵاتی سیاسیی بە دەستەوە گرت، هەڵبژاردنی مەجلیسی موئەسسان ساز بوو کە ٣٦ میلیون نەفەری تێدا بەشدار بوو. حیزبی بولشویك ٩ میلیون دەنگی هەبوو، یانی ٢٥٪ی هەموو دەنگەکان. بەڵام لەوە گرنگتر ئێس ئێرەکان (سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان) ٢٠ میلیون زیاتر دەنگیان هێنا، یانی ٦٨٪ی دەنگەکان. ئەوەش بارێکی تایبەتیی گرنگی شۆڕشی ئوکتۆبرە. ئەم شۆڕشە سەرکەوتبوو و حیزبی بولشویك دەسەڵاتی بە دەستەوە گرتبوو و حاکمییەتی بە دەستەوە بوو، بەڵام ئەکسەری خەڵکەکە بە تایبەت جووتیاران پشتیوانیان لە ئێس ئێرەکان دەکرد. بەرامبەر بەو حیزبی بولشویك زیاتر لە ٤٠٪ی دەنگی لە شارە کرێکاریەکان هێنابوو و لە نێو سەربازەکانیشدا نفووزی زۆر بوو تا ٦٠٪ی دەنگەکانی دەست کەوتبوو. بەڵام بەگشتی ئێس ئێرەکان لە دوو هێندی بولشویکەکان زیاتر دەنگیان هێنابوو.

مەسەلەیەکی زۆر موهیم لە پێش شۆڕشی ئوکتۆبردا مەسەلەی ئاشتی بوو. شەڕ وەزعێکی وای پێك هێنابوو کە بەڕاستی تێزاریزم هێزی خۆی لە دەست دابوو. سەربازانی رێژیمی تێزاری شەڕیان نەدەکردو لەوەش زیاتر لە ژێر تەئسیری تەبلیغاتی

بولشویکەکانو شۆڕشگێڕانی ئاڵمانیدا لەگەڵ سەربازانی ئاڵمانی پێکەوە دەبوون بە دۆست. وەزعێکی وا پێك هاتبوو کە تێزاریزم بەڕاستی قودرەتی کونترۆڵی بە سەر ئەرتەشدا لەدەست دابوو. پاش شۆڕشی فیوریەی ١٩١٧ ژمارەی ئەو سەربازانە کە نەیان دەویست شەڕ بکەنو لایەنگری ئاشتی بوون ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبوو. ئەم نۆ مانگە واتە لە فێوریەوە تا سەرکەوتنی شۆڕشی ئوکتۆبر لە مێژووی رووسیەدا نەخشێکی زۆر گرنگی هەیە. لەم ماوەیەدا بوو کە بۆ یەکەمجار رووسیە دێموکراسیی بە خۆیەوە دی. سەرەڕۆیی تێزاری لە فێوریەی ساڵی ١٩١٧دا کۆتایی هات. بەڵام پاش شۆڕشی ئوکتۆبر رووسیە دیسان بەرەو دیکتاتۆری ڕۆیی کە ئەمجارە دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا بوو. مەسەلەی ئاشتی نەك هەر لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئوکتۆبردا، بەڵکوو لە پەرەئەستاندنی پاش شۆڕشی رووسیەشدا تەئسیرێکی زۆری هەبوو. شوعاری ئاشتی لە نێو کۆمەڵانی خەڵكو بەتایبەتی سەربازاندا ئەوەندە نفووزی کردبوو کە لنین ناچار بوو پەیمانی ئاشتیی بریست لیتوفسکی پەسند بکا. ئەم پەیمانە شکستێکی نیزامی بەڵام سەرکەوتنێکی سیاسی بۆ لنین بوو و ئیمکانی دەدا وڵاتی سۆڤیەتی بتوانێ دەسەڵاتی سۆسیالیستیی خۆی بپارێزێ. ناکۆکی لە نێوان لنینو تروتسکیدا لە سەر ئاشتی توندتر بوو. تروتسکی کە نوێنەری سۆڤیەتی لە برێست لیتوفسك بوو، ئامادە نەبوو پەیمانی ئاشتی ئیمزا بکا. چونکە تروتسکی لەو بڕوایەدا بوو کە سەرکەوتنی شۆڕش لە نێو یەك وڵاتدا کافی نیەو دەبێ ئەم شۆڕشە بەردەوام بێو هەر نەبێ لە چەند وڵاتی دیکەشدا سەرکەوێ. لنین لەو بڕوایەدا بوو کە دەکرێ لە یەك وڵاتدا سۆسیالیزم دروست بکرێ. تیئۆریی پەرەئەستاندنی ناموزوونی سەرمایەداری مانای ئەوەیە کە هەموو وڵاتێك وەك یەك پەرە ناستێنێو لە هێندێ وڵاتدا ناتەبایی زیاتر خۆی دەنوێنێ. بۆیە لە زەمانی ئیمپریالیزمدا ناکرێ لە وڵاتاندا پێکەوە شۆڕشی سۆسیالیستی سەرکەوێ. جارێ دەبێ ئەم شۆڕشە لە یەك وڵاتدا وەك رووسیە کە ناتەبایی تێدا لە هەموان توندترەو ئاڵقەی هەرە کزی ئیمپریالیزمە، سەرکەوێ. تروتسکی دەیگوت ئەگەر شۆڕشی سۆسیالیستی لە شوێنێکی دیکە سەرنەکەوێ، لە رووسیەش ناتوانێ خۆی رابگرێو لە نێو دەچێ. ئەو تیئۆرییە کە دەکرێ بە کوردی ناوی دابنێین، تیئۆریی شۆڕشی بەردەوام، مانای ئەوەیە کە شۆڕش دەبێ درێژەی هەبێو حاڵەتی هێرشی هەبێ، یارمەتی بدا بە

کرێکارانی وڵاتەکانی دیکە کە بتوانن شۆڕش بکەن. شۆڕشی ئوکتۆبر دەبێ هاوپەیمانی هەبێ، دەنا ناتوانێ خۆی رابگرێ.

لە ساڵەکانی ١٩١٧ تا ١٩٢٠دا بەڕاستی وەزعێکی شۆڕشگێرانە لە ئۆرووپا هەبوو. لە مەجارستانو ئاڵمان ئیمکانی ئەوە هەبوو کە حیزبە شۆڕشگێڕە کرێکارییەکان دەسەڵات بەدەستەوە بگرن. لەو ساڵانەدا نەزەری تروتسکی زەمینەی زۆر بوو. بەڵام کە جووڵانەوەی کرێکاری لە ئۆرووپادا پاشەکشەی دەست پێ کرد، ئەو کاتە تیئۆریی لنین زیاتر جێگیر دەبێ. ئەمجا وڵاتی سۆڤیەتی دوو رێگای لەبەرە، یان ئەوە کە واز لە سۆسیالیزم لە رووسیە بێنێ یان ئەوە کە سۆسیالیزم لە یەك وڵاتدا جێگیر بکرێو ئەوە ببێ بە بناغەو بنکە بۆ سۆسیالیزمی جیهانی. هەر لێرەدا گیروگرفتێکی یەکجار زۆر دەست پێ دەکا. ئەوە کە ناچار واقعییەتی رەق ئەو تیئۆرییە دەسەپێنێ کە بەڕاستی تەجدیدی نەزەرێکە لە مارکسیزمدا. بۆیە ئەگەر باسی تەجدیدنەزەرکردن لە مارکسیزمدا دێتە پێش، بێ جێ نیە ئەگەر بگوترێ لنین یەکەم کەس بوو کە لە رووسیە هێندێ لە تیئۆرییەکانی مارکسی گۆڕی. بۆیە ئەگەر تیئۆرییەکی تازە لە مارکسیزمدا بێتە گۆڕێ، نابێ بە ناوی ریویزیونیسم مەحکووم بکرێو رەد بکرێتەوە، دەبێ بزانرێ ئەم تیئۆرییە چەند لەگەڵ واقعییەتی وڵاتێك یا چەند وڵات رێك دەکەوێو ئایا ئەوە تیئۆرییەکی شۆڕشگێڕانەیە یا پاشەکشەیە لە مارکسیزم.

مەسەلەیەکی دیکە کە پاش شۆڕشی ئوکتۆبر زۆر جێی سەرنجە، مەسەلەی جووتیارانە. ئاماری دەقیق بە دەستەوە نیە، بەڵام وێ دەچێ لە ١٤٠میلیۆن دانیشتووانی رووسیەی سۆڤیەتی، ١٠٠ میلیونی جووتیار بووبێ، هێزی هەرەئەساسیی کۆمەڵ جووتیاران بوون. راستە کە لە ئاخری چەرخی نۆزدەدا لە سێرواژ رزگار بوون، بەڵام زۆربەیان مووژیكو هەژارو نەخوێندەوارو پاشکەوتوو بوون. مەسەلەی گرنگ ئەوە بوو کە زۆربەی جووتیاران خاوەن زەوی نەبوون. پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئوکتۆبر بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی زەوی دوو رێگا هەبوو. یەکەم ئەوە کە زەوی میللی بکرێ، واتە وەك کارخانەکان کە میللی کرانو کەوتنە ژێر مالکییەتی گشتیی کرێکاران، زەویش بێتە ژێر مالکییەتی گشتیی هەموو جووتیاران. دووهەم ئەوە کە زەوی بە سەر جووتیارانی بێ زەویدا دابەش بکرێو

هەموو جووتیارێك پارچەیەكی زەوی بدرێتێ. زۆر زوو دەركەوت كە میللیكردن سەرناكەوێ. ئیمكاناتی ماددی بۆ ئەم مەبەستە ئامادە نەبوو و لەو كاتەدا دەوڵەتی سۆڤیەتی ئیمكانی ئەوەی نەبوو ئامرازو كەرەستەی پێویستی كشتوكاڵی بدا بە جووتیاران. مووژیكیش لەباری تێگەیشتنو ئاگایی سیاسییەوە بە هیچ جۆرێك بۆ ئیدارەكردنی زەویی میللیكراو حازر نەكرابوو. بۆیە حیزبی بولشویك وازی لە شوعاری میللیكردنی زەوی هێناو ئەسڵی دابەشكردنی زەویی بە سەر جووتیاراندا پەسند كرد كە شوعاری ئێس ئێڕەكان بوو. لنین لەو بڕوایەدا بوو كە لە پێشدا زەوی دابەش بكرێو پاشان جووتیاران هان بدرێن بۆ ئەوە لە كوئۆپێراتیوەكان (شیركەتە تەعاونییەكان)دا كۆببنەوە. بۆ ئەوە ئامادە كردنی زەمینەی ئابووریو كۆمەڵایەتی پێویست بوو.

دیارە پێشتر لە ماركسیزمدا مەسەلەی مالكییەتی زەویی جووتیاران بەو شێوەیە كە دەبێ دابەش بكرێ، نەهاتۆتە گۆڕێ. ئەوەندە گوتراوە كە دەبێ وەزعێكی ئابووریی ئەوتۆ پێك بێ كە جووتیاران دڵخوازانە لە بنكەی ئابووریی گەورەتردا كۆببنەوە. خۆی شوعاری سیاسیی یەكیەتیی كرێكارانو جووتیارانیش تا پەرەئەستاندنی جووڵانەوەی كرێكاری لە رووسیە لە ماركسیزمدا بەرچاو ناكەوێ. ئەم شوعارە لە لایەن لنینەوە بەرز كراوەتەوە. هەروەها كە شوعاری یەكیەتیی كرێكارانی جیهانیو گەلانی زۆرلێكراو پاش شەڕی دووهەمی جیهانی هی مائۆتسەتۆنگە، هیچ كام لەو شوعارانە زەمانی ماركس نەبوون. ئەو كاتە شوعاری "پرۆلتێرەكانی جیهان یەك بگرن" تەنیا شوعار بوو. كەڵخۆزیكردنی كشتوكاڵ پاش مردنی لنین لە ساڵەكانی ١٩٢٨ تا ١٩٣٣ هاتۆتە دی. دیارە پێكهێنانی كەڵخۆزەكان بە پێچەوانەی نەزەری لنین بە زۆر جێبەجێ كرا. بە داخەوە لە پشت ئەو كەلیمەی "زۆر"ەدا میلیونەها كوشتە هەیە، ٥ میلیون نەفەر تەبعیدی هەیە. دەیان میلیون مەڕو ماڵاتو حەیوان لە نێو چووە كە دەیانویست جووتیاران بە زۆر بكەنە كەڵخۆزیو ئەوانیش پێیان خۆش نەبوو. دیارە لە باتی ئەوە جووتیاران، حەیوانو مەڕو ماڵاتی خۆیان بەرنە نێو كەڵخۆزەكان دەیانكوشتنەوەو گۆشتەكەیان مەسرەف دەكرد. ئاكامی ئەوە بوو كە پاش ساڵەهای ساڵ واتە تا شەڕی دووهەمی جیهانییش ژمارەی مانگاو بەرازو مەڕ تەنانەت باڵندەی خۆماڵی وەك پێش ساڵەكانی ١٩٢٨ی لێ نەهاتەوە.

چونکه وڵاتی سۆڤیەتی لە پاشان شەڕی دووهەمی جیهانی بەسەردا هاتو ئـابووریی سۆڤیەتیو بەتایبەتی کشتوکاڵ زەربەیـەکی دیکـەی وێ کـەوت. دەکـرێ بڵێـین کـە هێشـتاش کشـتوکاڵی سـۆڤیەتی لـە ئاکـامی ناڵـەباری کـەڵخۆزیکردنی بـەزۆریی ساڵەکانی ١٩٢٨ تا ١٩٣٣ خۆی رزگار نەکردوە. بـە رێکـەوت نیـە کـە یەکیـەتیی سۆڤیەتی هەموو ساڵێ دەیان میلیون تـۆن گـەنم لـە وڵاتـەکانی سـەرمایەداری، بـە تایبەتی لە ئەمریکا دەکڕێ. لە حاڵێکدا وەختێك هەبوو کـە ئۆکرایـن بـە ئـەمباری گەنمی دنیا ناوبانگی دەرکردبوو. مەبەست ئەوەیە کـە لەگـەڵ قانوونمـەندیی ئـابووری گاڵتە ناکرێو ناشکرێ بە سەر قۆناخێکی پێویستی کۆمەڵایەتیدا باز بدرێو یـا بـێ ئامادەبوونی هەلومەرجی ئـابووری گیروگرفتـەکان بـە زۆرو بـە شـێوەیەکی ئیـداری چارەسەر بکرێن.

چارەنووسی دێموکراسیی نێوخۆی حـیزبیش جێـی سـەرنجە. ئـەو مەسـەلەیە لـە "کورتەباس"یشدا هاتوە. لە پاش شۆڕشی ئوکتۆبر لـە سـاڵی ١٩١٧ەوە تـا سـاڵی ١٩٢٤ کە لنین وەفاتی کرد، حیزبی بولشویك ٧ کۆنگرەی پێك هێناوە. قسە لە سەر زۆربوونی ژمارەی کۆنگرەکان نیە، بەڵام ئەمە خۆی نموونەیەکە لە بوونی دێموکراسـی لە زەمانی لنیندا‌و لە نێوچونی دێموکراسی پاش لنین، چونکە فاسیلە لە نێو کۆنگرەی هەژدەو نۆزدە لە زەمانی ستالیندا ١٣ ساڵ بوو. ئەوە سەردەمێکە کـە دیکتـاتۆریی پرۆلێتاریا یا دروستتر بڵێین دیکتاتوریی ستالینی لە یەکیەتیی سۆڤیەتیدا بەتەواوی دامەزراوە. "کروپسکایا" ژنی لنین کە هاوسەنگەریشی بوو، بە سەراحەت دەڵێ کـە لنین لە ئاخرین رۆژەکانی پاش ساڵی ١٩٢٢دا (کـە ئیـدی نـەخۆش کـەوتبوو و ئـەو وەسیەتنامەیەشی نووسی کە بەشێکی لە "کورتەباس"دا هاتوە) نەزەری ئـەوە بـوو کە هەرچۆنێك بێ ستالین لـە مـەقامی سـکرتێری گشـتی لابـەرن، دەنـا یەکیـەتیی سۆڤیەتی تووشی وەزعێکی زۆر ناڵـەبار دەبـێ. بـەڵام کـە لنـین مـرد ئیـدی کـەس نەیتوانی ئەو کارە بکاو ستالین مایەوەو لە جێگای خۆیدا سەقامگیر بوو. لـە سـەر کردەوەکانی ستالین زۆر شت گوتراوە، بەڵام با ئیشارە بە یـەك نموونـە بکـەین. ئـاخر کۆنگرەی حیزبی بولشویك پێش سەرکەوتنی شۆڕشی ئوکتۆبر کۆنگرەی شەشـەم بـوو کە لە مانگی ئووتی ١٩١٧ پێك هات. هەرچی ئەندامی خەباتگێڕی پێـش کۆنگـرە هەبوون، هەرچی کادری لە خۆبردوو هەبوون، لەم کۆنگرەیەدا ئامادە بوون. بەشدارانی

کۆنگرە نوێنەری ئەندامانی پێش سەرکەوتنی شۆڕشی ئوکتۆبر بوون. لەم کۆنگرەیەدا ٢١ ئەندامی کومیتەی ناوەندی هەڵبژێران لەگەڵ ٨ جێگر. لە ٢١ ئەندامی کومیتەی ناوەندی شەش کەسیان تا ساڵەکانی ١٩٣٣ ـ ١٩٣٦ کۆچی دواییان کرد کە یەکێکیان لنین بوو. لە ١٥ کەسی باقی، تروتسکی بۆ دەورەی یەکیەتیی سۆڤیەتی رای کرد کە لە پاشان لە مکزیك بە دەستووری ستالین کوژرا. ١٤ کەس دەمێننەوە کە یەکێکیان خودی ستالین بوو. ١٣ کەس لە ئەندامانی ئەو کومیتە ناوەندی‌یە کە زیندوو مابوون، هەموویان بێ ئیستسنا لە ماوەی بەینی ساڵەکانی ١٩٣٣ تا ١٩٣٦دا لە تەرەف ستالینەوە بە خەیانەتو جاسووسی بۆ بێگانە تاوانبار کرانو گیرانو ئێعدام کران. لە نێو ئەو ١٣ نەفەرەدا ناوی بوخارین، رینوییف، کامینیف بەرچاو دەکەوێ کە لە بەڕێوەبەرانی بەناوبانگی حیزبی بولشویك بوون. بەمجۆرە دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا وەك تئیوری‌یەك زۆر بەکاری ستالین هاتوە. هێناویەتی ئەو دیکتاتۆریەی کردوە بە دیکتاتۆری حیزب، واتە دیکتاتۆری ئاپاراتی حیزبی، یانی ئەوانە کە حێرفەیینو دەزگای حیزبەکە هەڵدەسووڕێنن. لە پاشانیش کردوویەتی بە دیکتاتۆریی شەخسی خۆی. وەختێك شۆڕشی ئوکتۆبر سەرکەوت لنین دەزگایەکی پێك‌هێنا وەك سازمانی ئەمنییەت بۆ خەبات‌کردن لەگەڵ دژی شۆڕش، لەگەڵ خراپکارانو دوژمنانی یەکیەتیی سۆڤیەتی کە لە دەرەوەڕا بۆ نفووزکردن لە نێو دەزگای سۆڤیەتی‌دا دەنێردران. لە سەرتادا ناوی "چی‌کا"و مەسئوولەکەشی "جیرژنسکی" بوو. چی‌کا بە مانای کومیسیۆنی "فوق‌العاده"یە. خۆی ناوەکەشی دەگەیەنێ کە شتێکی وا پڕ لە مەترسی نەبوە. ستالین پاش وەفاتی جیرژنیسکی، هەم کەسێکی لە سەر ئەو چی‌کایە دانا کە دەستووری خۆی بێو هەم ناوەکەشی گۆڕیو کردی بە "گ.پ.ئۆ"، واتە ئیدارە گشتیی سیاسی. لە کاتێك‌دا چی‌کا دژی دوژمنانی شۆڕشو خراپکاران تێ‌دەکۆشا، گ. پ. ئۆ لە ژێر بەڕێوەبەریی ستالین‌دا بەرە بەرە دەست دەکا بە پەروەندەسازیو چەندین پەروەندە بۆ چەندین دەستە لە ئەندامانو بەڕێوەبەرانی حیزبی ساز دەکا. لە پاشان گ. پ. ئۆیش دەبێتە ئین. کا. وی. دی. واتە کومیتەی کاروباری نێوخۆ کە ئەویش لە ئاخرەکەی‌دا دەبێتە کا. گ. پ کە مانای کومیتەی دەوڵەتیی ئەمنییەتی‌یە کە ئێستاش هەر هەیە. بەکارهێنانی ئەو سازمانە دژی ئەندامانو بەڕێوەبەرانی حیزبی بولشویك، یەکێك لە ئیبتکارەکانی

ستالین بوو. ئەم سازمانە ئامرازی هەرە ئەسڵی، وەسیلەی هەرە ئەسڵیی بەکارهێنانی دیکتـاتۆریی پرۆلێتاریـا بـوو. لـە پێـش هـەمووانـدا دژی ئـەندامانو بـە تایبـەتی بەڕێوەبەرانی حیزب کە موخالیفی ستالین بوون، بەکار هاتوە.

لە کاتێکدا کە چی‌کا لە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئوکتۆبـر پێـك هـاتو ئـەرکی پاراستنی شۆڕشو خـەبات کـردن دژی دوژمنـانی شـۆڕش بـوو نـە دژی ئـەندامانی حیزبو لایەنگرانی شۆڕش. ئێستاش بەختەوەرانە نەخشی کا. گ. پ زیـاتر خـەبات کردن دژی دوژمنانی یەکیـەتیی سـۆڤیەتی‌یە نـە ئـەندامانی حـیزبو بەڕێوەبـەرانی حیزب. ئەو راستی‌یەش دەبێ بگوترێ کە هەرچەند وەك لە "کورتەباس"دا هاتوە لـە یەکیـەتیی سـۆڤیەتی دێموکراسـیی سیاسـی زۆر مـەحدوودە، بـەلاّم تاوانبـارکردنو کوشتنی خەڵکیش وەك زەمانی ستالین نەماوە.

پاشان ستالین ئوسوولی لنینیزمی دانا. ستالین لە ئوسـوولی لنینـیزمدا بەڕاسـتی لنینیزمی زۆر سادە کردۆتەوە، کردوویەتی بە سیستمێکی زۆر مەفـهووم. هەرکـەس بیخوێنێتەوە زوو لێی حاڵی دەبێ، چونکـە ئوسـوولی لنینـیزم وەك کتێبـی دەرسـی دانراوە. بۆ ستالین، لنینیزم، مارکسیزمی سەردەمی ئیمپریالیزمو سەردەمی شۆڕشـی پرۆلێتاریایە. دیارە ئەوە خـۆی لادانـە لـە مارکسـیزم، چونکـە سـتالین هێناویـەتی لنینیزمی لە جێگای مارکسیزم داناوە. لە حاڵێکدا لنینیزم باری تایبەتی خۆی هەیە کە دەگەڕێتەوە سەر خاسیەتە تایبەتی‌یـەکانی رووسـیە. لنینـیزم ئوسـوولی گشـتیی مارکسیزم نیە کە لە هەموو جێگا بتوانرێ تەتبیق بکرێ. ئێستا زۆر لـە حیزبـەکانی کومۆنیستی رۆژئاوا وەك حیزبی کومۆنیستی ئیتالیا بـە رەسمـی رایانگـەیاندوە کـە لنینیزمیان قبووڵ نیە. هەروەها زۆر حیزبی کومۆنیستی دیکەی رۆژئاواش ئیدی بـە خۆیان ناڵێن مارکسیست ـ لنینیست. ئەوان تەنیا پێڕەوی لە مارکسیزم دەکەن نـەك لە مارکسیزم ـ لنینیزم. مانـای ئەوەیـە کـە شۆڕشـی ئوکتۆبـر تاقیکردنـەوەی زۆر بەنرخی هەیە بەلاّم ئولگوو نیە. لە هەموو ولاّتێکدا ئوسـوولی لنینـیزمی سـتالینی تەتبیق ناکرێ، واتە مارکسیزمی دەورانی ئیمپریالیزم هەر مارکسیزمە نـە لنینـیزم. هەروەها کە ئەندێشەی مائۆتسەتۆنگیش نەی‌توانی نە جێگای مارکسیزمو نە جێگای لنینیزم بگرێتەوە. چونکە زیاتر پێوەندیی بە شۆڕشی چینەوە هەیە کە تاقیکردنەوەی زۆر بە نرخی هەیە، بەلاّم ناکرێ بیانکەی بە ئولگوو بۆ ولاّتی دیکە. تەئکیدی ستالین

لە سەر دیکتاتۆریی پرۆلێتاریاو بە ئولگوو دانانی بۆ هەموو ولاّتەکانی دیکەش هەر لەو بۆچوونە نادروستەڕا سەرچاوە دەگرێ. هێندێ باری وەزعی تایبەتی یەکیەتیی سۆڤیەتییش لەم بارەیەوە ڕێگا بۆ ستالین خۆش دەکا. یەکیەتیی سۆڤیەتی گەمارۆ دراوە، وەزعی ئابووریی خراپە. شەڕی نێوخۆو بەرهەڵستی دژی شۆڕش حیزبی بولشویکی ناچار کردوە بەرەو توندوتیژتر بوونو سەرەڕۆیی بڕواو ئەوە خۆی هەڵکەوتێکە بۆ ستالین بۆ بەهێزترکردنی دیکتاتۆریی ئاپاراتی حیزبیو لە پێش هەمووانداو، شەخسی خۆی. دیارە ڕاگرتنی ئاپاراتێکی وەفادار نیازی بە دانی ئیمتیاز بە هەموو ئەوانە هەیە کە لە دەزگای بەڕێوەبەریی حیزبدا کار دەکەن. لێرەدایە کە "نومەنکلاتوورا" پەیدا دەبێ. کومیتەی ناوەندی لیستێکی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی هەیە بە پێی ئەو لیستە ئیمتیازیان دەدادتێ. لە نومەنکلاتووراداا دیاریکراوە کە لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی یا کومیتەی ناوەندییەوە بگرە تا خوارێ، هەرکەس چ ئیمتیازێکی هەیە. بەرە بەرە بەڕێوەبەرانی حیزب وایان لێ دێ کە هەلومەرجی ژیانیان لەگەڵ کۆمەلاّنی خەڵك زۆر فەرق دەکا. ناتوانین بڵێین ئەوە چینێکی تایبەتی‌یە، یا ئەوەی کە دوژمنانی سۆسیالیزم دەڵێن، چینێکی چەوسێنەرە وەك لە ڕێژیمی سەرمایەداری‌دا بەرچاو دەکەوێ، بەلاّم بەڕاستی توێژێکە کە ئیمتیازاتێکی تایبەتی زۆری هەیەو جیاوازیی هەیە لەگەڵ خەڵکی ئاسایی.

سیاسەتی دەرەوەی ستالین کە پاش مردنی ئەویش هەروا بەردەوام بوو و بەتایبەتی هەڵوێستی بەرامبەر بە ولاّتەکانی سۆسیالیستی جێگای سەرنجە. بە پێی ئەو بەڵگەیە کە ماوە، ئەگەر "دیمیتروف" زیاتر ژیابا، یەکیەتیی سۆڤیەتی لەگەڵ بولغارستانیش تێك دەچوو. بەلاّم ڕاستی ئەوەیە کە یەکیەتیی سۆڤیەتی لە ساڵی ١٩٤٨دا لەگەڵ یوگۆسلاڤی، لە ساڵی ١٩٥٦دا لەگەڵ پولونیاو مەجارستان، لە ساڵی ١٩٥٩دا لەگەڵ ئالبانی، لە ساڵی ١٩٦٠دا لەگەڵ چینو لە ساڵی ١٩٦٨دا لەگەڵ چێکۆسلوواکی تێك چوو. لە ساڵەکانی حەفتاوە تا ئێستا لەگەڵ رومانییش ناکۆکی هەر بەردەوامە. ئەم وەزعە بۆ خۆی نیشانەی ئەو ڕاستی‌یەیە کە لە یوگۆسلاڤیو ئالبانیو چین کە پاش خەباتێکی شۆڕشگێڕانە، خۆیان زرگار کردو نەچوونە ژێر باری سیاسەتی سۆڤیەتی، لە ولاّتانی دیکەدا لەشکری سۆڤیەتی جێگیر بووەو وا دێتە بەرچاو کە ئەگەر لەشکری سۆڤیەتی نەبێ سۆسیالیزم لە مەترسی

دەکەوێ. لە کاتێكدا یەکەم دەبێ ولاّتانی سۆسیالیستی رابیتەیان پێوەنـدی برایانـەو دۆستانەو بەرابەر بێ هەموویان وەك یەك بن‌و بە پێوەندی‌یەکانیاندا پۆلی سانترالیزم، واتە چەند ناوەندی حاکم بێ نە مونۆ سانترالیزم واتە تاقە ناوەندێك بە ســەر هــەموو ئەوانی دیکەدا زالّ بێ. دووهەم سۆسیالیزم، هەروەها کە پێشتریش گوترا، بە بوونــی لەشکری بێگانە ناپارێزرێ‌و گەلانی ئەو ولاّتانە کــە لەشــکری ســۆڤیەتییان تێدایــە، هەست بە نەبوونی سەربەخۆیی یا مەحدوودبوونی سەربەخۆیی دەکەن. سێهەم ئەوەیـە کە لە پێوەندی‌یەکانی ئابووریی‌شدا دەبێ وەك یەك بوون هەبێ‌و ئەم پێوەندییانە تەنیا بە قازانجی یەك لا نەبن. لەم بارەیەوە پێویستە کە بێجگە لەگەلّ یەکیەتیی سۆڤیەتی، پێوەندی‌یەکانی ولاّتەکانی دیکەی سۆسیالیستی لــە نێــو خۆشــیاندا بــەهێز بکــرێ‌و پێویست نەبێ ئەم پێوەندی‌یە هەر لــە رێگــەی یەکیــەتیی ســۆڤیەتی‌یەوە بــێ. واتــە پێویستە پێوەندی‌یەکان پۆلی سانترالیستی بن نە مونۆ سانترالیستی. رەنگــە یــەکێك لــە کوســپەکانی پێش‌نەکــەوتنی شــوورای هاوکــاریی ئــابووری هـــەر ئـــەو مونـــۆ سانترالیزمەیە لە نێو ولاّتانی سۆسیالیســـتی‌دا یـــانی یـــەك نـــاوەندی بوونـــە بـــێ. لـــە کاتێكدا لە ئۆرووپای رۆژئاوا بــازاڕی موشــتەرەك یــەك نــاوەندی نیــە. دیــارە ئــەوە بازاڕێکی سەرمایەداری‌یە، بەلاّم یەك مەرکەزی نیە، نــە ئــەلّمان، نــە فەرانســە، نــە ئینگلستان‌و نە ئیتالیا هیچیان میحوەر نین، هەموویان بە کــردەوە مــافو ئــەرکیان وەك یەکە. ئەگەر نەتیجە وەرگرین بەکورتی دەتوانین بلّێین کە ناکرێ چاوەڕوان بین کــە لە فەرانسە، لە ئەمریکا، لە ئینگلستان، لە سویس‌و لە ئەلّمان شۆڕشی چەکدار پێك بێ‌و یان شۆڕشێکی وەك شۆڕشی ئوکتۆبــر بکــرێ. تــازە دێموکراســیی سیاســی لــەو ولاّتانــەدا ئــەوەندە جێگــیر بــووە چ هــێزە دەســتی چەپی‌یــەکان‌و چ هــێزە دەســـتی راستی‌یەکان ناچارن رێزی بۆ دابنێن. ئەگەر ئەمڕۆ حیزبی کومۆنیست لە ئیتالیا بێتە سەر کارو بیهەوێ دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا دابمــەزرێنێ، بــۆی ناچێتــە ســەر، چونکــە دێموکراسی لەوێدا جێگیر بووە. خەلّکەکە ئەوەندە وریایە کە نــە رێگــا دەدا حــیزبی کومۆنیست دیکتــاتۆریی پرۆلێتاریــا دابمــەزرێنێ‌و نــە رێگــا دەدا حــیزبی فاشیســت دیکتاتۆریی فاشیستی. بۆیە حیزبە کومۆنیستەکانی ولاّتانی رۆژئاوا، هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕە کە دەبێ دێموکراسیی سیاسی بپارێزرێ‌و ئەگەر بڕیار وابــێ دێموکراســیی سیاسی بپارێزرێ‌و لە رێگای دێموکراسیی سیاسی‌یەوە دەسەلاّتی سیاسی بە دەستەوە

بگرن، هیچ ڕێگای دیکە نیە، دەبێ دیکتاتۆریی پرۆلیێتاریا ڕەد بکەنەوە. واتــە هــۆی پەسند نەکردنی دیکتاتۆریی پرۆلیێتاریا لەو وڵاتانەدا لــە پێــشدا هــۆی ئوســوولی‌یە. چونکە هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕە کە نە بــە تۆپــزی دەتوانــن دەســەڵات بەدەســتەوە بگرن‌و نە بە زۆرو سەرەڕۆیی دەتوانن ئەم دەسەڵاتە بپــارێزن. تــەنیا بــە پشــتیوانیی زۆربەی خەڵك دەتوانن حوکمداری بکــەن. بۆیــە ئــەم حیزبانــە هــاتوون‌و واقیع‌بینانــە وازیان لە دیکتاتۆریی پرۆلیێتاریا هێناوەو لە وڵاتەکانی ڕۆژئاوادا باســی دێموکراســی دەکەن نە دیکتاتۆری. ئەوەی لە "کورتــەباس"دا ئیشــارەی پــێ کــراوە ئەوەیــە کــە ئێمەش بە نەزەری خۆمــان لــە هەلومــەرجی خۆمــاندا دیکتــاتۆریی پرۆلیێتاریــا ڕەد دەکەینەوە. لە باری مێژوویی‌یەوە دیتمان پاش ئەوە کە شۆڕش لــە چــین ســەرکەوت، مائۆتسەتۆنگ هات‌و گوتی لە چــین دیکتــاتۆریی پرۆلیێتاریامــان نیــە. دیکتــاتۆریی دێموکراسیی گەلیمان هەیە. بەکورتی دێموکراسی بۆ گــەل هەیــەو دیکتــاتۆری دژی دوژمنانی گەل. بۆیە دەی‌توانی ئەوە بڵێ چونکە شۆڕشی چین لەگەڵ شۆڕشی ئوکتۆبــر لە زۆر بارەوە جیاوازیی هەبوو. کومۆنیســتە چینی‌یــەکان کــە ســەرکەوتن بەڕاســتی زۆربەی خەڵکەکە پشتیوانیان بوون. دیکتاتۆری بەو شێوەیە لــەوێ پێویســت نــەبوو. دیکتاتۆری تەنیا لە دژی دوژمنــانی گــەل هــی دەرەوەو ژوورەوە پێویســت بــوو، تــا ئێستاش ئەم وەزعە هەر بەردەوامە. گرتــن‌و تاوانبــارکردنی بەرپرســانی حــیزبی بــە جاسووسی‌و بە ئاشکراو بە دزی ئیعدام‌کردنیان، بە شێوەیەك لە زەمانی ستالیندا لــە یەکیەتیی سۆڤیەتی کرا، لە چین بەرچاو ناکــەوێ. لــەو رابیتەیــەدا بــا ئیشــارە بــەو ڕاستی‌یەش بکەین کە لە وڵاتەکانی سۆسیالیستی‌دا ئێستا کەس باســی دیکتــاتۆریی پرۆلیێتاریا ناکا. ئەگەر باسیشی بکرێ وەك دیکتاتۆریی چینی کرێکار بــاس دەکــرێ، چونکە پرۆلیێتر مانای تایبەتی خۆی هەیە. پرۆلیێــتر ئــەو کەســەیە خــاوەنی ئــامرازی بەرهەمهێنان نیەو بۆیە هێزی کاری خــۆی دەفرۆشــێ. لــەوەش زیــاتر لــە کۆنگــرەی بیســتەمی حــیزبی کومۆنیســتی یەکیــەتیی ســۆڤیەتی لــە ســاڵی ١٩٥٦دا باســـی دیکتــاتۆریی چینــی کرێکاریشــیان نــەکرد، بــەڵکوو گوتیــان ئێســتا لــە یەکیــەتیی سۆڤیەتی‌دا حاکمییەتی گشتیی گەل هەیە. هیچ کۆنگرەیەکی پاشتریش ئەم نــەزەرەی ڕەد نەکردۆتەوە. دروستیش هەر ئەوەیە، چونکە دیکتــاتۆری دژی کــێ بــێ؟ هــەموو چین‌و توێژەکان سۆسیالیستین‌و چینی دژی سۆسیالیستی لــەوێ نــەماون. کرێکــاران‌و

جووتیارانو رووناکبیران نه چەوسێنەرنو نه کەس دەیانچەوسێنێتەوە. بەکورتی ئێستا لە مەیدانی نێونەتەوەیی‌دا هەموو، هەم لە ولاّتانی رۆژئاوا باسی دێموکراسی دەکەن، هەم لە ولاّتەکانی سۆسیالیستی. کەس باسی دامەزراندنی دیکتاتۆری بە هیچ شکلێك ناکا، هەروەها کە ئیشارەمان کرد لە ولاّتە سۆسیالیستی‌یەکاندا باسی پەرەپێدانی دێموکراسی دەکرێ. ئێمە لەم بارەیەوە هەلّوێستمان روونە. یەکەم، ئێمە بە شێوەیەکی ئوسوولی لایەنگری دێموکراسین، دێموکراتینو ئیمانێکی قوولّمان بە دێموکراسی هەیە، بۆیە دیکتاتۆری هەر شێوە دیکتاتۆری‌یەك بێ، رەدی دەکەینەوە. لە پاشان ئێمە لە کوردستان پرۆلێتاریامان نیە تا دیکتاتۆری‌یەکەی دابمەزرێنین. سەرمایەداریشمان بەو شێوەیە نیە کە دامەزراندنی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا دژی سەرمایەداری پێویست بێ. راستە سەرمایەداری لە ئێراندا لە سەر یەك پێشکەوتووترە. بەلاّم حیزبی دێموکرات حیزبێکی ناوچەیی‌یەو ئێستا وا دابنێین هاتو گوتی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریای قبوولّە، سبەینێ لە ئێراندا شۆرش سەردەکەوێو لە تاراندا دەسەلاّتێکی سیاسی پێك دێ بە ناوی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا کە حیزبی دێموکرات تێی‌دا بەشدار نیە. ئەو کاتە شیعاری ئەسلّیی ئێمە "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان" چی بەسەر دێ؟ ستالین ئەو کاتە کە خۆی یەکێك لە دامەزرێنەرانی تیئۆریی مارکسیستی بۆ گیروگرفتی نەتەوەیی بوو، واتە لە سالّی ١٩٢٢دا ئەو جوملەیەی نووسیوە: "مافی دانانی چارەنووس نابێ کۆسپێك بێ لە سەر رێگای دیکتاتۆریی پرۆلێتاریادا، دەبێ تابعی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا بێ". جوملەیەکی زۆر کورتو روونە. سبەینێ ئێمە خودموختاریشمان هەبێ، ئەگەر دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا لە تاران دامەزرا، ئێمە دەبێ واز لە خودموختاری، لە مافی دانانی چارەنووسی خۆمان بێنینو تابعی دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا بین. مەسەلەیەکی دیکەش زۆر جار هەر بەم جۆرە باس دەکرێ. وا دانێین کە حیزبی دێموکرات هاتو سەرکەوتو خودموختاریی وەرگرت. رەنگە رێکخراوێکی دیکە لە کوردستاندا پەیدا بێو بیهەوێ بە زۆر دەسەلاّتی سیاسی لە دەست حیزبی دێموکرات دەربێنێو حیزب ناچار بکا کە دیکتاتۆری دابمەزرێنێ. ئەو کاتە ناچار دیکتاتۆری دادەمەزرێ. نەزەری ئێمە لەم بارەشەوە زۆر روونە. یەکەم، حیزبی دێموکرات ئەو کاتە دەسەلاّتی سیاسی بە دەستەوە دەگرێ کە زۆربەی خەلّك

پشتیوانی بــن. مەســەلەن لــە فەرانســە، زۆربــەی خــەڵك دەنگیــان داوە بــە حــیزبی سۆسیالیست. ئەگەر هێزێکی سیاسی یان غەیرە سیاسی، بڵێین تیرۆریســت، بیهــەوێ بە هێزی چەکدار دەسەڵات لە دەست حیزبی سۆسیالیستی فەرانسە دەربێنــێ، دیــارە ئەوە راپەڕین دژی قانوونــەو هــەر بــەم شــێوەیەش رەفتــاری لەگــەڵ دەکــرێ. بــەڵام سەرکوتکردنی چەند تیرۆریست یان هێزێکی ئەقەللییەت کە دژی زۆربەی حاکمییەتی خەڵك راپەڕیوە، دیکتاتۆری نیە. ئەوە حاکمییەتی ئەکسەرییەت بەسەر ئەقەللییــەت دایە. واتە دێموکراسی‌یە. ئەوە حاکمییەتی ئەقەللییەت بەسەر ئەکسەرییەت دایە کە دیکتاتۆری‌یە. کەسێك بیهەوێ ئوسوول‌و قاعیدەو قانوونی دێموکراسی تێك بــدا، بــە پێی قانوون رەفتاری لەگەڵ دەکرێ. لــە پاشــانیش هیــچ پێویســت بــە دامــەزراندنی دیکتاتۆری ناکا، دێموکراسی‌و قانوونەکانی هەر لە جێگای خۆیان دەمێننەوە. ئەگەر هەر کەس یا هەر هێزێکی دیکە هات نەزەری خــۆی بــە ئــازادی بــاس کــرد، مــافی ئاشکرای خۆیەتی، دەتوانێ دژی سیاسەتی حیزبی دێموکراتیش قسە بکا، بنووســێ‌و شت بڵاو بکاتەوە. بەڵام ئەگەر دەستی دایە چــەك‌و ویســتی بــە زۆری دەســەڵات لــە دەست حیزبێك کە زۆربەی خەڵك دەنگی داوەتێ دەربێنێ، دیارە ســـەرکوت دەکــرێ‌و ئەو کارە نەك هەر زیان لە دێموکراسی نادا، بەڵکوو خۆی دیفاع لە دێموکراسی‌یە.

بەجێ‌یە لە ئاخری وتارەکەماندا ئیشارە بە هێندێ پێشنیارو باسیش بکەین. لێرە پێشنیار کرا کە لە نێو حیزبدا لە سەر سۆسیالیزمی دێموکراتــی هــەم بــە نووســین‌و هەم بە تەرجەمە زیاتر باس بکرێ. ئەوە پێشـــنیارێکی بەجێ‌یــە. دەبــێ هــەوڵی بــۆ بدرێ. پێشــنیار کــرا کــە تاقیکردنــەوەی وڵاتــەکانی سۆسیالیســتی‌و تەنانــەت هــی سەرمایەدارییش باشتر بناسێنین، کتێبیان لە سەر بنووسین‌و تەرجەمە بکەین. ئەوەش پێشنیارێکی بەجێ‌یە. هەروەها دەبێ کادرەکان تەشویق بکەین بە موتالیعەو بە هیچ جۆرێك لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئــێراندا نابــێ پێشــگیری لــەوە بکــرێ کــە کادرێك هەر کتێبێك دەیەوێ، بخوێنێتەوە، ئەو کارە خــۆی ســەرەتای دیکتاتۆری‌یــە. کادری حیزبی هەر کتێبێکی پێ خۆشــە بــا بی‌خوێنێتــەوە. دەتوانــین لاوان رێنوێنــی بکەین، دەتوانین کتێبی باشیان پێ بناسێنین. بــەڵام ئەگــەر یــەکێك چــوو کتێبێکــی دیکەشی هێناو پێی خۆش بوو بی‌خوێنێتەوە، کەس مافی ئەوەی نیە پێشگیریی لــێ بکا. ئێمە دێموکراتین‌و دەبێ تا سەر دێموکرات بین. نابێ لەبیرمان بچــێ کــە ئەگــەر

هـەنگاوێك بـەرەو لـە ژێرپـێ نـانی دێموکراسـی بڕۆیـن، تـازە بـەرەو دیکتـاتۆری ڕۆیشتووین‌و گەڕانەوە دژوارە.

پێشنیارێکیش هاتوە کە ئەندامانی بەڕێوەبەریی حیزب دەگرێتەوە. با بە خۆشمـان بڵێین کە موتالێعە زیاتر بکەین. ئەندامانی کومیتەی ناوەندی خۆیان دەبێ بەرنامەی موتالێعەیان هـەبێ. چونکـە بەڕاسـتی نـاکرێ ئـەندامانی بەڕێوەبـەریی حـیزبێکی شۆڕشگێڕ کە ئیمانی بە تیئۆریی شۆڕشگێڕانە هەیەو مەسئوولییەتێکی مێژوویيشـی لـە سەرشـانە، هـەموو ڕۆژێ زانـین‌و شـارەزایی خۆیـان نەبەنـە سـەرێ. هـەروەها پێشنیارێکی باش هاتوە کە هەر وەخت پلینۆم هەیە بـا سمیناریشـی لەگـەڵ بـێ کـە ئەوەش پێشنیارێکی بەجێیە.

وابکەین باسەکانی سمینارەکەمان لە نێو ریزەکانی حیزبیش‌دا بڵاو بنەوە. دەکـرێ وەك نامیلکەی سەربەخۆ یان لە "تێکۆشـەر"و چاپەمـەنیی دیکـەی حـیزبی‌دا بـڵاو بکرێنەوە.

قسە لە سەر "کورتەباس" ئێستا باسێکی زۆر زیندووە. بـا تـەواوی بچێتـە نێـو حیزب‌و قسەی لە سەر بکرێ. با بچێتە نێو کۆمـەڵانی خـەڵکیش، بـا ئـەوانیش بـە تـەواوی لـە قسـەو باسـی حـیزبی دێموکـرات ئاگـادار بـن. یەکـەم سـەرکەوتنی "کورتەباس" ئەوەیە کە خودی ئـەو باسـەی لـە نێـو حیزبەکـەمان‌دا پێـك هێنـاوە، سنووری داناوە لە نێـوان دێموکـرات‌و غـەیری دێموکراتـان‌دا. ئەگـەر "کورتـەباس" بچێتە نێو کۆمەڵانی خەڵك سەرکەوتنی پتر وەبار دێنێ. قەدری ئـەو "کورتـەباس"ە کە نووسراوە، لە دوارۆژدا دەزانـین، لـە دوارۆژدا نرخـی ئـەم چـەند لاپەڕەیـە باشـتر دەردەکەوێ. هەر بۆیە پێویستە لە دوارۆژدا تەنانەت کتێبیشی لـە سـەر بنووسـرێ. لەگەڵ ئەوە کە لە کۆنگرەدا ناکۆکی هاتە پێـش، بـەڵام پـاش باسـەکەی ئێسـتامان دەرکەوت کە لە سەر گیروگرفتە ئەساسی‌یەکانی "کورتەباس" ناکۆکیمان نیـە. ئـەوە خۆی سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە بۆ "کورتەباس"و بۆ حیزبەکەمان. نیشانەی ئەوەیە کە حیزبی دێموکـرات هـەم دێموکراتـەو هـەم ڕێکخراوێکـی شۆڕشـگێڕو زینـدووە. "کورتەباس" بۆ پتەوترکردن‌و یەکگرتووترکردنی ریزەکانی حیزبەکەمان هـاتوەو ئـەم ئەرکەی بە چاکی بەجێ هێناوە. ئێمە دڵنیـاین کـە لەمـەودوا سـیمای دێموکراتیـی حیزبی ئێمە بەرچاوتر خۆی دەنوێنێ. ئێستا لە بـاری فکری‌یـەوە ئـەندامانی حـیزبی

ئێمە یەکگرتووتر لە جاران. دەکرێ بڵێین پاش بەرنامەی حیزب "کورتەباس" نەخشی لە کۆکردنەوەی ئەندامانی حیزب لە سەر ڕێبازی حیزب لە هەموو نووسراوێك زیاتر بووەو ئەوەی لە "کورتەباس"دا هاتوە بۆ دوارۆژی حیزبەکەمان هەم لە کورتخایەندا و هەم لە درێژخایەندا تەئسیرێکی زۆر پیرۆزی دەبێ.

## ژێدەر:

* ئەم بەشە (شیکردنەوەی کورتەباس) دەقی پیادەکراوی نەواری وتارێکی شەهید دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو لە یەکێك لە پلینۆمەکانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دایە کە نزیك بە پێنج ساڵ بەر لە شەهیدبوونی گیراوە.

بەشێك لەباسەکانی ئەم وتارە، پاش ئەو ئاڵوگۆڕانە کە لە یەکیەتیی سۆڤیەتیو وڵاتانی دیکەی سۆسیالیستیدا روویان داوە، کۆن دێنە بەرچاو. نابێ لەبیر بچێ کە ئەو قسانە کاتێ گوتراون کە جارێ میخائیل گورباچۆف نەهاتبووە سەرکارو پرۆستۆریکاو گلاسنۆست لەگۆڕێدا نەبوون، بەلاّم بۆ ئەوەی وتارەکە رەسەنایەتیی خۆی بپارێزێ، بە باشمان نەزانی دەسکاریی بکەینو هەروەك هەبوو بلاّومان کردەوە.

## فەسڵی دووەم:

# ئابووریی سیاسی

- چەمکە گشتی‌یەکان
- ئابووریی سەرمایەداری
- سۆسیالیزمو ئابووریی سۆسیالیستی
- ئابووریی تێکەڵاو
- وەڵامی پرسیارەکان

## خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەشە لە کتێبەکە، وانەیەك بووە لە یەکەمین دەورەی بەرزی کادر لە ساڵی ١٣٦٣ لە زانکۆ (فێرگەی سیاسی ـ نیزامی)ی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، کە مامۆستای نەمر، کاك دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو لەو دەورەدا بەناوی ئابووریی سیاسی وتوویەتیەوە. ئەوەی کە لێرەدا هێنراوەو لە بەردەستتان دایە، لە نەوار وەرگیراوە کە لەوێو لە هەلومەرجی ئەوکاتەدا لە کلاسەکان تۆمار کراون.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە لەبەر هەلومەرجی شاخو شۆڕش، ئەو نەوارانە بە کەیفییەتێکی لاواز تۆمار کراونو گەیشتوونەتە دەستمان، بۆیە لە چەند شوێنێك روون نەبووە کە لەو نەوارانەدا چی گوتراوەو وشەکانمان بۆ دەستنیشان نەکراون. لە کۆتایی وانەکەشدا، بەشێك بۆ پرسیارو وەلاّم تەرخان کراوە کە لەبەر کەیفییەتی لاوازی نەوارەکان، پرسیارەکانمان بۆ روون نەبوو، بەلاّم وەلاّمەکانی مامۆستای شەهیدمان هێناوەتەوە.

ئاماژەکردن بەوەش پێویستە کە لەبەر پاراستنی دەقو "سندیت"ی شتەکە، هیچ دەستێوەردانێکمان لە رێزمانو داڕشتنی رستەکاندا نەکردوەو هەر ئەو شتەی کە کاك دوکتور قاسملوو لە کاتی وتنەوەی دەرسەکەدا وتوویەتی وەك خۆی هێنراوەتەوە.

# چەمکە گشتی‌یەکان

ئەمەویست پێش ئەوەی کە دەرسەکە دەست پێ‌بکا چەند شتێکتان عــەرز بکــەم. دیارە ئیقتیسادی سیاسی لە پێش هەموو شتێکدا عیلمــەو بــۆ فــێر بوونــی هــەموو عیلمێك دەبێ ئامادەیی هەبێ. ئەو ئیقتیسادە سیاسی‌یەی کە بۆ منیــان دانــاوە کــە لێرە عەرزتان بکەم، لە دانشگا ئێمە بــە سێ‌ســالان تــەواومان ئــەکرد. لــێرە شــەش سەعاتیان بۆ داناوم، کە لە ماوەی شەش سەعاتاندا دەرسی سێ ساڵەی ئیقتیســادی سیاسی خەلاس کەین. دیارە بۆخۆتان باش دەزانن کە ئــەوە مومکــین نیــە. کــەوابوو ئێمە دەبێ شێوەی دەرسەکەمان پوخت بێت، ئەوەندە بلێین کە دەکرێ. لەو ماوەیــەدا ناچار زیاتر باسی شتی گشتی دەکەین کە مەفهوومتریش بێ. یەك هۆی‌تریــش هەیــە کە دیارە ئەویش ئەوەیە کە بێگومان چونکە ئەوە کلاســێکی سیاســی‌یە ئــی حــیزبی دێموکراتە، کلاسێك نیە کە مەسەلەن بلێین کلاسی دووی دانشکەدەی فەننی بــێ کــە سەتحی تێگەیشتنو زانینیان تەقریبەن وەك یەك بێ. لێرە ئی‌وا هەیە دیپلۆمی هەیە یا زیاترە ئی‌واش هەیە کە ئیمکانی ئەوەی نــەبووە بچێتــە مەدرەســە چــەند کلاســێکی خوێندووە. ئی‌وا هەیە کە موتالعەی زۆرە ئی‌واش هەیە کە موتالعەی کەمە یان هــەر نەبووە. کەوابوو ســەتحەکەش ناهەمگوونــە وەك یــەك نیــە. ئــەوەش رێگــا نــادا کــە دەرسەکە بەو شێوەیە کە پێویستە بگوترێ.

مەبەستی مە لەو دەرسە چیە؟ لە سەرەتاوە بلێم نە ئەمن ئەو ئیدیعایەم هەیەو نە ئێوەش دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بن، کە لە مــاوەی ئــەو چــەند ســەعاتەدا ئێــوە فــێری ئیقتیسادی سیاسی بن. ئەوە پێم‌وایــە تــەوەقوعێکی بێ‌جێ‌یــە. چــاوەڕوانی شــتی وا

مەبن. بەڵام ئەگەر یەك نەتیجە وەربگرین سەركەوتووین. ئـەویش ئەوەیـە كـە ئێـوە پاش كلاسەكە بە دوای ئەوە بكەون كە ئەوە بزانـن ئیقتیسـاد بەگشـتی یـانیٚ چـی؟ تەقریبەن، ئەگەر ئەوەندە سەركەوتوو بین زۆر زۆر باشە. دەنا بە رۆژێك یان بـە چـەند رۆژ دیارە ئیقتیسـادی سیاسـی فـێر نـابن. كـەوابوو ئـەمن خولاسـەی دەكەمـەوە، ئیقتیسادی سیاسی ناتوانین هەمووی باس بكـەین، ئیقتیسـادی سیاسـی هـەمووی ناتوانین تیٚبگەین. بەڵام دڵنیاین ئیقتیسادی سیاسی فێر دەبـینو هـەر نـەبیٚ دەزانـین ئیقتیسادی سیاسی چیە، باسی چ دەكا؟ دووهـەمیش وەزعێكـی وا پێـك بێنـین كـە لەمەودوا بۆخۆمان پێمان خۆش بیٚ وەدوای بكەوینو بزانین كـە ئیقتیسـادی سیاسـی چیە؟ لێی بكۆڵینو لێی بپرسین، پرسیار بكەین.

ئەوە یەك بەش، بەشی دووهەمی بەوەندە تەواو نابیٚ. بەشی دووهـەم ئەوەیـە كـە ئێمە لە باتی ئەوە بچین هەمووی ئەوەی كە پێی دەڵێـن مەقوولـەی ئیقتیسـادی كـە ناوی هاتوە، مەسەلەن بزانین كە كار چیە؟ سەرمایە چیە؟و ئەوانە موتالیعە بكـەین. لە باتی ئەوە ئێمە شتێكی دیكەش دەكەین چونكە ئەوانەمان پیٚ موتالیعـە نـاكریٚ، وەختەكە تەنگە. ئێمە دەتوانین لە واقیٚعدا باسی ئەوە بكەین كە ئەو شتەی لـە بـاری ئیقتیسادیەوە بە كارمان دیٚ لە كاری سیاسیماندا ئەوەیە كە هـەر نـەبیٚ باسـی زۆر كورت دیارە باسی ئەوە بكەین كە كۆمەڵی ئادەمیزاد چۆن تەكامولی كـردوە؟ ئـەوە زۆر كورتە. بگەین بە سەرمایەداری باسی ئەوە بكەین كـە سـەرمایەداری چیـە؟ لـە باری ئیقتیسادیەوە ئەوە موهیمە دەبیٚ بزانین. چونكـو ئێمـە تـەرەفین لەگـەڵ دەیـان وڵاتی سەرمایەداریو دەبیٚ بزانین لە باری ئیقتیسادیەوە سەرمایەداری مانای چیە؟ لە پاش سەرمایەداری دیارە سۆسیالیزمە، لە باری ئیقتیسادیەوە دەبیٚ بزانین سۆسیالیزم چیە؟ ئەگەر وڵاتانی سەرمایەداریمان باس كرد كە بەشێكی زۆری وڵاتـەكانی دونیـان، وڵاتەكانی سۆسیالیستیمان باس كرد كە ئەوانیش هەروا. لەو نێوەڕاسـتەدا هێندێـك وڵات دەمێنێتەوە كە پێیان دەڵێن وڵاتانی جیهانی سێهەم. دیارە ئەوە كە بۆچی پێـی دەڵێن جیهانی سێهەم كە نەدەبوایە وا بگوتـریٚ، بـە نـەزەری مـن دەبوایـە بگوتـریٚ جیهانی یەكەم، كارم بەوە نیە باسێكیترە، بەڵام ئەو وڵاتانەی وەك ئـێرانی خۆمـانو وەكو زۆر وڵاتی دیكە، لەویٚدا ئیقتیسادەكە بە تەواوی سەرمایەداری نیـە. هـەر لـە كوردستانی خۆمان بگرین، دیارە سۆسیالیسـتیش نیـە، باشـە چیـە؟ ئـەوەش بـاس

دەکەین. کەوابوو سێ شێوە "تولیدی" بڵێین بەرهەمهێنانی ئابووری، کە فەرقیان هەیە، سەرمایەداری، سۆسیالیزمو ئەوەی کە پێی دەڵێن ئیقتیسادی تێکەڵاو، تێکەڵاو لە هەموو بارێکەوە، ئەو سێیانەش باس بکەین جا ئەگەر بتوانین لەو وەختە کەمەدا کە هەمانە هەموو ئەو شتانە باس بکەین پێموایە سەختە. با بچینە سەر باسەکەمان.

باسەکەمان ئەوەیە کە ئێمە ئیقتیسادی سیاسی موتالیعە دەکەین. ئیقتیسادی سیاسی دەڵێین زۆر کەس بیستوویەتی. کەوابوو ئێوە دیارە بیستووتانە زۆر لە باسو ئەوانە دوو ئیستلاحتان بیستووە، جا پێمخۆش بوو هەر لە سەرەتاوە ئەو دوو ئیستلاحە روون کەینەوە. یەك ئیقتیسادی سیاسیتان بیستووە، دوو سیاسەتی ئیقتیسادی. زۆر جار ئەمن "متوجە" بووم کە ئەو دوو شتە تێکەڵ دەکەن: "سیاسەتی ئیقتیسادی"، "ئیقتیسادی سیاسی". ئەوانە دیارە فەرقیان زۆرە هەرچەند کەلیمەکان لە یەکێکیاندا، یەکێکیان سفەتە ئەوی دیکە مەوسووفە، ئەگەر لە باری زمانەوە بڵێین. فەرق دەکا جێگاکەیان، لە یەکێکیان سیاسەت مەوسووفە، ئیقتیسادەکە سفەتە، ئەوی دیکەیان بە پێچەوانە. بەڵام ماناکەیان فەرقی زۆرە کە دەڵێین سیاسەتی ئیقتیسادی ئەوەیە کە یان حیزبێك یان وڵاتێك سیاسەتێك بەڕێوە دەبا بۆ هەڵسووڕانی ئیقتیسادی وڵاتەکە یان بڵێین حیزبەکەی خۆی سیاسەتێك بەڕێوە دەبا، شێوە بۆچوونێکی هەیە بۆ بەڕێوەبردنی، بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری ئیقتیسادیو ئەوە پێی دەڵێن "سیاسەتی ئیقتیسادی". مەسەلەن "رەیگان"، رەئیس جمهووری ئەمریکا، سیاسەتی ئیقتیسادیی ئەوەیە دەوڵەتی ئەمریکا. میتەران رەئیس جمهووری فەرانسە سیاسەتی ئیقتیسادیی ئابەو شێوەیە کە فەرقی هەیە لەگەڵ "ژیسکار دیستان" کە پێشتر رەئیس جمهوور بوو. کەوابوو، یا مەسەلەن سیاسەتی ئیقتیسادیی شا ئەوە بوو کە فەرقی هەیە لەگەڵ سیاسەتی ئیقتیسادیی رێژیمی خومەینی. کەوابوو سیاسەتی ئیقتیسادی ئەو شێوە هەڵسووڕاندنەی ئیقتیسادییە کە دەوڵەتێك یان بڵێین حیزبێك یان ئۆرگانێك بەڕێوەی ئەبات.

مەعمولەن باسی دەوڵەت دەکەین یا حەتا مەسەلەن شیرکەتێکی گەورە، شیرکەتێکی نەفتی گەورە سیاسەتی ئیقتیسادی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو سیاسەتە بەڕێوە ئەبا. بەڵام کە گوتمان ئیقتیسادی سیاسی وەزعەکە فەرق دەکا، ئیقتیسادی

سیاسی عیلمە، سیاسەتێك نیە کە کەسێ بەڕێوەی ئەبا. ئیقتیسادی سیاسی یــەعنی عیلمی ئیقتیساد، بۆ ئیقتیسادی سیاسی پێدەڵێن؟ ئـــەوە دیـارە لـە بۆچوونـی ئـەو کەسانە کە ئەساسی ئیقتیسادی سیاسیان داناوە لە قەرنی نۆزدەو ئەوانەی ئینگلستان بە تایبەتی، کە موهیم نیە ناوەکانیان بزانین ئەوەش بۆخۆ مەجبوور دەبن بچن بزانـــن کێ بوون. بەڵام ئیدی لە ئەواخری قەرنی هەژدەوە یــان باشـتر بڵێـم ئـەوایلی قـەرنی نۆزدەو بە تایبەتی لە نیوەڕاستی قەرنی نۆزدەوە لە سەد ساڵ لەوە پێشەوە تا ئێســـتا ئیدی ئەوە بۆتە ئیقتیسادی سیاسی، وەکوو عیلم تەماشای کراوە بــە تایبــەتی پــاش نووسینی کتێبی هەرەگەورەو هەرە مەشهووری "مارکس" کە ناوی "سەرمایە" بوو.

کەوابوو ئیقتیسادی سیاسی عیلمێکە کە باسی ئیقتیساد دەکا. بــەڵام ئایـا ئـەو ئیقتیسادی سیاسی‌یە باسی هەموو ئیقتیســاد دەکـا؟ باســی جوزئییــاتی ئیقتیســاد دەکا؟ فەرقی چیە لەگەڵ عیلمەکانی دیکەی ئیقتیســادی؟ مەســەلەن فــەرز دەکـەین ئێمە ئیقتیسادی سەنعەتیشمان هەیە، بەڵام، مــن مەســەلەن ئیقتیســادی ســەنعەتیم خوێندووە. یان دەڵێـــن مــن ئیقتیســادی زەراعــەتیم خوێنــدووە. بیســتووتانە ئــەڵێ ئیقتیسادی زەراعەتیم تەواو کردووە. ئەوەی دیکە دەڵێ مەسەلەن مــن بەرنامــەریزیم تەواو کردووە، بەرنامەریزی ئیقتیسادیم خەڵاس کردوە. کەوابوو یــەك نیــە، فــەرقیان هەیە. باشە کەوابوو ئیقتیسادی سیاسی نیسبەت بە عیلمــەکانی دیکــەی ئیقتیســاد ئەوەیە کە لە هەمووان گشتی‌ترەو قانوونەکانی گشتیی ئیقتیســـاد موتالیعــە دەکــا، کاری بە جوزئییات نیە. مەسەلەن فەرز دەکەین لە زەراعــەتدا وەزعــی ئیقتیســادی چۆن دەبێ؟ جوزئییاتی ئەو کارە ئیقتیسادی سیاسی نیە. ئیقتیسادی سیاسی قانوونە کولی‌یەکان موتالیعە دەکا. تیکراری دەکەمەوە ئیقتیسادی سیاسی عیلمەو عیلمێکە کە کاری بە قانوونەکانی گشتیی ئیقتیسادی پەرەئەستاندنی کۆمەڵە، ئەگەر بمانهەوێ تاریفی بکەین ئەوە دەبێتە ئیقتیسادی سیاسی.

دیارە تێدەکۆشم برێك شتەکە سادەتر بێت بۆ ئەوەی کە باش لێی حاڵی بین. ئێمە گوتمان سیاسەتی ئابووریــان هەیــە لــە پاشــان ئــابووری سیاســیمان هەیــە. ئــەوەیان سیاسەتێکە کە دەوڵەتێك یان شیرکەتێك یان حیزبێك بەڕێوەی ئەبا. ئەوەی دیکــەیان عیلمە، عیلمێکە کە ئێستا ئیدی زۆر تەکامولی پەیدا کردوە، زۆر کتێبــی لــە ســەر نووسراوە، لە واقیێــعدا عیلمــی هــەرە ئەساســی لــە هــەموو وڵاتــەکان، لــە هــەموو

دانشگاکان دایە. لێرەشدا ئابووریی سیاسی‌مان گوت کە ئابووریی سیاسی ئەو عیلمەیە کە قانوونەکانی گشتیی پەرەئەستاندنی کۆمەڵ موتالیعە دەکاو دیارە کاری بە جوزئییات نیە. لە پاشان لە واقیعدا لە بەینی عیلمە ئیقتیسادیەکاندا عیلمی عموومی‌یە. عیلمی هەمووانە، هیچ عیلمێکی ئیقتیسادی ناتوانێ بە بێ ئیقتیسادی سیاسی بچێتە پێش. لە واقیعدا ئەوەی کە پێی دەڵێن زانستی دایکە ("علم مادر")ە بە نیسبەت ئەوانی‌ترەوە. بۆیە هەرکەس هەر رشتەیەکی ئیقتیسادی بخوێنێ، مەجبوورە، ناچارە ئیقتیسادی سیاسی بخوێنێ.

ئیقتیسادی سیاسی سەرەتاکەی عیلمێکی موجەڕەدە، موجەڕەد یانێ لە واقیعدا زۆر موشەخەس نیە، ناتوانین نیشانی بدەین، بڕێك فیكری دەوێ. بەڵام هیچ رێگا نیە هێندێك ئیستیلاح، هێندێك کەلیمە هەیە دەبێ فێر بین لە ئیقتیسادی سیاسی‌دا، هەتا بتوانین فێری بین. لە پاشان کە باسی ئەو سێ شتەمان کرد بتوانین ئیسباتیان بکەین. جا ئەمن پێم‌خۆشە زۆریش نەبێ ئەوانە، چونکو لە مەقوولەی ئیقتیسادی سیاسی‌دا بە دەیان یان سەدان ئیستیلاحمان هەیە، کەلیمەمان هەیە، مەقوولەمان هەیە کە دەبێ فێری بین. ئەمن سێ چوارێکی هەڵدەبژێرم، ئەوانە کە هەرەپێویستن، ئەوانی دیکە ئەگەر وەختی خۆی بەکارمان هاتن باسیان دەکەین. بەڵام ئێستا ئەمن دەمەوێ سێ چوارێکیان هەڵبژێرم.

یەکێکیان کە پێم‌وایە هەموومان دەبێ بیزانین کە هەڵی‌دەبژێرین "کارە". رۆژ هەتا ئێوارێ قسە دەکەین، کارم هەیە، بابا وەختم نیە کارم هەیە، کارم هەبوو بۆیە نەهاتم، ئەو کەلیمەی کارە مورەتەب لە سەر زارە، باشە کار بە گشتی چیە؟ لە واقیعدا بە گشتی ئەگەر بمانهەوێ بڵێین، ئەوەیە کە پێوەندیی ئینسان یا لەگەڵ ئینسانەکانی دیکە یا لەگەڵ تەبیعەت دیاری دەکا. یا من لە تەبیعەتدا شتێك دەکەم، مەسەلەن دارێك دەبڕم، میوەیەك دێنم یان هەرچێك بڵێین لە سەرەتای بەشەریەتەوە ببێ، یان لەگەڵ ئینسانەکان رابیتەم هەیە. ئێستا مەسەلەن ئەوەی کە من لەگەڵ ئێوە قسە دەکەم پێی دەڵێن کار.

جا ئەوە بە گشتی ئاوا تەعریفی دەکەن. بەڵام دیارە ئێمە کارمان دابەش کردووە. ئەوەی دیکە کە بۆ ئێمە زۆر موهیمە نامانهەوێ زۆر لە سەری بڕۆین چونکە بەو وەختە ناکرێ. دەمانهەوێ بیکەین بە دووبەشەوە: کارێك کە بەرهەمی هەیە، کارێك

که بەرهەمی نیە. بەرهەم، نە بەرهەم لە واقیعدا بەرهەمی ماددی. مەسەلەن ئێستا یەکێك دەچێ کشتوکاڵ دەکا کارەکەی بەرهەمی هەیە. گەنم بەرهەمی کاری ئەوە. ئێمە لێرە دەرس دەڵێین، بەرهەمەکە نیە. بەڵام ئەوە بەرهەمە دیارە مەسەلەن لە واقیعدا بەرهەمێکی هەیە. بەرهەمەکە چیە؟ ئێوە شت فێر دەبن ئەو شتە دەچنە جێگایەك تەبلیغی دەکەن، نەتیجەیەکی دەبێ، کە ئەوە دەبێتە بەرهەمی ئەو کارە. بەڵام وا دابەشی دەکەین کارێك کە بەرهەمی هەیە، کارێك کە بەرهەمی نیە. ئەو دوو بەشە، ئەوانی دی لێیان گەڕێ، دەنا ئەگەر بمانهەوێ دابەشی بکەین یەکجار{زۆرن} فەقەت ئەوە بە کارمان دێ لە ئیقتیسادی سیاسیدا: بەرهەمی هەیەو بەرهەمی نیە.

دەتوانین هەر کارێکی ئێستا بڵێین، دەتوانین ئەوەیان یان ئەوی دیکە یان مەسەلەن فەرز بکە یەکێك، هونەرمەندێك گۆرانی دەڵێ، ئەویش کار دەکا. کارە بەڵام بەرهەمی ماددیی مومکینە نەبێ بەڵام ئەو گۆرانیە مومکینە تەئسیریش بکاتە سەر بەرهەمی ماددی، جاری وا هەیە ئینسان فیکر دەکاتەوە شتی وا نیە، بەڵام با هەیە. مەسەلەن فەرز دەکەین کە پێکەوە پازدە، بیست نەفەر کار دەکەن، فەرز دەکەین کە لە خەرمانێ کار دەکەن، ئەگەر گۆرانی بڵێن باشتر کاریان بۆ دەکرێ، هەر بۆیەشە خەڵکەکە گۆرانی دەڵێن. جووت دەکا شتێك دەڵێ، گۆرانییەك دەڵێ. بۆ دەڵێ؟ چونکە ئەوە موستەقیمەن تەئسیری هەیە لە سەری.

بەڵام ئێستا ئێمە دێینە سەر ئەو کارەی کە بەرهەمی هەیە، کارێکی کە بەرهەمی هەبوو کۆمەڵایەتیە. یانێ چی؟ یانێ ئەگەر لە سەرەتای ژیانی خۆیدا ئادەمیزاد برسی دەبوو دەچوو تێری دەخوارد، ئێمە بەوە ناڵێین کار ، ناڵێین کارێك کە بەرهەمی هەیە ، چونکو نەهاتۆتە نێو کۆمەڵ، بۆ کۆمەڵ هیچی نەکردووە، بۆخۆی خواردوویەتیو خەلاس بوو رۆیشت. هەروەها لە واقیعدا لەو وەختەشدا فەرقێکی زۆر بەینی ئینسانو حەیوان نیە. چونکو حەیوانیش هەر ئەوەی دەکا. ئەو وەختە ئێمە دەڵێین ئینسان دیارە تەعریفی زۆر دەتوانین بکەین، مەسەلەن دەڵێین لە مەیموونەوە هاتوە کە تەماشاتان دەکەم دەبینین ئەم تیئۆرییە زۆریش نادروست نیە! بەڵام لەوەی گەڕین. ئینسان دەڵێن لە پێش هەمووانda تەعریفی ئەوەیە کە حەیوانێکی

کۆمەڵایەتیە ("اجتماعی")یە، یانی چی؟ یانێ ئەو بەرهەمەی کە هەیەتی بۆ ئیجتماعە.

ئەگەر ئەو چەند کەسە کە دەچن میوە دێنن، بۆخۆیان لە پێشدا دەبنە یەك نەفەر، دەبێتە پازدە کەس ئەوە ئیشی ئیجتماعی بەشەرە، ئاوا لەپێشدا دەبێتە سەد کەس، دەبێتە چەندین سەد کەس، موهیم نیە، ئەگەر ئەوانە هەر ئەوەندە میوەیان دەس کەوێ کە خۆیان تێر کەن، کۆمەڵەکە لە جێگادا وەستاوەو هیچ حەرەکەت ناکا. کۆمەڵ ئەو وەختە دەست پێدەکا بە بەرەوپێشچوونو هەر ئەو وەختەش چەوساندنەوەو چەوسانەوە، ئیستیسمار پەیدا دەبێ کە ئەو سەد کەسە کە باسی دەکەین، زیاتر لەوەی بۆ خۆی ئیحتیاجی هەیە بەرهەمی دەبێ. مەسەلەن فەرز دەکەین ئیدی لەبەر ئەوەی پێمەڕەیەکی ئاسنی یا بەردیی درووست کردووە، عەسری حەجەر موهیم نیە، بەلاَم وەسایلێکی تەولیدی ئاوای درووست کردوە کە ئێستا ئەوەندە بەرهەم پێك دێنێ کە لە ئی سەد کەسەکە زیاترە، فەرز دەکەین ئی سەدوپێنج کەسە. باشە وا دابنێ کە ئەو سەد کەسە هەموو ڕۆژێ دەچین کاری دەکەین، لە پاشان دەبینین پێنج نەفەر زیادی دێنێ، بەرەبەرە ئەو فیکرەمان بۆ پێك دێ ئێستێ کەوایە ئەو زیادیە چی لێ دەکەین؟ بۆ هەموو ڕۆژێ سەد کەس کار بکەین با ٩٥کەس کارێ بکا. ئەو پێنج کەسەی کارێ نەکا چ بکا؟ ئەگەر کاریش نەکا هەر دەخوا، بەرهەمەکە گەیشتۆتە ئەو ڕادەیە کە بۆ سەدو پێنج کەس تەولید دەکا. ٩٥کەس دەتوانێ بۆ سەد کەس شت درووست بکا. هەر کە گەیشتە ئەوێ پێنج کەسەکە پەیدا دەبێ. جا جاری وا هەیە ڕەئیسی عەشیرەتە، جاری وا هەیە قەشەیە، جاری وا هەیە مەلایە، موهیم نیە، یەکێك کە ئیمتیازێك بۆ خۆی قایل دەبێت بۆ ئەوەی کار نەکا، ئەوانەی دیکە کار بکەن. پێنج کەسەکە جاری وا هەیە شوورایە، هیچ موهیم نیە. فەرق دەکا، لە ولاَتی موختەلیف فەرق دەکا.

ئەو پێنج کەسە کە کار ناکا، ئەو نەوەدو پێنج کەسە کار دەکا بایی سەد کەس، چ بەرهەمێکی بە ئیستلاَح پێك دێنێ پێکەوە دەخۆنو بەرەبەرە سەرەتای پەیدا بوونی تەبەقەشە، لە واقیعدا ئەساسی تەبەقە ئالێرەدا پەیدا دەبێ. کەنگێ پەیدا دەبێ؟ ئەگەر ڕۆژێك بپرسن، جا من پێم خۆشە ئێوە ئەوانە بزانن وەك ئەندامی حیزبی دێموکرات، چونکە بەداخەوە ئەوانەی کە زۆر ئیدیعایان هەیە لە بارەی موباریزەی

تەبەقاتیو نازانم چینی کرێکارو...، کە بۆخۆتان دەزانن هەر لەو دۆڵە پێنج، شەش حیزبی چینی کرێکاری لیٚیە، ئەوانە لێیان بپرسە باشە تەبەقە کەنگێ پێکهات؟ ئەساسی پێکهاتنی چ بوو؟ بڕوام پیٚبکەن نازانن. تەبەقە ئەو وەختە پێکدێ کە ئینسان ئەوەندە بەرهەمی زۆر دەبێ کە لە ئیحتیاجی ئەو وەختەی خۆی زیاترە. مومکینە لە ئێستادا کەمتر بەڵام ئی ئەو وەختە زیاترە. کە زیاتر بوو تەبیعی‌یە هێندێ کەس دەڵێ باشە ئێمە بۆ کار بکەین. کێن ئەوانە؟ یا مەلایە یا قەشەیە، دوعاخوێنە، هەرچی بێ. دیارە ئەوانە کە باسی ئەکەم ئی زەمانی کۆنە بەرەبەرە تەبەقە پێکهات. کەوابوو ئەساسی پێکهاتنی تەبەقە لە چیەوەیە؟ لە کارە. لەوەڕا کە یەکێك کار ناکا. ئەوان چی دەکەن، ئەو پێنج کەسە؟ ئەوان کاری دیکە دەکەن. مەسەلەن یەکێکیان دوعا دەخوێنێ، مەلایەتیش کارە ئیدی یان یەکێکیان دەبێ بە مەسئوول وەکوو شوورایەك، کوێخایەك، ریش سپی‌یەك هەرکەس هەر ئیشکالاتێکی بۆ هات دەچێتە کن وی. ئەو بۆی حەل دەکا. ئەویش کارێکە دی. بەڵام کاری چی نیە؟ کارێك نیە کە بەرهەمی ماددی هەبێ.

ئالێرەدا دووپاتی دەکەمەوە لە سەرەتا هەموو کاریان دەکرد، بەرهەمی ماددیشیان هەبوو. بەڵام ئێستا ئەوە جودا بووە، هێندێ کەس کارێ دەکەن بەرهەمی ماددیان هەیە، هێندێك کەس نیانە. جا بەرەبەرە ئەو تەقسیمی کارە رۆژبەرۆژ دەچێتە پێش. وای لیٚدێ کە ئێستا مەسەلەن ئەو وەختە فەرز دەکەین پێنج کەس بوون لە موقابیلی ٩٥کەسدا. ئێستا بچیە کۆمەڵێکی پێشکەوتووی سەرمایەداری یا سۆسیالیستی، دەبینی تەقسیمی کارەکە بە شێوەیەکە بە دەیان هەزار نەوع کار هەیە. دوو نەوع کار نیە دەیان هەزار نەوع کار هەیە.کاری تەولیدی دەکەن، کاریان بەرهەمهێنەرە، بەشێکیان کاریان بەرهەمی نیە، یانێ بەرهەمی ماددی نیە.

کەوابوو ئێستا ئێمە بێین ئەو کارە لە کۆمەڵێکی پێشکەوتووی سەرمایەداری یا سۆسیالیستی تەماشا بکەین، دەبینین کە ئەو کارە دیارە کاری کۆمەڵایەتی‌یە، ئیجتیماعی‌یە. بۆ ئیجتیماعیە؟ چونکو کارەکە نەتیجەی دێتە نێو کۆمەڵ، پێکەوە موقایسە دەکرێنو ئەو کارە دەبێتە کارێك کە بۆ کۆمەڵ دەکرێ. لێرەڕا شتێکی دیکە دێتە پێش، هەر لە سەرەتایەکەڕا بەشی ئەو پێنج کەسەتان لەبیرە، بۆ خۆیان نەیاندەخوارد، زیادی دەما، وا نیە؟ ئەوە بۆچی بوو؟ بۆ ئیجتماع بوو ئەو پێنج کەس

هەڵیبژاردبوون، یان دایاننابوون یان خۆیان بە زۆر خۆیـان سـەپاندبوو، ئـەوە موهیـم نیە. ئەوان دەیانخوارد. ئێستاش بەرەبەرە ئەوە هەروای لیٚدیٚ. یانی هــەر کەسـێکی کار دەکا لە ئیجتیماعی خۆیدا، چ وڵاتی سۆسیالیستی بیٚو چ وڵاتی ســەرمایەداری بیٚ کارەکەی بەرهەمی ماددیشی هەبیٚ کە ئێمە باسی دەکەین، دەبیٚ دووبــەش بــیٚ. بەشێکی ئەو بەرهەمە ئی خۆیەتی بەشێکی ئەو بەرهەمــە ئــی کۆمەڵــە. دیـارە لــە کۆمــەڵی ســەرمایەداریدا ئــی ســــەرمایەدارە کـــە ئیســـتیعمارەو لـــە کۆمـــەڵی سۆسیالیستیدا ئی هەموو کۆمەڵە. ئی هــەموو جامیعــەی سۆسیالیســتییە. باشــە پاشان باسی دەکەین، لە سۆسیالیزمدا ئەوە بە تەفسیل باسی دەکـەین. بـەڵام ئێسـتا پێمخۆشە هەر ئەوەندەمان زانیبیٚ.

ئێستا یەك مەسەلەی دیکەش لە سەر کار بڵێین، ئیدی خەڵاسی بکـەین. ئـەویش ئەوەیە وەختی خۆی کابرا مەسەلەن جووتـــیٚ گـای هــەبووە، ئێسـتاش هەمانــە، لــە کوردستان خۆ ماوە، کاری دەکرد. سەعاتێك کــاری دەکـرد، رۆژێـك کـاری دەکـرد. نەتیجەی ئەو کارە دەگەڵ ئەو کەسەی کە ئێستا بە تراکتۆرو کۆمباین کار دەکا، هەر لەو زەویەدا یەکێکە؟ یەك نیە. هەر ئەو یەك نەفەرەشە ها. یەك نەفەر تراکتۆرێکـــی هەیە، کۆمباینێکی هەیە. ئەوی دیکەش یەك نەفەر بوو جووتیٚ گــای هــەبوو. یــەك نەفەرەکە لە جێگای خۆیەتی، بڵێم یەك هێکتار زەوی هەیە، هەر ئەو زەویەیە، بــەڵام نەتیجەکەی چیە؟ بەرهەمی ئەو زەویە زیاتر بــووە. ئــەوە چــی پیٚدەڵێــن؟ ئــەوە لــە فارسیدا دوو کەلیمە بەکار دێنن. "بازدهی کار"و "حاصل بخشی کار". ئەو دووانــە لە کوردیدا بە حاسڵبەخشی بەکار دێنن. باشە چونکە مەفهوومە حاسڵبەخشیی کار زیاد دەبیٚ، یەك سەعات کاری ئێستا موقابیلی ١٠ سەعات،٢٠ ســـەعات یـا ١٠٠ سەعات کاری جارانە. کەوابوو حاسڵبەخشیی کار چیە؟ حاسڵبەخشیی کــار ئەوەیــە کە من بەرهەمەکە هەڵگرم تەقسیمی سەعاتی کار بکەم، هــەرچی زیـاتر بـوو ئــەوە حاسڵبەخشیەکە زیاترە. ئەگەر بە یــەك ســەعات جـاران یــەك کیلـۆ گــەنم دەسـت دەکەوت، ئێستا بە سەعاتێك ١٠کیلۆم دەست دەکەویٚ، مـــەعنای ئەوەیــە ١٠ جـار حاسڵبەخشی چۆتە سەریٚ. دەبینین کە زۆر زەحمەتیش دێتە پێش تا قازانج بکەین.

کەوابوو حاسڵبەخشیی کار ئەوە بە نەزەری ئێمە زۆر موهیمە. لە واقیعدا تەواوی کۆمەڵی بەشەر لە باری ئیقتیسادییەوە لــە رۆژی هــەوەڵ تـا ئێسـتا لــە ســەر ئــەو

کەلیمەیە، ئەو ئیستلاحە دانراوە. تەواوی هەدەفی ئەوەیە کە حاسڵبەخشی بباتە سەرێ، یانێ بە کارێکی کەمتر بەرهەمێکی زیاتری دەست کەوێ. لە هەر جێگایەکی ئەوە زیاتر بوو پێشکەوتووترە. ئێستا جا، باشە ئەگەر لە ئێوە بپرسن لە باری سەنعەتی‌یەوە پێشکەوتووترین وڵاتی دونیا کوێیە؟ دەڵێن چی؟ ئەمریکایە. بۆ؟ چونکە حاسڵبەخشیی لەوانی دیکە زیاترە. دیارە خەڵکی سادە وەك ئێمە نیە. ئێمە ئێستا ئیقتیساد دەزانین ئیدی، لەوڕۆوە وانیە؟ یانێ ئیقتیساد دەزانین. خەڵکی سادە دەڵێن ئەوە تەیارە درووست دەکاو نازانم بۆمبی ئەتۆمی هەیەو مومکینە ئاوا جواب داتەوە. بەڵام ئێمە وا جواب نادەینەوە. ئێمە کە ئێستا ئیقتیساد دەزانین دەڵێین چونکو حاسڵبەخشی‌یەکە بەرزترە. ئەمریکا حاسڵبەخشیی مەسەلەن لە سوئید بەرزترە، سوئید لە ئاڵمانی غەربی بەرزترە، ئاڵمانی غەربی مەسەلەن لە یونان بەرزترە، یونان لە ئێران بەرزترە. هەروەها دێتە خوارێ ئەگەر تەماشای مەسەلەن ئامارێکی سازمانی میلەلی موتەحید (نەتەوە یەکگرتووەکان) بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە چ وڵاتێك بڵێین پێشکەوتووترەو چ وڵاتێك کەمتر پێشکەوتووە.

بەڵام باشە ئەو حاسڵبەخشیی کارە ئەوە چۆن ئێمە بە قەوڵی کوردی خۆمان ناسی کەین، بیناسینو بزانین چۆنی حەسێب بکەین. چۆن ئاخر خۆ ئەو کارە میتر نیە بچم کارەکە ئەندازە بگرم، کە ئەوەندەی نەداوە، دەبێ مێعیارێکم بە دەستەوە بێ. ئۆسووڵەن ئێستا من هەر شتێکم هەبێ بیدەمە بازاڕێ دەبێ مێعیارێکم هەبێ، کە ئەو مێعیارە بە منی نیشان بدا کە ئەو شتومەکەی من ئەرزشی هەیە یان نیە. دەبێ شتێك هەبێ کە موعادڵێکی گشتی بێ، وەك ئاوێنە نیشان بدا کە ئەو شتەی من هێناومەتە بازاڕ، ئەو کارە، ئەو شتوومەکە، ئەو بەرهەمە، ئەوە بایی چەندە؟ بایی بە مانای ئەرزشە. پووڵیش هەر لەوێڕا پێکهاتووە.

دەنا ئەوەڵەکەی داستانەکەی دەزانن چۆن بوو؟ لێرەدا نازانم شیری دابە داپیرو ئەو داستانەتان بیستووە. جاران وابوو مەسەلەن دەیگوت ئەمن فلاَن شتم دەوێ. من دەچوومە بازاڕێ دەمگوت ئەمن پێمەڕەیەکم دەوێ، کابراش گەنمی دەویست، دەچوومە لای ئەو کابرایە دەمگوت پێمەڕەیەکم دەوێ. دەیگوت ئاخر گەنم دەیە. ئەمنیش گەنم پێ‌نەبوو، لۆکەم پێ‌بوو. لۆکەکەم دەبردە لای ئەو کەسە کە گەنمی پێ‌بوو، دەمگوت لۆکەت دەدەمێ گەنم دەیە. دەچم گەنمەکەی دەدەم پێمەڕەکە

وەردەگرم. باشە ساحیبی گەنمەکە کە من دەچووم لۆکەم بۆلای دەبرد، دەیگوت ئەمن لۆکەم ناویٚ ئەمن بزنێکم دەویٚ. باشە جا من ڕێگام چ دەبوو؟ دەبوا بچم لە پێش‌دا بزنێکی پەیدا بکەم، بزنەکە بدەم بە ساحیبی گەنمەکە. وانیە؟ پاشان گەنمەکە وەربگرم بیدەم بە ساحیبی پێمەڕەکەو لەوێڕا پێمەڕەکە وەربگرم. دیارە ئەوە هەتا ئەو وەختە کە ئاڵوگۆڕ زۆر کەم بوو، شتێکی زۆر زەحمەت نەبوو. ئێستاش هەر لە کوردەواری‌دا ماوە، کەم ماوە بەڵام جاران زۆریش هەبوو. مەسەلەن ترێی دەهێنا بۆ دێیەکی، دەیگوت ترێو گەنم سەربەسەر، کیلوێ ترێ لە موقابیل کیلوێ گەنم. یا سەربەسەر دەیانگۆڕییەوە. ئەوە بە نەزەری من شتێکی پاشماوەی ئەو وەختەیە.

بەڵام ئێستا دەبینین بە میلیۆن حەتتا میلیارد ئاڵوگۆڕ هەیە. خۆ ناکرێ کابرا بچێ ئەو هەموو گەنمە لە گیرفانی بکا یا مەسەلەن بی‌با بیدا پێمەڕەیەك وەربگرێ، ناکرێ، عەمەلی نیە. کەوابوو شتێکیان دیتەوە کە ئیدی ئەوە نەبێ، کە من ئەوەم برد هەر شتوومەکێ (شتوومەك بە مانای کاڵا) وەبەر چاوم کەوت، بیدەمێ، بمداتێ. ئەوە پووڵە، پووڵیش دیارە بۆ ئەوەی ببێتە پووڵ ئەوەڵەکەی، ئەساسەکەی لە زێڕەوە هاتووە. چونکو ئەرزشی تایبەتیی خۆی هەیە. ئەویش ئەگەر وەختتان هەبوو موتالیعە بکەن، بۆچی لە بەینی هەمووان‌دا زێڕ بووەتە پووڵ؟ ئەوە بۆ خۆی داستانێکی، چیرۆکێکی زۆر خۆشی هەیە لە باری عیلمیەوە. بەڵام ئێمە بەداخەوە وەختمان نیە باسی بکەین.

باشە جا ئەو پووڵە کەوابوو پێی دەڵێن موعادیلی گشتی، یانێ لە موقابیلی هەموو شتێك دایە. ئیدی پێویست ناکا لۆکە بدەی بە گەنم، ئێستا جا من ئەوجارە ئاوای دەکەم، ئەمن دێمە بازاڕێ مەسەلەن لۆکەم هەیە، دەمەوێ پێمەڕە بکڕم. ئیدی لۆکەکە دەبەم دەیفرۆشم، پووڵێ وەردەگرم. بە پووڵێ دەچم پێمەڕەکە وەردەگرم. هەر شتێکی دیکەشم پێ‌بێ دەیدەم بە پووڵ کە موعادلی گشتی‌یە، ئەو وەختە دەچم شتی دیکە دەکڕم. کەوابوو ئەوەش بۆخۆی لە مەرحەلەیەکی موعەییەنی پەرەئەستاندنی کۆمەڵ‌دا پەیدا دەبێ. ئەوەڵەکەی نیە حەتتا لە مەسەلەن زۆر کۆمەڵی وامان هەیە، دەبینی سەری گایان داناوە وەکوو پووڵ، یان مەسەلەن لاقی حەیوانیان داناوە وەکوو پووڵ. بەوە دەبژێرن، دیارە سەرەتاکەی مومکینە بەڵام لە پاشان کە وڵاتەکە دەچێتە پێشێو ئاڵوگۆڕ زیاتر دەبێ ئەوە ناکرێ کە مەسەلەن من پێنج کامیۆن سەری مانگام

پیٚبیٚ، چی؟ مەسەلەن شتی پیٚبکڕم، ئەوە عەمەلی نیە. بەرەبەرە پــوولٚ دیٚ. حـەتتا ئەو پوولەش ئیٚستا بۆخۆی تووشی کیٚشە بووە، لە پاشان چونکـە ئەوەڵەکـەی پوولــی زیٚو هەبووە، کاغەز نەبوو، حەتتا ئیٚستا ولاٚتی وا هەیــە هیٚشــتا پوولــی کاغــەز بــە تەواوی لەویٚ جیٚگای خۆی نەکردۆتەوە. مەسەلەن زۆر کەس هەبوون هەتا بیست، سی سالٚ لـــەوەپیٚش ئیمانیــان بــە پوولــی کاغــەز نــەبوو، وەریــان نــەدەگرت. هــەر لــەو کوردستانەدا دەیگوت ئەمن ئەوەم دەویٚ یا زیٚوم دەویٚ یا زیٚڕم دەویٚ. پاشان وەختیٚك نەبوو کە پوولٚ بدات.

باشە بۆ پوولی کاغەزی پیٚکهات؟ چونکە موعامیلەکە ئــەوەندە گــەورە بــوو لــە ولاٚتی بە تایبەت سەرمایەداریدا کــابرای ســەرمایەدار دەهــات دەیگــوت بــایی دوو میلیۆن دۆلار گەنم دەیە. باشە دوومیلیۆن دۆلار ئەگەر دەگیرفانی بنیٚ، با زیٚڕیش بیٚ ئەوە دەبیٚ چەندین کامیۆن لەگەلٚ خۆی بیٚنیٚ، ئەوەش هەر نەدەبوو. بەرەبەرە گوتیــان لە واقیعدا ئەوەی لە بــانك دادەنیٚــن لــە جیٚگــای پوولــی کاغــەزیان دەنــیٚ. پوولــی کاغەزیان لە جیٚگای ئەوەی دانا کە پشتیوانەی ئەو بــیٚ. لــە بــاتی ئــەوە کــە ئیٚمــە زیٚڕەکە ئالٚوگۆڕ بکەین، کاغەزەکە ئالٚوگۆڕ دەکەین. زیٚڕەکەش لە جیٚگــای خۆیــەتی. بەلاٚم دیارە ئەوە سەرەتاکەی بوو. ئەو کاغــەزە بۆخــۆی بــوو بــە موشــکیلی دیکــە. بەرەبەرە وای لیٚهات، کە ئیدی ئەو پشــتیوانیەی نــەما، یــانیٚ لــە ســەرەتادا ئــەتۆ دۆلاریٚکی کاغەزت بردبا هەر بانکیٚکی ئەمریکایی گوتبات ئەوە دۆلاریٚکی کاغــەزی دۆلاریٚکی زیٚڕم بدەنیٚ، ئیٚستا هیچ بانکیٚکی دونیا لە موقابیلی پوولی کاغــەزدا بــەو شیٚوەیە زیٚڕت ناداتیٚ. بۆ؟ یەعنی لە واقیعدا پشیتوانەکە بەو شیٚوەیە نەماوە. ئەوەش بۆخۆی هیٚندیٚ فورسەتی پیٚکهیٚنا.

بۆ ئەوەی باش حالی بن ئیٚستا ئیشــارەیەکی پیٚدەکــەم. ئەگــەر دەولــەت کەوتــە تەنگانە پوولی نەبوو چی بکا؟ پوولی بیٚ پشتیوانە چاپ بکا بــە کــەیفی خــۆی، وەك جمهوری ئیسلامی خۆمان کە یەکیٚك لە ریٚگاکانی بە خەیالی خۆی چارەســەر کردنــی وەزعی ئیقتیسادی ولاٚت ئیٚستا پیٚی وایە ئەوەیە کە پوولی چاپ دەکا. دیارە پوولـــی بیٚپشتیوانە کە چاپ بوو نەتایجی یەکجار زۆر خراپی هەیە، دەبیٚتە هۆی گرانـــی. لــە واقیعدا چاپ کردنی پوولی بیٚپشتیوانە، دراوی بیٚپشتیوانە مەسەلەکەی حــەل ناکــا. مەسەلەکە وەپاش دەخا. وەکوو ئەوەیە کە مەســەلەن یــەکیٚك موعتــاد بوویٚــت بــە

فەرزکەین تریاك، ئەو موعتاد بوونە ئەوەیە کە لە ئەوەڵەکـەیدا کـەمتری مەسـرەف دەکا، بەڵام هەرچی زیاتر دەڕوا دەبێ زیاتر مەسرەف بکا بۆ ئـــەوەی خـۆی رابگـرێ. هەرچی زیاتر مەسرەف دەکا ئۆرگانیزمی بەدەنی خۆی زیاتر تێك دەدا. ئەوەش وایە، ئیقتیسادو چاپ کردنەکەش وایە. هەرچی دەچێتە پێش زیاتر ئیحتیاجی هەیـە پـوولْ چاپ بکاو هەرچی زیاتر چـاپ بکـا ئیقتیسـادەکەی ناسـالمتر دەکـا، خراپـتر دەکـاو ئیحتیاجی بۆ چاپ کردنەوەی پوولْ زیاتر دەبێ. عەینی وەکو کـابرای تریـاکی هـەتا لەبەینی دەبا.

دیارە ئەوە حاشیە بوو. بەڵام هەرچی زووە بگەڕێینـەوە سـەر کارەکـەی خۆمـان. کەوابوو گوتمان کارمان هەیە. کـاری بەرهەمهێنـەر، کـاری بـێ بەرهـەمی مـاددیو حاسڵبەخشیی کارمان باس کرد. بەڵام گوتمـان حاسڵبەخشـیی کارمـان بـۆ ئـەندازە ناگیرێ دەبێ بە پوولْ ئەندازەی بگرین. بەڵام پووڵیش چۆن ئەندازە دەگـیرێ؟ ئـەویش ئیشکالاتێکی زۆری هەیە.

کەوابوو ئێستا دەمانهەوێ مەسەلەن فەرزکەین دوو وڵاتمان هەیە جارێ وا دادەنێین دوو وڵاتـی مەسـەلەن "الـف"و "ب"، وا دادەنێـین ئـەو دوو وڵاتـــە هـــەردووکیان جەمعییـەتیان وەك یەکـە، دانیشـــتوویان مەســـەلەن ١٠ ملیۆنـــە، هـــەردووکیان پووڵەکەشیان وەك یەکە وا دادەنێین بۆ ئەوەی بکەوینە نێو مەسەلەکە، باشە جا ئێمە چووزانین ئەو وڵاتە پێشکەوتووترە لە باری ئیقتیسادی یان ئەوی دیکـــەیان. بــە چـی دەزانین؟ بە حاسڵبەخشیی کار. ئەندازە گرتنی حاسڵبەخشیی کـار بۆمـان زەحمەتـە، ئێمـە لـێرەدا مێعیـارێکی ئیقتیسـادیی دیکـەمان هەیـە کـە هـەموو ئامـــارێکی ئیقتیسادی، کتێبێکی ئیقتیسادی تەماشـا بکـەن، ئـەلێرەدا باسـی دەکـا، ئـەویش ئەوەیە کە لە فارسیدا پێـی دەڵێـن "درآمـد ملـی"و ئێمـە پێـی دەڵێـین "داهـاتی نەتەوەیی". داهاتی نەتەوەیی چیە؟ داهاتی نەتەوەیی هەموو ئەو بەرهەمە ماددیەیە کە لە ماوەی ساڵێکدا لە وڵاتێکدا پێكدێ. تەواوی حاسڵاتی زەراعـــەتو بەرهـەمی سەنعەتو ئەوەی کە لە رێگاوباندا کار کراوە، هـــەموو کـۆ دەکرێتــەوە، ئـەوە پێـی دەڵێن داهاتی نەتەوەیی نە ئەو هەمووە کە هەیەتی لە وڵاتدا، نە ئەوە نـا، بۆچـی؟ چونکە هەر وڵاتێك مەسەلەن ئێران بگرن، ئـێران ئێسـتا مقدارێکـی زۆر کارخانـەی تێدایە، مقدارێکی زۆر رێگاوبانی هەیە، زەراعەتی هەیە، تراکتۆری هەیە، ماشـێنی

هەیە. بەلاّم ئەوە ئی ساڵەکانی پێشووە ئەوانە ئیتر حەسێب ناکرێن، ئەوەی لەو یەك ساڵەدا بەرهەممان هێناوە، ئەوە لە زەراعەتدا روونترە، لە زەراعەتدا، کشتوکاڵدا هاسانترە، ئەو گەنمەی کە لەویّ ساڵ بە ساڵ پێكدێ، ئەوە لە زەراعەتدا کۆ دەکەینەوە لەگەڵ ئەوەی کە لە سەنعەتدا پێكهاتووە هەموو قیمەتەکەی حەسێب دەکەینو کۆ دەکەینەوە، دەبێتە داهاتی نەتەوەیی.

باشە جا ئەگەر گوتمان داهاتی نەتەوەیی مەسەلەن دوو ولاّت بلّێین بۆ ئەوەی کە تەقریبەن وەك یەك بن، برێکیش دوور نەبن لێرە، مەسەلەن تورکیەو ئێران. ئێرانو تورکیە تەقریبەن جەمعی‌یەتەکەیان وەك یەکە، تورکیە برێك جەمعی‌یەتی لە ئێران زیاترە بەلاّم خاکی تورکیە لە ئێران کەمترە. بلّێین ئەوە تورکیە ئەوە ئێران، باشە، ئەگەر گوتمان داهاتی نەتەوەیی‌یان وەك یەکە هەر دەستبەجێ مانای ئەوەیە کە حاسلّبەخشیشیان وەك یەکە. وانیە؟ ئەگەر زەمینەی کاریش بیّ، بەلاّم ئەگەر گوتمان جا داهاتی نەتەوەیی تورکیە زیاترە ـ دیارە ئی ئێران زیاترە ـ یا ئی ئێران زیاترە لە تورکیە مانای ئەوەیە کە دیارە ئێران وەزعی ئیقتیسادی پێشکەوتووترە. باشە، بەلاّم ئەوە خۆ ئەو داهاتی نەتەوەیی‌یە وەك ئەوەیە کە ئێمە بنەماڵەیەکمان هەبیّ بیست کەسی تێدا بیّ. ئەوەی کە مەسئوولی، خاوەنی بنەماڵەکەیە داهاتی مانگیّ بلّێین دوو هەزار تمەنە یەکیّ سەد تمەنیان بداتیّ چی دەبیّ؟ شوغڵیان وەك یەك بێت، بەلاّم ئەگەر وای لیّکرد، جا ئێستا ئێمە دەبیّ بزانین چۆنە لە کۆمەڵدا. ئایا ئەو داهاتی نەتەوەیی‌یە هەموو کەس وەك یەك وەردەگریّ؟ هەموو داهاتیان وەك یەکە؟ خۆ وانیە. لە ئێران ئی وا هەیە حقووقی هەزار تمەنو بە تایبەتی زەمانی شا بلّێین ئی واش هەبووە حقووقی پەنجا هەزار تمەن بووە یا زیاتر بووە. کەوابوو داهاتی نەتەوەیی‌یەکە وەك یەك دابەش ناکریّ. بەلاّم ئێمە ئەگەر بمانهەویّ ـ ئەوەش بۆ ئێمە موهیمە ـ چی لیّکەین؟ بێین داهاتی نەتەوەیی ئەوەی کە گوتمان هەزار تمەنە، دابەش بکەین بە سەر دانیشتووانی ولاّتەکەدا، هەرچی هاتە دەستمان زۆر بە کوردی سادە پێی دەلّێین داهاتی سەرانە. سەرانەداهاتمان ئەوەندەیە. بەلاّم ئەوە مانای ئەوە نیە کە هەموو کەس ئەوەندە وەردەگریّ، ئەوە نێوەنجەکەیەتی، دابەشمان کردوە. مەسەلەن فەرزکەین هەر لە ماڵیشدا وایە. مەسەلەن کابرایەك ١٠سەر ماڵو هەزار تمەنیش داهاتیانە. باشە دابەشی ناکەن. منداڵە چکۆڵەکە کە مەسەلەن عومری دوو ساڵە خۆ سەد تمەنی

ناداتیٚ، بەلاٚم ئەوی منداڵە گەورەکەیانە مەسەلەن عومری پازدە یان بیست ساڵە، ئەو دووسەد تمەنی دەداتیٚ، سیٚسەد تمەنی دەداتیٚ، لە حاڵێکدا منداڵە چکۆلەکە مەسەلەن پەنجا تمەن خەرج بکا. یەعنی فەرقیان هەیە. داهاتی نەتەوەیی ئەوەی کە ئەمە دەڵێین داهاتی سەرانەی نێوەنجی.

کەوابوو داهاتی نەتەوەیی ئەو بەرهەمە ماددیەیە کە ولاٚتێك لە ماوەی ساڵێکدا بەرهەمی دێنیٚ. ئەو بەرهەمەی کە لە ماوەی ساڵێکدا پێكهاتووە، ئێمە بە پوولٚ حەسێبی بکەین، دابەشی بکەین بە سەر هەموو دانیشتوواندا، دەبێتە داهاتی سەرانە. ئەمە پاشان لە قسەکانماندا هەر دێتە پێش، داهاتی سەرانە وابوو و داهاتی سەرانە وای بەسەر هات، جا بۆیە لە ئێستاوە دەمهەویٚ کە روون بێتەوە داهاتی سەرانە مەبەست چیە؟ کەوابوو ئەمە مێعیارێکی زۆر باشمان وەدەست کەوتووە، لە هەر ولاٚتێکدا داهاتی سەرانە لە هەموو ولاٚتەکانی دیکە زیاتر بوو، ئەو ولاٚتە پێشکەوتووترە.

دیارە داهاتی سەرانە حەسێب کردنەکەیشی برێك ئاوا هاسان نیە. چونکە ئێمە چمان دانا لەویٚ؟ گوتمان دانیشتوانیان وەك یەك بیٚ. ئەوەمان حەل کرد، دانیشتوانیشیان وەك یەکیش نەبن بە سەر دانیشتواندا دابەش دەکەین. بەلاٚم ئێستا ئێمە دەمانهەویٚ ئێران‌و ئەمریکا موقایسە بکەین، جەمعی‌یەتی ئەمریکا پێنج ئەوەندەی جەمعی‌یەتی ئێرانە، دووسەدو پەنجا میلیۆنەو ئێرانیش چل میلیۆن، بلێین شەش بەرامبەری ئێرانە. باشە، ئەوە دەتوانین حەسێب بکەین، یا تەقسیم بەر شەشی دەکەین یا زەربدەر شەشی دەکەین یا شتێکی دیکە، ئەمریکا دەڵیٚ ئەمن داهاتی سەرانەم دەهەزار دۆلارە تەقریبەن، هەر یەك نەفەر ئەمریکایی ساڵانە بایی دەهەزار دۆلاری داهات هەیە. ئێرانیش دەڵیٚ ئەمن دەهەزار تمەنە فەرز دەکەین، باشە، ئەمن ئەو تمەنە چۆنی ئەکەمە دۆلار؟ ئەو دۆلارە چۆن بکەم بە تمەن؟ ئەگەر بە پێی شتی بانکیی بکەم، دەڵێم هەر ئێرانی‌یەك هەزار دۆلار داهاتیەتی. بەلاٚم ئەگەر ئەوەی نەکەم، ئەوەی بکەم کە ئەوە لە بازاڕی رەشدا هەیە، یەکێك دەڵیٚ دۆلار دە تمەنە، نەخێر دۆلار پەنجا تمەنە، ئەگەر بە پەنجا تمەن حیساب بکەم، دەهەزار تمەن دیارە زۆر کەم دەبیٚ، دەبێتە دووسەد دۆلار. زۆر فەرق دەکا. ئەویش یەکێکە لەو ئیشکالاتانەو بە تایبەت ئەگەر ئەوە مەربووت بە ولاٚتەکانی سەرمایەداری بیٚ، هەموویان‌و ئەو

دونیای سێهەمەیش لە پاشان باس دەکەین، جوزئـی لـە واقیـعدا سیسـتمی پوولـی، دراوی ولاتانی سەرمایەداری حەسێب دەکرێن. لێرە هاسانترە بەلام کە بوو بـە ولاتـی سۆسیالیسـتیو سـەرمایەداری ئـەوە لـەوێدا ئیشـکالاتێکی یـەکجار زۆر پێـکدێ، مەسەلەن یەکێك دەڵێ ئیتیحـادی شـوورەوی داهـاتی سـەرانەی مەسـەلەن دووسـەد رووبلە، باشە، ئەتۆش دەتوانی چۆنی حەسێب بکەی؟ بە رەسمی ئـەوەی کـە دەوڵـەتی ئیتیحادی شوورەوی دایناوە حەسێب بکەی؟ بە رەسمی ئـەوە کـە دەوڵـەتی ئـەمریکا دایناوە حەسێب بکەی؟ بە بازاڕی ئازاد کە وجوودی نیە حەسێب بکەی یا بە بـازاڕی رەشی حەسێب بکەی؟ ئەوە بە نەزەری من زەحمەتە، ئێمە خۆمان تووشی ئەو کێشەیە نەکەین، دیارە رێگای حەسێب کردنی هەر هەیە. عیلمی ئیقتیساد بێدەسـەلات نیـە لەوەدا. بەلام مەبەستم لەوەش ئەوەیە کە مەعموولەن هێناویانە ئێسـتا، حـەتتا ئـی ولاتانی سوسیالیتیش دەڵێن داهاتی سەرانەیان ئـەوەندە دۆلارە. بـە دۆلار حەسـێبی بکە.

جا ئەگەر ئێمە تەماشا بکەین ئێستا دەتوانم پێتان بڵێم کـە داهـاتی سـەرانەمان هەیە لەو دونیایەدا لە سەدو چەند دۆلارەوە دەست پێدەکا. سەد دۆلار، تـەنیا سـەد دۆلار بۆ ساڵێکی، ئەویش بۆ نێوەنجی‌یەکەی، واقعییەتەکەی لەوەش کەمترە وەك بزانم لە سەد دۆلارەوە دەست پێدەکا، هەتا تەقریبەن شازدە هەزار دۆلار. دیارە ئەوانی کە زۆر لە سەرەوەن دوو بەشن، با ئەوەش روون کەینەوە. بەشێکیان وەك ئـەمریکا، وەك سوئێد، وەك ئالمانی رۆژئاواو فەرانسەو سویسو کاناداو ئەوانە، ئیقتیسادەکەیان زۆر پێشـکەوتووە بۆیـە داهاتەکـەیان ئـاوا زۆرە. بـەلام بەشـێکیان ئیقتیسـادەکەیان پێشکەوتوو نیە بەلام داهاتیان زۆرە، وەك کوێ؟ وەك کوەیت، عەرەبستان سـعوودی، وەك قەتـەر، وەك ئیمـاراتی موتـەحیدەی عـەرەبی، ئێسـتا ئـەوەڵ ولات ئیمـاراتی موتەحیدەی عەرەبی‌یە لە باری داهـاتی سـەرانەوە. چونکـە نـەوتێکی زۆری هەیـەو دانیشتووانی کەمەو کە دابەشی دەکەی بە سەریاندا دەبێتـە سـاڵێ حـەڤدە، هـەژدە هەزار دۆلارو لە ئەمریکاش زیاترە، بەلام ئەوە بەو مانایە نیە کە ئیقتیسادەکەی لـە ئەمریکا پێشکەوتوترە. ئەوە بەو مانایەیە کە پێی دەڵێن لە فارسی‌دا "اقتصاد یـك پا" یانێ لە واقیعدا لە سەر یەك رشتەی ئیقتیسادی دامەزراوە، کە ئـەویش نەوتـە. ئەگەر نەوتەکەی لێ بستێنین لە برسـان دەمـرێ. ئێسـتا هـەر ئـەورۆ مەسـەلەن لـە

کوەیتدا نەوت داهاتی نەبێ، ئاویشیان نیە بخۆنەوە، چونکە ئاوەکەش لە واقیعدا بە نەوتی دەکڕن.

کەوابوو ئێمە کە دەڵێین پێشکەوتوو، دەبێ لە هەموو بوارەکانەوە تەماشای بکەین. پێشکەوتووترین وڵاتی جیهان لە باری ئابووریەوە ئەو وڵاتەیە کە داهاتی سەرانەی لە هەموویان بەرزتر بێ و ئەو وڵاتانەن کە زیاتر لە باری ئیقتیسادیی‌یەوە پێشکەوتووترن: ئەمریکاو سوئێدو سویس، فەرانسە، ئاڵمانی غەربی و دانمارك و کاناداو وڵاتانی ئیسکاندیناوی بەگشتی، نیوزلەندو ئافریقای جنووبی و ئیتالیایە. ئەوانە وڵاتانی سەرمایەداریی پێشکەوتووترن، ئێستا ئێمە ئیدی شتەکانمان هاتە دەست. یانێ تێگەیشتووین لە ئیقتیساددا لە کارەوە هاتووین تا گەیشتووین بە داهاتی سەرانە. کەوابوو ئەو شتانە ئێمە دەبێ بزانین کارە، کاری بەرهەم‌هێنەرە، کارێك کە بەرهەمی ماددی نیە لە پاشان حاسڵ‌بەخشیی کارە، لە پاشان داهاتی نەتەوەیی و داهاتی سەرانەیە.

ئەوانە بە نەزەری من باش بزانن ئەو وەختە دەتوانین بچینە سەر ئەو سێ‌شتەی کە باسمان کرد، ئەوە موتالیعە بکەین. لە ئیقتیسادی سیاسی‌دا ئەوەی کە پێی دەڵێن مەقوولە ـ داهاتی نەتەوەیی مەقوولەیە ـ ئێمە بە سەدانی وامان هەیە کە ئێمە دەبێ بزانین، ئەگەر بمانهەوێ باش بزانین. بەڵام ئێمە جارێ لێی دەگەڕێین، وەکوو گوتمان ئەوەندەی دەبێ بزانین کە بۆ ئەو دەرسەمان پێویستە.

ئێمە باسمان کرد کە لە سەرەتاوە کە کۆمەڵ دەست پێ‌دەکا بە بەرهەم، مەسەلەی زیاد بوونی ئەو بەرهەمەمان باس کرد، ئەو نوختە حەساسەمان باس کرد کە لێرە ئیستیسمارو تەبەقەو ئەوانە هەموو پەیدا دەبێ هەتا دەچێتە پێش. ئێمە لە عیلمی ئیقتیساددا تەرەفین لەگەڵ پێنج مەرحەلە لە پەرەئەستاندنی کۆمەڵ. پێش هەموویان ئەوەی کە دەڵێن کۆمۆنی سەرەتاییە. کۆمۆنی سەرەتایی ئەوەیە کە لە واقیعدا هیچکەس خاوەنی هیچ وەسیلەیەکی تەولید نیە، هەموو پێکەوە کار دەکەن و هەموو پێکەوە دەخۆن، ئەوەی کە باسمان کرد. هیچ شتێکی زیادیش نیە کە یەکێك بێ هەڵگرێ و بڵێ ئەمن لەوڕۆوە کار ناکەم کەسی دیکە کار بکا ئەمن بەرهەمەکەی بخۆم، ئەوە نیە هەموو پێکەوە کار دەکەن و هەموو پێکەوە دەخۆن. لە بەر ئەوە

تەبەقەش نیە، لە بەر ئەوە چەوسانەوەش نیە. ئەوە پێی دەڵێن کۆمۆنی سەرەتایی، دیارە ئەوە بە سەدان ساڵو سەدان هەزار ساڵ درێژەی بوو.

ئەوە درێژترین مەرحەلەی لە واقیعدا ژیانی بەشەرە لەو وەختەی بەشەر پێکهاتووە هەتا ئاخری کۆمۆنی سەرەتایی. ئەوە لە ئاخیرەکەی ئەو نوختەیە کە بەشێك پەیدا دەبن دەڵێن ئێمە پێویست نیە کار بکەین. چ نیازی هەیە کار بکەین؟ پێنج شەشێکیان ئەوانەی لە هەموویان سەرەوەترن یا زیرەکترنو یا رەئیس عەشیرەتە یا مەلایە، رەئیس قەبیلەیە، خولاسە ئەو کارکەرە کە کاری نەکرد بەرەبەرە تەقسیم دەکرێ.

مەرحەلەی دووهەمەکەی یا قۆناغی دووەمەکەی ئێمە پێی دەڵێین کۆیلەتی یا ئەوە فارس پێی دەڵێ "بردەداری". ئەو وەختەیە کە ئیستیسمار هەیە، چەوسانەوە هەیە. زۆریش روونە ئەویش ئەوەیە کە کۆیلە "بردە" هەرچی دەیکا هەر بەرهەمێکی هەبێ ساحیبەکەی لێی دەستێنێ، ئەوەندەی دەداتێ کە لە برسان نەمرێ. بۆ ئەوەی کە بتوانێ سبەیش کاری بۆ بکا. لەوەش زیاتر، شتومەکە! دەتوانێ بیفرۆشێ. خەریدو فرۆشی ئازادە، دەیبا لە بازاڕدا وەکوو ئەسپێ دەیفرۆشێ، بارەکەی دەفرۆشێ ئینسانەکەیش دەفرۆشێ، ئەوەش مەرحەلەی دووهەم.

پاشان مەرحەلەی سێهەم، مەرحەلەی ئەوەی کە دەڵێن مەرحەلەی فێئودالیزم، دەرەبەگایەتی، کە ئەو وەختە دیارە وەزعەکە فەرقی کردوە. ناتوانێ ئەو کەسە کە کاری بۆ دەکا بیفرۆشێ. باسی دەکەین کە ئەوە چۆنەو شێوەی بەرهەمهێنان لە پاش فێئودالیزمیش، سەرمایەدارییە. لە پاش سەرمایەداریش سۆسیالیزمە کە بۆخۆی مەرحەلەیەکی سەرەتایی ئەو کۆمەڵەیە کە پێی دەڵێن کۆمۆنیزم کە سەرتان لێ دەرنایە. ئەوە ناتوانین ئێستا بڵێین چونکە ئەوە جارێ زۆر دوورو درێژە یانێ لە عومری ئێمە حەتمەن درێژتر دەبێ. جا ئەوە با بێڵێن بۆ نەسڵی داهاتوو، بەڵام ئەوە کە بۆ ئێمە نەقدە سۆسیالیزمە کە باسی دەکەین. باشە، جا پێم خۆشە دیققەت بکەن ئەویش مەسەلەیەکی قووڵە لەو پێنجە.

کۆمۆنی سەرەتایی لە هەموو کۆمەڵێکی ئادەمیزاددا هەبووە. هیچ جێگایەك نیە کە ئەو کۆمۆنە بەرچاو نەبێ. لە هەر جێگایەك ئادەمیزاد هەبووە، ئەو کۆمۆنەیش هەبووە. ئیدی جا ئەوە باسی ئەوەیش ناکەم کە عیلم دەڵێ کاتێك لەو وەختەوە کە

مەیموون بۆتە ئینسان یا لەو وەختەوە کە خودا حەزرەتی ئادەمو حەواى خەلق کردووە، ئـەوەش باسـێکی فەلسـەفیـیە. کۆمۆنـی سـەرەتایی لـە هـەموو کۆمـەڵێکدا لـــە ئۆسترالیاش هەیە، لە ئەمریکاش هەیە، لە ئاسیاش هەیە لە هەموو ئـــەو وڵاتانــەدا هەیە، زۆریش درێژە سەدان هەزار ساڵ شایەد زیاترە. بـەڵام بـەردەداری (کۆیلـەتی) بەو شێوەیە کە ئێمە لە رۆمو لە یوونان دەبینین کە وڵاتــانی کلاسـیکی ئـەوێن، ئـەو بەردەداریەن، ئەو کۆیلەتیەن. ئـەوە لـە وڵاتـانی ئاسـیاییدا نیـە. هـەر لـە ئـێرانی خۆشماندا ئەوە نەبووە، لە میســریش ئـەوە نـەبووە، کـەوابوو کۆیلـەتی بـە شـێوەی کلاسیکییە کە هاتووە، مەرحەلەیەکی، قۆناغێکی ئیجباری نیە حەتمەن دەبێ ببــێ، جارجار کۆمەڵ بازی داوە بە سەریدا.

دێینە سەر فێئودالیزم، دەرەبەگایەتی، چ پێمان خۆش بێو چ پێمان ناخۆش بـێ ـ نازانم کورە دەرەبەگتان تێدایە یان نە ـ ئەو دەرەبەگایەتییە لــە هــەموو جێگایــەکدا هەیە. شێوەکەی فەرقی هەبووە. ئێمە دەتوانین لە پاشان باســی بکـەین کـە شـێوەی دەرەبەگایەتی مەسەلەن کوردستانی ئێمە فەرقی لەگــەڵ شـێوەی دەرەبەگایــەتی ئـی وڵاتانی ئورووپایی چیە. بەڵام هەبووە دەرەبەگایەتیش. کەوابوو دەرەبەگایــەتیش وەك کۆمۆنی سەرەتایی، ناچاری بووەو هیچکەســیش نـەیتوانیوە بـە سـەریدا بـاز بـدا. مەرحەلەیەکی ئیجباری بوو.

دەگەینە سەرمایەداری، دیارە هەتا سۆسیالیزم پێکنەهاتبوو، هەموو کـەس پێـی وابوو سەرمایەداریش ئیجبارییە، مەرحەلەیەکە، قۆناغێکە کە ناتوانی بــە سـەریدا باز بدەی. بــەڵام تەجروبـەی هێندێـك وڵاتــان نیشـانی دا کـە دەتوانــینو بەتایبـەتی تەجروبـەی "مەغوولســتان"، مــن مەغوولسـتان کـە دەڵێــم "جمــهوری تـــودەای مغولستان"و جمهوورییەکانی ئاسیای میانەی ئیتیحادی شوورەوی وەك قرقیزســـتانو تورکەمەنستانو ئەوانە...، ئەوانە وڵاتێك بوون مەســەلەن مەغوولسـتان کـە ئێسـتا وڵاتێکی سۆسیالیستییە ، قەت سەرمایەداری نەبووە. قەت یەك کارگـا نـەبووە کـە کرێکاری تێدا بێ، کاری کردبێ، ئیستیسمار کرابێ، راسـت لـە نـیزامی عەشـیرتیی پاشکەوتوو، فێئودالیزمی پاشکەوتوو هاتووە. چۆن بازی داوەو چووە بــۆ مەرحەلــەی قۆناغی سۆسیالیستی دیارە ئەوە یەك شەرتی هەیــە، هــەروەها نـاکرێ. شـەرتەکەی بێجگە لە وەزعی داخڵی کە مەسەلەن دەبێ هێزێکی ئەوتۆ هەبێ لە باری سیاسـیەوە

که بەڕێوەبەری ئەو میللەتە بێ بەرەو سۆسیالیزم، بێجگــە لــەوە یارمــەتیی دەرەوەی وڵاتێکی گەورەی سۆسیالیستی وەك شوورەوی پێویست بوو. هیــچ وەخـت ســەربەخۆ بۆخۆی نەیدەتوانی بەرەو سۆسیالیسم بڕوا ئاوا ڕۆیشتووەو ئەو وەختــە کــە باسـێکی دوورو درێژ لە سەر ئەوە هەبوو، عیدەیەك لەوانە کە زۆریش زانا بوون، دەیانگوت کە لە مەغوولستان ئێمە دەبێ لە پێشدا سەرمایەداری پێك بێنــین. کـە سـەرمایەداری پێكهات لە پاشان چینی کرێکاریش پێك دێت، ـ ئەوەش کە تەقریبــەن کۆمەڵـە تـا رادەیەك لە سەر کوردستان دەڵێ چینی کرێکار کە پێكهات، پرۆلێتاریا پێكهات ئەو وەختە ئــەو چینـی کرێکـارە شۆڕشـێکی سۆسیالیسـتی دەکـاو دەسـت پێدەکـا بـە دامەزراندنی کۆمەڵی سۆسیالیســتی ـ "لنــین" گوتــی بــۆ وابکــەین، خـۆ ئێســتاش دەتوانین بەبێ ئەوەی ئەو سەرمایەداریە پێك بێنین، راستەوخۆ ئەوە دەڕۆیـــن بــەرەو سۆسـیالیزم. هیـچ ئیحتیاجێکمـان بـە سـەرمایەداری نیـە، چ پێویســتێك هەیــە سـەرمایەداری لـەوێ پێـك بێنـین. ئـەوجار هـاتن فکریـان کـردەوەو دیتیـان هیـــچ پێویستیەکی نیە، دەکرێ بە تەدریج، بەرەبەرە بەرەو سۆسیالیزم بڕۆن. یانێ ئەوە کە دەگوترا بناغەی ئیقتیسادیو ئیجتیماعیی سۆسیالیزم دەبێ سەرمایەداری پێك بێنــێ راستە، بەڵام ئەوە لەوێ هیچ پێویست نەبوو وای لێبێ.

من لە سەر ئەومەسەلەیە تەکیە دەکەم، کە پێموایە کە نــەك وەك مەغوولســتان. نا، کۆمەڵی کوردەواریی ئێستای ئێمە زۆر پێشکەوتووترە لــە مەغوولســتانی ســاڵی ١٩٢٤ کە دەبێتە ٦٠ ساڵ لەوەی پێش. ئی ئێمە ئێستا زۆر پێشـــکەوتووترە، بــەڵام هێندێك شەباهەتی بەو وەزعە هەیە. سەرمایەداریەکی زۆر گەورە لــە کوردســتاندا پێــك نــەهاتووە. پرۆلێتاریایــەکی ئــەوتۆ بــەرچاو ناکــەوێ. ئایـا ئێمـە رابوەســـتین سەرمایەداری، پرۆلێتاریا پێك بێنین جا ئــەو وەختــە بــەرەو سۆســیالیزم بڕۆیــن؟ یـا دەتوانین بە بێ ئەوەش ئەوەی بکەین، ئەوەش بۆخۆی باسێکە کە ئیشــارە دەکــەم بــۆ ئەوەی کە زەمینەی فیکری پێك بێنین.

بەڵام بـا بگەڕێینــەوە بــۆ ئــەو پێنــج مەرحەلەیــە. دیـارە پـاش سـەرمایەداری، سۆسیالیزمیش بە نەزەری من ئیجباریە. ئیجباریە چونکو هیچ رێگایەکی دیکــە نیە. سەرمایەداری کە کۆمەڵێکە کە چەوساندنەوەی تێدایە دەبێ لەبەین بچێ. دەبــێ یەك شت ببێ بە مێعیار لـــە دواڕۆژی کۆمــەڵی ئـادەمیزاددا، ئــەویش کـارە. هیـچ

ئیمتیازێکی دیکە نابیٚ، چونکو فلاٛنکەس کوڕە ئاغایە دەوڵەمەندەو، ئەوی دیکەش کوڕە سەرمایەدارە دەوڵەمەندەو ئیمتیازێکی هەبیٚ. لە حالێكدا ئەوەی کە مەسەلەن لە باری خۆیەوە شایەد کار باشتر بزانیٚ بۆ کۆمەڵ بکا، داهاتی کەمتر بیٚ.

ئێستا ئەو داهاتی سەرانە لە ولاٛتی ئەمریکادا چۆن دابەش دەکریٚ؟ مەسەلەن فەرز دەکەین خانمی کریستینا، ئەو کچی ئوناسێسە. ئووناسیێس کابرایەکە یونانی لە ئەمریکا گەورە بوو ـ دیارە وەفاتی کرد ـ لە پاشان ژنی کێنێدیشی هێنا، ژاکلین کێنێدیی هێنا. لە ئاخری عومریدا ئەو کابرایە زۆربەی زۆری کەشتی نەوتکێشی دنیای ئەو وەختەی بەدەستەوە بوو. یەکجار زۆر دەوڵەمەند بوو. کتێبێکی نووسراوە لە سەر، لە سەر ئەو وەختەی کە ژاکلینی هێنا، نووسراوە لە سەری کە ئەوانە هەرچی دەیانکرد کە ژاکلین کێنێدی بە تایبەتی پاش ئەوەی کە بوو بە ژنی، پاش کوژرانی کێنێدی کە رەئیس جمهووری ئەمریکا بوو بە ژنی ئووناسێسی تەواوی هەمی ئەوە بوو، ئەسڵەن نەخۆشی ئەوەی هەبوو، دەچوو شتی دەکڕی، هەروا شتی دەکڕی، پووڵی زۆر بوو دراوی یەکجار زۆر بوو و زۆر جاریش شتەکەی دەکڕیو بەجێی دەهێشت، هەر نەیدەویست، هەر پێی خۆش بوو، هەر کڕینەکەی پیٚخۆش بوو. لەگەڵ ئەوە یەکێك دوکتورێکی شتێکی جوانی لە سەر ئەوانە نووسیبوو کە حەسێبی بۆ کردووە کە نەیانتوانیوە هەردووکیان ساڵیٚ زیاتر لە ٢٠میلیۆن دۆلار خەرج کەن. دیارە ٢٠میلیۆن دۆلار زۆرە، ئەوە بۆ ئێمە زۆرە، بۆ پێشمەرگە زۆرە بەلاٛم ئەوان نەیاندەتوانی زیاتر لە ٢٠میلیۆن خەرج بکەن. ٢٠میلیۆن دۆلار یەك لە دەی کەمتری داهاتی ساڵانەیان بوو. یانیٚ حەتتا لە ١٠ دۆلار داهات کە هەیانبوو، یەکێکیان بۆ خەرج دەکرا، ٩ی زیادی دەماوە، بێجگە لە ئەسڵی سەرمایەکە کە لە جێگای خۆیدا بوو. لە حالێکدا چەندین جەزیرەیان کڕیبوو کە جەزیرە ئی خۆیان بوو بێجگە لە چەندین کەشتی تایبەتی کە دەیانتوانی ساڵەها تێیدا بژین، بە هەموو دەزگایەك. خانوویان هەبوو، لە ئورووپا خانوویان هەبوو، لە ئاسیا، لە ئامریکا بە هەموو خەدەمەوە، بە نۆکەرو بە کولفەتو بە خدمەتگوزارو بە تەواوی ئەوانە دیسانەکان ٢٠میلیۆنیان خەرج بۆنەدەکرا.

ئێستا کچی ئووناسێس، خانمی کریستینا کە عەرزم کرد کچی وییە، ئەو هەموو دامو دەزگایە بۆ ئەو ماوە داهاتەکەی دیارە داهاتی سەرانەی ئەو فەرق دەکا لەگەڵ

داهاتی سەرانەیەکی نێوەنجی. هیچ خزمەتێکیشی نەبووە، خزمەتەکەی هی خۆی نیە، بابی دەوڵەمەندە. مومکینە ئەگەر دەگەڵ کچێکی متەوەستی موقایسە بکەی هیچ ئیمتیازێکی نیسبەت بەو نیە. بەڵام داهاتی ئەوەندە زۆرە کە نازانێ چی لێبکا. خەرجی بکا. کەوابوو ئەوە دیارە سەرمایەداری ئەورۆی عادلانەیە! شتەکە ئاوا هاتووە. باشە دەگەڵ ئەوە ئەو واقعییەتە دەبێ بڵێین کە سەرمایەداری هەیە. ئەوە ئینسانێك کە رۆژبەرۆژ دەچێتە پێشێ لە باری فیکریەوە ناتوانێ تەحەمول بکا، وانیە؟ دەبێ رۆژێك بێتو ئێستا هەر لێرە ئەمە جارێ نە سۆسیالیزمان دامەزراندووەو نە هیچ. ئێوە لە داخیل حیزبێکی شۆڕشگێڕ وەك حیزبی دێموکرات کۆبوونەوە بەڵام ئەگەر یەکێك ئیمتیازێکی خۆڕایی هەبێ زوو ئیعتیراز دەکەن. ئەوە بۆ فلانکس وایە، هەتا نەك هەر ئەوە ئەدی بۆ هێزی ئاوارە ئەوەی دەست کەوتووە لە حالێکدا مەسەلەن هێزی بێستوون نیەتی. ئیعتیرازەکە دەست بەجێ دەگا! دیارە ئەوە بەشێکی خراپی هەیە چونکو هەر ئیمتیاز دەبێ لە جێی خۆی بدرێ. کارم بەوەی نیە، بەڵام مەنزوورم ئەوەیە کە هەموو دەبێ وەك یەك لەو ئیمتیازانە بەرخوردار بن جا ئەگەر بەشەر بەرەو ئەوەی دەڕوا لە دوارۆژدا رێگا نادا سەرمایەداری حاکم بێ. سەرمایەداری مەحکوومە بە فەنا، دەبێ لەبەین بچێ. کەوابوو سۆسیالیزمیش کۆمەڵێکی ئیجبارییە.

نەتیجە: کۆمۆنی سەرەتایی، فیئودالیزمو سۆسیالیزم ئەوانە ئیجبارین، هی هەموو کۆمەڵێکە. لە سەرەتای مەدەنییەتی تەمەدونی بەشەریدا لە حالێکدا بەردەداری (کۆیلەتی) بەو شێوە ئیجباری نیەو نەبووە، باسیشی دەکەین. هەروەها خودی سەرمایەداریش دەکرێ بە سەریدا باز بدەین. تا رادەیەکی زۆر مەغوولستان بە تەواوی بازی بە سەریدا داوە. ئێمە لە کوردستاندا باوەڕمان بەوەی هەیە کە سەرمایەداری تا رادەیەك پێكهاتووە، بەڵام دیسان ئایا ئێمە بەرەو سەرمایەداری بڕۆین یا بەرەو سۆسیالیزم بڕۆین. یا لەپێشدا دەبێ بۆ رۆیشتن بۆ لای سۆسیالیزم سەرمایەدارییەکە دروست بکەین جا لەپاشان بڕۆین. ئەوە شتێکە کە دەتوانین باسی لە سەر بکەین. بە نەزەری من پێویست نیە.

دەبا بگەڕێینەوە سەر کۆمۆنی ئەوەڵیە. نامەوێ زۆر قسە بکەم چونکە پێموایە ئەوە ئیدی لە سەر کۆیلەتیش هەر ئەوەندە بەسە. پێموایە لەوە زیاترمان ناوێ کە لە

واقیعدا لەویٚ کابرای خاوەنی کۆیلە نەك خاوەنی کاریەتی بەڵکوو خاوەنی خۆشیەتی. دەتوانیٚ بیفرۆشیٚو دەشیفرۆشیٚ. ئەسڵەن تەجارەتی بەردە هەتا ١٥٠ ساڵ لەوەی پێشو هەتا لە بەعزە جێگایەك هەتا ٢٠، ٣٠ ساڵ لەوەیپێش هەر مابوو ئێستاش بە شێوەیەکی دیکە هەیە. دیارە بەداخەوە بە شێوەیەکی دیکەو زۆر ناخۆشتر، ئەویش ئەوەیە کە عیدەیەك، ژمارەیەك ـ دیارە ئەوە هەو نیە بەلاّم دیسانەکە لە واقیعدا هەوە ـ ژمارەیەك لەوانەی کە بەڕاستی ماکەی فەسادن لە ولاّتەکانی سەرمایەداریدا کە لەگەڵ خودی سەرمایەداریش ڕێك دەکەویٚ، کاریان ئەوەیە کە کومپانی (شیرکەت)ی زۆر گەورەیان هەیە، ڕەوابیتی زۆر قایمیان هەیە لە نێو دەوڵەتدا، لە نێو پۆلیسدا، لە ولاّتەکانی ئورووپای غەربیەوە دەچن لە ولاّتەکانی ئافریقایی ، ئامریکای لاتین، خاوەرمیانە (ڕۆژهەلاّتی نێوەراست) کچی جەوان دەکڕن، کچی ١٠ــ٩ ساڵە دەکڕن. میللەتەکە فەقیرە بە پوولێکی کەم کچەکە دەفرۆشن. ئەو کچانە دێنن تەربیەتیان دەکەن، لە پاشان بەداخەوە دەیانفرۆشن. دەیانکەن بە وەسیلەی مەعاش لە ئورووپا. ئەوە شتێکە، تەجارەتێکە بەداخەوە یەکجار زۆر ڕەونەقی هەیە. ئێستا شتێکی تەبیعی‌یەو فەرزکە کابرا لە ئامریکاوە یا لە ئورووپاوە دەچیٚ بۆ ولاّتێکی ئافریقایی کە داهاتی سەرانە ساڵیٚ ١٠٠ دۆلارە، باسمان کرد، ئەویش ٥٠٠ دۆلاری دەداتیٚ، ١٠٠٠ دۆلاری دەداتیٚ، حازرە هەم کچەکەی دەدا، لە برسان ئەوە وەردەگریٚ. بە هەزارو یەك فڕوفێڵ، دیارە شەبەکەیان هەیەو فڕوفێڵیان هەیە بۆ ئەو کارە. بەو شێوەیە کۆیلەتی ئێستاش ماوە بەلاّم ئیدی وەکو ئیعتیباری ئیقتیسادی گشتی‌یەکەی نەماوە، لەبەین چووەو لە پاشان لە واقیعدا مەحکوومیش کراوە لە هەموو ولاّتەکاندا. ئاخر ولاّت کە مەحکوومی کردو تێیدا مابوو، عەرەبستانی سعوودی بوو.

بەلاّم باسی فیئودالیزمەکە دەبیٚ بڕێك بکەین. چونکە ئێمە ئێستا خۆمان دیارە یانیٚ ئێمە ولاّتەکەمان لەو مەرحەلە دایە. داخیل سەرمایەداری بووین بەلاّم نە بە تەواوی. فیئودالیی‌شمان بەجیٚ هێشتووە بەلاّم نە بەتەواوی. یانیٚ لە واقیعدا، لاقێکمان لە فیئودالیزم دایەو لاقێکمان لە سەرمایەداریدا. ئاخری فیئودالیزمو سەرەتای سەرمایەداریو پاشان ئەو شتەی کە لە ئێراندا هاتووە سەرەتای شۆڕشی ئێران؛ ئێستا دیارە وەزعەکە روونە بەلاّم لە سەرەتای شۆڕشدا مەعلووم نەبوو ئەو

ڕێژیمە لەکوێڕا بۆ کوێ دەڕوا. وادیـارە بـۆ ئێمـە مانـان ئەقڵـەن روون بـوو، بـەلاّم زۆرکەس بە تایبەتی ئەو هێزە چەپانـە (لـە حـیزبی تـوودەوە بگـرە چریـكو مریـكو ئەوانە) کە تەبلیغاتیان دەکرد کە دژی ئیمپریالیستە، بەرەو سۆسیالیزم دەڕوا. بـەلاّم واقعییەت ئەوە بوو کە لە ترسی خەڵکی، لە ترسی کۆمەلاّنی خەڵك ڕێژیمیش بڕیـاری خۆی نەدابوو، نەیدەتوانی بڕیار بدا. ئەگەر لەبیرتان بێ چ شەڕێکیان نەکرد لـە سـەر بەندی "ج"، چ شەڕێکیان نەکرد لە سەر میللی کردنی تیجارەتی خارجی. ئاخرەکەی دەرکـەوت کـە سـەرمایەداریان ئێسـتا هـەڵبژاردووەو ئیـدی تـەواو بـوو، زیـددی ئیمپریالیزمیش نـەماوە. ئێسـتا روونـە بۆیـە پێموانـەبێ ئێسـتا بـۆ کەسـێك روون نەبووبێت.

بەلاّم ئەوەی کە من دەڵێم ئەوەیە کە ئێمە کۆمەڵی کوردەواریمان بە تایبەتی ئێران زیاتر بەرەوە سەرمایەداری ڕۆیشتووە، یـانێ ئـێران لـە سـاڵەکانی ئـەخیری زەمـانی شاهەنشاهیدا بە گشتیو بـە تایبـەتی شـارە گـەورەکان ئیـدی ببـوو بـە ولاّتێکـی سەرمایەداری بە هەموو شتە خراپو باشەکانیەوە. بـەلاّم کوردەواریـی ئێمـە جـارێ نەگەیشـتبووە ئـەو رادەیـە. سـەرمایەداری تێـیدا بـە وجـوود هـاتبوو، رەوابتـــی سەرمایەداری، بەلاّم نەگەیشتبووە ئەو جێگایە کە بە تـەواوی ببێتـە سـەرمایەداری؛ چونکو پاشماوەی پەیوەندییەکانی فیئودالی تێدا هـەبوو، مـابوو. فیئـودالی بۆخـۆی مەراحلی هەیە، سێ قۆناغی ئەساسی لە فیئودالیزمدا بەرچاو دەکەوێت:

قۆناغی ئەوەڵ: ئەوە کە لە ولاّتەکانی ئوروووپاییدا هەبووە لە کوردەواریی ئێمـەدا کەم بووە، قۆناغی یەکەم بووە. زۆریش درێژ بووە لە ولاّتـەکانی ئوروووپـاییدا. ئـەوە بووە کە ئاغا بە کوردی خۆمان دەڵێم خاوەن زەوی، خـاوەنی زەوی بـوو. ئـەوەی کـە پێیان گوتووە "سرف" یان هەر ناوێکی دیکەیان لە سەر ناوە، ئەو کاری ئەوە بوو کە زەویی نەبووە دوو کاری کردووە. یانێ زەوییەکی داوەتێ ئاغا بە ئیجارە، سێ ڕۆژ لە سەر زەوی خۆی کاری کردووە، سێڕۆژ لە حەفتەدا لە سەر زەوی ئاغا کاری کـردووە. ڕۆژی یەك شەممۆانیش جومعەی ئێمەش تەعتیل بووە. یـانێ ئـەوە کـە پێـی دەڵێـن "رنتی" یان لە واقێعدا ئەرزی، زەوی یانێ چ بووە؟ چووە کاری بـۆ کـردووە بـە کـار ئیستیسمار کراوە. ئیستیسمارەکە زۆر روونە ئیدی، ئەتۆ سێ ڕۆژ بێی لە سـەر زەوی من کار بکەی، بۆ من کار بکەیو تەواوی بەرهەمەکەیش ئـی مـن بێـت، ئیـدی بـە

تەواوی روونە کە ئەو سێ رۆژە ئـەتۆ ئیستیسـمار کـراویو سـێ رۆژەکـەی دیکـەش بۆخۆی کاری کردوە. دیارە هەر وەختێك کاری نەبووە ئاغا مەجبووری کردوە زیاتر لە سەر زەوی ئاغادا کار بکا. شتێکی زۆر تەبیعیشە ئەوەش گوتنی زیادیە کە باشـترین زەویشی هـەبووە، وەختێـك بۆخـۆی ئاغـا هـەڵیبژاردوە، زەویـە باشـەکەی بۆخـۆی هەڵبژاردوە، ئەوی بەرهەمی باشتر بووەو زەویە خراپەکـەی داوە بـە رەعیـەت. ئـەوە قۆناغی ئەوەڵ بوو.

قۆناغی دووهەمی دیـارە کـە پێشـکەوتووترە ئەوەیـە کـە لـە کوردسـتان ئێمـە هەمانە. ئەویش ئەوە بوو کە زەویەکە لـە واقیـعدا حاسـیلەکە بـەش کـراوە. لـەوێ کارەکە دەکرا سێ رۆژ بۆخۆی کاری دەکرد، سێ رۆژ بۆ ئاغا کاری دەکرد. لـێرە نـا، زەوییەکەی داوەتێ، چووە کاری کردوە بەرهەمەکەی حازر کـردووە کـە حـازر بـووە ئاغانەی تێدا بووە باشە جا ئیدی بەشکردنەکە فەرقی هەیە. لە بەشـە جیاوازەکـانی کوردستاندا. لە ١٠و٢ەوە بگرە، ١٠و٢ ئەوەیە کە ٢بەشی بۆ رەعیەتـە ٨بەشـی بـۆ ئاغایە، لەوێڕا بگرە تا دەچێتە ئەوەی کە نیوە بە نیوەیە، نیوەکارەیە، سێکوتە، سێ یەك بەرە. سێکوت ئەوەیە کە دوو بەشی ئی ئاغایە بەشێکی ئـی رەعیەتـە یـا زۆر جاریش ئەو سـێکوتە سـێ لایەشـی هەیـە. مەسـەلەن لـە تووتـندا وایـە، دەبینـی تووتنـەوانێکی دەگـرێ لـە پاشـانیش جووتـێرێکیش عەرزەکـەی دەکێڵـێ، کـــاری زەراعەتەکەی دەکا. ئاغاش کە ساحیبی عەرزەکەیەو کە لە پاشان تووتنەکە دەبێتـە سێ بەش. یەك بەش ئاغا وەریدەگرێ، یـەك بەشـیش ئـەو کەسـەی کـە زوەیەکـەی کێڵاوەو ئەوانە، بەشێکیش تووتنەوان هەڵیدەگرێ. لە پاشان ٣ـ١ بەرە کە عەکسـی سێکوتەکەیە، هەروەها تا نیوەکارە بەڵام یەك شت لـێرەدا هەیـە، لـە فیئودالـیزمی کوردەواریدا بە تایبەتی زۆر روونە، پێنج عـامیل تەئسـیریان هەیـە: زەویـە، ئـاوە، تۆیە، کـارە، وەسـیلەی تـەولید. هـەرچی ئاغـا زیـاتر لەوانـە بـدا ئـەوەندە زیـاتر هەڵدەگرێ. مەسەلەن فەرز دەکەین نیوەکارە، کەنگێیە؟ دیـارە هـەموو وەختێـك وا نیە؟ بەڵام ئەگەر زەویەکە بەرئاو بێ، زەویەکە ئی ئاغایەو ئاوەکەیشی ئـی خۆیـەتی کە دیارە ئاوەکەش ئی ئەوە، نیوەی تۆیەکەی دەدا، وەسایلی تەولید بڵێین جووتـەگاو ئەوانە ئی رەعیەتەکەیەو کارەکەیش ئی رەعیەتە کەوابووە دەبێتە نیوە بە نیوە. ئەوە نیوەکارەیە. لە سێکوتدا ئاغا هەر شتێکی دەدا، دیارە سێکوت ئاغا یـەك بەشـی

هەیەو رەعیەت دووبەشی هەیە لە سێکوتدا. ٣ـ١ بەرعەکسی ئەوە، لە سێکوتدا ئاغا مەعموولەن هەر زەوی‌و ئاوەکەی دەدا، تۆوەکەی نادا. یان زۆر جار وایە ئەسڵەن دێمە ئاوی نیە، ئەو پێنج عامیلە هەموو وەختێك تەئسیری هەیە. هەرچی رەعیەت زیاتر بدا زیاتری وەبەر دەکەوێ، ئاغا زیاتر بدا زیاتری وەبەر دەکەوێ. بەڵام ئاغاش شەرتێکی بدا ئەگەر زەوی‌یەکە باشتر بوو ئەوەش بە قەرز لێ‌دەکرێ. زەوی‌یەکە هەرچی باشتر بێت ئاغا پێی خۆشە زیاتر بدا، چونکو حاسڵەکەی باشترە. زەوی‌یەکە هەرچی خراپتر بێ، دێم بێ، بەردەڵان بێ ئەو وەختە ئاغا پێی خۆش نیە هیچ بدا. دەچێ دەی‌کێڵێ ئەگەر شتێکی دەست کەوت بەشی خۆی هەڵدەگرێ دەنا لەبەین دەچێ. کەوابوو ئەو فیئودالیزمە لە ئورووپادا زیاتر بە شێوەی کارە. ئەوە مەرحەلەی ئەوەڵیەتی. ئی ئورووپا زۆر درێژ بووە ئی مە زۆر کورت بووە ئەو بەشە یان زۆر کەم هەیە. بە شێوەیەکی دیکە هەیە. ئەوە لە کوردستاندا پێی دەڵێن "بێگار"، بە شێوەی بێگار هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لەگەڵ ئەوەی کە کار دەکا مەسەلەی حاسڵ هەیە لەگەڵ ئەوە دیسانەکە مەسەلەیەکی دیکە لەگۆڕێ دایە ئەویش ئەوەیە کە رەعیەتێك مەجبوورە بچێت هێندێك کار بۆ ئاغا بکا بێجگە لەوەی کە بەرهەمەکەیان بەش دەبێ. مەسەلەن ساڵێ ١٥ رۆژان دەبێ بچێ بیکا جا ئەوە ئیدی بۆ هێنانی جۆگە یان بۆ کاری ساختمان یا بۆ کاری دیکە. زۆر جاریش ئاغا بۆ کاری‌تر سوئیستیفادەیشی لێ دەکا، هەروەخت کاری پێ بوو بانگی دەکاو کاری پێ‌دەکاو لە زەمانی فیئودالی‌دا پووڵیشی ناداتێ، ئەوە مەرحەلەی دووهەمە.

مەرحەلەی سێهەم کە هەم لە ئورووپا هەیە، هەم لای ئێمە هەیە، مەرحەلەکە دەگاتە سەر پووڵ. یانێ ئاغا دەڵێ ئەوە زەوی منە بە ئیجارەت دەدەمێ بە ١٠هەزار تمەن. ئیدی کاری بەوە نیە، نە ئاوی دەداتێ نە تۆی دەداتێ هیچی ناداتێ. دەیداتێ زەوی‌یەکە بەڵام حاسڵەکە باش بێ خراپ بێ کاری پێ نیە ١٠هەزار تمەنەکەی لێ‌دەستێنێ ئەوە مەرحەلەیەکە کە پووڵ ئەهەمییەتی پەیدا کردووە. مەرحەلەی ئاخر فیئودالیزمە. ئەوە مەرحەلەیەکە کە ئێمە ئێستا بڵێین تێی‌دا دەژین‌و ئەگەر دیققەتتان کردبێ هەرچی زەوی باش هەیە لە دەوروبەری شارەکان یا لە دێیە گەورەکاندا ئاغا ئیسراری ئەوە بووە کە بەرەبەرە لەو ئەواخیرەدا کە بە پووڵ بە ئیجارەی بدا. هەرچی زەوی دوورکەوتوو هەبوو لە دەوروبەری شار نەبوو، نێزیك

نەبووە؛ یا مەسەلەن سێکوت بووە یان نیوەکاری بووە یا بە شێوەیەکیتر. مەرحەلەکە هەرچی دەچێتە پێشتر دەگۆڕێ. کەوابوو مەرحەلەی سەرەتایی دەبێتە مەرحەلەی لە واقێعدا ئەوەی کە پێی دەڵێن رنتی کار، ئەمن کە ئەو کەلیمەیە بەکار دێنم وەکو رنت یانێ حەقی کارو حەقەکە بە کار وەردەگرێ، کەلیمەیەکی خارجییە بەڵام زۆر بەکار دێ، رنتی کار. مەرحەلەی دووهەم دەبێتە رنتی حاسڵ، رنتی جنسی لە مەرحەلەی سێهەمدا دەبێتە رنتی دراوی، رنتی پووڵو ئەوەش فیئودالیزمە، بڕێك زیاتر لە سەری رۆیشتم.

فیئودالیزمان کە خەلاس کرد ئەگەینە سەرمایەداری. سەرمایەداری هێندێك شتی تایبەتیی خۆی هەیە. ئەوەڵەن سەرمایەداری یەك خاسییەتی ئەوەیە کە لە خودی بەتنی، لە نێو جەرگی فیئودالیزمدا پێكدێ. پێش ئەوەی کە بورژوازی وەك تەبەقەی سەرمایەدار سەرکەوێ، قودرەتی سیاسی بەدەستەوە بگرێ لە واقێعدا سەرمایەداری پێكهاتبوو، رەوابتی سەرمایەداری، پێوەندییەکانی سەرمایەداری پێكهاتبوو. باسی ئەوە کە پێوەندیی سەرمایەداری بە چی دەڵێن، ئەوە لە دوایی باس دەکەین، بەڵام ئێستا پێكهاتووە.

دیارە کە سەرمایەداری پێكهات پرۆلێتاریاش پێكهاتووەو ئەو سەرمایەدارییە، ئەو بورژوازیە بەرەبەرە دەبینین کە کۆمەڵی فیئودالیستی، دەرەبەگایەتی پێشی پێشکەوتنی دەگرێ. مەسەلەن لە زەمانی فیئودالیزمدا ئاغایەك دێت دەڵێ هەموو ئەو دێهاتە ئی منە، هیچکەسیش حەقی نیە بە بێ ئیجازەی من حەتا ترێش بفرۆشێ. کەس حەقی نیە دووکان دابنێ. حەتمەن بیستووتانە، ئێستاش پاشماوەی ئەوە هەر ماوە کەس حەقی نیە لە دێی من دووکانیش دابنێ. باشە سەرمایەداریش عەکسی ئەوە کە شتومەك بەرهەم دێنێ دەیهەوێ بیفرۆشێ. تەواوی هەوڵی سەرمایەداری ئەوەیە کە بازاڕی رۆژبەرۆژ بەرینتر بێ. ئاغاش دەڵێ نا، ئەوە دێی خۆمەو نایەڵم. لە لایەکی دیکەشەوە سەرمایەداری کرێکاری دەوێ، دێ بەجێ بهێڵێ بچێتە شار لە کارخانە کاری بۆ بکا. کرێکار لە کوێڕا بێنێ؟ دەبێ هەر لە دێهاتەوە بێن. ئەگەر کرێکار نەبێ سەرمایەدار، سەرمایەدار نیە. باشە بۆ ئەوەی کرێکار بتوانێ لە دێڕا بچێتە شاری دەبێ ئەو ئازادیەی هەبێ ئەگەر سێرف بێ بە زەویەوە بەسترابێتەوە، ئەوەی کە لە ئورووپا باسمان کرد. لە واقێعدا بە تایبەت لە رووسیە

کابرا کە زەوی دەفرۆشت دەشیانگوت کە ئەوەندە گیانی لەسەرە. کەلیمەی گیانیان بەکار دەبرد. ئەوان بە رووسی "دوشیچکیا"ی پیٚ‌ەڵێن. دەیانگوت ئەوەندە دوشیکچیای لە سەرە، مەسەلەن نەیدەگوت زەوییەکەم ئەوەندە هیکتارە دەیگوت دووهەزار سێرف گیانی لە سەرە، ئاوای دەفرۆشت. ئەوەندە زەوی دەفرۆشت ئەویشی لەگەڵ دەفرۆشت. جا ئیدی ئەو دووهەزار نەفەرە دیارە خەریدو فرۆش نەدەکرا بەلاٚم حەقی نەبوو هەڵسێ بڵێ وەڵا من دەچمە شاری، نەخێر مەجبوور بوو لە سەر ئەو زەویە بۆ ئەو ئاغایە کار بکا.

ئەویش بۆخۆی مانعێکیترەو زۆر مانعی دیکە هەبوو کە ئەو قانوونانە کە هەبوون سەرمایەداری پێویستی بوو کە لە بەین بچێ. هەرکەسێك کە پێی خۆشبوو لە هەر جێگایەك فرووشگایەك دابنێ، لە هەر گوندێکی شت بفرۆشێو پێی خۆشبوو کە شتەکان بەرێتە شاران بیانفرۆشێو بە عەکسی ئەوە کرێکاریش ئەگەر پێی خۆشبوو بچێ لە شاران کار بکا. بۆ ئەوە پێویست بوو تەواوی پێوەندییەکانی فیئودالیستی، دەرەبەگایەتی تێکبچێو چونکو دەرەبەگایەتی قودرەتی سیاسیی بە دەستەوە بوو نەیدەهێشت. هیچ رێگایەك نەبوو بێجگە لەوەی کە شۆڕش بکا. شۆڕشیشی دەکرد بە ناوی خەڵك، خەڵکی لە پشتەوە بوو. ئێستا کۆمەڵە دەڵێ حیزبی دێموکرات بورژوازییەو خەڵکی لە پشتەوەیە، دیارە حیزبی دێموکرات ئەوەندە بورژوازیە کە ئەوان پرۆلێتاریان! ئەو وەختەش بورژوازی هەموو خەڵکی دەهێنا، بەو شوعارانەی کە بیستوتانە لە شۆڕشی فەرانسەدا (برایەتی، مساوات، ئازادی)و بەو شیعارانە شۆڕشیان کرد.

فیئودالیزم بەرەبەرە لەبەین چوو و دیارە لە هێندێ جێگا شۆڕشەکە زۆر توندوتیژ بوو، تەواوی ئەساسی فیئودالیزمی تێکدا. وەك لە فەرانسە حەتا مەزهەبیشی لە واقیٚعدا لە سەرەتا لەبەین برد. لە سەرەتای شۆڕشی فەرانسەدا تەقریبەن کەس نەیدەوێرا بڵێ من کاتۆلیکم، مەزهەبیم، یانێ ئەوەندە توند بوون لەگەڵیان. لە حاڵێکدا لە جێگایەك وەك ئینگلستان مەسەلەن سازشی کردبوو بورژوازی لەگەڵ فیئودالیزمدا. هێندێ ئیمتیازیشی هەر هێشتەوە. لە حاڵێکدا کە فەرانسە بوو بە جمهووری هەر دەستبەجێ، ئەوان پاشایەتیان هێشتووەتەوە، حەتا ئەورۆش رایان گرتووە چونکە سازشیان کرد لەگەڵیان شۆڕشەکەیان ئەوەندە توندوتیژ نەبوو بەلاٚم

ئەساسی فیئودالیزمی لەبەین بردو ئێستا لە واقیعدا لە ولاّتەکانی جیهانی سـێهەمدا نـەبێ پێوەندیـیەکانی فیئودالیسـتی، پێوەندیـیەکانی دەرەبەگایـەتی بـەو شـێوەیە نەماون، لەبەین چوون.

# ئابووریی سەرمایەداری

لە پێشدا باسی ئیقتیسادی سەرمایەداری دەکەین پاشان هێندێ باسی وەزعی سەرمایەداری مەوجوود دەکەین، باسی مەراحلی پەرەئەستاندنی ئەو سەرمایەدارییە دەکەین. پاشان نەتیجە لەو باسەمان وەردەگرین جا ئەوکاتە دەچینە سەر باسی سۆسیالیزم، ئیقتیسادی سۆسیالیستی. پاش ئەوەی کە باسی ئیقتیسادی سۆسیالیستیمان کرد باسی ئیقتیسادێك دەکەین کە ناومان ناوە "ئیقتیسادی تێکەڵاو". بەوە دەرسی ئیقتیسادی سیاسی تەواو دەکەین.

لە باسی سەرمایەداریدا لە پێش هەموو شتێکدا پێویستە دوو مەسەلەی ئەساسی بۆخۆمان روون کەینەوە. یەکێکیان ئەوەیە کە سەرمایەداری قۆناغێکە لە قۆناغەکانی پەرەئەستاندنی کۆمەڵ هەروەها پێشتر باسمان کرد. یانێ سەرمایەداری شتێك نیە، پەدیدەیەك نیە دیاردەیەك نیە لە خۆڕا پەیدا بووبێ، بە جارێك پێکهاتبێ، بە جارێك بڵێین بە هیچ‌و خۆڕایی هاتبێتە مەیدان، نە. لە نەتیجەی پرۆسەیەکدا، رەوەندێکدا ئەوەی کە ئێمە پێی دەڵێین "رەورەوەی مێژوویی"، لە نەتیجەی ئەوەدا پەیدا دەبێ. گوتمان کە لە نێو جەرگەی کۆمەڵی فیئوودالیستیدا، دەرەبەگیدا، سەرمایەداری پێکدێ. پێوەندیی بەینی کرێکارو سەرمایەدار یان ئەو پێوەندیە کە پێی دەڵێن "پێوەندیی سەرمایەداری" ئێستا لە سەری باس دەکەین. لە پاش ئەوەی کە بناغەکەی یا باشتر بڵێین "ژێربەنا"کەی پێکهات، ژێربەنای ئیقتیسادی‌و ئیجتیماعی، ژێربەنای ئابووری‌و کۆمەڵایەتیی سەرمایەداری پێکهات.

لە پاشان ئەو چینە ئەو تەبەقەیە کە نوێنەری سەرمایەداری‌یە، کە بورژوازی‌یە، ئەو دەسەلاٚتی سیاسیش بە دەستەوە دەگریٚو لە نەتیجەدا سەرمایەداری پێكدێ. ئەوە شۆڕشی سەرمایەداری بوو کە لە فەرانسە پێكهات، لە ئینگلستان پێكهاتو بەرەبەرە لە هەموو ولاٚتەکانی پێشکەوتووی سەرمایەداری‌دا پێكهات.

ئەوە زۆر موهیمە چونکو ئەگەر ئەوەمان گوت کە سەرمایەداری سەرەتایەکی مێژوویی هەیە هەر لێرەش‌دا ئەوەمان گوتووە کە سەرمایەداری دیارە دواڕۆژێکی، پایانێکی مێژوویشی دەبیٚ. وەك هەموو پەدیدەیەك لە جێگایەك دەست پیٚدەکاو لە جێگایەکیش خەلاٚس دەبیٚ. شتێك نیە کە ئەبەدی بوویێت، لە سەرەتاوە هەر هەبوویێتو هەتا هەتایە هەر بمێنێتەوە، پەدیدەیەکی ئاوا نیە. پەدیدەیەکی کۆمەلاٚیەتییە، دیاردەیەکی کۆمەلاٚیەتییە کە پێكهاتووە لە هەلومەرجێکی تایبەتی‌داو لە هەلومەرجێکی تایبەتیش‌دا لەبەین دەچیٚ. یانیٚ راست ئەگەر بلێێن دەبیٚ بۆچوونێکی دیالکتیکیمان هەبیٚ، بۆچوونێکی وشکمان نەبیٚ، بۆچوونێکی خەلاقمان هەبیٚ. ئەو بۆچوونەش ئەوەیە کە سەرمایەداری لە جێگایەك دەست پیٚدەکا لە جێگایەکیش دەبیٚ لەنێو بچیٚ.

مەسەلەی دووهەم ئەوەیە کە لە قسەکردن‌دا ئێمە باسی سەرمایە دەکەین هەرکەس لە مێشکی خۆی‌دا شتێك تەسەور دەکا یا شتێکی دێتە بەرچاو. مەسەلەن پێی وایە ئەگەر یەکێك پوولێکی زۆری هەبوو، دراوێکی زۆری هەبوو ئەوە سەرمایەیە یا ئەوی دیکە پێی وایە کابرا هەزار سەر مەڕی هەیە سەرمایەی زۆرە، ملّكو ئەملاٚکی زۆرە سەرمایەی زۆرە. یان مەسەلەن فەرز دەکەین لە مالّی خۆی‌دا زێڕی هەیە، خانووی هەیە، چی هەیە. لە باری عیلمیەوە هیچی ئەوانە سەرمایە نین بە سەرمایەش دانانرێن. هەرکام لەوانە حەتتا پوولّەکە ئەو وەختە دەبێتە سەرمایە کە ئێمە بێین بلێێن ئەو پوولّە لە رابیتەیەکی تایبەتی‌دا، پێوەندی‌یەکی تایبەتی‌دا بۆتە هۆی ئەوە کە کرێکارێك دەگەلّ سەرمایەدارێك تەرەف بێت، لە نەتیجەی ئەوەدا کە کرێکار هێزی کاری خۆی دەفرۆشیٚو سەرمایەدار ئەو هێزی کارە لەوی دەکڕیٚو لە واقیع‌دا ئیستیسماری دەکا، دەی‌چەوسێنێتەوە ئەوە ئەو پێوەندی‌یە پێكهات، ئەو پوولّە دەبێتە سەرمایە دەنا سەرمایە نیە.

ئێستا باسی دەکەین مەسەلەن فەرز دەکەین سەرمایەدارێك میلیۆنێکی هەیە، میلیۆنەکە تمەنە، دۆلارە ئەوە موهیم نیە. ئەو میلیۆنە دێنێ کارخانەیەکی پێدەکڕێ. بە بەشێکی. بەشێکیشی دادەنێ بۆ ئەوەی وەك کرێ بیدا بە کرێکاران کە کاری بۆ دەکەن. دیارە کرێکار کە دێ کار دەکا مەوادی خام هەیە، کارخانە هەیە لەو شتەی کە لە کارخانەدا لەو مەوادەی لەگەڵ ماشێنو شتی کارخانە پێکەوە وەك هێزی کاری زیندوو شتێك درووست دەکا. کە ئەو شتە لە واقێعدا پاش ئەوەی کە کرێیەکەی وەرگرتەوە هی خاوەنی کارخانەکەیە. دەنا ئەگەر لەبیرتان بێ گوتمان کە ئەساسی هەموو بەرهەمێك لە واقێعدا کارە. لێرە ئێستا زۆر موهیمە کە ئێمە ئەو شتەی کە پێی دەڵێین چەوسانەوە یا چەوساندنەوە ئەوەی روون کەینەوە، چونکو بە داخەوە ئەوەش وەکوو مەسەلەکەی دیکە کە باسمان کرد لە چ تاریخێکدا یانێ لە چ وەختدا لە تاریخ چەوسانەوە دەست پێدەکا ئەوەش زۆر موهیم نیە خۆتان لە پاشان تەجروبە بکەن. لەو گرووهانە یان ئەندامانی ئەو گرووهانە کە خۆیان بە نوێنەری بیروباوەڕی پێشکەوتوو و مارکسیسمی ئینقلابیو ئەوانە دەزانن، لێیان بپرسن بزانن ئاگادارن لەوە یا نە؟ پێموایە زۆربەیان تێناگەن. ئەویش ئەوەیە کە من لێرەدا دەمەوێ نیشانی ئێوەی بدەم، زۆریش زەحمەت نیە فێربوونەکەی.

دیارە ئەو وەختە وا نەبوو ئەو وەختە کرێکاران رۆژی وا هەبوو ١٦سەعات کاریان دەکرد. پاش خەباتێکی زۆر بوو کە توانیان ئەو ١٦ سەعاتە بێننە خوارێ هەتا ٨ سەعات. ئەویش لە واقێعدا لە ساڵی ١٨٨٦ەوە بوو کە ئەو تەزاهوراتە مەشهوورە لە شیکاگۆ پێکهات، کە لێیان دان هێندێك لە کارگەرانیان کوشت کە بوو بە رۆژی ئەوەڵی ماهی مەی. لە واقێعدا شیعاری ئەساسی ئەوەڵی ماهی مەی "٨سەعات کار" بوو. دیارە ئێمە وەك حیزبی دێموکرات بە ٨سەعات کار رازی نین، دەڵێین ٤٠ سەعات کاری حەفتەیی، یانێ لە واقێعدا کەمتر لە ٨سەعات کارە.

کە حەفتەیی دەڵێن چونکە ئەوە دەلیلی خۆی هەیە بەڵام وا دابنین کە ٨ سەعات کار دەکا، وا دابنێین کە رۆژێ ٨دۆلاریش وەردەگرێ، بۆ هەر سەعاتێکی یەك دۆلار وەردەگرێ. ئێستا ئەو کرێکارە کە ٨ سەعات کار دەکا بۆ ئەو ٨ سەعاتەش ٨ دۆلار وەردەگرێ. سەرمایەداریش دێت دەڵێ باشە برام تۆ ٨سەعات کارت کردووەو ٨دۆلارت وەرگرتوە، ئیتر نارەحەتی چیت؟ کرێکاریش دەڵێ راستە کە من ٨سەعات کارم

کردووەو ٨دۆلارم وەرگرتوە، بەڵام تۆ لەو ٨ســەعات کـارەی مــن، ١٦دۆلارت دەست کەوتوە، یانێ ١٦ دۆلارت پێكهێناوە، بای کارەکەی ١٦دۆلار، ئەوەی کە تۆ بردووتە نیوەت بردوە لە واقیٚعدا، ٨دۆلارت داوە بە من، کە لــە کـوردیدا تەرجومــە کـراوە، مامۆستا مەلا عــەولاٚ تەرجومــەی کـردوە بــە "زێدەبـایی"، کـە بـە نـەزەری مــن کەلیمەیەکی جوانە زێدەبایی لە فارسیدا پێی دەڵێــن؛ "ارزش اضـافی". کـە دەڵێــی کاکی سەرمایەدار راستە کە ٨ سەعات کارم کردوە بەڵام تۆ حەقی ٤ســەعاتت داوە بە من، ٤سەعاتەکەی دیکەت راگرتوە. دیارە کرێکار پێی خۆشە لــەو ١٦دۆلارە کـە هەموو شتەکە هی خۆیەتی، هەرچی بتوانێ هــەمووی وەربگــرێ، خـەبات دەکـا بـۆ ئەوەی لە باتی ئــەوەی ٨دۆلاری بدەنــێ، ببێتــە ١٠ دۆلار، ئەگــەر بکـرێ ١٢دۆلار، هەروا بچێتە سەرێ. شتێکی زۆر تەبیعییە، نە تەنیا خواستی هەرە ئەسـڵی کرێکـار ئەوەیە لەوەی کە کاری کردوە بۆ سەرمایەدار زیاتر وەربگرێ. ســەرمایەدار، ئــەویش پێی خۆشە ٨دۆلاری نەداتێ، ئەویش پێی خۆشە ئەگەر بکرێ ٦دۆلاری بداتێ، بگــرە کەمتریش یــان هــەر نــەبێ نایــەڵێ ١٠دۆلاری لیٚ داوا بکـا. هــەر ٨دۆلارەکـە بــێ. سەرمایەدار ئەوەی لە دڵی دایە کە هەر کەمی بکاتەوە. کرێکار ئەوەی لــە دڵێ دایــە کە هەر زیادی بکاتەوە. ئەوە دەبێتە چی؟ خەباتی چینایەتی.

موبارزەی تەبەقاتی، قسەیەکی هەوایی نیە، ئەساسێکی راستو دروســتی هەیــە. کە ئەو دەیهەوێ کــەمتر بـدا بــە کرێکـار، کرێکـاریش دەیهــەوێ زیـاتر وەربگــرێ. سەرمایەدار دێ دەڵێ ئەتۆ ٨سەعات کارت کردوە باشە، ئەوە ٨دۆلارو چەوســانەوەی تێدا نیە، دیار نیە چەوســانەوە. کرێکـاریش نــەیدەزانیو دەیگـوت ٨ ســەعاتم کـار کردوەو ٨دۆلاری داومێ. مارکس هات گوتی لە ماوەی ئــەو ٨ ســەعاتە کـە کـاری کردوە، بایی ٨دۆلار کاری نەکردوە، بە ١٦دۆلار کاری کردوە. لە ٤ سەعاتاندا بــایی ئەو ٨دۆلارە کاری کردوە، ٤سەعاتەکەی دیکە زیادی کاری کــردوە. جـا بــۆ ئــەوەی ناوی ئەو چەند سەعاتەی یەکەمی ناوە وەختی لازم یا پێویستو ئەوی دیکە وەختــی زیادی. یانێ ٤ سەعات لازم بووە کە ئەو ٨دۆلار وەربگــرێ. ٤ ســەعاتەکەی دیکـە زیادی بووە. کاری کردوە بۆ کێ؟ بۆ سەرمایەدار. بەرهەمەکە بۆ سەرمایەدارە.

جا ئەو چەوسانەوە کەمێك روون نیە، داپۆشــراوە، زۆر روون نیــە، تێکـەڵاوە. لــە زەمانی کۆیلەتیدا مەسەلەکە روون بوو. کابرا کاری دەکرد، بــەردە، کۆیلـە هــەرچی

داهاتی هەبوو هی خاوەن کۆیلەکــە بــوو. لــە زەمــانی فئودالیســتیدا، دەرەبــەگیدا ئەویشمان باس کــرد، روون بــوو یــان ئــەوەی ٣ رۆژ لــە حەفتــەدا کــاری دەکــرد بــۆ دەرەبەگو ٣ رۆژ بۆخۆی. ئەو ٣ رۆژەی کــاری دەکــرد بــۆ دەرەبــەگ دیــار بــوو کــە ئیستیسمار دەکریٚ، چونکە بە خۆڕایی کاری دەکرد بۆ دەرەبەگ. یان ئــەوە بــوو کــە حاسڵەکە دەهات بە نیوەکاری مەسەلەن خەرمانەکە کە حازر دەبوو، فئــودال دەهــات دەیگوت نیمەم دەیەو نیوەی دەبرد. لەویٚش روون بــوو کارەکــە جووتیــار کردوویــەتی بەلاٚم بەرهەمەکە نیوەی هی دەرەبەگ بوو. بــەلاٚم لــیٚرە روون نیــە لــیٚرە لــە واقیٚــعدا سەرپۆشی لە سەر دانراوەو ئیشکالی کارەکەش هەر لەویٚ دابوو. هەتا مارکس هــات ئەو سەرپۆشەی لابردو نیشانی دا کە کریٚکار کــاری نەفرۆشــتوە، بــەو شــیٚوەیەی کــە جەنابی سەرمایەدار دەڵــیٚ، بــەڵکو هــیٚزی کــاری خــۆی فرۆشــتوە. پارەکەشــی کــە وەرگرتووە هی هیٚزی کارەکەیەتی. ئەوانە بڕیٚك فەرقیان هەیە لیٚی گەڕیٚن، فەلسەفەی تیٚدایە. بەلاٚم ئەسڵ ئەوەیە ٨سەعات کاری کردووە بایی ٤ سەعاتی وەرگرتوەو ئــەوە ئەساسی چەوسانەوەی سەرمایەدارییە.

جا لیٚرەدا لایەکمان سەرمایەدارە، لایــەکمان کریٚکــارە. جــا ئــەو رابیتــە لــیٚرەدا پیٚکهاتووە، ئەو پیٚوەندییە ئەوەیە کە بۆ کریٚکار حازرە هیٚزی کاری خۆی بفرۆشیٚ بــە سەرمایەدار؟ هۆکەی زۆر سادەیە، چونکە کریٚکار بۆخــۆی کارخانــەی نیــە، ئــەبزاری تەولیدی نیە، ئامرازی بەرهەمهیٚنانی نیە. مەجبوورە بچیٚ کار لە کارخانەی کــابرای سەرمایەدار بکا. ساحیبی هیچ نیە، خاوەنی هیچ نیە، بۆیــە پیٚــی دەڵیٚــن کریٚکــار. خاوەنی هیٚزی کاری خۆیەتی کە ئەویش دەفرۆشیٚ. دەیباتــە بــازاڕ لــە واقیٚــعدا، لــە بازاڕی کاردا دەیفرۆشیٚ. سەرمایەدار ساحیبی کارخانەیە، ساحیبی ئەبزاری تەولیدە، ئەویش هــیٚزی کــاری لیٚ دەکــڕیٚ. پیٚوەندیــەك پیٚــكدیٚ لــە بــەینی ئەوانــەدا، ئــەو پیٚوەندییە، پیٚوەندیی سەرمایەدارییە. جا ئەگەر هاتن گوتیان "سەرمایە" چیە؟ نــە دەبیٚ بلیٚی پووڵە، نە دەبیٚ بلیٚی کارخانەیە، نــە دەبــیٚ بلیٚــی ماشــینە. دەبــیٚ بلیٚــی سەرمایە پیٚوەندییەکی کۆمەلاٚیەتییە. کە لە سەر ئــەو ئەساســە پیٚــكدیٚ لــە بــەین کریٚکــارو ســەرمایەداردا. پیٚوەندیــی کۆمەلاٚیەتیــە، واقعییــەت ئەوەیــە کــە ئــەو پیٚوەندییە کە پیٚکهاتوە، پیٚوەندیی سەرمایەدارییە. کەوابوو ئەوە نیە کە، مومکینە تمەن لە گیرفانتدا هەبیٚ میلیۆنــها، بــەلاٚم هــەتا نەگەیەتــە ئــەو پیٚوەندیــە، هــەتا

سەرمایەدار ئەو پووڵە وەکار نەخا لە کارخانەداو کرێکار کاری بۆ نەکا، ئەوە نابێتە سەرمایە. عەکسی ئەوە مومکینە پووڵ نەبێ، ئەمن تاکسی دەکڕم، تاکسییەکە بەکرێی دەدەم، شوفێرێك بەکرێ دەگرم، تاکسیەکەم بۆ کار پێبکا. لە ناو شاری سنە، تاران، مەهاباد، ورمێ. ئەوە ئەگەر کاری پێبکەمو یەکێکی بە کرێ بگرمو داهاتم هەبێ لەو تاکسییە، ئەو تاکسییە سەرمایەیە، بەڵام هەر ئەو تاکسییە، ئەو ماشینە، پەیکانێك بێ کە بۆخۆم سواری بم، بەکرێی نەدەم، کاری پێ نەکەم ئەو وەختە دیارە سەرمایە نیە. "ملك"ە، موڵکی خسووسیی منە، بەڵام سەرمایە نیە. جا بۆیە، ئێوە مەسەلەن لە پاشان باسی دەکەین لە ولاتی سوسیالیستیدا، فەرق دادەنێین بەینی مالکییەتی خسووسیو مالکییەتی شەخسی. ئەگەر پەیکانەکە هی خۆمە سواری دەبم ئەوە مالکییەتی شەخسییە. هەرچەند پەیکانی وات هەبێ لە ولاتی سوسیالیستیدا هەموو شەخسییە. بەڵام ئەگەر پەیکانەکە بە کرێی بدەم، یەکێك کارم بۆ بکا ئەوە مالکییەتی خسووسییە. ئەوە ئیستیسماری تێدایە، نابێ. ئەوە دەبێتە رابیتەی سەرمایەداری.

کەوابوو سەرمایە ئەساسەکەی ئەوەیە، دیارە ئەوە سەرمایەداری ئێمە سادەمان کردەوە بۆ ئەوەی حاڵی بین، ئێستا ئێمە بە سەدان، هەزاران کارخانەمان هەیە. کرێکارو موهەندیس لە ولاتانی سەرمایەداریدا کاری تێدا دەکەن. مومکینە زۆر برادەر بڵێن کرێکاری وا هەیە لە ئەمریکا دوو خانووی هەیە، دوو ماشینی هەیە. باشە ئەو چەوساندنەوە لە کوێیە؟ ئەوە نیشاندەری نەبوونی چەوسانەوە نیە، مومکینە چوار ماشینی هەبێ بەڵام حاسڵبەخشیی کار ئەوەندە چۆتە سەرێ، راستە هی چوار سەعات وەردەگرێ، دیارە ئێستا زۆرتر وەردەگرێ. ئێستا کرێکار "متشکل" بووە، کرێکار سەندیکای هەیە، موباریزە دەکا، ٨ سەعات کاری سەلماندووە بڵێین بە سەر سەرمایەداردا. ئێستا ٤٠ سەعات کاریشی سەلماندووە. تەنانەت لە زۆربەی زۆری ولاتانی سەرمایەداری ئێستا حەفتەیەك ٥رۆژ کار دەکەن، یان حەفتەیەك ٣٥سەعات.

باشە دیسانەکە حەتتا ئەگەر ئەوەش بڵێین موهیم ئەوەیە بەشێکی کاری خۆی، ئەوەی پێمان گوت وەختی زیادی، کار دەکا بۆ سەرمایەدار یان نا؟ ئەگەر کاری کردووە بۆ سەرمایەدار خەلاس، مەسەلە نیە ئیستیسمار بووەو چەوسانەوەی تێدایە.

ئەگەر کاری نەکردوە جا ئەوە داهاتی مانگیٚ ٢٠٠٠، ٣٠٠٠، ٤٠٠٠ دۆلار، ئەوە هیچ فەرق ناکا، لە ئەسڵی مەسەلەکە هیچ ناگۆڕیٚ. بەلاٚم چۆن حاسڵبەخشی کار چۆتە سەریٚ، مەسەلەن لە ئەمریکا لەو ٢٥ساڵەدا تەغیراتیٚکی زۆر پیٚکهاتووە. جاری وا هەبوو کارخانەیەك مەسەلەن ٥٠٠ کاریگەری هەبوو ئیٚستا هەر ئەو کارخانە بەرهەمی زۆر زیاترە، ٣٠ کاریگەریشی نیە. چونکە هەموو ئۆتوماتیکەو ماشینەکان کار دەکەن. لە نەتیجەدا کابرای سەرمایەدار دیارە "استثمار"ەکە زۆر، زۆر زیاتریشە. بەلاٚم کریٚکاریش داهاتی زیاترە. زۆرتر بوونی داهاتی کریٚکار مانای ئەوە نیە کە "استثمار" لاچووە، یا کەمتر بوونی داهاتی کریٚکار مانای ئەوەنیە کە "استثمار" دەکریٚ. چونکە سبەی فەرز دەکەین حیزبی دیٚموکرات دەسەلاٚتی بەدەستەوەیە، خودموختاریمان دامەزراندووە. کارخانەکەش بەدەست خۆمانەوە دەبیٚت. پیٚمان خۆش نیە کریٚکار "استثمار" بیٚ. باشە دیارە ئەو وەختەش دەبیٚ بەشیٚکی هەر زیٚدەبایی هەبیٚ. باس دەکەم لە سۆسیالیزمدا چۆنە. بەلاٚم ئەو وەختە چۆن دەبیٚ؟ ئەو وەختە چونکو کریٚکاری کورد لە کوردستان داهاتی کەمتر دەبیٚ لە کریٚکاری ئەمریکایی، مانای ئەوەیە لیٚرە سەرمایەداری هەیەو لیٚرە زیاتر "استثمار" دەکریٚ. نە، چوون لەویٚ حاسڵبەخشی کار زۆرترە حەتتا ئەگەر ٨سەعاتەکەش کار بکەی، ٤ سەعاتی ئەمریکا داهاتی زیاترە لەو ٨ سەعاتە. حەتتا ٢سەعاتی ئەمریکا لەو ٨ سەعاتە زیاترە. مەعموولەن وایە لە بەینی ولاٚتانی جیهانی سیٚهەمو ولاٚتانی سەرمایەداریی پیٚشکەوتوو، لە واقیٚعدا یەكو دەیە. یانیٚ ١ سەعات کاری ئیجتیماعی کە دەکریٚ لە ولاٚتانی سەرمایەداریی پیٚشکەوتوو بەقەد ١٠ سەعات کار لە ولاٚتانی جیهانی سیٚهەم بەرهەمی هەیە. جا بۆیە هەم سەرمایەدارەکە نەفعی زیاتر دەبا، هەم کریٚکارەکە داهاتی زیاترە. بەلاٚم زیاتر "استثمار" دەکریٚ، چونکە داهاتی زیاتر دەگەیەنیٚ بە سەرمایەدار. ئەوە ئەساسی سەرمایەداریو موباریزەی تەبەقاتییە.

ئیٚستا موباریزەکە چۆنە؟ کریٚکار دەتوانیٚ دوو نەوع موباریزە بکا:

یەکیٚکیان ئەوەیە، تەواوی هەدەفی ئەوە بیٚ، ئەوەی زیاتر بکا. یانی لە باتی ٤ سەعات بیکا بە ٦ سەعات بە موباریزە، یان بیکا بە ٧ سەعات، بلیٚین هەتا ٨ سەعاتەکەش هەروا موباریزە بکا بۆ ئەوە. ئەوە تەنیا مەبەستی لە موباریزە ئەوە بیٚ

که وەزعی مادیی خۆی، "اقتصاد"یی خـۆی باشـتر بکـا، پێـی دەڵێـن موبـاریزەی "اقتصادی". موباریزەی ئیقتیسـادی کـە بیسـتووتانە چونکـە کۆمەڵـە زۆری بـاس کردووە، مـن کوردیەکـەی دەنووسـم، "ئێکۆنومـیزم". ئێکۆمـی یـانی ئیقتیسـاد، ئێکۆنومیزم یانی ئەوانە کە فەقەت موباریزەی ئیقتیسادی دەکەن. یانیٚ چی فەقـەت موبـاریزەی ئیقتیسـادی دەکـەن؟ یـانی نایانـەویٚ دەسـەلاٚتی سیاسـی لـە دەسـت سـەرمایەدار بێننـەدەر. تـەنیا دەیانـەویٚ لـە چوارچێـوەی سـەرمایەداریدا وەزعـی کرێکاران باشتر بکەن. سەرمایەداری لەغو نەبێتەوە بـەلاٚم وەزعـی کرێکـاران باشـتر بکەن. نایانەویٚ بۆخۆیان دەسەلاٚتی سیاسی بەدەستەوە بگرنو سـەرمایەداری لەبـەین بەرن. ئەوە ئێکۆنۆمیزمە کە دیارە شتی هەرە بارزی ئەو ئێکۆنۆمیزمـە حیزبـەکانی سۆسیال دێموکراتن. سۆسیال دێموکراتەکانی هەموو ئەو ولاٚتانـە، حـیزبی کارگـەری ئێنگلستان، حیزبی سۆسیال دێموکراتی سوئێد، حیزبی سۆسیال دێموکراتـی ئالٚمـانی رۆژئاوایە، هەموو ئەوانە خەباتەکەیان لە چوارچێوەی رێژیمی سەرمایەداری دایـە. بـۆ هەڵسووڕاندنی رێژیمی سەرمایەداری بەلاٚم لە عەینی حـالٚدا بـۆ باشـترکردنی وەزعـی ئیجتیماعی ـ ئیقتیسادیی کرێکاران. هەدەفیان ئەوە نیە کـە رێژیمـی سـەرمایەداری لابەرن، رێژیمێکی دیکە، رێژیمی سۆسیالیستی لە جێگای دابنـن. ئـەوە پێـی دەڵێـن ئێکۆنومیزم.

باشە، بەلاٚم ئەگەر هاتو کرێکاران ئەوەندە تێگەیشتنیان زۆر بـوو نـەك هـەر بـۆ داخوازەکانی مافی خۆیان، بەڵکو بۆ داخوازەکانی سیاسـیی خۆیـان خـەباتیان کـرد. گەیشتبنە ئەو نەتیجەیە کە ئەو خەیاتە نەتیجەی نیە چونکە ئەتۆ دەتوانـی وەزعـی ئیقتیسادیی خۆت باشتر بکەی بەلاٚم هەر "استثمار" دەمێنێتەوە، هـەر چەوسـانەوە دەمێنێتەوە. دەبیٚ کارێکی وا بکەین ئەو چەوسانەوە نەمێنیٚ. دەبیٚ بۆ ئـەوە دیـارە ئەو رەوابیتە تێكبدەین. خەبات نەکەی بۆ ئەوە کە لە باتی ٤سەعات کار ٦سـەعاتت بداتیٚ، خەبات بکە بۆ ئەوە خۆت ئەو لای دیکە، یانی کارخانەکە بگری بەدەسـتەوە. بۆ ئەوە وای لیٚبیٚ دەبیٚ رێژیمی سەرمایەداری لابەرین. دەبیٚ شۆڕشێکی سۆسالیسـتی بکەین، جا ئەوە دەبێتە فەرقی بەینی ئەوەی کە بۆ هەدەفەکانی ئیقتیسادی موباریزە دەکا، لە واقیعدا تاکتیکی ئێکۆنومیستیی هەیە لەگەلٚ ئـەو کەسـانە کـە تـاکتیکی شۆڕشگێڕانەیان هەیە. ئەوەی کە شۆڕشگێڕنو دەیانهەویٚ رێژیمی تازە بێننـە سـەرکار

وەك سۆسیالیزمو ئەوەی دیکە دەیهەوێ لە چوارچێوەی رێژیمی سەرمایەداریدا کاری خۆی جێبەجێ بکا. مەسەلەن ئەگەر بمانهەوێ بە شێوەیەکی دیکە بارەکە ئیقتیسادییە بەلاّم هەدەفەکە سیاسییە. مەسەلەن ئێمە وەك حیزبی دێموکرات دوو رێگامان هەیە: یەك ئەوەی کە لە چوارچێوەی رێژیمی خومەینیدا داخوازەکانی ئێمە جێبەجێ بێ، ئەگەر جێبەجێ بێ بۆ خەبات بکەین بۆ رووخانی رێژیمی خومەینی؟ دەچین بە رێژیمی خومەینی دەڵێین ئەوانەمان دەیە، پێمان خۆشە لە چوارچێوەی رێژیمی تۆدا ئێمە داخوازەکانمان جێبەجێ ببێ. یەکی دیکە ئەوەی ئێستا گەیشتین پێی کە لە چوارچێوەی رێژیمی خومەینیدا داخوازەکانمان جێبەجێ نابێ. ئەگەر بمانهەوێ داخوازەکمانمان جێبەجێ ببێ، دەبێ رێژیمی خومەینی لابەرینو بیڕووخێنین. ئەویش ئەوەیە کە لەوێدا مەسەلەی ئێکۆنومیزم لەگەڵ موبارزەی شۆڕشگێڕانەی کرێکاران فەرقی هەیە. باشە ئەوە ئەسڵی سەرمایەدارییە. جا من نامەوێ لەوە زیاتر باس بکەم.

بچینە سەر ئەوە کە قۆناغەکانی سەرمایەداری باس بکەم. سەرمایەداری لە واقێعدا دوو قۆناغی ئەساسیی هەیە، بەشی دووەمیشی دەبێتە دوو قۆناغ. دوو قۆناغە ئەساسییەکە ئەوەیە کە: یەکەم ئەوەیە کە پێی دەڵێن سەرمایەداریی ئازاد. سەرمایەداریی کلاسیکی پێ‌دەڵێن، سەرمایەداریی بازاڕی ئازادی پێ دەڵێن، زۆر ناوی لە سەرە. ئەو سەرمایەدارییە هەتا ئاخری قەڕنی ١٩ تەقریبەن سەد ساڵ لەوەی‌پێش هەبووە. ئەوە سەرمایەدارییە کە سەرمایەدارمان هەیە، کرێکارمان هەیە. لە بازاڕی ئازاددا کرێکار هێزی کاری خۆی دەفرۆشێ، سەرمایەداریش دەی‌کڕێ. دەوڵەتیش وەزیفەی ئەوەیە کە دانیشتووە تەماشا دەکا بۆ ئەوەی قاعیدەی قانوونی بازاڕی ئازادی سەرمایەداری رەعایەت بکرێ، کەس تێکی‌نەدا. هەر وا بزانێ کە مەسەلەن دوو نەفەر دانیشتوون پێکەوە قومار دەکەن یان شەترەنج دەکەنو یەك نەفەریان داناوە کە کەس فێڵ لە کەس نەکا. بە پێی قانوونی شەترەنج دەبێ رەعایەتی بکەن. شاهید یانی دەوڵەت دەخاڵەت لە کاروباری ئەو دووانەدا ناکا. هەرچەند لە ئەساس‌دا دەوڵەت، دەوڵەتی سەرمایەدارانە، بەلاّم هیچ ئێحتیاجی بەوە نیە کە دەخاڵەت بکا. چونکە بازاڕی ئازادی سەرمایەداری ئەو وەختە تەواوی مەنافێعی سەرمایەداری تەئمین دەکا. ئەوە مەرحەلەی یەك.

لە مەرحەلەی دوودا وەزعەکە فەرق دەکا، چونکە بە پێی پێشکەوتنی ئیقتیساد، بە پێی ڕێژەی سەرمایەو بە پێی زۆر شتی دیکە کە بەداخەوە وەختمان نیە باسیان بکەین، نەتیجە وای لیٚدیٚ کە سەرمایەداری داخلّی قۆناغێکی تازەتر دەبیٚ، کە پێی دەڵێن قۆناغی ئیمپریالیستیی سەرمایەداری، یا قۆناغی سەرمایەداریی ئینحیساری یا قۆناغی مۆنۆپۆلیستی ("انحصاری") بە کوردی یانیٚ پاوانخوازی. یانیٚ بە تاقی تەنیا بۆ خۆی دەویٚ. باشە، ئەو "انحصاری"یە چیە؟ ئەوەیە کە ئەگەر بازاڕی ئازاد هەبوو دیارە ئەو بازاڕی ئازادە هەتا ئەو وەختە کە سەرمایەداری زۆر گەشەی نەکردبوو زۆر باش بوو بەلاّم ئیدی لە پاشان زۆر قازانجی نەبوو. مەسەلەن دوو سەرمایەدار پەیدا بوون، هەردووکیان کەوش دەفرۆشن، دیارە ڕەقابەتیان لە بەیندا هەیە. ئەو نرخی کەوشی خۆی دێنێتە خواریٚ بۆ ئەوەی ئەوی دیکە بشکێنیٚو ئەوی دیکەش هەروا. ئەگەر سەرمایەداری چکۆلە بوون ئەوە ئەوەندە موهیم نیە، چونکە زۆریش بەلاّم ئەگەر بوون بە دوو سەرمایەدار، سیٚ سەرمایەداری گەورە ئەو وەختە خەتەری ئەوەی هەیە کە قازانجی سەرمایەداری بخاتە خەتەرەوە. چونکە ئەگەر تۆ قیمەتی کەوشی خۆت دێنیتە خواریٚ، ئەمنیش مەجبوورم بیهێنمە خواریٚ. هەم ئەتۆ زەرەر دەکەی وەك سەرمایەدار هەم من. ماوەیەك ئەوەی دەکەن، هەتا یەکتر لەبەین دەبەن.

ئەوەی کە مەشهوورە دەڵێن ماسی گەورە ماسی چکۆلە دەخوا، ئەوە لە سەرمایەداریدا بە تەواوی باوە. بەلاّم دەگاتە جێگایەك لە باری ئیقتیسادییەوە فکر دەکەنەوە کە ئەگەر ئاوا بڕواتە پێش هەردووکیان وەرشکست دەبن. جا ئەو دوو سەرمایەدارە، دەڵێن بابە ئێستا ئێمە بۆ وابکەین، بۆ دانەنیشین ڕێك نەکەوین؟ با ڕێك کەوین لە سەر قیمەتێك، ئەتۆش بەو قیمەتە بفرۆشە، ئەمنیش بەو قیمەتە دەفرۆشمو ئیدی پێویستیش ناکا ئێعلام بکەین کە ڕێك کەوتین. بەلاّم لە بەینی خۆماندا ڕێككەوین بە دزی باشترە. جا ئەوەیە کە سەرمایەداری مۆنوپۆل پێكدیٚ. مۆنوپۆلیستەکان پێكدێن. یانیٚ چ دەکەن. دێن پێکەوە ڕێك دەکەون کە ئێمە، لە سەرتاسەری دونیا نموونەی زۆر جالبمان هەیە. ئەویش نەوت، ئەگەر دیقەتتان کردبێت لە سەر ئەوەی نەوتی بە چەند بفرۆشن ڕێك دەکەون. ئۆپێك (**OPEC**) دیاری

دەکا. ئەو ولاّتانەی کە نەوت سادر دەکەن، ئەو دیاری دەکا. چونکە شیرکەتە نەوتەکانی گەورەی ئۆپیك ئەوانەن کە تەواوی زەخایری نەفتی تیدایە.

ئیستاش لیرە کە بوون بە مۆنوپۆلو ئەو دەلیّ وەرە با ئەوەی بکەینو ئەوی دیش دەلیّ با ئەوەی بکەین. بەرەبەرە ئەو هاوکارییە زیاتریش دەبیّ، لە زۆر شتی دیکەشدا ریك دەکەون. ئەو سەرمایەدارییە کە بەو شیوەیەی کە ئازاد بووە لەبەین دەچیّو دەبیتە سەرمایەداریی مۆنوپۆل. ئەوانەی مۆنوپۆلی هەرە گەورەن لەگەلّ دەولەت رۆژبەرۆژ نیزیکتر دەبن. دەولەت کە بوو بە شەر، خەرجی زۆر دەبیّ وەك ئیستای ریژیمی جمهووریی ئیسلامی، کە خەرجی زۆر بوو پوولی زۆر چاپ دەکا، کۆمەکی مالّیی دەویّ، لە بانکەکانی خسووسی لە شیرکەتەکانی خسووسی، لە نەتیجەدا ئەوە وا دەبیّ کە بەرەبەرە دەولەت لە مۆنوپۆلەکان نیزیك دەبیتەوە.

جا لە مەرحەلەیەك کە ئیمە ئیستا تییداین مەرحەلەی سەرمایەداریی ئیمپریالیستییە، سەرمایەداریی ئیمپریالیستیی دەولەتییە. یانی دەولەت دەخالەت لە هەموو کارەکاندا دەکا. مەسەلەن ئیستا ئەگەر ئیوە دیققەتتان کردبیت دەولەتی ئەمریکایە کە لە باری ئیقتیسادییەوە دەچیّ قەرارداد دەبەستیّ، دەخالەتیش دەکا. دەولەتی فەرانسە هەر وا، دەولەتی ئالمانی رۆژئاوا هەر وا، دەولەتی ژاپۆن هەر وا. نەتیجە وای لیّدیّ کە دەولەت بۆخۆی دەبیتە شیرکەتیکی گەورەی ئیقتیسادیو خۆی دەکا بە نمایەندەی هەموو خەلّك. دیارە قەت نالیّ من نمایەندەی سەرمایەدارانم، دەلیّ من نمایەندەی هەموو خەلّکم. ئینتیخابات دەکریّ، لە ئینتیخابات دەچیتە سەر، لە ولاّتانی دیموکراتی سەرمایەداری دەبیتە نمایەندەی دەولەت. دەبیتە سەرمایەداریی ئینحساری دەولەتی. لە واقیعدا مەرحەلەی ئیستای سەرمایەدارییە، کە لەگەلّ دەورانی رەقابەتی ئازاد فەرقی هەیە. ئیدی دەورانی رەقابەتی ئازاد نەماوە.

مەسەلەن ئیستا بۆخۆتان دەزانن ویدئۆ پەیدا بووە. ژاپۆن ویدئۆی زۆر هەرزان درووست دەکا، ویدئۆی خۆی دەنیریّ بۆ ولاّتانی ئورووپای غەربی، لەویّ بە هەرزان دەیفرۆشیّ. لە نەتیجەدا خودی ئەو ولاّتانە ناتوانن ویدئۆی خۆیان بفرۆشن. چی دەکەن؟ تەسمیم دەگرن ئیمە نایەلّین ویدئۆی ژاپۆنی بەو ئاسانیە بیتە ئیرە، یا دەبیّ گومرکیکی زۆر بدا یا دەبیّ سەهمیەیەکی زۆر کەم بنیریّ. حەقی نیە ئەوەندە ویدئۆ بنیریّ. بۆ ئەوەی دیفاع لە ئیقتیسادی خۆی بکا. لە حالیکدا جاران ئازاد بوو.

هەرکەس بە کەیفی خۆی لە هەر جێگایەکی هەر شتێکی فرۆشتبا ئیمکـــانی ئـەوەی هەبوو، گومرك زۆر کەم بوو. جا ئێستا وا نیە. دوایـــە لـە نەتیجـەدا وەزعەکـە وای لیّدێ کە دەوڵەتەکە دێنێتە سەر ئەوە کە دیفاع لە مەنافعی دەوڵەتیی خۆی بکا لـــە موقابیلی سەرمایەدارانی دیکەدا. کە هەرچەند سەرمایەدار ئێستا ئەنتێرناسیۆنالیزە بوە، یانێ "بین‌الملل"ی بووە. سەرمایەداری رۆژبەڕۆژ زیاتر "بین‌الملل"ی دەبـێ، بـەلاّم لەگەڵ ئـــەوەش هــەر دەوڵــەتێکیش، هــەر گرووهێکــی ســەرمایەداریش لــە فیکــری مەنافێعی خۆی دایەو دیفاع لە مەنافێعی خۆی دەکا.

باشە، ئێستا بزانین ئێمە چمان هەیە. ئێمـە لـە واقیـعدا رێژیمـی سـەرمایەداریمان هەیە کە گەیشتۆتە ئاخر مەرحەلەی خۆی کە پێی دەڵێن مەرحەلەی ئیمپریالیســتی. بەلاّم لە باری ئیقتیسادی‌یەوە، ئێستا مەرحەلەی سەنعەتی کردنــی لـەمێژە خـەلاس کردوە. گەیشتۆتە مەرحەلەی پاش سەنعەتی‌بوون. وەکو ئەمریکا، ولاّتانی ئورووپـای غەربی، ئۆستڕالیا، کانادا، زلاندی تازە ("زلاند نـــو")، ئافریقـای جنووبـی، ئەوانـە ولاّتانی سەرمایەدارین کە گەیشتوونەتە قۆناغی پاش سەنعەتی بـوون. ئێمـە ئێسـتا پێش سەنعەتی بوونین.

جا سەنعەتی بوونو نەبوون لە باری عیلمی‌یەوە روون بکەینەوە یانی چی؟ ئێســـتا مەسەلەن دەڵێ ئێران ولاّتێکــی ســەنعەتی‌یە؟ نــە، کشـتوکاڵی‌یە. بـۆ؟ بـە داهـاتی نەتەوەیی، مەسەلەن داهـــاتی نەتـەوەیی ١٠٠میلیـۆن دۆلارە، ١٠٠میلیـۆن تمەنـە، ئەگەر بەشی زۆری ئەو داهاتە نەتەوەیی‌یە لە کشتوکاڵەوە بێ، لـە زەراعەتـەوە بـێ، ولاّتەکـە کشـتوکاڵی‌یە، ئەگـەر داهـاتی نەتـەوەیی لـە سـەنعەتەوە بێـت، ولاّتەکـە سەنعەتی‌یە. هەرچی پێشکەوتووتر بێ زیـاتر لـە سـەنعەتەوەیە. ئـەو ولاّتانـەی کـە گەیشتوونەتە پاش سەنعەتی‌بوون، ئەو ولاّتانەن کە بەشی هەرەزۆری داهاتەکەیان لـــە سەنعەتەوە دێت، نە لە کشتوکاڵەوە. مەسەلەن ئێستا مومکینـە پێتـان سـەیر بـێ، ئەمریکا لە نەزەر بگرن، کە بۆخۆتان دەزانن لە باری کشتوکاڵەوە نەك خـۆی تـەئمین دەکا، نەك بە زۆر ولاّتی دیکە گەنمیان پێدەفرۆشێ، نازانم رۆنو کەرە یان حـەتتا زۆر گەنم دەفرۆشێ بە ولاّتێکی وەك "اتحاد شـوروی"، بـە میلیۆنـها تۆنـی پێدەفرۆشـێ هەموو ساڵێ، بە ولاّتەکانی سۆسیالیســـتی دیکـە. بـەلاّم ئـەوە، دەزانـن نیسـبەتی ئەوانەی کە لە کشتوکاڵی ئەمریکا کار دەکەن بە پێی ئـــەوە دەبـێ ئینسـان زۆر ورد

بیٚ. مەسەلەن بلێین کە لە ٢٥٠میلیۆن خـەڵکی ئـەمریکا، ٥٠میلیـۆن کـار دەکـا، هەموویان کار ناکەن. بەشێکیان منداڵــن، بەشـێك پـیرن. باشـە پێتـان وایـە چـەند دەرسەدی ئەو ٥٠میلیۆنە لە کشتوکاڵدا کار دەکا کە ئەو هەموو داهاتــەیان هەیـە؟ کەمتر لە ٢٪. جا لەوەڕا بزانن کشتوکاڵی ئەمریکا حاسڵبەخشیە چەند زۆرە. چونکو وڵاتی وامــان هەیـە کـە ٨٠٪، ٩٠٪ی وەکـو وڵاتـی کوردسـتانی خۆمـانو وڵاتـی بەنگلادێش، پاکستانو ئەوانە کار دەکەن لە کشتوکاڵدا، بــە ئـەندازەیکافی غــەزای دەس ناکەویٚ. لە ئەمریکا فەقەت ٢٪ لە کشتوکاڵ کار دەکەنو لەگــەڵ ئـەوە خـۆی تەئمین دەکاو بە میلیۆنها دەتوانیٚ سادر بکا. یانیٚ بەرهەمی سەرانەی یانیٚ بەرهەمی یەك هێکتار زۆر زیاترە لە زۆر جێگــای دیکـە. باشـە بۆیـە پێـی دەڵێـن وڵاتێکـی سەنعەتی. چونکە لە سەنعەتدا بە پێچەوانەوە زۆر زیاتر لە ٢٥٪ کار دەکەن، لـەویٚ بەرهەمی دەبیٚ چ بیٚ. ٢٪ کشتوکاڵ ئەوەندە بەرهەمی هەیە، دەبیٚ ٢٥٪ی سەنعەت چەندە بەرهەمی هەبیٚ؟ ئــەویش یـەکێك لــە نیشـانەکانی پێشـکەوتنە. ئەگـەر لــە جێگایەكدا بیستتان لە سەنعەتدا خەڵك زیاتر کار دەکا، ئەوە مانــای پێشـکەوتنە. لە کشتوکاڵ ڕۆژبەڕۆژ کەمتر کار بکا ئەوە مانای پێشـــکەوتنە. وەکـوو لای خۆمـان هەتا ٣٠ ساڵ، ٤٠ ساڵ لەوەی پێش لە ئێران، لە کوردستاندا بە گشتی بلێـــین ٨٥٪ لە گوندەکان بوون، ١٥٪، ٢٠٪ لە شارەکان بوون. ئێستا ٥٠ بە ٥٠ بوون، ٥٠٪ لە دێیەکان، ٥٠٪ لە شارەکان، کە ڕۆژبەڕۆژ هەروا دەچێتە پێشیٚ. دیارە بەداخەوە ئەوە مانای پێشکەوتنی کشتوکاڵەکەمان نیە. ئەوە وەزعێکی تایبەتی‌یە. ئێستا لە ئــەوە کە بۆ ئێمە موهیمە رێژیمی سەرمایەداری بریتی‌یە لەو وڵاتانە، لە پێــش هــەمووان‌دا ئەمریکا، پاشان وڵاتانی ئورووپای غەربی، لە پاشـــان دیـارە ژاپـۆن پاشـان کانـادا، نیوزلەند، ئەو چەند وڵاتەی کە باسمان کرد. بەڵام موهیم ئەوەیە کە ئەگەر هەموو ئەو وڵاتانە ئێمە کۆ بکەینەوە، هەموویان پێکەوە لە واقیعدا نابنە ٢٠٪ی دانیشـــتووانی دنیا. بەڵام ئەگەر تەماشای داهاتیان بکەین، تەقریبەن ٧٠٪، ٧٥٪ی داهــاتی دنیـا هی ئەو وڵاتانەیە. ئەمریکا بۆخۆی بە تاقی تــەنیا، کـە لـە واقیـعدا ٦٪ تـا ٧٪ی دانیشتووانی دنیا لــە ئــەمریکان، بۆخـۆی بـە تـاقی تـەنیا نیـوەی بەرهــەمی دنیـا پێكدێنیٚ.

کەوابوو نیسبەتەکە بە قازانجی ولاّتانی سەرمایەدارییە. بەلاّم لە موقابیل ئەواندا ئێستا مەجموعەیەکی دیکە پێکهاتوە لە ولاّتانی سۆسیالیستی کە بریتییە لە "اتحاد شوروی"، لە چین، لە ولاّتانی سۆسیالیستیی ئورووپای رۆژهەلاّتو چەند ولاّت وەکوو کووباو ویتنامو ئەوانە. لە باری دانیشتووانەوە ئەوانە زۆر زیاترن لە ولاّتانی سەرمایەداری، تەقریبەن دانیشتووانیان لەوانەیە سێ بەرابەر بێت، یان زیاتر لە دانیشتووانی ولاّتەکانی سەرمایەداریی پێشکەوتوو. بەلاّم لە باری ئیقتیسادییەوە کەمترە. دانیشتووانیان زیاترە، چونکە چین بە تاقی تەنیا نێزیك یەك میلیارد دانیشتووی هەیە، بە قەد هەموو ولاّتانی سەرمایەداری، بەلّکو زیاتریش لە ولاّتانی سەرمایەداری. تەنیا ئەمریکا ٢٥٠ میلیۆنە. بە ولاّتانی دیکەی ئورووپای رۆژهەلاّتەوە ئێستا بەرەبەرە ئەوە دەڕوا ١/٥ تا ٢ میلیارد کەس ئەو رێگایەی دەچن.

پێمخۆش بوو ئەوەلّەن، لێرە کە پاشان دەچینە سەریان نەلّێین، چونکو زۆرجار بەکاری دێنین ئۆردووگای سۆسیالیستی. ئۆردووگای سۆسیالیزم بەو شێوەیە وجوودی نیە. بلّێین ولاّتەکانی سۆسیالیستی چونکە ئۆردووگای سۆسیالیزم ئەوە چینو شوورەوی هەر لە کێشەدان، چینو ویتنام لە کێشەدان، ئەوە یوگۆسلاڤیو ئالّبانییە کێشەیان هەیە، کەوابوو بلّێین ولاّتانی سۆسیالیستی. بۆچی؟ لە پاشان باسی دەکەین، دەلّێین ولاّتانی سۆسیالیستی.

بەشی سێهەمی دنیا پاش سەرمایەداریو سۆسیالیزم، ئەوەیە کە پێیان دەلّێن جیهانی سێهەم. جیهانی سێهەم هەموو ئەو ولاّتانە دەگرێتەوە کە خاریجی ئەو دوو بەشەن، سەرمایەداریو سۆسیالیستی. دیارە جار جار چین بە بەشێك لە جیهانی سێهەمی دەزانن لە باری ئیقتیسادی ـ ئیجتیماعییەوە دەبێ هەر وا بێ، ویتنامیش هەر وا، بەلاّم لە باری رێژیمی سۆسیالیستییەو بەشێکە لە ولاّتانی سۆسیالیستی. ئەگەر ئەوانە دەربێنین، ئێستا ئێمە دەزانین کە پێکەوە سۆسیالیزمو سەرمایەداری ٢میلیاردن، ٢میلیارد زیاتری دیکە جیهانی سێهەمن. یانی ئەکسەرییەت ئەو ولاّتانەن کە ولاّتی پاشکەوتوون. نە ولاّتی پێشکەوتووی سەرمایەدارین نە بوون بە ولاّتی سۆسیالیستی. پاشکەوتنەکەیان لە رووی چییەوە دیاری دەکەین؟ داهاتی نەتەوەیی یا داهاتی سەرانە. لە رووی داهاتی سەرانەوە ئەوانە پاشکەوتوون.

لێرەدا گرووهێکی دیکە تایبەتی لەو ولاّتانە هەیە کـە داهـاتی سـەرانەیان زۆرە. بەلاّم ئەوانە زۆر کـــەمن، دانیشـتووانی هەمووشـیان پێکـەوە ئەگـەر بگاتـە ١٠٠، ١٥٠میلیۆن، ئەویش ئەو ولاّتانەن کە نەفت سادر دەکەن. لە عەرەبستانی سـعوودی، کوەیت، ئێرانو عێراقەوە بگرە هەتا دەگاتە جەزائیرو نیجریەو هێنـدێ ولاّتـی دیکـە چونکو دانیشتووانیان زۆرە وەکو ئێران، ئەوەیە نەفتەکە فایدە ناکـا وەزعیـان باشـتر بکا. بـەلاّم بازێکیشـیان بەڕاسـتی داهاتەکـەیان زۆرەو دانیشـتووانیان کەمـە. وەك کوەیت، قەتەر،خودی عەرەبستانی سعوودی، ولاّتەکانی "امارات متحده"و ئەوانـــە. دیارە ئەوانە وەزعیان لە باری داهاتەوە زۆر باشە. بـەلاّم ئەگـەر ئەوانـە لـە لایـەکی دابنێن، ئەوەی دیکە جیـــهانی سـێهەم کـە بەڕاسـتی نزیکـی دوو میلیـاردە وەزعـی ئیقتیسادیی زۆر خراپە، زۆربەی دانیشتووان لەوێن. زۆربەی مەوادی خـامو ئەوانـەش لەوێڕا دەچێتە دەرێ، بەلاّم حەتتا ١٠٪ی بەرهەمی سەنعەتیی دنیاش لەو ولاّتانـەدا نیە. ئـــەوەندە وەزع لـە بـاری ئیقتیسـادییەوە لـەو ولاّتانـەدا خراپـە. بـەلاّم ئێمـە تەقسیمێك بوو کە کردمان بۆ ئەوەی کە بەو تەقسیم کردنە بتوانین نیشان بدەیـن کـە سەرمایەداری وەزعی چۆنە، سۆسیالیزم وەزعی چۆنەو لە دنیـــای ئێسـتادا ولاّتەکـە، ئەو ولاّتانەی کە زۆر جار ناومان ناوە ئیقتیسادی تێکەلاّو، ئەوانە وەزعیان چۆنە.

بگەڕێینەوە ئێستا بۆ ئەوەی وەزعی سەرمایەداری لە باری "بین‌المللـــی"یـەوە روون بکەینەوە. لە باری داخیلییەوە ئەوە بـــوو وتمـان. لـە بـاری "بین‌المللـی"یـەوە دیـارە مەسەلەکە بەو سادەییە نیە. ئەوەڵەن بەو سادەییە نیە کە ولاّتـــەکانی سـەرمایەداری هەموویان پێکەوە یەکدڵو یەکپارچە راوستاون بەرامبەر بە ولاّتانی جیـــهانی سـێهەم یان سۆسیالیستی، شتی وا نیە. بە پێچەوانە ئێمە دەبینین کە لـە زۆر شـتدا ئەوانـە پێکەوە ناتەباییان هەیە، ئیختیلافاتیان هەیە. حـــەتتا لـەویش زیـاتر زۆرجـاری وا دەبێ زۆر توندوتیژ دژی یەکتر رادەوستن.

ئەمریکا لەگەڵ ئورووپـــای غـــەربی ئیختیلافـی هەیـە، ژاپـۆن لەگـەڵ ئورووپـای غەربی، لەگەڵ ئەمریکا هەیەتی، ئەگەر هەمووی تەماشا بکەین دەبینین کـە راسـتە هەموویان ولاّتی سەرمایەدارین بەلاّم لە بەینی خۆشیاندا، ئەوانەی کە هەرە گەورەن، بە تایبەتی ئەمریکا، ئەوان بەو شێوەیە کە هەموو ولاّتـــەکانی سـەرمایەداری پێیـان خۆشە نایەنە دنیای دەرەوە. مەسەلەن فەرز بکەین ئێستا ئەمریکا بە سـەدان هـەزار

لەشکری هەیە لە دەرەوەی ولاتەکەی. لە ژاپۆنەوە بگرە هەیەتی تا ئورووپای غەربی. باشە ئەگەر ولاتی سەرمایەدارییە، ئازادە دەڵێی دێموکراتیشــە، لەشــکری تــۆ لــەو ولاتانە چ دەکا؟ ئێستا ئەوە ئیختیلاف هەیە لە سەر ئەوە کە ئایا لەشکری ئــەمریکا لە ئورووپای رۆژئاوا هەبێ بە قازانجی ئەو ولاتانەیە یا نەبێ. لە پاشان، دێینــە ســەر ئەوە کە مەسائیلی ئیقتیسادی لەگەڵ مەسائیلی ئێستراتژیکی تێکەلاو دەبێ، هەموو وەختێك ئەوانە پێکەوە وەك یەك نین.

مەسەلەن ئێستا ئەگەر بپرسی لــە بــاری ئیقتیســادییەوە ژاپــۆن بــەهێزترە یــان فەرانسە؟ دەبێ بلێین ژاپۆن بەهێزترە. چونکــە ژاپــۆن ١٥٠میلیۆنــەو لــە زۆر شــتدا پێشکەوتووە، فەرانسە ٥٠میلیۆنە. بەلام ئەگەر بە گشتی حیسابی بکەین لــە بــاری ئیستراتژیکییەوە فەرانسە بەهێزترە، چونکە فەرانسە چــەکی ئــەتۆمی هەیــە ژاپــۆن نیەتی. بۆمبی ئەتۆمی ئەوەندەی هەیــە کــە کــەس نــاتوانێ دەســتدرێژی بــۆ بکــا، ئەوەندەی نیە کە بە سەر خەڵکی دیکەدا دەستدرێژی بکا، بەلام هەر ئەوەندەی هەیە کە خەڵك نەتوانێ دەستدرێژی بکا بۆ سەر فەرانسە.

مەقســەدی مــن لــەو نموونانــە یــەك شــتە. ئــەویش ئەوەیــە کــە ئــەو دەوڵەتــە سەرمایەدارییانە یەکپارچەش نین کە هەموو لە یەك لا راوستابن. چونکو زۆر جار وا دێتە بەرچاو کە بەداخەوە ئێمە لە کوردستانو لە ئێراندا تەمایۆلێکی ئاوامان هەیە، حیزبی دێموکرات کەمتر، خەڵکەکە زیاتر، گرووهەکان زۆر زیاتر کــە هــەموو شــتێك سابیتە. مەسەلەن فەرز دەکەین دێت لەگەڵ تۆ ئاوا قســە دەکــا، رێژیمــی خومــەینی زیددی ئیمپریالیستە یان نە؟ باشە ناپرســی کێــها ئیمپریالیســت؟ زیــددی کەلیمــەی ئیمپریالیستە؟ بە چی زیددی ئیمپریالیستە؟ ئیمپریالیستیش هەیولایەکە دیاریش نیە لە کوێیە. بێ مەسەلەکە حەل کە. نە، بین تەحلیلی بکەین، بزانین بەراســتی زیــددی ئیمپریالیستە؟ چی کردوە، زیددی ئەو ئیمپریالیزمە کە بلێین زیــددی ئیمپریالیســتە؟ عەمەلەن چی کردوە؟ ئایا عەکسی ئەوەی کردوە؟ ئێمە هــەموو وەختــێ دەمــانگوت دەیکا، عەکسی ئەوەی کردوە.

رێژیمێك ناتوانێ زیددی ئیمپریالیستی بێ کە ئەگەر لە داخیلی خۆیدا، لە داخڵــی ولاتــی خــۆیدا لــە پێــشدا بیهــەوێ دژی ئیمپریالیســتەکان لەبــەین بــەرێ، وەك موجاهیدینی خــەڵك، وەك حــیزبی دێموکــرات. ئەوانــە ســەرکوت دەکــا، چــۆن دژی

ئیمپریالیستە کە ئەوانە لە پێشدا سەرکوت دەکا کە دژی ئیمپریالیستین؟ چۆن دژی ئیمپریالیستە کە تەواوی وەزعی ئیقتیسادی وڵاتەکە بە شێوەیەك لەبەین دەبا کە وابەستەگی ئێران رۆژبەرۆژ بە ئیمپریالیزم زۆرتر دەبێ. حەتتا مەجبوور بوو لە ئیسرائیل ئەسڵەحە بکڕێ. ئەوانە واقێعیاتن نەك ئەوەی کە هەر شوعار بدەی بە دژی ئیمپریالیزم. چونکە شوعار، کاتێك خومەینی یان هەر کەسێکی دیکە قسە دەکا دەڵێن تەکبیر لە ئاخرەکەیدا جنێو دەدەن مەرگ بەر ئەمریکا، مەرگ بەر ئیسرائیل، مەرگ بەر شوورەوی، بەوە نیە دژی ئیمپریالیستی. ئەوە نابێتە دژی ئیمپریالستی. بێین تەحلیل بکەین مەسەلەن ئێستا زۆر هەوڵ ئەدا رێژیمی جمهووری ئیسلامی کە نیشان بدا کە فەرانسە رێژیمێکی ئیمپریالیستی‌یە. ئەگەر دیققەتتان کردبێت، حەتتا تەبلێغاتی دژی فەرانسەش زیاترە هەتا دژی ئەمریکا. نە لەبەر ئەوەی کە فەرانسە ئیمپریالیستە. لە بەر ئەوەی کە فەرانسە رێگای داوە ئێرانی‌یەکان لە فەرانسە فەعالییەتی ئازادیان هەبێ دژی رێژیمی خومەینی. شووورای میللی مەقاومەت نوێنەری لەوێ هەبێ، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران رەسمەن دەفتەری هەبێ. دیارە ئەوانە کە باسی ئەوەی دەکا رێژیمی فەرانسە سەهیۆنیستی ـ سۆسیالیستی ـ ئیمپریالیستی‌یە، ئیدی ئەو هەموو شتێ تێکەڵاو دەکا.

بەڵام واقێعبیانە تەماشا بکەین، ئێمە کە تەماشا دەکەین لە زۆربەی زۆری مەسائیلی ئەساسیی دنیا، فەرانسە ئیختیلافی هەیە لەگەڵ ئەمریکا. ئەمریکا دەیهەوێ حکوومەتی نیکاراگوا بڕووخێنێ، شتێکی وازیحە، نایەوێ کووبایەکی دیکەی بۆ ساز بێ. ئێستا لە نیکاراگوا لە بندەستی ئەمریکا شۆڕشێك هەیەو خەریکە سەردەکەوێ. سەریش کەوتووەو حکوومەتی بەدەستەوەیە، ئەمریکا دەیهەوێ بیڕووخێنێ، فەرانسە ئەسڵەحەی بۆ دەنێرێ. باشە ئەوە چۆن ئەوانە یەکن؟ ئەوە چۆن ئیمپریالیستێکە کە پشتیوانی لە حکوومەتی شۆڕشگێڕی نیکاراگوا دەکا. نموونەی زۆر ئاوا هەیە.

کەوابوو ئێمە بۆ تێگەیشتن ـ وەکو حیزبێکی سیاسی ـ لە چوارچێوەی سەتحی "بین‌المللی"دا بتوانین هەم لە تەزاددی ئیمپریالیستەکانیش ئیستیفادە بکەین‌و هەم بزانین ئەویش نیە کە گوتی زیددی ئیمپریالیستە ئەمنیش لە دوورەوە سڵاوی لێدەکەم. بزانین کێ بەڕاستی ئیمپریالیستە؟ کێ چ دەکا؟ تەماشای کردەوە بکەین.

عەمەلی خراپ بوو، ئەوە باش. کردەوەی خراپ نەبوو ئیدی لە خۆڕایــی کێشــە ســاز نەکەین. ئەوە دیارە لە باری یەکگرتوونەبوونو یەکپارچە نەبوونی ئیمپریالیســتەکانە. حەتتا بەرامبەر بە ولاّتانی سۆسیالیستییش یــەکگرتوو و یەکپارچــە نــین. مەســەلەن ئێســتا مەســەلەی دانــانی ئــەو مووشــەکانە لــە ئورووپــادا هەیــە. حەتمــەن دەزانــن بیستووتانە ئەمریکا دەڵێ من "پرشنگی٢" دادەنێم، شوورەویش لە موقابیلی ئەوەدا دەیەوێ مووشەکی تایبەتیی خۆی "**SS20**" دابنێ. ئالْمانی رۆژئاوا زۆر مەسەلەکەی بۆ موهیمە، چونکە ئەوەڵێن ولاّت ئەگەر شەڕ ببێ، لەبەین بچێ، ئالْمانی رۆژئاوایــەو دیارە لە فکری گیانی خۆی دایە. دەڵێ ئێمە با ئاوا بکەین کە نــە ئــەتۆ دابنێــی نــە ئەتۆ. بەلاّم ئەمریکا نە، پێی خۆشە هی خــۆی دابنــێ. چونکــو دوورە. لــە ئالْمــانی غەربی دیارە ئەمریکا چەندین هەزار کیلومتر دوورە، لە ئەو ناکــەوێ ئــەو دەیهــەوێ ئالْمانی غەربی بکا بە پێشجەبهەی خۆی. دەبینین کە لەوێ ئیختیــلاف هەیــەو لــەو ئیختیلافانە ئیستیفادە بکەین.

مەقســەدم ئەوەیــە کــە ئێمــە کــە باســی ســــەرمایەداری دەکـــەین، ئەساســـی سەرمایەداری لە سەر چی راوەستاوە، ئەوەی کە باسمان کرد، بەو شێوە عیلمی‌یەی کە باسمان کردو دیارە دەبێ بڵێن ئەو سەرمایەداری‌یە یەکدڵو یەکپارچە نیە، لە پاشان ئەو سەرمایەداری‌یە ئەوەش نیە کە ئێمە بڵێن هەرچی لەوێ هەیە خراپە. ئێستا هەر ئــەو جمــهووری ئیســلامی‌یەو ئەوانــەی ماوەیــەکی زۆر پشــتیوانیان لێدەکــرد، دەڵێــن سەرمایەداری وابوو و واچوو، مەرگ بەر ئــەمریکا، ئالْمــانی غــەربی وایــە، خراپــە. حوجەتولئیسلامەکان پێیان خۆشە سواری بێنز بنو بێنزیش لە ئالْمان دەکــڕن. پێیــان خۆشە هێلیکۆپتێر بکڕن، پێیان خۆشە فانتۆمــەکانیان کــار بکــا، لــە کــوێ دابینــی بکەن؟ لە ئەمریکا. حەتتا چەکی لە ئیسرائیل دەکڕن. بڕوام پێبکەن سێ ساڵ لەوەی پێش، من ـ دیارە ئەوەڵ کەس بووین کە زانیمان ئێران چەکی لە ئیسرائیل دەکــڕێ ـ لە کۆنفرانسێکی مەتبووعاتی لە پاریس گوتم ئێران ئەسڵەحەی دەکڕێ لە ئیســرائیل. بڕێك پێکەنین. پێیان وابوو کە هەروا قسەیەکە کە دەیکەم. ئەوجارە کە من، ســاڵێك لەوەی پێش لەوێ بووم، هەر ئەو خەبەرنیگارە دەیگوت هیچم لە بــیر نــاچێ کــە تــۆ ئەوەڵ کەس بووی کە ئەوەت گوت. دیارە زۆر شتی دیکەش دەزانی کە پێمان نالێی.، دیارە ئەو مەبەستی ئەوە بوو کە خەبەرم لێوەرگرێ. مەبەستم ئەوەیە کە کەس بڕوای

نەدەکرد کە "آیتاللە"یەك کە دەیهەوێ لە ڕێگای کەربەلاوە بچێ قودس بگرێ، دەیهەوێ قودس بە ئەسڵەحەی ئیسرائیل بگرێ. ...

دێن لە خومەینیش شت دەکڕنو دەیبەنەوە، ئینگلیز کاری بەوە نیە ڕێژیمی "آیتالله خمینی" خوێنمژە، ئینسانکوژە، کورد لەبەین دەباو موجاهدینی سەرکوت دەکاو زندانەکانی پڕ لە شکەنجە هەیە، ئەوانە جەنبین بۆ وی، سەرمایەدار قازانجی خۆی دەوێو سوودی خۆی دەوێ.

ئەوە مەقسەدم ئەوەیە کە لێرە یانێ لە ولاتی سەرمایەداریدا ئەوەی حاکمییەتی بە دەستەوەیە لە پێش هەمووان سوودە. ئەوانی دیکە جەنبین، یانێ ئەوانی دیکە لە پشتەوەن، مەسەلەن فەرزکەین نموونەیەکی دیکەتان بۆ دێنم کە پێمخۆشە ئەوانە زۆر باش حالّی بن. گوێ لە "صدای امریکا" بگرن، هەموو کەس دەزانێ ئەوانەی کە لە ئەفغانستان موبارزە دەکەن زیددی ئەرتەشی شوورەوی، زیددی حکوومەتی ئەفغانستان، هەموویان یان زۆربەی زۆریان ئینسانی پاشکەوتوون. وەکوو ئەوانەی کە ئێستا ئەمڕۆ هەمانە لە ئێران "موجاهیدینی ئیسلامی". بەلاّم باسی ئەوان کە دەگاتە لای "صدای امریکا" هەموو ڕۆژێ باسیان دەکا، هەر دوو نەفەر بکووژرێ، هەر بچووکترین شتێك لە سەر ئەفغانستان بێ نیوسەعات لە سەری دەڕوا. باشە بەلاّم ئێمە هەرچی ئەخبار بدەین لە سەر کوردستان باسی ناکەن، خەبەری زۆر موهیمتر لەوەی لە ئەفغانستان قەوماوە باسی ناکەن. زۆر جاریش باسی بکا دەیهێنێتە خوارێ باسی حیزبی دێموکرات ناکا، دەڵێ عەشایری کوردستان هەیە. حەتتا مەسەلەن لە باتی ئەوە ناوی من کە بێنێ بڵێ سکرتێری حیزبی دێموکراتە، دەڵێ ڕەئیس عەشیرەتە، بۆخۆم دیومە، ڕەئیس قەبیلەیە تازە عەشیرەتی چی، قەبیلەکە هی سەد ساڵ لەوەوپێشە. دێنێتە خوارێ ئەرزشەکەی سەتحی، بۆ؟ واقعیەتەکەی ئەوەیە.

ئێمە ئێستا هەمانە بەرادەری خەبەرنگاری فەرانسەوی وتی من دەچمە ئەفغانستان چوو و نووسیویشیانە، حەتتا بە موقایسە نووسیویانە. کتێبێك دەرچووە لە فەرانسە مەقالەی لە سەر کوردستانی ئێرانە، مەقالەی لە سەر ئەفغانستانەو موقایسە دەکا بە قازانجی ئێمەو ئەوانە زەمینو زەمان فەرقیان هەیە. ئەوە چەندە لە پێشە، چەند پێشکەوتووە، چەند مودێڕنە، ئەوی دیکە چەند پاشکەوتووەو خراپە. ئێمە بۆخۆمان دەزانین دیارە چەندە ڕەخنەمان لە سەرەو چەندە ئیرادمان هەیە بەلاّم

ئەوە شتێکی دیکەیە بەڵام ئەو وا درووستی دەکا. باشە ئەدی بۆ "صدای امریکا" وا دەکا. "صدای امریکا" ئەو شتەی زیددی شوورەوی بێ پێـی خۆشـە گـەورەی بکـاو باسی لە سەر بکاو شتی لە سەر دابنێ، بەڵام بۆ هی کورد بۆ بیکا، چ قازانجێکی بـۆ وی هەیە، تورکیە لە خۆی عاجز بکا کە دۆستیەتی، ئێران لە خۆ عاجز بکـا کـە لـە بنەوە دۆستایەتیی لەگەڵ دەکا یا عـێراقێ لـە خـۆ عـاجز بکـا کـە لەگـەڵ ئـەویش دۆستایەتی دەست پێکردووە؟ بۆ بیکا؟ قازانجەکەی ئەوەی ناهێنێ بیکا یانێ زەرەری زیاترە لە قازانجی، عاشقی چاوی کوردانیش نەبووە. ئەو هەموو باسو قسەیە لە سەر بەشەردۆستیو دێموکراسیو نازانم چیو ئەوانە هەمووی قسەی پووچـە. کـەوابوو ئـی وی زۆر گەورە دەکا، باسی دەکا، وەڵاهی یـەك نەفـەر برینـدار بـێ وەك خەبـەرێکی موهیم باسی دەکا. بەڵام ئـی مـە سـەدان کـەس بکـووژرێ لـە پاسـدار، شـتی زۆر گرنگیش بقەومێ یەك کەلیمەش باسی ناکەن.

بێمە سەر ئەوەی سەرمایەداری ئێمە بەو شێوەیە دەناسین، ئەوەندەیش بە نـەزەری من لە شەرایەتی ئێستادا بۆ بەحس باشە. بەڵام دەبـێ ئـەوەی بڵێـین سـەرمایەداری راسـتە کـەوا بـەرەو لەبـەینچوون دەڕوا لـە بـاری ئیجتیمـاعیو ئیقتیسادیشـەوە مەحکوومە، باسیش دەکـەین باسـی سۆسـیالیزمان کـرد بۆچـی؟ بـەڵام دەبـێ ئـەو واقعییەتەش ببینین کە سەرمایەداری زەخیرەی زۆرە، نوقتەی ئیتیکای زۆرە. جارێ بە تەواوی ئامادە نەبووە بۆ لەبەین چوونو ئەگەر کەسێك تەسەور دەکا کە سـبەینێ لـە ئەمریکا مەقسـەدم ئێتانزۆنییـە کـە ماوەیـەك موسـتەعمەرەی ئەمریکایـە لـەوێ کرێکاران دەست دەدەنە تفەنگو شۆڕشی چەکدارانە دەکەن دیارە ئاگایان لـە دونیـای نیە، یا ئەگەر پێموایە ئەوە لە سوئیسی بەو جۆرە بقەومێ هەروا ئاگایـان لـە دونیـا نیە. پێی وابێ لە سوئێد شتی وا ببێ، نابێ. ئەوەی کە لە رووسیە بووە وەختی خـۆی ساڵی ١٩١٧ بەو شێوەیە لە هیچ یەك لە وڵاتـان تیکـرار ناکرێتـەوە. نـە ئیمکـانی هەیەو نە رێگا هەیە. دەبێ کرێکارانی ئەو وڵاتانە رێگایەکی دیکە ببیننەوە.

دیارە هەر کرێکارێ هەر وڵاتێك ناچین، لێرە لـەوەشدا پێموایـە لەگـەڵ کۆمەڵـە فەرقمان هەیە کە ئێستا برادەرانـی حـیزبی کومۆنیسـتیان چوونـە دەرێ بـۆ ئـەوەی ئەنتێرناسیۆناڵی پێنجەم دابنێنو کرێکارانی جیهان فێر کەن، کە چۆن موبارزە بکـەن ئێمە ئەو ئیدیعایەمان نیەو ئەمن پێموایە کرێکاری هەر وڵاتێك زۆر باشتر لـە ئێمـە

دەزانیٚ چۆن موبارزە بکا. هەروەها کە بۆخۆمان پێمان وایە باشتر لــە هــەموو کــەس دەزانین کە لە کوردستان چۆن دەبیٚ موبارزە بکەین ئەوانیش باشتر لە ئێمــە دەزانــن. باشە فێریان ناکەین. هەر چینی کرێکار ولاٚتێك لــە سیاســەتەکانیان ڕێگــای خۆیــان دەبیننەوە. دەڵێم ئەو ڕێگایە نابێتە ئەم ڕێگایە. مەقسەدم ئەوەیە کە ســەرمایەداری بەو ئاسانی‌یە لەبەین ناچیٚ.

دەمێنێتەوە سەر مەسەلەی ئەوەی کە باشە لە ڕێگای شــەڕەوە لەبــەینی بــەرین، ئەوەی کە وەختی خۆی مــــەرحوومی خودالێخۆشــبوو "مــائۆ تســە دون" زۆر بــاوەڕ بەوەی هەبوو لە ڕێگای شەڕەوە حەتتا دەیگوت: "ئێمــە بــا شــەڕەکە بکــەین شــەڕی ئەتۆمییش بیٚ قــەیدی ناکــا، پــاش شــەڕ تەمــەدونێك درووســت دەکــەین لــە ســەر وێرانەکانی شەڕ کە لەو تەمەدونەی ئێستا سەدجار باشتر بیٚ." دیارە ئەوە نازانم پاش شەڕی ئەتۆم کیٚ دەمێنێتەوە هەتا ئەو تەمەدونە درووست بکا، بەلاٚم ئەوەی دەگوت، خوەشبەختانە ئەوانیش ئەوەی ناڵێن. باشە، کەوابوو ئەگــەر شــەڕ بــیٚ، بــە شــەڕیش نابیٚ. شەڕ بۆ نابیٚ؟ شەڕی وردە، شەڕی ئێرانو عێراق، شەڕ لە "ویتنــام"، شــەڕ لــە بەینی نازانم تایلەندو کامبۆج، ئەوانە دەبیٚ. بەلاٚم شەڕی جیهانی نابیٚ. چونکــە ئــەو هێزە کە دەبیٚ شەڕ بکا هێزێکی ئــەوەی بــە فارســی پێــی دەڵێــن "بــازدارندە"شــی لەگەڵە. هەر شەڕێکی جیــهانی یــانیٚ شــەڕی ئــەتۆم. لــە واقیٚــعدا ئــەوەش بۆخــۆی پرۆسەیەکی دیالیکتیکی‌یــە. شــەڕی درووســت کردنــی ســیلاح بۆخــۆی ســیلاحێکی درووست کردووە کە بوەتە مانێعی شەڕ، شەڕ سیلاحی ئەتۆمی درووست کردووە کـــە ئێستا سیلاحی ئەتۆمی گەورەترین مانێعی شەڕە. هەرکەس شەڕەکە دەســـت پیٚبکــا دەبێتە هۆی ئەوە کە هەر دوو لا لەبەین بچن. ئەوەندە چووەتە پێشیٚ کە پێم وانیە لە پاش ئەوە ئیدی کەسێك لەو دونیایەدا بمێنێت کە پێی خۆش بیٚ بمێنێتــەوە کــە بێــت تەمەدونێکی دیکە درووست بکا.

لە هەر حاڵدا مەسەلەی شەڕیش کەوابوو حەلی ناکا. بە شەڕیش ئەوە نیە خۆ لــە داخیلی ئێراندا ئێمە چەك هەڵگرینو لەگەڵ ڕێژیمی خومەینی شەڕ بکــەین، ئــەوەندە شەڕ بکەین هەتا ماندووی کەین یا شتەکانمان قبووڵ بکا، داخوازەکانمان قبــوول بکــا کە زەحمەتە یان ڕێژیمێکی دیکە بێتە سەرکار کە داخوازەکانمان قبــوول بکــا. ئــەوەش هەر شەڕی ئەتۆمی نیە. ئەگەر شەڕەکە گەورە بێت ئێستاش هەر یەك نەفەر ئەتۆمی

نیـە. چـین هەیـەتی، شـوورەوی هەیـەتی، ئامریکـا هەیـەتی، فەرانسـە هەیـەتی، ئینگلستان هەیەتی زۆر ولاّتی دیکەش خەریکن دروستی دەکەن، ئیستا لەو رۆژانەدا خەبەر هەیە کە رێژیمی خومەینیش خەریکە بۆمبی ئـەتۆمی درووسـت دەکـا. باشـە ئەگەر وایە شەڕیش مەسەلەکە حەل ناکـا. کـەوابوو رێگـا تـەنیا رێگـای موبـارزەی درێژخایەنـەو موبـارزەی دوورو درێـژە. ئەگـەر دەمانـەوێو دۆزینـەوەیو دیتنـەوەی وەزعێك لە داخلّی هەر ولاتێكدا کە بتوانیّ هەر میللەتێك بە شێوەی خـۆی، رێگـای خۆی بگرێتە بەر. دەنا من بێم بلّێم ئەوەی کە لە شۆڕشی ئۆکتۆبردا کەشـتیی ئـادرۆ هاتو دەستی بە تەقە کردو چۆن قەسری زمستانییان گرتو بوو بە شۆڕشی ئۆکتۆبـر ئەوە تیکرار بکرێتەوە، ئەگەر چاوەڕوانی ئەوە بین کـە سەعاتسـازەکانی سـووئیس، کرێکارانی سەعاتسازیی سووئیس، ئەوان بێن چەك هەلّبگرن ئەوە ئیدی ئێمە دەبـێ هەتا قیامەت هەر چاوەڕوان بین، قەد شتی وا نابیّ.

مەقسەدم ئەوەیە کە هەر ئەوە کە ئێمە چەك هەلّنەگرین خراپە، ئەوەش راست لە شەرایەتی ئەواندا چەك هەلّگرتنی ئەوانـە، ئێسـتا لـە فەرانسـەدا هەرکـەس چـەك هەلّگریّ ئەوانی دیکە هەموو "متحد"ن کـە سـەرکوتی بکـەن. ئەسـلّەن کـەس بـە فیکریدا نایە چەك هەلّگریّ. لە ولاّتیّ وەکو فەرانسەو سـوئێدو ئینگلسـتانو ئەوانـە ئەسلّەن خەیالّە. کەوابوو هیچ رێگا بێجگە لە موبارزەی سیاسی موسالمەتئامیز نیـە هەتا ئاخیر. رێگای دیکە نیە، شەڕیش مەسەلەکە حەل ناکا. مومکینە بوحران پێـك بیّ، کۆمەك بکا لە ئینتیخاباتێکدا مەسەلەن ئێستا لە فەرانسە پاش ماوەیەکی زۆر حیزبی کومۆنیستیی "سۆسیالیست" سـەرکەوتووە، ئەگـەر بتوانـن سـەرکەون هـەم دەتوانن بەرنامەکەیان جێبەجیّ بکەنو هەم لە سەری کار بمێننەوە، دەبـیّ هـەردووکی بیّ. مەسەلەن لە سەر کار بمێننەوەو بەرنامەکەیان جێبەجیّ نەکـەن خەلّکەکـە لێیـان دەکشێتەوە، بەرنامەکە دیارە جێبەجیّ بکـەن بـەلاّم ئیمکـانی نـەبیّ لـە سـەر کـار بمێننەوە هیچیان پیّناکریّ. ئەگەر هەردووکیان پیّ بکریّ ئەو وەختە بە نـەزەری مـن بلّێین بەدیلێکی دیکە، ئالترناتیڤێکی دیکە پەیدا دەبیّ. کەوابوو دەبیّ موبارزەکە بـە شێوەی سیاسی بلّێین موسالمەتئامیز بیّ.

ئەوەمان کە گوت دیارە دێینە سەر مەسەلەی نەزەری ئێمە لە سەر سەرمایەداری کە لە پاشان باسی دەکەین. دیارە روونە، ئێمە گوتوومانەو ناشیشارینەوە سەرمایەداری دەبێ لەبەین بچێ. ئێمە سەرمایەداری نەفی دەکەینەوە، سەرمایەداری رەد دەکەینەوە. لە بناغەوە رەدی دەکەینەوە. بە چەوساندنەوەو حەتا بەو سوسیال دێموکراتی‌یەی کە دەیهەوێ هەڵی بسوورێنێ بەلاّم دەیهەوێ رایگرێ، ئێمە نامانەوێ رایگرێ. مەسەلەن ئێمە نەزەرمان ئەوەیە کە سەرمایەداری بەو شێوەیە لە کوردستاندا پێکنەهاتووە، نابێ بهێڵین پێك بێت، نابێ بهێڵین سەرکەوێت. ئەو عەناسوری سەرمایەداری‌یە، عەناسور مەقسەدم ئەشخاس نیە، یانێ شەواهیدو قەرائنی سەرمایەداری کە پێکهاتووە لە کوردستاندا ئەوەش بەرەبەرە دەبێ لەبەین بەرینو ئەگەر شۆڕشەکەمان سەرکەوت دیارە ئەو وەختە خودی سەرکەوتنی شۆڕشەکەمان سەرکەوتنی رێگای سۆسیالیستی‌یە بە سەر رێگای سەرمایەداری‌دا.

# سۆسیالیزمو ئابووریی سۆسیالیستی

کەلیمەی سۆسیالیزم لە کەلیمەی "سۆسیال" درووست کراوە. سۆسیال یانێ ئیجتیماعی. ئەوەی کە قەدیم لە ئێرانێ ئەوانەی کە موبارزەیان دەکرد حیزبی "اجتماعیون" هەبوو، ئەوانە یانێ سۆسیالیزمیان داوا دەکرد. ئەوانەی کە داوای ئیجتیماعی کردنی لە پێش هەمواندا ئەبزاری بەرهەمهێنان "وسایل تولید" دەکەن، ئەوە پێیان دەڵێن سۆسیالیست. دیارە سۆسیالیزمی بلێین خەیاڵی هەبووە، ئەو وەختە هەبووە تەخەیولی هەبووە کە لە فیکریدا درووستی کردووە، ولاتێکی وا خۆش بێو ئەوە لە چیرۆکەکاندا بیستووتانە کە دەگەیشتنە جێگایەکی دارو بەردی جوان بوو، پڕ بوو لە گوڵو ئاوو نازانم هەموو شتێکی باش بوو، حەتتا پادشاکەشی عادڵ بوو. کچی پادشاکەش وا جوان بوو نازانم چی بوو ئەوانە هەمووشی، ئەوە وەکو شتێکی خەیاڵی درووست دەکرا هەتا نێوەڕاستی قەرنی لە واقیعدا "١٩". لە نێوەڕاستی قەرنی "١٩"وە ئیدی سۆسیالیزمی عیلمی پێکهات.

سۆسیالیزمی عیلمی ئەوەیە کە بەڵێ ئەو سۆسیالیزمە ئیمکانی هەیە پێکی بێنین بەلاّم نە خەیاڵ، موبارزەی بۆ بکەین چوارچێوەی پێوەندییەکانی سەرمایەداری تێک دەین. تێکدانی چوارچێوەی پێوەندییەکانی سەرمایەداری ـ بۆ ئێمە ئێستا روونە. هەموومان ئیقتیسادداین لێرە ـ یانێ لابردنی چەوساندنەوە. ئەوە لابەرین، ئەبزاری تەولید بکەینە سۆسیالیستی، میللی بکرێ، سەرمایەدار ساحێبی کارخانە نەبێ، هەموو کۆمەڵ ساحێبی کارخانە بن، کرێکاران بۆخۆیان ساحێبی کارخانە بنو ئەوە

دەبێتە زەمینە بۆ درووست کردنی سۆسیالیزم. کەوابوو سۆسیالیزم تـەنیا یـەك بـاری ئیقتیسادیو ئیجتیماعی نیە، سۆسیالیزم باری فەرهەنگیی هەیە، سۆســیالیزم بـاری سیاسیی هەیە، سۆسیالیزم لە واقیعدا کۆمەڵێکی گشــتییە کـە هـەموو بوارەکـانی ژیانی ئادەمیزاد دەگرێتەوە. ئەوە نیە کە من هەر ئەوەندە هاتم کارخانەکانم کـرد بـە میللی ئەوە بوو بە سۆسیالیزم. بەداخەوە ئەوەش لە ئێرانی خۆماندا زۆر بــاو بـووە، مەسەلەن فەرزکەین زۆر بەڕاستی بە شێوەیەك کە بۆ پێکەنین دەبوو، بە تایبــەت بـۆ ئەوانە کە ئیدیعای مارکسیسمی دەکـەن بـۆ ئـەوان بـۆ پێکـەنینی دەبـوو، دەهــاتن دەیانگوت ئەوە نیە رێژیمی خومەینی زیددی ئیمپریالیستە، بازەرگانی خارجی میللی دەکا ؟! دیارە ئەوە بازەرگانی خارجی میللی کردن نەبوو ئەوەڵـەن، لـە پاشـان حـەتتا ئەگەر ئەوەشی میللی کردبا ئەوە نە سۆسیالیزم بوو نە زیــددی ئیمپریـالیزم بـوو نـە هیچ.

مەقسەدم ئەوەیــە کـە ئێمـە ئامـادەگیی فیکریمـان هـەبێ کـە سۆسـیالیزم زۆر "جامع"ترو کاملترە لەوە کە بە میللیکردنێك جێبەجێ بکرێ. کۆمەڵێك دەبێ پێــك بێ کە لەو کۆمەڵەدا ئەسڵ ئەوەیە کە گوتراوە. مەقسەدم ئەوەیە کە ئەوانە خۆیان بە مارکسیست دەزانن ئەو ئەسڵە لــەبیر دەکـەن. ئەسـڵ ئەوەیـە کـە سۆسـیالیزم ئـەو کۆمەڵەیە کە مێعیاری پێوەندیی ئینسان لەگەڵ کۆمەڵ، پێوەندیی ئادەمیزاد لەگــەڵ کۆمەڵ تەنیاو تەنیا کارە. بە پێی ئەو ئەسڵە کە گوتراوە ئەوەڵجار لــە "گۆتـا"، لـە ئینتیخابی بەرنامەی گۆتا، کۆنگرەیەکی حـیزبی سوسـیال دێموکـرات پێکـهاتبوو ـ "گۆتا" شارێکە لــە ئالـمـان ـ لـەو کۆنگرەیـەدا بەرنامەیـەکیان هێنـابوو مـارکسو ئەنگێلس کە ئەو وەختــە هـەردووکیان زینـدوو بـوون ئێنتێقادێکیـان نووسـیوە بـەو بەرنامەی گۆتا لە ساڵی ١٨٧٥ لەو ئێنتێقادەدا ئەوە هــاتووە بـۆ یەکـەم جـار هـەم سۆسیالیزم چیە، هەم کومۆنیزم چیە.

سۆسیالیزم ئەوەیە کە هەر کەس بە پێی لیاقەتی خۆی کاری دەدرێتــێ، بـە پێـی ئێستێعدادی خۆی کاری دەدرێتێ، هەرکەس بە پێــی ئیسـتێعدادی خـۆی، لیاقــەتی خۆی کار دەکاو بە پێی کاری خۆی لە کۆمەڵ شت وەردەگرێ. جــا ئـەوە شـوعارەکە ئەوەیە: (هەرکەس بە پێی ئیستێعدادی خۆی، بۆ هەرکەس بە پێی کاری خۆی)، یانێ مێعیار تەنیا دەبێتە کار. ئیدی یەکێك بابی دەوڵەمەندەو، یەکێك ئـەملاکی هەیـە،

یەکێك نازانم بابی بانکدارە، یەکێك کارخانەی هەبووەو هەزارویەك ئیمتیازی دیکـــە، هەموویان دەبنە هیچ لە موقابیلی یەك مێعیار، ئەوانەی کـــە دیـــارە ئـــەوە شـــتێکی ئەسڵە ئەوەی کە کار دەکا بە پێی کاری خۆی شـــتی دەدەنـــێ، حـــەقی دەدەنـــێ. ئـــەو حەقە مومکینە نەقدی بێ، ئەو حەقە مومکینە غەیرنەقدی بێت. هەر لەوەڕا دیارە، چونکو ئیستێعدادی ئینسانەکان هەموو وەك یەك نیـــە. خـــۆ هـــەر لـــەوەڕا دیـــارە لـــە سۆسیالیزمدا هەموو وەك یەك نابن، ئەوەی ئیستێعدادی زیاترە، قابلییـــەتی زیـــاترە، زیاتر وەردەگرێ. ئەوەی ئیستێعدادی کەمترە، قابلییەتی کەمترە، کەمتر وەردەگـــرێ. کەوابوو سۆسیالیزم با فریو نەدەین خۆمان زۆر عادیلانەترە لە سەرمایەداری. پاشـــان لە سەر ئەوە دیسان قسە دەکەین بۆچی، بەڵام هەر لـــە ئێســـتاوە دیـــارە عادیلانـــەترە بەڵام ئیدی بە تەواوەتی عادیلانە نیە.

بۆ نموونەکان فەرز دەکەین دوو نەفەر لە نەزەر دەگرین. هـــەردووکیان قابلییـــەتیان وەکو یەکە ـ دیارە من وا دادەنێم ـ بەڵام یەکێکیان هەشت، نۆ منداڵی هەیـــە ئـــەوی دیکەیان بە تاقی تەنیایە، مەسەلەن خێزانی هەیە. بە قەت یەك وەردەگـــرن، هێنـــدێ ئیمتیاز بۆ منداڵەکان هەیە بەڵام ئەوە مەسەلەی ئەساسی حەل ناکا. ئەگەر بمانـــەوێ تەواوی عادیلانە بێ دەبێ چۆن بێ؟ نابێ بە پێی کاری خۆیان وەربگرن، دەبێ بە پێـــی ئیحتیاجی خۆیان وەرگرن. لە حاڵەتێکی موعەییەندا بە پێی ئیحتیاجیان چۆنە ئـــەوە وەربگرن. مەسەلەن ئێستا لێرە ئەوە تەقریبـــەن کومۆنیســـم بەرقـــەرارە لـــەو زانکۆیـــە بۆچی؟ چونکە هەرکەس بە پێی ئیحتیاجی خۆی ئەوەی کە ئیمکان هەیە وەردەگـــرێ، ناڵێن ئەتۆ چونکو شاگردێکی باشی وەرە دوو هێلکە، ئەتۆ شـــاگردێکی خراپـــی وەرە یەك هێلکە، ئەوە نیە، هەموو ئەگەر هێلکە هەبێ یـــەکێ یـــەك دانـــە، پـــەنیر هـــەبێ یەکێ یەکێك.

تەقریبەن دیارە ئەوە موقایسەیەکی ســـادەیە، بـــۆ تێگەیاندنـــە، دەنـــا واقعییـــەت فەرقی هەیە. چونکە لە کومۆنیزمدا ئەوەندە کۆمەڵ دەچێتە پێشێ، ئەوەندە شت زۆر دەبێ کە هەموو کەس دەتوانێ بە پێی ئێحتیاجی خـــۆی وەرگـــرێ. ئـــەو تەربیەتـــەش دەبێ کە کابرا لە گیرفانی خۆی نەڵێ زیادی بێ، چونکە ئێستا فیکر دەکاتەوە ئێستا کە وای لیهات ئەمن مەسەلەن دەچمە دووکانی قەنادی گیرفانی خۆم پڕ دەکـــەم لـــە شیرینی یەکێکیشی دەخۆم، ئیدی ئەو وەختـــە بـــۆ پـــڕی کـــەم، ئـــەمن دەزانم هـــەموو

وەختێك بچمە دووکانی قەنادی هەموو وەختێك ئەو شیرینییە هەیە. مەسەلەن فەرز بکەن ئێوە بەیانیان کە هەڵدەستن هەموو وەختێك کانییەك هەیە ئاوێکی زۆر خۆشیشی هەیەو دوو، سێ هەنگاو دوورە لە ماڵەکەتان، باشە ئێوە دەچن ئاوەکە پڕ دەکەنەوەو دەیهێنن بۆشکە بە بۆشکە دەیشارنەوە؟ شتی وا بۆ دەکەن؟ زۆر سووکە ئەمن وەختێك کە ئاوی تازەیە دەچم دەستم بشۆم، ئاوەکە دەخۆم. ئەوەش وای لێدێ. دیارە ئەو مەسەلەی پەروەردە کردنو تەربیەتو ئەوانەیە بەلاّم کارم ئێستا بە سۆسیالیزمە، بەلاّم فەرقەکەی چی بوو لەگەڵ کومۆنیزم؟ لە کومۆنیزمدا هەموو کەس بە پێی کاری خۆی کار دەکا، بە پێی ئیستێعدادی خۆی کاری دەدەنێ بەلاّم بە پێی ئیحتیاجی خۆی دەدەنێ. ئەوە لە زانکۆی حیزبی دێموکراتدا وایە دەنا لە کۆمەڵ دەزانن کە وانیە. بەلاّم لە سەر سۆسیالیزم هەر ئەوە خۆی نموونەی ئەوەیە کە فەرق دەکا، چونکە یەکێك ئیستێعدادی باشترە زیاتر وەردەگرێ، ئەوەی ئیستێعدادی کەمترە کەمتر وەردەگرێ. هەر بۆ ئەوەیش لە وڵاتەکانی سۆسیالیستیدا فەرق هەیە لە ژیانی خەڵکی.

بەلاّم ئێستا با بین بزانین ئۆسووڵەن باوە بۆچی؟ مەسەلە چیە مەسەلەن حیزبی دێموکرات هەستاوە هاتووە دەڵێ سۆسیالیزمم دەوێ، چ قازانجێکی هەیە ئەو سۆسیالیزمە، دیارە پاشانیش کورتەباسی هێناوەو کێشەی ساز کردوەو ئەوە بۆچیە؟ ئەسڵەن سۆسیالیزم بۆچیە؟ بۆم باس بکەن ئەسڵەن سۆسیالیزم قازانجی هەیە بۆ ئێمە کە داوای دەکەین؟ یا خودای نەخواستە حیزبی دێموکراتیش تابیعی جەوە، هەرکەس سۆسیالیزمی بوێ پێشکەوتووە ئەویش لەبەر ئەوەی کە پاش نەکەوێ لەوانی دیکە سۆسیالیزمی دەوێ. ئەمن پێموایە ئێوە تەجروبەتان هەیە کە حیزبی دێموکرات بە دوای جەو ناکەوێ. عەکسی ئەوە حیزبی دێموکرات، حیزبێکە کە جەو دەشکێنێ، شکاندوویەتی. وەختێك سەفارەتی ئەمریکایان گرت ئەگەر لەبیرتان مابێ تەنیا حیزبێك کە پشتیوانیی لێنەکرد حیزبی دێموکرات بوو. مەحکوومیشی کرد. نە لە بەر خاتری ئامریکا، لەبەر ئەوە کە ئۆسووڵی دیپلۆماسیی نێونەتەوەیی لە بەرچاو گیرابوو. لە کوردەواریدا ئەتۆ قاتڵێك بنێری بۆ لای یەکی دیکە نایگرێ زیندانیی بکا. ئەگەر بیگرێ زیندانیی بکا عەیبە. لە رەوتی "بین‌المللی" (نێونەتەوەیی)شدا وایە. ئەوە هاوارە زیدی ئیمپریالیستیو زیدی ئەمریکایی ئێمە لە چیەوە دێ،

جەوەکەمان شکاند. ئێستا لە دەرەوە پێمان دەڵێن ئەو وەختە، زۆرکەس دەڵێن حیزبی دێموکرات تەنیا حیزبێکی سیاسی بوو نەچوە ژێر ئەو جەوە.

شەڕی ئێرانو عێراق ساز بوو زۆر لەو ڕێکخراوانە کە ئێستا لەو دۆلاّنەدان شەڕ دەکەن لەگەڵ ڕێژیمی ئێرانیٚ ئەو وەختە چوون شەڕیان لەگەڵ عێراق کرد شەهیدیشیان دا. لە موجاهیدەوە بگرە هەتا دەگاتە چریکی فیدایی. حیزبی دێموکرات نەزەری خۆی زۆر بە روونی گوت: "حەقی خۆمان دەداتیٚ دەچین شەڕیشی بۆ دەکەین، دیفاع لە وەتەنیش دەکەین. حەقی ئێمە نەدا حازر نین دیفاع لە حاکمییەتی ئاخوندان بکەین." جوملەکەم زۆر چاك لەبیرە، حازر نەبووین. دەیانگوت حیزبی دێموکرات بەعسییەو فلاّنە. ئەوانە کە بە ئێمەیان دەگوت بەعسی بۆخۆیان لە ئێمە بەعسیترن، بە وەلاّهی ئەگەر حیزبی دێموکرات بەعسی بووبیٚ، ئەگەر ئێمە هەنگاویٚ چووینە پێش ئەوان سەد هەنگاو چوونەتە پێش. نە ئەو وەختە بەعسی بووین نە ئێستا، باسی ئەوەش دەکەین.

بەلاّم مەبەستم ئەوەیە کە جەوشکێن بین. ناکریٚ، کەوابوو حیزبی دێموکرات دانیشتووە فیکری لیٚکردۆتەوە. ئەوە ئەو سۆسیالیزمە بۆ؟ دوو هۆی هەیە: یەکێکیان ئەوەیە کە ئێمە ولاّتێکی پاشکەوتووینو دەمانەویٚ ولاّتەکەمان، ئابووریی ولاّتەکەمان، وەزعی ئیقتیسادیو ئیجتیماعی ولاّتەکەمان هەرچی خێراتر، هەرچی توندتر بەرەو پێش بچیٚ. کە ئەوە پێموایە شتێکی تەبێعییە، هاتووینە سەر ئەو بڕوایە کە سۆسیالیزم زۆر باشترو ئاسانتر کۆمەڵی کوردەواریی ئێمە یان کۆمەڵی ئێران وەپێش دەخا هەتا سەرمایەداری. کەوابوو توندتر دەچین. مەسەلەن فەرزکەین ئێمە باسی ئەوەمان کرد کە ئێستا لە ساڵی ١٣٦٣دا داهاتی سەرانەی ئێمە فەرز دەکەین دیارە بە متەوەست هەزار دۆلارە ـ ئەوانە هەموو فەرزییە ـ باشە ئێمە دەمانەویٚ ئەو داهاتە بگەیەنینە دەهەزار دۆلار، پاش بیست ساڵان مەسەلەن. پێمان وایە ئەگەر بە ڕێگای سۆسیالیزمدا بڕۆین زووتر دەگەین، بە ڕێگای سەرمایەداریدا بڕۆین درەنگتر دەگەین. بۆچی؟ ئەوە ئەوەڵەن لە باری تیئۆرییەوە درووستە لە باری نەزەریو عیلمییەوە درووستەو سانیەن لە پاشان تەجروبەش نیشانی داوە ئەو ولاّتانەی کە پاشکەوتووتر بوون، ڕێگای سۆسیالیزمیان گرتەبەر، زۆر باشترو سەرێعتر چوونە پێشیٚ. لەگەڵ هەموو ئەو ئیشکالاتەی کە هەیانبوەو هەموو ئەو رەخنەیە کە

ئێمە نیسبەت بە سۆسیالیزم هەمانە ئەوە لە جێگای خۆیــەتی بــەلاّم باشــتر چووەتــە پێشێ. کەوابوو سۆسیالیزم بۆ ئەوە دەمانەوێ.

دووهەم: بۆ ئەوە هەڵیدەبژێرین کە کۆمەڵێکی عادیلانەترە. یانێ چی؟ ئەوەیە کە ئەگەر داهاتی نەتەوەییمان سەدهەزار بڵێم پێنسەدمیلیۆن یان سەدمیلیاردە یان هەر چەند، ئەوە عادیلانەتر دابەش دەکرێ. ئەوە نیە کە یــەکێك هــەزار بەرابــەری ئــەوی دیکە بگرێ. مەسەلەن فەرز دەکەین رێژیمی شاهەنشاهی، بۆخۆتان دەزانن لە رێژیمـــی شاهەنشاهیدا خەڵکی وا هەبوو کە حقووقیان ١٠٠٠ تمەن بوو، ئیواش هەبوو کە بــە یەك میلیۆن تمەنی مانگێ دەگرت. یانێ چی؟ هەزار بەرابەری ئــەوی دی وەردەگــرێ. حەتتا هیوا هەبوو کە حەتتا هەزار تمەنیشی نەبوو یانێ مانگێ، ساڵی ١٢٠٠٠ تمەن داهات بۆ زۆر کەس هەر ئارەزوو بوو، بەلاّم بۆ زۆر کەس ساڵێ ١٢میلیۆن هەر هیــچ نەبوو. هەر لەو تارانە، شارە گەورەکانو زۆر جێگا. باشە ئێمــە چیمــان دەوێ؟ ئێمــە ئەوەمان ناوێ، ئێمە دەمانەوێ مەسەلەن نە ئی وامان هەبێ یــەك میلیــۆن وەرگــرێ مانگێ، نە ئی واشمان هەبێ مانگێ ١٠٠٠ تمەن. وای لێبکەین داهاتــەکان لــە یــەك نزیك بن، سێهەزار تمەنمان هەبێ کە "حداقل"ی زندەگی تەئمین بکا، ئــەوی دیکــەش زۆر، زۆر ئەوی کــە لــە هــەمووان بــە ئیســتێعدادترە زۆر، زۆر ٣٠٠٠٠ تمــەن بێــت. ١٠بەرابەر، بەلاّم لەوە زیاتر ئیدی نە. "١" هەتا "١٠" بێ، "١" هــەتا "١٠٠٠" نەبێو جا ئەوەش ئاوا لێبکەین بەرە بەرە کەمتر بێ. یانێ وابکەین کە زۆربــەی زۆری خــەڵکی کوردســتان بــەینی ٦٠٠٠و ٧٠٠٠ وەرگـــرێ، بــەینی ١٠٠٠٠و ٢٠٠٠٠ وەربگرێ، لە ٢٠٠٠٠ هەتا ٣٠٠٠٠ کەم کــەس وەربگــرێ. ئــەوە سۆســیالیزمە بــە تیئۆری، بە عەمەڵیش وایە. لەگەڵ تەواوی ئیشکالاتی خۆی لەگەڵ تەواوی رەخنـــەی کە ئێمە هەمانە، سۆسیالیزمێك کە ئێستا هەیە ئەوەی بەدی کردووە، فەرقەکەی لــە یەك هەتا دەیە، لە حــاڵێكدا لــە ولاّتــی ســەرمایەداری فەرقەکــەی لــە یــەك هــەتا دەهەزارە، جاری وا هەیە سەدهەزارەو زیاتر.

باسم کرد بۆتان، داهاتی "ئووناســێس" چــەند بــوو، گــوتم داهــاتی کرێکــارێکی سادەی ئامریکایی ئەو وەختـــە مــانگێ ٥٠٠ دۆلارە جــا بزانــە چــەندە ئــەو بیســت میلیۆنی خــەرج دەکــرد، ئــەو هــەموو ســاڵێك ٦٠٠٠ دۆلاری بــە زەحمــەت دەســت دەکەوت. نە، چونکو سۆسیالیزم نەبو لە پاشان ئەگەر زۆر ئینسان دەوڵەمەند دەبــوو،

یەکێ زۆر خەرج بکا ئەوی دیکە زۆرکەم خەرج بکا، دیسان ئەوەی کە زۆر کەم خەرج بکا دیسان شتێکی مەنتێقی‌یە. چونکو زۆر دەوڵەمەندە وەکو ماڵێکی لە نەزەر دەگرین چەند کوڕی بێو کچ، بابەکەی زۆر دەوڵەمەند بێت، باشە مومکینە کەمیان بداتێ پووڵی گیرفانی، بەلاٚم چونکو زۆر دەوڵەمەندە ئەو پووڵەی کە دەدا بە کوڕەکانی خۆی، یەکێ مەسەلەن مانگێ ١٠٠٠ تمەنیان دەداتێ، بەلاٚم یەکێ دیکە دەرنەزەر بگرین کە زۆر فەقیرە بیەوێ زۆریشیان بداتێ زۆر زۆر پێیان بدا یەکێ ١٠٠ تمەنە. جا ئێمە کە کۆمەڵێکی فەقیری کوردەوارییین ئەگەر ئێمە فەرقەکەمان زۆر بێ یەکێ یەك میلیۆنی بەرێ بۆ ئەوی دیکە هەزارە، کە نامێنێ چونکە ئەوەندەمان نیە، فەقیرین. کەوابوو دەبێ عادیلانە بەشی بکەین.

بە دوو هۆی ئەساسی سۆسیالیزمان هەڵبژارد: ١ـ کۆمەڵی سۆسیالیستی توندترو باشتر دەچێتە پێش، داهاتی سەرانە زووتر سەردەکەوێ دەچێتە سەرێ. ٢ـ ئەو داهاتی نەتەوەیی‌یە گشتی‌یە باشتر دابەش دەکرێ، عادیلانەتر، دێموکراتی‌تر دابەش دەکرێ. بۆیە سۆسیالیزمان دەوێ. باشە بەلاٚم دیارە ئێمە سۆسیالیزمی خەیاڵیشمان ناوێ. دەمانەوێ، دەزانین سۆسیالیزم دەبێ چۆن درووست بکەین. ئەو سۆسیالیزمە کە ئێستا ئێمە باسی دەکەین، ئەوەیە، ئەساسەکەی بەو شێوەیە کە ئەو ئیستیسمارە، چەوساندنەوە کە باسمان کرد ئەگەر لەبیرتان بێ، بڵێم چوار سەعات کار بۆخۆی دەکا، چوار سەعات بۆ سەرمایەداری دەکا. ئەگەر حەتتا واش بێ ئەوجارە ئەو چوار سەعاتە بۆ سەرمایەدار نیە، بۆ کۆمەڵە. ئایا دەکرێ کرێکارێك هەشت سەعات کار دەکا هەموو پووڵی هەشت سەعاتەکە بگرێ لە سۆسیالیزمدا، بۆ ناکرێ؟ شەڕ هەیە، ئەرتەش هەیە، دەوڵەتی مەرکەزی هەیە، مەدرەسە هەیە، بیمارستان هەیە، هەزار کاری دیکە هەیە، باشە پووڵی ئەوە کێ بیدات. دەبێ لەوە هەڵبگرێ، لەوە هەڵدەگرینو خەرجی ئەوەی دیکەی دەکەین. کەوابوو لە واقێعدا بەشێکی بۆخۆی هەڵدەگرێو بە شێکی دەیدا بە حکوومەت، یانێ بە کۆمەڵ کە نوێنەری دەوڵەتە. دەوڵەتیش لە ئەساسدا دەبێ نوێنەری کرێکاران بێ. ئەویش بەرنامەڕێزی دەکاو خەرجی دەکا.

باشە، بزانین ئێستا ئێمە لە سەرمایەداریدا گوتمان مالکییەتی خسووسی هەم لە کشتوکاڵدا هەیە، مالکییەتی خسووسی هەم لە سەنعەتدا هەیە. یانێ کابرا

سەرمایەدارە کارخانەی خۆی هەیە، ئەوی دیکە زەمینداری هەیە، ئی خۆیەتی. بزانین لە سۆسیالیزمدا، سۆسیالیزمێك کە سەرف بووە، خەلاس بووە چۆنەو مالکییەت چییە؟

ئێمە لێرەداو لە واقیعدا دوو شێوە مالکییەتی سۆسیالیستیمان هەیە کە یەکێکیان بریتییە لە مالکییەتی سۆسیالیستی گشتی. مالکییەتی سۆسیالیستی گشتی یانێ چی؟ یانێ کارخانە ئی هیچکەس نیە، ئی هەموو کۆمەڵ، ئی دەوڵەتە، ئی میللەتە. ئەو کرێکارە کە لە کارخانەدا کار دەکا ناتوانێ بڵێ ئەو کارخانە ئی منە، ئەو کرێکارانە کە لە کارخانە کار دەکەن ناتوانن بڵێن ئەو کارخانە ئی مەیە. دەبێ بڵێن ئی هەموو خەڵکی ئیتیحادی شوورەوییە، ئی هەموو خەڵکی مەجارستانە. باشە، یانێ لە واقیعدا مالکییەتی گشتیی سۆسیالیستییە. زۆربەی زۆری کارخانەکان، زۆربەی زۆری هەموو ئەو شتانە کە پێیان دەڵێن ژێربەنای ئیقتیسادی ـ ئیجتیماعی؛ تەلەفۆن، پۆست، نازانم ڕێگاکان، ڕێگای ئاسن، هەرچی وەسایلی تەولیدو ئەوانە هەیە، زۆربەی زۆری نەخۆشخانەکان، مەدرەسەکان، هەموو ئەوانە لە واقیعدا ئی هەموو کۆمەڵە.

بەلام ئێمە شێوەیەکی دیکەی مالکییەتی سۆسیالیستیشمان هەیە کە دەستەجەمعییە. کەڵخۆزێك کە پێی دەڵێن کەڵخۆز ئەوە بیستووتانە حەتمەن، کەڵخۆز یانێ مالکییەتی جەمعی یا دەستەجەمعی لە ئیقتیساددا. مەسەلەن دێیەك هەیە زەوی ئەو دێیە ئی هەموو دەوڵەت نیە، ئی هەموو کۆمەڵێش نیە، ئی هەموو خەڵکەکەش نیە. فەقەت ئی خەڵکی ئەو دێیەیە. خەڵکی ئەو دێیە دەڵێن ئەو زەوییانە ئی مەیە، حەقیشیانە. مالکییەتەکە سۆسیالیستییە چونکو جەمعییە. بەلام دەوڵەتی، گشتیش نیە. فەقەت ئی ئەوانە ئەوە پێی دەڵێن کەڵخۆز.

مانای ئەوە نیە خۆ هەرچی لە دێی بوو وایە، هەرچی لە شار بوو ئەوەیە. نەخێر لە شاریش زۆر جار مالکییەتی جەمعی یانێ دەستەجەمعی هەیە، دەستەجەمعی سۆسیالیستی هەیەو لە دێیەش زۆرجار مالکییەتی گشتی سۆسیالیستی هەیە. مەسەلەن لە دێی دەبینی وەختی خۆی وەکو ئێرانی خۆمان وەقف بووە، وەقف ئی ئەوانەیە کە مەسەلەن ئی مەلاکان بووە، ئایەتوڵلاکان بووە، نازانم چ بووە، ئی ئیمامی ڕەزا بووە یا حەتتا ئی دەوڵەتی بووە. خالیسە بووە، لە ئێراندا خالیسەی پێ

دەڵێن. لە پاشان بووەتە شۆڕش ئیدی خالیسەیان نەهێناوە دابەشی بکەن بەینی جووتیاراندا، بە سەر چیدا دابەشی بکەن. چونکو مەعموولەن خالیسە ملکی زۆر باش بووە، زۆر گەورە بووە، زۆر زۆر بووە، هێناویانە لەوێ بە شێوەیەکی بلێین زۆر مودێڕن دەیکێلن. تراکتۆریان هێناوە، کۆمباینیان هێناوە، کردوویانەتە دەوڵەتی، گشتی. یانێ زەویوزاری وا هەیە دەوڵەتی، گشتییە، مالکییەتی سۆسیالیستی گشتییە. ئەوە پێی دەڵێن بیستووتانە حەتمەن ـ رادیۆ مۆسکۆ گوێ گرن ـ ئەوە پێی دەڵێن "سەڵخۆز".

سەڵخۆز گشتییەکەیەتی لە زەویوزاردا. بەلام بێجگە لەوە ئێستا بزانین نیسبەتەکە چۆنە، دیارە نیسبەتەکە زۆری فەرقە. ئەوەی مەربووتە بە سەنعەتو بە شار ٩٥٪ی زیاتری لە ولاتەکانی سۆسیالیستی، مالکییەتی گشتیی سۆسیالیستییە. یانێ ئی هەموو خەڵکە، ئەوەی مەربووتە بە دێ، ئەوەی مەربووتە بە زەویوزار هەتا ئێستا زۆربەی زۆری کەڵخۆزین، نەبۆتە سەڵخۆز. یانێ مالکییەتی گشتی زەوییەکە ئی خۆیەتی، دێیەکە ئی خۆیەتی، هەموو زەوییەکانی دێ ئی هەموو خەڵکی دێیە. بەلام ئی دێیەکەی دیکە حەقی بە سەر ئەو دێیەدا نیە.

ئەوە دوو شێوە مالکییەتی سۆسیالیستییە. بەلام خۆ لە ولاتی سۆسیالیستیدا تەنیا ئەو دوو شێوە مالکییەتە نیە. بێجگە لە مالکییەتی سۆسیالیستی، مالکییەتی غەیر سۆسیالیستیش هەیە. ئەویش دوو شێوەی هەیە. یەکێکیان پێی دەڵێن مالکییەتی شەخسی. مالکییەتی شەخسی ئێجگار زۆرە. لیباسی شەخسیی خۆم، ماشینی شەخسیی خۆم، خانووی شەخسیی خۆم، مۆبلو ئەساسی شەخسیی خۆمەو نازانم زۆر شتی دیکەی شەخسیی خۆمەو رادیۆی خۆمەو حەتتا زۆر جار هەڵدەکەوێ کە خانوویەکی هەیە لە نێو شارێکی گەورە مەسەلەن مۆسکۆ، خانوویەکی هەیە لە دەرەوەی ولات هەردووکی خانووی شەخسییە، ئەوە مالکییەتی شەخسییە. مالکییەتی شەخسییش مەحدوودییەتی لە واقیعدا تەقریبەن نیە. مەسەلەن فەرزکە ئەتۆ لە ولاتی سۆڤیەت هەزار پانتۆڵیشت هەبێ هیچکەس پێت ناڵێ بۆ، بە کەیفی خۆتە. وەختی خۆی ـ ئەوە زۆر کۆنە ـ کە "لنین" رەئیس‌جمهووری شورەوی بوو، کاغەزێکیان بۆ نوسیبوو لە زەمانی شەڕ کە ئێمە لە بەینی خۆماندا کومۆنیزمان پێکهێناوە، ئەویش ئەوەیە کە پانتۆڵێکمان هەیە، بیست کەسین هەموو

رۆژێ یەکێ ئەو پانتۆڵە لە پێی دەکا، ئەوەندە پێکەوە رەفیقینو کومۆنیزممان پێکهێناوە. ئەویش جوابی دابووەوە کە: "ئەو رەفاقەتەم زۆر پێباشە، بەڵام ئێوە خراپ حاڵی بوون، کومۆنیزم ئەوە نیە کە بیست کەس یەك پانتۆڵ لە پێ بکەن. کومۆنیزم ئەوەیە کە هەرکەس هەر نەبێ بیست پانتۆڵی هەبێ."

کەوابوو مەسەلەی شەخسی‌یەکە ئازادە، ناڵێم ئەتۆ پەنجا خانووت هەبێ، دیارە ئەوە دەڵێم بۆچی‌یە ئەوە کە یەك خانوو زۆر دەبێ لە ژوورەوە بێ یەکێکیش لە دەرەوە بێ. بەڵام بۆ شتی شەخسی دیکە هیچ مانع نیە. دەمێنێتەوە سەر مالکییەتی دیکە کە پێی دەڵێن خسووسی. ئەو مالکییەتە لە ولاتەکانی سۆسیالیستی‌دا زۆر کەم ماوە بەڵام هەیە. ئەویش مالکییەتی یان ئەبزاری تەولیدە یان مالکییەتی شتێکە کە نیوە بە نیوەیە بەڵام بەکاری دێنێ بۆ ئیستیسمار. ئەوەیە مەسەلەن فەرز دەکەین کابرا زۆرجار لە هێندێ‌جێگا، جارێ وایان لێ‌نەهاتووە کە دەوڵەت بتوانێ هەموو تاکسی‌یەکان ئیجارە بکا. رێگا دەدا ئەتۆ ئۆتۆمۆبیلی خۆت بکەی بە تاکسی، بیکەی بە تاکسیو کار بکەی. بەڵام پوولەکە یا بۆخۆت یا بیدەی بە یەکێکی‌تر بۆ کار کردن. ئەوە زۆر جار هەیە ئەو مالکییەتە یا مەسەلەن دەبینین کە لە شتی خۆی‌دا هەر جووتێرێك، کەڵخۆزی‌یەك لە دەوری ماڵی خۆی‌دا دوو، سێ هێکتاری دەدەنێ، نیو هێکتاری دەدەنێ بەستراوە بە وەزعی مەزرا، بۆخۆی عەرزی خۆی دەکێڵێ بۆ خۆیەتی بۆ دێ‌یەکە نیە. تەماتەی تێدا دەچێنێ، پیازی تێدا دەنێ یا نازانم خەیارو سەوزی‌یەو ئەو جۆرە شتانە، حەقیشی هەیە کە ئەو شتانە بفرۆشێ. هی خۆیانە لە واقیعدا جێ‌یەکە، شتەکە، عەرزەکەی ئیستیسمار کردوە بۆ فرۆشتنی شتەکان. ئەوە مالکییەتی خسووسی‌یە. بەڵام ئەو مالکییەتی خسووسی‌یە ئێستا لەو جێگایە کە سۆسیالیزم بە تەواوی سەرکەوتووە زۆر زۆر مەحدوودە لە حاڵەتی ئیستێسنائی‌دا ماوە.

باشە کەوابوو ئەو چوار شێوە مالکییەتەتان لەبیر نەچێ: مالکییەتی گشتی سۆسیالیستی، مالکییەتی جەمعی سۆسیالیستی یا بڵێین مالکییەتی هەرەوەزی سۆسیالیستی بە کوردی خۆمان کە وای لێ‌دێ، مالکییەتی شەخسیو مالکییەتی خسووسی، ئەو دووانە فەرقیان هەیە، خسووسی ئەو وەختەیە کە یەکێکی ئیستیسمار دەکا، یانێ ئەو شتەی کە هەیەتی، ئەو ماڵەی کە هەیەتی بە کرێی دەدا. مەسەلەن

فەرزکەین ولاٚغی هەیــە، ئەگــەر رۆژێـك بگەینــە ئــەو سۆسیالیســتی‌یە لــێرە بلێـین کارخانەکانو زەوی هەموو ببنە سۆسیالیستی، ئەو قاچاخچیانە کە بە خۆیـان دەلێــن بازەرگان، بازەرگانی کردنو کەلیمەی قاچاخی بــەکار نـاهێنن ئـەوان، مەســەلەن دوو ولاٚغی هەیە دەبینی مەسەلەن ولاٚغەکە بە کرێ دەدا بە یەکێك قاچاخچیەتی بۆ بکا، شتی بۆ بکڕی، شتی بۆ بێنێتەوە، دیارە ئەوانە ئەوە مالکییەتی خسووســی‌یە. بــەلاٚم ئەو ولاٚغە ئەگەر بۆخۆی سوار بێت، هاتوچۆی پیٚ بکا بۆخۆی، دەتوانیٚ. یــانیٚ یــەك شت دەتوانیٚ هەم ببێتە وەسیلەی ئیستیسمار هەم نەبێت. ئۆتۆمۆبیلەکەی هی خــۆی بیٚ وەك ماشینی شەخسی سوار بێت ئەوە ئەگەر کردی بە تاکسی، بە کرێی دا دەبێتە مالکییەتی خسووسیو ئەوی دیکــە شەخســی. یــانیٚ دوو نــەوع مالکییــەتی غــەیر سۆسیالیستیمان هەیە، دوو نەوع مالکییــەتی سۆسیالیســتیمان هەیــە. باشــە ئــەوە ئێستا بزانین یەکێك لێرە پرسیار دەکا ئەو هەموو هاوارە نــازانم شــەڕ بکــریٚ، کێشــە بکریٚ، نازانم سۆســـیالیزم پێــك بێــت باشــە ئیــدی بــۆ پــوولٚ مــاوە؟ بـۆ لــە ولاٚتــی سۆسیالیستی پوولٚ هەیە؟ یا بیٚپوولٚ بیٚ هەرکەس بچیٚ بە کۆپــۆن وەرگــریٚ. کۆپــۆن، ئەوە جاریٚ ئەوەڵەن ئەوەندە شت زۆر نیە کە هەرکەس بە پێی ئیحتیاجی بدەنــیٚ، لــە بەر ئەوە مەجبوورین. بەلاٚم عیللەتێکی دیکەشی هەیە، ئەویش ئەوەیە کــە ئــەو دوو نەوعە مالکییەتە، مالکییەتی سۆسیالیستی‌یە کە یەکێك دەڵیٚ مالکییەتی جەمعی مەسەلەن یا هەرەوەزی ئەوی دیکە "گشتی"، هەردووکیان سۆسیالیســـتین. ئــەو دوو نەوع مالکییەتە نمایەندەی دوو تەبەقەیە، دوو چینی کۆمەلاٚیەتی. مالکییەتی گشتی نوێنەری چینی کرێکارە، مالکییەتی جەمعی نوێنەری جووتیارانە.

کەوابوو ئێستا بۆمان دەرکەوت کە بابا "چین" لە سۆسیالیزمدا جاریٚ هەر مــاوە. بەڵیٚ ماوە. دوو چینی ئەساسی ماوەو یەك توێژی ئەساسی؛ چینـــی کرێکــار، چینــی جووتیارو توێژی رووناکبیر، ئەوە کۆمەڵی سۆسیالیزمە. لەو سیٚیانە هیچکــام خــارج نیە مەگەر کابرا دیارە زۆر لە کۆمەڵی سۆسیالیستی دایــە، مەســەلەن بــە دزی، بــە فڕوفێلٚ، بە قاچاخی بژی ئەوەش هەیە، بەلاٚم ئیدی ئەوە ئیستیسنایە دەنا لە جوزئــی ئەو سیٚیانەیە. جوزئی چینی کرێکارە لێرەیە، جوزئی چینی جووتیــارە کــە لێرەیــە، جوزئی توێژی رووناکبیرانە. بۆچی ناڵێن چینی رووناکبیران؟ دیقەتتان کردووە؟ چینــی کرێکار، چینی جووتیار، بەلاٚم توێژ یا قشری رووناکبیر. لێرە ناڵێین تەبەقە. تەنانــەت

بە شێوەیەکی عیلمی گوتوومانە تەبەقە چیـە، مانـای تایبـەتی خـۆی هەیـە. ئـەو کەسانەی کە نیسبەت بە ئامرازی بەرهەمهێنان (وسـایل تولیـد) یـەك هەڵوێسـتیان هەیە یانیٚ یا ساحیبی ئـەو ئامرازانـەن یـا سـاحێبی نـینو قازانجیشـیان وەك یەکـە، مەسەلەن کرێکار خاوەنی ئەبزاری تەولید نـین، قازانجیشـیان جـا هـەر پێکـەوە دژی قازانجی سەرمایەدارە. یا سەرمایەدار ئەوانیش یەك چینن. ساحێبی ئامرازی تەولید، ئەبزاری تەولیدن قازانجیشیان ئیجاب دەکا نەهێڵن کرێکاران حەقێکی زیاتر وەربگرن. کەوابوو نیسبەت بە ئەبزاری تەولید هەڵوێستیان یەك بیٚو قازانجیشیان یەك بێت ئەوە دەبنە یەك چین. کەوابوو ئەو دووانە، چینی کرێکارو چینی جووتیار، ئـەوی دیکـەیان توێژە. چونکو ئەوە مەسەلەن دەبینی یەکێکیان لە کارخانە کار دەکـا موهەندیسـە، یەکێکیان موهەندیسە لە کەشاوەرزیدا کار دەکا. ئەوە ناکریٚ جا ئەوانە بخەینـە نێـو یەك تەبەقەو یەك چین. ئەوە تەرکیبی کۆمەڵی سۆسیالیستییە.

بەلاٚم کە چونکە ئەتۆ کـە نوێنـەری کرێکـاری لـێرەو نوێنـەری جووتیـاری لـێرە مەسەلەیەك دێتە پێشـیٚ. باشـە مـن جووتیـارمو گـەنم بەرهـەمهێناوە، بـەلاٚم مـن جووتیارم ئیحتیاجیم بەوە هەیە کە تراکتۆرم هەبیٚ، عەینی مەسەلەی جارانتان لەبیرە کە یەکیٚ گەنمی دەبردە بازاڕیٚ، گەنمی دەباتە بازاڕیٚ جووتێر دەیکاتە پووڵ تراکتـۆری دەکڕیٚ. باشە چی دەتوانیٚ شتی خۆی بفرۆشیٚ، هەرکەس شتی دەتوانیٚ بفرۆشێت کـە مالکی بێت، خاوەنی بێت. ئەی خاوەنی نەبێت خۆ ناتوانیٚ بیفرۆشێت. جووتیار ئـەو وەختە دەتوانیٚ گەنمەکە بفرۆشیٚ کە خاوەنی ئەو گەنمە بێت. ئەو خاوەنی ئەو گەنمەیە، کرێکاریش خاوەنی تراکتۆرە. دەڵیٚ تۆ گەنم دەیە ئەمنیش تراکتۆر، ئەو ئاڵوگۆڕە کە هەیە لە بازاڕدا دەبیٚ بە چی پێك بێت؟ پووڵ، بە پووڵ. وەسیلەیەکی دیکە نیە ئەگەر هەردووکیان یەك ساحێبیان هەبا ئەو وەختە نەدەکرا مەسەلەن شتێك لەو گیرفانەمایە دەری بێنم بیفرۆشم بەو گیرفانەی دیکەم. دەبێتە گاڵتە. بەلاٚم چونکو دوودانە تەبەقـە هەیە، دوو تەبەقە لە موقابیلی یەکتردا دەبیٚ شت بە یەکتر بفرۆشن بۆیە دەبـیٚ پـووڵ هەبیٚ. پووڵ هەیە لە ولاٚتی سۆسیالیستیدا.

ئەوە نەك هەر پووڵ هەیە لەوە زیاتر ئەوەیە کە هـەموو جـاریش، ئێـوە تەماشـا بکەن هەر لێرە یەکێك "ضبط صوت"ی هەیە. دیارە ئەوە ئیستیسـنایە ئـێرە بـازاڕ نیە، بـەلاٚم ئـەوە بـازاڕە. هـەر ئـەوەش تەماشـا بکـەن یـەکێك، دانەیـەك "ظبـط

صوت"ێکی دێنیٚ دەڵیٚ بە ١٠٠٠ تمەن دەیفرۆشم، ئەوی دیکە ئەڵیٚ بە ٨٠٠ تمەن یا ئەڵیٚ بە ٩٠٠ تمەن، یانیٚ چی؟ یانیٚ ئەوەی کە دەیفرۆشیٚ پێیخۆشە هەرچی گرانتر بیفرۆشیٚ، ئەوەی کە دەیکڕیٚ پێیخۆشە هەرچی هەرزانتر بیکڕیٚ. مەنافعیان وەك یەك نیە. قازانجیان بە تەواوی وەك یەك نیە لەگەڵ ئەوەی کە هەردووکیان سۆسیالیستن، کرێکارو جووتیار لە وڵاتی سۆسیالیستیدا بە گشتی قازانجیان بەرەو سۆسیالیزم رۆیشتنە بەڵام لە بازاڕدا کە تووشی یەکتر دەبن بە تەواوی قازانجیان وەك یەك نیە. بۆ ئەوە دەبیٚ هەر دەوڵەتێکی سۆسیالیستی لە بەرچاوی بگریٚ.

ئەگەر ئەوە وا فیکر کەینەوە کە بەس بەو شێوەیە کە لە تەبلیغات دێن کە ئەوەی لە وڵاتی سۆسیالیستیدا بژی هەموو قازانجیان یەکە، هیچ ئیختیلافیان نیە، درۆمان کردووە. واقعییەتەکە ئەوە نیە. عیلم ئەوەی ئیسبات دەکا کە وا نیە، بێجگە لەوەش واقعییەتیش ئەوە ئیسبات دەکا، بێجگە لەوە کە ئەو دوو تەبەقەیە، ئەو دوو چینە قازانجیان وەك یەك نیە. زۆر توێژی دیکەش هەیە کە قازانجی وەك یەك نیە، پێی خۆشە بە قازانجی توێژی خۆی شتەکەی دەست کەویٚ. دەستەو گورووه هەیە، مەسەلەن فلاٚن جمهووری پێی خۆشە زیاتر سەرمایەگوزاری لەو جمهوورییەدا بکا، ئیعتیبارەکە بدریٚ بەو جمهوورییە. یا فلاٚن شار حەتتا لە داخلی فلاٚن جمهووریدا پێی خۆشە زیاتر شتی بدرێتیٚ. یانیٚ مەنافعەکە بە تەواوی وەك یەك نیە. مەسەلەن فەرز دەکەین لە بەینی سەقزو سنەدا، ئەوە بووین بە سۆسیالیزمو ـ ئەوان (سەقزیو سنەیی) یەکتریان زۆر خۆش ناویٚ ئەو وەختیش هەر وای لیٚدیٚ. ـ مەسەلەن ئەوە دەمانەویٚ لە بەینی ئەوانەدا سەدێك درووست کەینو ئاو بدەین بە سنە یا بدەین بە سەقز. قسەیەکە ئاوەکە لەپێشدا بدریٚ بە سەقز، سنەیش دەیەویٚو لە پێشدا بدریٚ بە سنە، سەقزیش دەیەویٚ.

یانیٚ وای لیٚنەکەین کە گوتمان هەمووومان سۆسیالیستین ئیدی هەموو مەنافعێکمانو هەموو شتێکمان یەکە. بۆ ئەوە دەڵێین؟ بۆ دوو دڵن؟ ئێمە ئێستا هاتووین حیزبێکی شۆڕشگێڕمان پێکهێناوە، رۆژ نیە دەیان رەفیقمان شەهید نەبیٚ. خۆ لە گیان زیاتر نیە؟ هاتوون گیانی خۆیان لەو رێگایەدا داناوە. ئێمەش کە هاتووین، هەموومان ئەو رێگایەمان گرتووەتە بەر، رێگای دیکەشمان نیە، یا لەو رێگایە دەبیٚ سەرکەوین یا ئەبیٚ شەهید بین. باشە ئەوەندە لێك نزیکین خوێنمان

تێکەڵاوە، بەڵام دەتوانین بڵێین کە مەنافعمان لە هەموو شتدا وەك یەکە؟ نیە. هەر لەو جێگایە کە دەچین، برادەرەکانی خۆمان، قارەمانەکانی حیزبی دێموکرات، مەسەلەن دەسکەوتیان دەبێ، بۆ دەسکەوتەکە مەنافیعیان وەك یەك نابێ و لەبەر دسکەوتە کە شەهیدی خۆڕایی زۆرە.

کەوابوو مەقسەدم ئەوەیە کە ئێمە شتی ئیدەئالی، خەیاڵی لە خۆڕا درووست نەکەین. چونکو وڵاتی سۆسیالیستی ئەبێ هەموو شتێکی وەك یەك، هەموو نەزەریان وەك یەك، هەموو مەنافعیان وەك یەك بێت. هەم لە باری عیلمیەوە لێرە نیشانمان داو هەم فلاّن پروفیسۆری دانشگاه، ئوستادی دانشگاه، دەچێت تەماتە دەکڕێ لەو کەڵخۆزیە کە لە بازاڕ دەیفرۆشێ، پێی خۆشە بە هەرزانتری بکڕێ، ئەویش پێی خۆشە بە گرانتری بفرۆشێ. ئەو پروفیسۆرە، ئەو پروفیسۆرەی کە زەبتی سەوت درووست دەکا، لە کارخانەیەکدا کار دەکا موهەندیسە، پێی خۆشە گرانتری بفرۆشێ بە کەڵخۆزیەکە، کەڵخۆزیەکەش پێی خۆشە بە هەرزانتری بکڕێ. قانوونی بازاڕ هاتە مەیدانێ ئیدی ڕێگا نیە، هەتا ئەو وەختە پووڵ ماوە.

لە سەر ئەوەش کە پووڵیش دەمێنێتەوە یا نامێنێتەوە دیارە هەروەها وەك زۆر وڵاتی دیکە لە وڵاتانی سۆسیالیستی زۆر جوك هەیە لە سەر ئەو جۆرە شتانە. مەشهووریشە کە ڕادیۆی ئیرەوان ئەویش بۆخۆی تاریخێکی تایبەت بۆخۆی هەیە، بەڵام زۆر مەشهوورە، ڕادیۆی ئیرەوان کە پایتەختی ئەرمەنستانە، لە ڕادیۆ ئەرمەنستان دەپرسن دەڵێن پووڵ لە کومونیسمدا ـ سۆسیالیسم هیچ کە هەیە ـ لە کومونیسمدا دەمێنێتەوە یا نامێنێتەوە؟ جواب دەداتەوە دەڵێ ئەوانەی کە مارکسیسمی بە شێوەیەکی ویشكو دوگماتیك حاڵی بوون ئەوە پێیان وایە پووڵ نامێنێتەوە. ئەوانەی کە مارکسیستی خەلاقن یا ئەوەی کە پێی دەڵێن "ڕێڤیزیۆنسیتن" (تەجدید نەزەر تەڵەبن) پێیان وایە کە پووڵ دەمێنێتەوە. بەڵام ئێمە کە مارکسیست لنینیستی واقعیین نەزەرمان ئەوەیە کە لە کۆمۆنیزمدا پووڵ لە کن هێندێ کەس دەمێنێتەوە. یانێ وەکوو ئێستامان لێدێ پووڵەکە هەر هەیە، ئەوەی دەوڵەمەند بێت پووڵی هەیە، ئەوەی ... ئەوە جوکە، بەڵام واقعیەتێکیش نیشان دەدا کە ئەوەی کە ئینتیزاری ئەوەی هەبوو کە بەڵێ لە سۆسیالیزمدا پووڵ نەبوو، هەموو شتێك هەموو کەس بە مساوات وەرگرێ، نەخێر وانیە. ئێمە پێمان خۆشە، لە داخڵی

حیزبی خۆماندا واقعییەتەکە بەو شێوەیە کە هەیە بە برادەرانی حیزبیمــان بگوتــرێ، هەم باش، هەم باری باشە، هەم باری خراپ، کەوابوو پوولێش لەوێ هەیە.

با ئاوا بڵێم مەنافعیان موتەناقیز نیە، چینی کرێکار لــە ولاٚتــی سۆسیالیســتیدا بەرانبەر بە چینــــی ســەرمایەداری رانەوەســتاوە، بــەلاٚم بەرانبــەر بــە چینــی جوتــێر راوەستاوە کە مەنافعیان لە یەك جەهەتدا دەڕوا. بەلاٚم بە تەواوی وەکــو یــەك نیــە، جارجاریش مەنافعیان، قازانجیان جیاوازیی هەیە لەگەڵ یەکتری، ناکۆکیــان لەبــەینەدا پەیدا دەبێ. وەك عەمەلەن پەیداش بووەو ئەو تیئۆرییە لە عەمەلیشدا سابت بووە. کەوابوو ئەوە دەبێتە سۆسیالیزم لە باری ئیقتیسادییەوە.

باشە ئەو سۆسیالیزمە چۆن بوو لە سەر ئەوەش چەند کەلیمەیــەکیش بڵێــم، ئــەو سۆسیالیزمە چۆن هەڵدەســووڕێ؟ چونکــو لــە ســەرمایەداریدا کــابرای ســەرمایەدار کارخانەکەی هەڵدەسووڕێنێ، زۆر جــار گوتمــان دەوڵــەت دەخالــەت دەکــا بــەلاٚم بــە هاوکــاریی ســەرمایەدارەکان، ئیــــدی دەوڵــــەت هــــەڵی ناســــووڕێنێ، لــــێرە کــــێ هەڵیدەسووڕێنێ؟ ئەو کارخانەیە لێرە دانراوە کێ هەڵیدەسووڕێنێ؟ دیارە لێرەدا لـــە هەڵسووڕاندنی ئیقتیسادی سۆسیالیستیدا دوو بۆچــوون هەیــە: یــەکێکیان بۆچوونــی سانترالیستی، یەعنی هەموو شتێك لە مەرکەزەوە ئیدارە دەکرێ، یەکێکیان بۆچوونی غەیری سانترالیستییە، یەعنی ئەوە کــە کارخانــەکان حــەقی تــەسمیمگیرییان هەیــە بۆخۆیان، ئەوە فەرقەکە ئەوەتە، ئالەو جێگایە کە هەموو شتێك لە مەرکەزووە دێت کارخانەیەك کە لە شاری سنەیە، مەرکەزیشمان فەرز دەکەین کامیارانە، بــۆ ئــەوەی کێشە پەیدا نەبێ بڵێین مەرکەزیشمان، پایتەختیشــمان کامیارانــە. لــە کامیارانــەوە بڕیار دەدەن کە لە فلاٚن کارخانە لە سنە دەبێ تــەولیدی ئــاوا بــێ، ســالێك ئــەوەندە تەولید بکا، مەسئوولی ئــاوا دادەنێــین کارەکــانی ئەوەیــە، هــەموو شــتێکی دیــاری دەکرێ، بە پێی بەرنامە بەلاٚم دیاری دەکرێ، ئی مەهابادیش هەر کامیــاران دیــاریی دەکا، هی نەغەدەش دیاری دەکا، ورمێش دیاری دەکا. تەواوی ئــێران ئەگــەر بڵێــین تاران بێت، تاران دیاریی دەکا، لە تارانەوە دەستوور دێ کــە کارخانــەکان وەزیفــەیان چیەو دەبێ چ بکەن. هەروەهاش ئەوە مەرکەزە کـــە مـــەوادی خامیـــان بـــۆ دەنـــێرێ، تەقسیمی کاریان لە بەیندا دەکا. دیارە ئەوە کارێکی یەکجار زۆر سەختە، کـــارێکی یەکجار زۆر وردو دەقێقە، کادرێکی زۆر وەرزیدەی دەوێ.

تەماشای مەسەلەن ئیتیحادی شوورەوی بکەین باشە یەك شەشەمی جیهانە. مەسەلەن مومکینە ئێستا ئەوەتان پێ بڵێم پێتان سەیر بێ، بەلاّم لە مۆسکۆوە بۆ ڤلادی ڤستۆك ـ هەردووکیان لە ولاّتی شوورەویدان ـ چەند بەرابەری ئەو فاسڵەیەیە کە لە مۆسکۆوە بۆ نیۆیورکە. لە مۆسکۆوە بۆ ئامریکا زۆر نێزیکترە تا لە مۆسکۆوە بۆ ڤلادی ڤستۆك کە شارێکی خودی شوورەوییە. باشە جا مەقسەد ئەوەیە کە لە ولاّتێکی ئاوا گەورەدا کە دابنیشی، دەهەزار کیلومەتر دوور لە مەرکەز لە سەر کارخانەیەك بڕیار بدا، دەبێ ئیتلاعاتێکی زۆر وردت هەبێ، دەقیقت هەبێ، ئیشتبا نەکەی . بەڕاستی کارێکی زۆر زەحمەتە. ئێمە بۆچی لە چیڕا دەزانین زەحمەتە، ئێستا دانیشتووین لە مەرکەز بڕیار دەدەین لە سەر فلاّن هێزی خۆمان، یان لە سەر فلاّن رێکخراوی شارستان، کومیتەی شارستان کە نیسبەتەنیش نزیکین، نیسبەتەنیش تەماسمان هەیە. بەلاّم دیسانەکە ئەگەر ئیتلاعاتەکەمان کەمێك دەقیق نەبێت دوچاری ئیشتیبا دەبین.

لە سەرەتای درووست کردنی سۆسیالیزمدا هیچ رێگا نیە بە تایبەتی لە ولاّتەکانی پاشکەوتوو دەبێ ئەو رێگایەی هەڵبژێری. چونکو ئێستا ئێوە تەسەوری ئەوە بکەن کە ئێمە سبەینێ سەرکەوتین بە برادەرانی بانەیی بڵێین ـ با ئەمجارەش نێوی بانە بێنین ـ بابە ئەو کارخانەیەی کە هەتانە بۆخۆتان بەرنامەریزی بۆ بکەنو هەرچی دەکەن، بیکەن. بانەی فەقیریش دوو کادری ئیقتیسادیی بۆ کاری بەرنامەڕیزی نیە، چۆن ئەوەی تێبگەن؟ دەبێ لە مەرکەزەوە فکرێ بە حاڵی ئەوان بکەین هیچ رێگای دیکەمان نیە بەداخەوە.

بەلاّم ئەگەر بمانەوێ تەسمیمگیرییەکی زیاتر بدەین بە کارخانەکان ئەوە دەبێ پاش ماوەیێ کە کادرمان بۆ پێكهات، ئێستا مەسەلەن دەزانن ئێمە سێ مەرکەزمان پێكهێناوە، سپی سەنگمان هەیە، ئاژوانمان هەیە، ئاگریمان هەیە. باشە جاران نەماندەتوانی ئەوەی پێكبێنین. پێنج ساڵ لەوەی پێش هەر مومکین نەبوو. ئەو کادرەمان نەبوو کە ئەسڵەن پێکی بێنین. ئێستا بە خۆمان ئیجازە دەدەین ئەوەی پێكدێنین، ئیختیاراتیشی دەدەینێ بۆخۆی تەسمیمگیری بکا. بەس لە سەر زۆر مەسایلی موهیمیش تەسمیمگیری بکا. مانای ئەوەیە کە تا رادەیەك ئیختیاراتمان

پیٚداوە. ٥ ساڵ لەوەی پێش، ٤ ساڵ لەوەی پێش، ٣ ساڵ لەوەی پێش نـــەماندەتوانی ئەوەی پێك بێنین. جا لە مەسەلەی ئیقتیسادیشدا هەر وایە.

کەوابوو لــە ئەوەڵەکـەیدا نـاتوانین، بـەلاّم لـە پاشـان کێـهایان باشـترە؟ ئەگـەر سۆسیالیزمەکە پێشکەوت ئەوەی کە لە مەرکەزەوە تەسمیم دەگیرێ باشترە یا ئـــەوەی کە هەر کارخانەیەك، هەر بەخشێك بۆخۆی تەسمیمی خۆی بگریٚ؟ دەرکەوتووە کە لـــە پاشان ئەگەر مەرکەز جەهاتی گشتی، ختووتی گشتی بەرنامەڕیزیی‌یەکە دیـاری بکـا بەلاّم تەسمیمگیری‌یەکە بهێڵێ بۆ کارخانەکان، ئەو وەختە ئەوە باشترە. چونکە ئـــەمن لێرە فەرزکە مەهابادیم دانیشتووم لەوێ کارخانـــەم هەیـە، لـە کامیارانـەوە تـەسمیم دەگرن دەبێ تۆ ئەوەی بکەی، باشە ئەوە ئەوان ئاگایان لیٚنیە بە چـاکی، باشـە حـەق بدە، ئەمنیش دەبێ جێبەجێی بکەم، تەسمیمەکە ئەوان جێبــەجێی ناکـەن خـۆ ئـەوان تەسمیمەکە دەگرن. باشە بۆ تەسمیمەکە نەدەین بەو کەســانە کـە بۆخۆیـان جێبــەجێی دەکەن. با ئەوان بەشدار بن لە تەسمیمگیری‌یەکەدا.

ئێستا هەردووکی هەیە یانێ لــە وڵاتـانی سۆسیالیسـتی‌دا هـەردووکی ئیمتحـان دەکەن. مەسەلەن لە مەجارستان زیاتر تەسمیمگیری‌یەکـە لـە کارخانـەکان دایـە، لـە شوورەوی بەشبەشە. لە مەسەلەن فەرزکەین ڕۆمانی بــە پێچەوانــەوە، هــەمووی لــە مەرکەزەوە تەسمیم دەگیرێ. مەقسەدم ئەوەیە هەر دوو لایان ئیمتحان کـــردوە. بـەلاّم دەرکەوتووە کە ئەوەی مەرکەزیەتەکە ئەگەر خودی خەڵکەکە یانێ ئەوانەی کە دەبێ، مەسەلەن ئەمن بە کارخانەکە دەڵێـــم: ئـەتۆ دەبـێ سـاڵێ سـەد هـەزار ئۆتۆمۆبیـل درووست کەی، ئەگەر کرێکارانی ئەو کارخانە لەگەڵ موهەندیسەکان بۆخۆیان بەشدار بن لەو تەسمیگیریەدا، ئەمن پێموایە ئەو وەختە نەتیجەکەی باشترە، هەروەها ئێسـتا لە باری ئینسانی‌یەوە ئێمە دەمانەوێ لە ئاخر لەحزەدا، دەمانەوێ بــە پێشـمەرگەکان بڵێین، دەبێ ئەو پایەگایە لەبەین بچێ. دابنیشین لەگەڵیان مەشوەرەت بکــەین پێیـان بڵێین ئەوان بەشدار بن، ئێحساسی مەسئوولییەت بکەن بۆ ئەو کارە، باشتر دێن هەتا ئەوەی کە هەروا بە دەستوور بێــت. ئــەوە شـتێکی زۆر تەبێعی‌یـە لـەوێشدا وایـە، هەرچەند ئێرە کارەکەی نیزامی‌یە، جاری وا هەیە فـەرماندە هــەر مـەجبووریش نیـە پێیان بڵێ. بەلاّم لەوێ تەسمیمگیری‌یەکە ئیقتیســادی‌یە. کـەوابوو ئـەو مەسـەلەیەش

یانیٚ مەسەلەی هەڵسووڕانی ئیقتیسادی سۆسیالیستی کە یەکێك لە ئەساسیترین مەسەلەکانە ئەوەیە کە تەسمیمگیری لە مەرکەزەوە بێت یا لە خودی کارخانەوە.

مەسەلەیەکی دیکە کە زۆر موهیمەو بەداخەوە هێشتا لە زۆر ولاٚتی سۆسیالیستی حەل نەکراوە، مەسەلەی ئەوەیە کە لەو تەسمیمگیرییەدا بەتایبەتی دیاریکردنی نرخی شتومەك مەسەلەن فەرزکەین هەروا کە گوتمان لە کامیارانەوە دانیشتووین لە مەهاباد فلاٚن کارخانە فلاٚن شت بەرهەمی فلاٚن شتە، ئێمە لێرەوە دیاری دەکەین کە دەبیٚ بە ئەوەندە بفرۆشریٚ، لە پاشان بۆمان دەردەکەویٚ کە وردە وردە بفرۆشیٚ کارخانە هەر زەرەر دەکا. کرێکارەکان هیچ قازانجیان نیە کاری بۆ بکەن لە نەتیجەدا نایکەنو بەرهەمەکە دێتە خواریٚ. کەوابوو چی بکەین؟ ئەوە یەکێکە لەو مەسایلە لە ولاٚتانی سۆسیالیستی زۆرجار ئیمتحان کراوە، هیلکە دەست ناکەویٚ، نیە، کەمە، چ بکەین هیلکە دەست بکەویٚ؟ هاتوون فیکریان کردوەتەوە ئێمە هیلکەی دەکڕین بە تمەنێکی کەڵخۆزی، حسێب دەکەین دەبینین ئەو کەڵخۆزییە هیلکە ٩قرانی زیاتر بۆ تەواو دەبیٚ لەویٚڕا دەیهێنێنە بازاڕیٚ دەیفرۆشیٚ بە تمەنێکی، قازانجێکی وا زۆری تیٚ نابیٚ کەوابوو یانیٚ یا ئەسڵەن هەیە بەرهەمی نیە یا ئەگەر هەیبیٚ بۆخۆی دەیخوا. قازانجی نیە، باشە چ بکەم کە هیلکە زۆر بیٚ؟ تەجروبە نیشانی داوە کە کردم بە ١٥قران تەماشا دەکەین هیلکە زۆر بوو.

ئەویش یەکێك لە مەسەلەی هەرە ئەساسیی، مەسایلەکانی هەرە ئەساسیی ولاٚتی سۆسیالیستییە کە "انشاء الله" بۆتان جێبەجیٚ بوو ڕۆژیٚ چوونە ئەو ولاٚتانە ئەو وەختەی دەبینن کە من ئەوەی عەرزتان دەکەم ڕاست بەو شێوەیە. چونکو بە جارێك دەبینی یەك شت پەیدا نابیٚ لە رووی ئەوەوە کە بەرنامەڕیزیی مەرکەزی غەڵەتیش بەرنامەڕیزی کراوە، وەکوو مەسەلەن لێرە نازانم بۆتان هاتۆتە پێش نان کەمە یان نیە، یا دەبینن پەنیر نەهاتووە، بۆچی لە وەختی خۆیدا نەچوون بیهێنن، بەیانی لە زانکۆدا نانی ویشك دەخۆین یا هەر لە بەر ئەوە شاترەکە نەیتوانیوە نانەکەی بە تەواوی حازر بکا. ئەو جا ئەگەر ئەوە بکەینە کۆمەڵێکی گەورە لێرە دەبینین کە ئەو کەمبوودانە زۆرجار زۆر زیاتر بەرچاو دەکەویٚو زۆر جاریش قابیلی حەل بەداخەوە نیە. چونکو ئەوەی کە تەسمیمگیری دەکا نایەویٚ تەسمیمگیرییەکە لەدەست بدا

دەیهەویٚ تەسمیمگیری‌یەکە بە عوهدەی خۆی بیٚت، ئەوە بە ئەسڵیٚکی سۆسیالیستی دەزانیٚ. لە نەتیجەدا نەتیجەکەی ئەوە دەبیٚ کە مەسەلەکە هەر چارەسەر ناکریٚ.

کەوابوو ئەمە ئیٚستا تیٚگەیشتین کۆمەڵی سۆسیالیستی چۆن پیٚکدیٚ؟ ئەسڵەکانی چیە؟ چۆن هەڵدەسووڕیٚ؟ بەڵاٚم یەك شت ماوە، بەڵاٚم پرسیار لە سەر ئەو یەك شتە ئیٚستا نیە. ئەویش ئەوەیە باشە لە باری سیاسی‌یەوە چۆنە. ئەو کۆمەڵە ئیٚمە گوتمان ئەو کۆمەڵە کۆمەڵیٚکی گشتی‌یە خۆ هەر مەسەلە باری ئیقتیسادی‌یەکەی نیە. ئەگەر باری ئیقتیسادی‌یەکە تەنیا بگرینە پیٚش دەبینە چی؟ دەبینە "ئیٚکۆنۆمیست" وانیە؟ وەدوای ئیٚکۆنۆمی دەکەوین. دەبیٚ باری سیاسیو فەرهەنگیو ئیجتیماعیو ئەوانەی ببیٚ. باری سیاسی‌یەکەی: باشە ئیٚمە دەڵیٚین ئیٚستا خەبات دەکەین، شەهید دەدین، کویٚرەوەری دەبینین، لە شاخی دەبین، نازانم زۆر زەحمەتی دیکە ... ئاوارە دەبینو ئەوانە، بۆ ئەوەی کە کۆمەڵیٚکی سۆسیالیستین، ئەو کۆمەڵە هەرکەس، هەر کوردیٚك، هەر ئەندامیٚکی حیزبی دیٚموکرات حەقی هەیە ئەو پرسیارەمان لیٚبکا، یەکەم بۆچی ئیٚمە سۆسیالیزمان دەویٚ؟ تەقریبەن لیٚرە جوابمان داوەو من پیٚموایە بەش بە حاڵی خۆم جوابیٚکی "قانع کننده"و جوابیٚکی باشە.

دووهەم: ئیٚمە چ نەوعە سۆسیالیزمیٚکمان دەویٚ؟ چونکو هەموو وەك یەك نیە، بۆیەش ئەمن گوتم وڵاٚتانی سۆسیالیستی، چین سۆسیالیستی‌یە، بەڵاٚم ئالبانی کە تا چەند ساڵ لەمەوپیٚش دۆستی چین بوو، چینی بە سۆسیالیست نەدەزانی. یوگۆسلاڤی سۆسیالیستی‌یە، ئالبانی بە سۆسیالیستی نەدەزانی. بەڵاٚم بۆ ئیٚمە کە دەمانەویٚ واقعبین بینو لە سەر ئەو ئوسووڵەی کە باسمان کرد هەموویان سۆسیالیستن، بەڵاٚم هەموویان وەك یەك نین، نە لە بارەی ئیدارەی ئیقتیسادی‌یەوە نە لە بارەی ئیدارەی سیاسی‌یەوە. مەسەلەن فەرز دەکەین ئیٚستا پاش مردنی تیتۆ لە یوگۆسلاڤی، ٦جمهووری هەیە لەویٚ جمهووری فدراتیوە، ٦میللەت هەیە لەویٚ هەر میللەتیٚك جمهووریی خۆی هەیە. سبەینیٚ ئەگەر ئیٚرانیش لە واقیٚعدا وای لیٚهات، دەبیٚ وای لیٚبیٚ، جمهووریی بەلووچستان هەبیٚ، جمهووریی کوردستان هەبیٚ، جمهووریی ئازەربایجان هەبیٚ، نازانم عەرەبستان هەبیٚ، لە پاشان هی سەرتاسەری ئیٚرانیش بە هەمووشی یەك وڵاٚت، هیچ تەجزیەو مەجزیەشی تیٚدا نیە.

باشە، پاش وەفاتی تیتۆ هاتن گوتیان ئێمە ئەگەر یەکێکی لەوانە بکەین بە رەئیس جمهووری ئەوانی دیکە مومکینە پێیان ناخۆش بێت. بۆ شتێکی نەکەین هەموو ساڵێك رەئیس جمهووری یەکێك لەو جمهووری‌یانە ببێتە رەئیس جمهووری یوگۆسلاڤی، قبوولْ نیە. ئێستا هەموو ساڵێك یەکێ ببێتە رەئیس جمهوور کێشە دەبێت. باشە! بەڵام ئەو شێوەیە لە شوورەوی نیە، بەڵام لەوێ شێوەیەکی دیکەیە.

جا مەقسەدی من ئەوەیە کە دەبێ دیاریی بکەین، خۆ نامانەوێ خەڵکی خۆمان فریو بدەین کە چ سۆسیالیزمێکمان هەیە. بە تایبەتی یەك مەسئەلە لێرە ئەساسی‌یە، لە باری ئیقتیسادی‌یەوە حەلمان کرد، لە باری ئیجتیماعی‌یەوە باشە سۆسیالیزم بۆ ئێمە عادلانەترە وانیە؟ دەبینین سۆسیالیزم تەنیا ئەوە نیە کە وەزعێکی باشتر دەدا، بەڵکوو مەدرەسەی مەجانی‌یە، نەخۆشخانەی مەجانی‌یە، بە خۆڕایی‌یە. زۆر قازانجی دیکەشی هەیە، فەرهەنگی زووتر دەخاتە پێش، ئەوە هەموو هەیە. بەڵام باشە ئێمە ئەوانەمان هەموو هەبێ بەڵام هەر یەکێك بڵێ لە موقابیلی یەك شتدا، نە! حەقی قسەکردنی نابێ. فەقەت ئەوانە قسە دەکەن کە موهەندیسن، ئەتۆ دەبێ فەقەت ئیجرا بکەی. ئازادیت نەبێ. دێموکراسی کە دەتەوێ دەبێ خەتێکی بە سەردا بێنی، ئێمە دانیشتووین لە سەر ئەوەش فیکرمان کردەوە، کە بڵێین چی؟ ئەوەمان دەوێ یا ئەوەمان ناوێ.

بە نەزەری ئێمە پاش ئەو هەموو شەڕو کێشەیە بۆ دێموکراسی وەك حیزبی دێموکرات، پاش ئەو هەموو زەحمەتکێشانە لە ڕێگای ئازادی‌دا، ناتوانین وەك حیزبی دێموکرات واز لە ئازادی بهێنین. سۆسیالیزمی بێ ئازادیمان ناوێ، سۆسیالیزمێکمان دەوێ کە ئازادیی بێ، دێموکراسیی لەگەڵ بێ. شیعاری ئەساسیی ئێمە ئەگەر خودموختاری‌یە کە شیعاری ئیستراتیژیمانە "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان" ئەگەر بمانەوێ ئەو شیعارە لەگەڵ ئامانجی دوارۆژمان ڕێك بخەین خۆ ناکرێ شیعاری ئیستراتیژی لەگەڵ ئامانجی دوارۆژ موتەناقیز بن، ناتەباییان لە بەین‌دا بێ، یان جودا بن. ئەو وەختە دەبێ بڵێین خودموختاری، دێموکراسی، سۆسیالیزم، ئاوا یا بچینە پێش، ئەویش ئەوە، ئەوەمان دەوێ هیچی دیکەمان ناوێ. یانی دەمانەوێ سۆسیالیزم تەواوی ئەو خسووسیاتەی تێ‌دا هەبێ کە باسمان کرد.

بەلاٚم لە عەینی وەختیشدا سۆسیالیزم خودی میللەتی کورد یان میللـەتی ئـێران دروستی دەکا. سۆسیالیزم بە زۆر بە هیچکەس تەحمیل نەبێ. خـۆی داوتەڵەبانـە بـێ درووستی بکا!. پشتیوانیشی ببێ. پێمان وایە دروستی دەکاو پشتیوانیشی دەبـێ بـە یەك شەرت کە ڕێگا بدرێ قسەی خۆی بکا، نەزەری خۆی بدا لــە ســەر سۆســیالیزم. دەنا ئەگەر ئەتۆ بیکەی بە مەڕ وەك شوان بیکەی، حەقی قسەکردنیشی نیە. ئەوە بە نەزەری من دەبێتە سۆسیالیزمی بەزۆر، سۆسیالیزمی بە تۆپزیو ئــەو سۆســیالیزمە، سۆسیالیزمێکی سەرکەوتوو نابێ. ناتوانی ئەتۆ سۆســیالیزم بــە پێچەوانــەی ویســتی زۆربەی خەڵکی کوردستان هەڵبسووڕێنی، ناتوانی. بە پێچەوانەی ویستی ئەقەلییەت درووست دەکەی، چونکو ئەکسەرییەت لە پشت ســەری تۆیــەو ئــەوە مانــای ئەوەیــە دێموکراسی هەیە. ئەکسەرییەت شتێکی ویست بە شێوەی دێموکراتیك، دێموکراســی پێچەوانەی ویستی ئەقەلییەتێك قبووڵ دەکا. بەلاٚم ئەوە ناکرێ ئەکسەرییەت بڵێ نە، ئەتۆ بە زۆر بە سەریدا تەحمیل بکەی.

بە نەزەری ئێمە لە بەر ئەوەیە کە ئێمە ئیسرارمان هەیە لە سەر ئەو مەســەلەیەو لە ئێستاوە دەمانەوێ تەکلیفی خۆمان روون بکەینەوەو کۆنگرەش هەر لەو جێگایەی کە ئێــوە دانیشــتوون بڕیــاری لــە ســەر داوە لــە بەرنامــەی خـۆیدا، سۆســیالیزمی دێموکراتیك، سۆسیالیزمێك کە دێموکراسیی لەگەڵ بێ، ئازادیی لەگــەڵ بــێ. ئــەوە شتێك نیە کە حیزبی دێموکراتی کوردستان ئێستا ئیجرای کردبێ، ئەوە شــتێکە کــە ئێمە ساڵەهای ساڵە ئێمە موبارزەی بــۆ دەکــەین، ئێســتاش کــە کۆنگــرە تەســویبی کردوە، بۆتە خەتی سیاسیی حیزبەکەمان. هەر ئەندامێکی حیزبی دێموکــرات دەبــێ تەبلیغی بۆ بکا. دەبێ ئەوە بەرێتە نێو کۆمەلاٚنی خەڵك، لەگەڵیان قسە بکا، روونیان بکاتەوە. ئەو کەسانە کە بە شێوەیەك یا لەبەر نەزانین یا خــودای نەخاســتە لــە بــەر غەرەز موخالفەتی لەگەڵ دەکا، روون بکاتەوەو پێیان بڵــێ کــە هیــچ فەلســەفەیەکی ناوێ. یانێ ئەگەر بتانەوێ بە ئیجبار، بە ناچار بە هەرچی بڵێم کارم ئــەوە بــووە کــە ٢٠ ساڵ دەرسی ئیقتیسادی سیاسیم گوتوەو دەرسی مارکسیسمم گوتوە، دەتوانم لـــە رووی مارکسیسم چەندین سەعات لێرە قسەتان بۆ بکەم بۆچی ئەوە باشە.

بەلاٚم پێموایە ئەو فەلسەفەیە ناوێ. مەسەلە زۆر سادەترە لــەوە. هــەر کوردێکــی ئەندامی حیزبی دێموکرات خودموختاریی دەوێ، هــەر کوردێکــی ئــەندامی حــیزبی

دێموکـرات دێموکراسـیی دەوێ، هـەر کوردێکـــی ئـــەندامی حـــیزبی دێموکـــرات سۆسیالیزمی دەوێ. سۆسیالیزمێکی ناوێ کـە لـێرە دیکتـاتۆری دابمـەزرێ. چونکـە تەجروبە نیشانی داوەو ئەوەیـە کـە ئێمـە لـە تەجروبـە دەبـێ دەرس وەربگریـن کـە دیکتاتۆری لە پێشدا بە ناوی تەبەقەیەکە لە پاشان ئەبێتە هی حیزبێك، بـا حـیزبی دێموکراتیش بێ کە حیزبی خۆمانە، پاشان دەبێتە هی کومیتەی مەرکەزی لە پاشـان دەبێتە هی دەبیرکوللی حیزب، من وەك سکرتێر لە ئێسـتاوە دژی ئـەو دیکتاتۆریـەم ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە لە رووی زانینەوە ئەو کارە دەکەین. دەنـا ئەگـەر لـە بارەی خۆمانەوە بێت چ باشتر دەبێتە دیکتاتۆرو هیچکەسیش ناتوانێ قسە بکا! ئێمە دوارۆژی میللەتەکـەمان بۆمـان موهیمـە. پێمـــان خۆشـــە شـــتێك دابنێـــین کـــە میللەتەکـەمان سـبەینێ نـەڵێ لەعنـەتی تاریخیتـان لێبـێ. دەیـانزانی، فلانکـەس دەیزانی یـا ئـەوی دیکـە دەیزانـی، خـۆ ئێمـە نـەماندەزانی، ئێمـە نـەچوبووین، نەماندیتبوو، بەلاّم ئەو چووبوو دیتبووی بەلاّم پێمـانی نـەگوت. وەزیفەمانـە پێتـان بلێین بە سەراحەتیش.

وەشتێکیش کە حیزبەکەمان تەسویبی کرد جارێ ئیدی دەبێ دیفـاعی لێبکـەین. ئیدی ناتوانین بەرانبەری راوەستینو دوای تیئۆریی حیزبەکانی دیکە بکەوین. باشە من هاتووم ئەندامی حیزبی دێموکراتم، ئەوە بەرنامەکەیەتی کۆنگرەش تەسویبی کـردوە، بەلاّم مەوافقی نیم، بەلاّم من دیکتـاتۆری پێرۆلێتاریـام دەوێ. دیکتـاتۆریی حـیزبیم دەوێ یا هەر شتی دی، باشە بەقوربان ئـەوە ئـەو دۆڵـە لێرەیـە، ١٥ حـیزبی چینـی کرێکاری تێدایە، بچۆ بۆ لای یەکێك لەوانـە. لەوانەیـە زۆر زوویـش سـەرکەوی، زۆر زوویش بچیە سەرێ. بەلاّم ئەگەر لە حیزبی دێموکراتدا دەتەوێ ببی بە دێموکـرات، ناومان لە سەرە، دێموکراتیش ئـەو کەسـەیە هـەموو وەختێـك لایـەنگری ئـازادیو دێموکراسی بێت. لە هەموو شەرایەتێك هیچشتێك بەنرختر لـە ئـازادی نیـە. ئەگـەر ئازادی نەبێت ئێمە حەتتا لە داخیلی حیزبی خۆمانا ناتوانین دوو کەلیمە پێکەوە قسە بکەین لە کۆنگرەکانماندا، جا ئەو وەختە دیارە لـە پاشـاندا کـە دەسـەلاّتمان کەوتـە دەس، هەرکەس قسە بکا گوێی ببڕین وای لێ دێ، ئێمە نامانەوێ وای لێبێ.

دەمانەوێ هەر کوردێك کە ئەندامی ئەو حیزبەیە موستەقیل فیکـر بکـاو ئـازاد بێ. بتوانێ فیکر بکاتەوەو بێجگە لەوە شتی دیکەشمان دەوێو ئەویش پێوەندی ئێمـە

لەگەڵ وڵاتەکانی سۆسیالیستی. ئەویش دوو کەلیمەیە هیچ فەرقێکی نیە لەگەڵ وڵاتەکانی دیکە هەتا ئێستا لە ئێراندا دوو شێوە هەیە. یەکێ ئەوە کۆمەڵە دەڵێ هەرچی لە مۆسکۆ گوتیان ئێمە دەبێ ئەوەی بکەین، بە قەولی برادەرێکمان هەیە دەیگوت ئەوە نازانم وایە پێم بڵێن، بەڵام بە جیددی بە سەداقەتەوە پرسیاری دەکرد، دەیگوت باشە ئێستا ئەوە هی دە دەوازدە ساڵ لەوەپێشە. دەڵێ چین ٧٥٠ میلیۆنە، ... گوتم نەخێر نابێ، وابێ خۆ ئێمە ئەوەمان نابێ.

کەوابوو ئێمە نە دەمانەوەێ دوژمنایەتی لەگەڵ وڵاتەکانی سۆسیالیستی بکەین، چونکو دۆستایەتی ئەوان بە قازانجی میللەتەکەمانە، بە قازانجی دوارۆژمانە، قازانجی پێشکەوتنی کۆمەڵی ئێرانو کوردەواریی لەسەرە بۆیە دەمانەوێ دۆستییان لەگەڵ بکەینودۆستیشیانین. جا ئیدی دۆستایەتی خۆ ئەوە نیە هاوار بکەی. ٥ساڵی تەواو حیزبی توودە حیزبی دێموکراتی کوتا، ٥ ساڵی تەواو گوتی نۆکەری بەعسن، نۆکەری ئەمریکان. ٩ میلیۆن دۆلاریان وەرگرتوە نازانم چیان کردوە، بۆخۆتان دەزانن چی نەکرد؟ باشە نەیدەتوانی رادیۆ مۆسکۆ جارێ قسەی ئەوان تیکرار بکاتەوە لە سەر ئێمە، زمانی گیرابوو، بۆ نەیکرد؟ ئەو وەختە کە ئەوانیش پشتیوانی رێژیمی خومەینی بوونو حیزبی توودەش، حیزبی کومۆنیستی برادەر لە ئێراندا ئەدی بۆ نەیانکرد. کەوابوو وا نیە کە هەرچی حیزبی توودە گوتی لە مۆسکۆ بڵێن بەڵێ. عەکسەکەی راستە هەرچی لە مۆسکۆ بیڵێن توودە دەڵێ بەڵێ.

بەڵام لە عەینی وەختیشدا ئێمە نامانەوێ نۆکەر بین، لە بەینی دوژمنایەتیو نۆکەریدا دۆستایەتیمان هەڵبژاردووە. نە دەمانەوێ نۆکەر بین، نە دەمانەوێ دوژمن بین، خراپ بڕیار دەدەین، باش بڕیار دەدەین بۆخۆمان بڕیار دەدەین. ئەوە بە نەزەری من حەقی موسەلەمی خۆمانە، هێزێکی بچووکین، گەورەین، بۆخۆمان بڕیار دەدەین. چەندین ساڵە ئێستا نزیکی خەریکە دەبێتە ١٥ساڵ کە حیزبی دێموکرات هەموو بڕیارەکانی بۆخۆی دەدا. بە قسەی هیچکەس ناکا. لە خومەینیو سەدامو چەرمێکۆوە بگرە هەتا دەگاتە رەیگان. دیارە هەرکەس بڕیاری سیاسی بدا مەجبوورە وەزعی وڵاتەکەی، وەزعی حیزبەکەی، تەناسوبی ئەوانە هەمووی بخاتە بەرچاو. خۆ ناکرێ هەروا هەستم، بڕیار بدەم ئەمڕۆ لە مکزیك ئینقلاب دەکەم، خۆ بڕیار دەتوانم بدەم بەڵام هیچ ناتوانم بکەم. دەبێ بڕیارێکی وا بدەم کە بۆم جێبەجێ بێت. دەبێ

ئەوانە هەموو بخەمە بەرچاو بەلاَم بۆخۆم بڕیار بدەم، کەس لە باتی مـــن نـابێ بڕیـار بدا.

لە بەر ئـــەوە مەســەلەی سـێهەمیش ئەوەیـە رابیتــەی ئێمــە لەگـەڵ وڵاتــەکانی سۆسیالیستی چۆن بێ. رابیتەی دۆستانە، نە نۆکەر وەك حـیزبی تـوودە، نـە دوژمــن وەك کۆمەڵە. دۆستێکی سادق، دۆسـتیش ئەوەیـە کـە شـتێکی پێخـۆش بـوو بڵـێ پێمخۆشە، باشە، شتێکی پێناخۆش بوو بڵێ پێمناخۆشە. مەجبوور نیـــە، دۆسـت لـە دۆستی خۆی هەموو شتێك قبووڵ ناکا. باشە ئەمن هەرچی بڵێم لە مۆسکۆ قبووڵـــی دەکەن تا ئەوانە هەرچی بڵێن من قبووڵی بکەم. مەسەلەش ئـەوە نیـە بڵێـن چونکـە ئەوان بەهێزن، ئەمن بێهێزم. مەسەلە ئـــەوە نیـە نـەخێر لـە سـەتحی "بینالمللـی"دا مساواتە. بەلاَم ئێمە پێمان وایە کە گەورەترین دۆستی ئێمە لـــە دوارۆژدا یەکیـەتیی سۆڤیەتە، ئیتیحادی شوورەوییە. نایشـــارینەوە دۆسـتی سـتراتژیکمان ئـەوە. دەبـێ تێبکۆشین ئەو دۆستایەتییە رۆژبەرۆژ بەهێزتر بکەین، ئەگەر جاران پیسترین وەختی ئەو دۆستایەتییەمان ئێستا رۆیشتووە، ئێستا بەرەو باشتربوون چووە.

بەلاَم باشە ئایا میللەتی کورد، ئایا حیزبی دێموکرات قبووڵ دەکـــات حـەتا ئـەو دۆستە بڵێ من ئەوەت بۆ دەکەم، بە شەرتێك ئەتۆ هــەرچی ئـەمن دەڵێـم بـە قسـەم بکەی. قبووڵ ناکەین. نموونەی ئەوەیە ئەوانەی بە ئێمەیان دەگوت بەعسی، هیچیـــان ئەو ئیستیقلالە، ئەو تەسمیمگیرییەیان نیـە کـە ئێمـە هەمانـە بەرانبـەر بـە عـێراق، بەرانبەر بە حیزبی بەعس هیچیان نیانە، دیومانە بە چاوی خۆمان. ئێمە ئەو وەختـــە کە پێیان دەگوتین، ئەوانە پێیان دەگوتین بەعسی، لەگەڵ حیزبی بەعسیش رابیتـــەمان هەبووە، نەماندەشاردەوە، ئێســـتاش هەمانــەو نەشمانشـاردوەتەوەو هیـچ شـتێکیش فەرقی نەکردووە بۆ ئێمە هەر هەوین. هــەر ئـی جـارانین بـەلاَم هــەر ئـەو وەختـەش رابیتەمان هەبوو لەگەڵ یەکیەتیی نیشتمانی، خۆ ئێستا یەکیــەتیی نیشـتمانی شـەڕ ناکا لەگەڵ حیزبی بەعس، جاران شەڕی دەکرد. ساڵێ لەوەپێش خـــۆ شـەڕی دەکـرد. بەلاَم ئەوە چەندین ساڵە کە حیزبی بەعس دەزانێ کە ئێمە رابیتـــەمان هەیـە لەگـەڵ یەکیەتیی نیشتیمانی، نەشمان شاردوەتەوەو ئەوە ئیستیقلالی ئێمە دەگەیەنێ. حیزبی بەعس دەزانێ لەگەڵ یەکیەتیی نیشتیمانی پێوەندیمان هەیە، یەکیـــەتیی نیشـتیمانی دەزانێ کە لەگەڵ حیزبی بەعس پێوەندیمان هەیە، حیزبی دێموکراتیشین، نە بە قسـەی

یەکیەتیی نیشتیمانی دەکەین، نە بە قسەی بەعس دەکەین. بە قسەی حیزبی دێموکرات دەکەین، هەر بڕیارێکی بێ.

ئەگەر لێرەدا ئەوەمان ئیسبات کردوە لە موقابیل لە سەتحی "بین‌المللی"دا بووە، بەلاّم ئێمە لەگەلّ فەرانسەیش دۆستین، فەرانسەیش هیچ شتێکی گەورەی بۆ ئێمە نەکردووە بەلاّم هیچ شەرتو شرووتێکی بۆ ئێمە دانەناوە. خودای نەخاستە ئەگەر رۆژێك دای‌بنێ لێی قبوولّ ناکەین. بۆخۆمان دەبێ بڕیار بدەین کە دەی‌کەین یا نای‌کەین. ئەوە ئەساسێکە کە دە دەوازدە سالّ پێش دامان‌ناوە، ئێمە ئەو وەختە گروهێك دە دوازدە نەفەری بووین لە بەغدا دەژیاین. نە پێشمەرگەمان بوو، نە حیزبی دێموکرات ئەو حیزبی دێموکراتە بوو. یەخسیر بووین بە دەستی ئەو حیزبی بەعسەوە. رێك لە بەر دەستی ئەوان، رادیۆیەکمان هەبوو گوتیان دەبێ دژی مەلا مستەفا قسە بکەن ئێوە، بۆخۆشتان دەزانن کە مەلا مستەفا چی کردبوو لەگەلّ بەرادەرانی ئێمە، زۆر خۆشەویست نەبوو لای ئێمە، زۆریش، قسەشمان زۆر بوو لەسەری بکەین گوتمان نای‌کەین. نای‌کەین چونکو بۆخۆمان دەبێ بڕیار بدەین شتی وابکەین، بە قسەی ئێوە ناکەین. رۆژێك بڕیارمان دا ناکەین. گوتیان ئەگەر ئەوە نەبێ ناتوانن لێرە بمێننەوە، رادیۆەکەتان لیّ‌دەستێنینەوەو نازانم چیو رادیۆیان داخست، ٦مانگ رابیتەمان قەتع بوو، هەرچی توانیان فشاریان بۆ ئێمە هێنا نەچووینە ژێر بار. ئەو وەختە کە لە بەغدا بێ تفەنگ بووین، بێ ئەوەی کە یەك پێشمەرگەمان هەبێ، لە بەر دەستی ئەوان دانیشتین، دەیان‌توانی ئیعدامان بکەن، بمان‌کوژن. هەرچی شتێکیان پێیان دەکرا بەلاّم ئێمە نەچووینە ژێر بارو لەو وەختەوە سەپاندوومانە کە حیزبی دێموکرات حیزبێکی سەربەخۆیە.

کەوابوو بۆ ئێمە ئەو سێ مەسەلەیە ئەساسی‌یە: دەمانەوێ سۆسیالیزم دابمەزرێنین، دەمانەوێ سەرمایەداری رەد کەینەوە، سوسیال دێموکراسی رەد کەینەوە، نامانەوێ لە چوارچێوەی سەرمایەداری‌دا بژین، دەمانەوێ پێوەندی‌یەکانی سەرمایەداری تێك بدەین، پێوەندیی سۆسیالیستی دابمەزرێنین. دەمانەوێ بەلاّم ئەو سۆسیالیزمە سۆسیالیزمێکی دێموکراتی بێ، میللەت حەقی قسە کردنی هەبێ. ئەندامانی حیزب حەقی قسە کردنیان هەیە بەلاّم خۆ ئەوە دەلێم مەگەر لە ولاّتەکانی سۆسیالیستی‌دا حەقی قسەکردنیان نیە؟ نەخێر نیە! ئەمن بە چاوی خۆم دیومە، نیە. خۆ من

نامەویٚ، ویژدانم قبوولٚ ناکا پێتان بڵێم هەیانە، نیە. دەتوانم بە هەزاران مەساڵتان بۆ بێنم نیە. ئێمە پێمان خۆشە هەبیٚ. خۆ ئەگەر لە باری کە، ئێستا شەخسیمانەوە بیٚ مومکینە پێمان خۆش بیٚ حەقی قسەکردنتان نەبیٚ، چونکو بەڕاستی بۆخۆمان بە کەیفی خۆمان دەیلێین بەڵاٚم ئەوە نیە مەسەلەکە، مەسەلەکە دواڕۆژی میللەتەکەمانە، نەسڵی داهاتووە کە دیٚ. ئەوەیە کە دەبیٚ لە نەزەر بگیریٚو ئەوە مەسەلەی دووهەمە سۆسیالیزمێکی دێموکراتی بۆیە دەمانەویٚ.

مەسەلەی سێهەم سەربەخۆیی گەلەکەمانە. لە رابیتە لەگەلٚ دەولەتەکانی سۆسیالیستیدا، دەمانەویٚ دۆستیان بین، دوژمنایەتی لەگەلٚ ئەوان مەحکووم دەکەین. سەد جار ئەو چریکی فیدایی خەڵك، کۆمەڵە هەزار شتیان لە سەر ئێمە نووسی. ئەو رێژیمە ئێستا دەستی پیٚکردۆتەوە بۆ چوار پێنج ساڵ لەوە پێش، چوار ساڵو نیو لەوە پێش، جاران ئێمە پیاوی بەعس بووینو ئیستیکباری جیهانی (ئەمریکا) بووین، ئێستا ئەوە بووینە دیسان پیاوی سۆڤیەت، پیاوی شوورەوی.

ئەوانەمان هەموو دیوە بەڵاٚم ئێمە گورگی باران دیدەین. ئەمن کە بۆخۆم بزانم نۆکەری حیزبو میللەتەکەمم، جا هەرکەس هەرچی بڵیٚ هیچ تەئسیرێکی نیە. ئێمە سیاسەتی سەربەخۆمان دەبیٚ بەرینە پێشو ئەو سیاسەتی سەربەخۆیە زامنی دواڕۆژی میللەتەکەمانە، ناتوانین وازی لیٚبهێنین. لێرەدا ئیدی شۆخی ناکەین لەگەلٚ هیچکەس ئەوە زامنی دواڕۆژی میللەتەکەمانە، ناتوانین وازی لیٚبهێنین. ئەگەر گرووهی حەوتکەسیمان هەبوو هاتن ویستیان بە نۆکەری حیزبی توودە، شتەکەیان روون بوو هاتن گوتیان بە حیزبی توودە، کومیتەی ناوەندی، دەفتەری سیاسی حیزبی توودە، گوتمان نامانەویٚ. ئێمە حیزبی دێموکراتین، دەمانەویٚ سەربەخۆیی حیزبەکەمان بپارێزین. ئەو بەزمەیان بە سەر هێناین کە خۆتان دەزانن. بەڵاٚم ئێستا ئەوانە کیٚ بوون؟ لەکوێن ئێستا؟ هەر ناونیشانیان نەماوە. حیزبی دێموکرات لە جێگای خۆیەتی، حیزبی دێموکرات بەهێزتر بووە لە باری کەیفییەتەوە ئەفرادی وەرزیدەتری هەیە، کادری نیزامی ـ سیاسی باشتری هەیە. ئەوانیش ون بوون. ئەسڵەن بە قەوڵی کابرا گوتی بزر بوون بە یەکجاری.

باشە جا ئێمە ئەو سیاسەتە کە ئەوڕۆین بەڵاٚم ئێمە ئێستا گوناحمان نەکردوە ئەو سیاسەتەمان هێناوەتە پێش، کۆنگرەیەکیش لە سەر ئەو رێگایە دەڕوا، رێگایەکی

درووست، راست بە قازانجی میللەتەکەمان، بــە قــازانجی حیزبەکــەمان سۆســیالیزمان دەویٚ بە دڵەوە بۆی دەکۆشین، سۆســـیالیزمێکی دێموکراتیکمــان دەویٚو ســەربەخۆیی حیزبەکەمان دەویٚ.

یەك مەسەلەی دیکە کە پێمخۆش بوو باسی بکەم ئەوەیە کە بۆچی ئێســتا نــاڵێین سۆسیالیزمان دەویٚ؟ بۆ شیعاری زیددی سەرمایەداری نادەین؟ ئەوەیە کە پرســـیاریان کرد. مەسەلەکە زۆر روونە، خۆ ئێمە خۆمان نامانەویٚ لە کۆمــەڵی کــوردەواری دوور کەوینەوە، من ئێستا بێم شیعاری سۆسیالیزم بــدەم بــە قــەوڵی کۆمەڵــە کــە دەڵێــن نمایەندەی پرۆلێتاریان. لە فەرهەنگی جیهانیدا ناوێك هەیە پێی دەڵێن "بورمنشیۆ"، بورمنشیۆ کابرایەك بوو ئیسپانیایی بوو، داستانێکی زۆر خۆشی هەیە. ئەوە بوو کــە هــێزێکی زۆر کــەم لــە موقــابیلی هــێزێکی زۆر گــەورە رادەوەســتا هــەموو جــاریٚ دەیشکاند ئەوە پێی دەڵێن "بورمونشیۆیسم". ئــەوە کــە مــن بێــم بڵێــم نووێنــەری پرۆلێتاریای کوردستانم، مەگەر ئێوە خەڵکی کوردستان نین، کوا ئــەو پرۆلێتاریــا لــە کوێیە؟ چوار کرێکاری ساختمانی سنە یا مەهاباد دەبێتــە پرۆلێتاریــا؟ پرۆلێتاریــای سەنعەتی مانای خۆی هەیە. ئەما من ئەوەی نــاڵێم مــن دژی پرۆلێتاریــا نیــم، دژی بورژوازیم. ئەویش باس دەکەم لە پاشان، بەڵام دەڵێم میللەتی، کۆمەڵی مــن ئێســتا زۆر پاشکەوتووە. ئەمن ئەوەڵ هەنگاو کە دەبیٚ بتوانم بەڕاستی بچمە پێشــیٚ ئەوەیــە کە خودموختاری تەسبیت بکەم لەگەڵ دێموکراسی، دەست بکەم بە جێبەجیٚ کردنـــی بەرنامەی حیزبی دێموکراتی کوردستان، ئەو بەرنامەیە بەرنامەیــەکی پێشــکەوتووە، بەرنامەیەکی سۆسیالیستی نیە، بڵێم پاش ئەوە کە ئەو بەرنامەیەم جێبــەجیٚ کــرد ـ کە بە نەزەری من ٢٠ ساڵی دەویٚ، لە کۆنگرەی ئێمەدا یەکێك هات گوتــی کــەوابوو ئێمە بە ١٠٠ ساڵی دیکە ناگەین، دیارە ئەوە عەوامفەریبییە ـ پــاش ئــەوەی ئێمــە توانیمان ئەو بەرنامەیە جێبەجیٚ بکەین، ئەو وەختە دەست پیٚدەکــەین بــە درووســت کردنی سۆسیالیزمیش.

ئێستا وڵاتی وەك چێکۆسلۆواکی کە تا ئەو وەختە دەســتی پیٚکــرد بــە درووســت کردنی سۆسیالیزم لــە ئێســتای ئێمــە هــەر نــەبیٚ ٣٠٠ ســاڵ لــەپێش بــوو، هێشــتا نەیتوانیوە ئیدیعا بکا بە تەواوی سۆسیالیزمی درووست کردوە. هێشــتا دەڵــیٚ تــازە ئێمە خەریکین تەواوی دەکەین ئەو نەزمە. باشە ئەمن بــە شــتی خــۆم کــە نــە یــەك

کارخانەم هەیە نە سەنعەتم هەیە، نە هیچم هەیە، هــەر ئیدیعـا بکـەم سۆسـیالیزمم درووست کرد تەواو بوو. نامانــەویٚ درۆ لەگــەڵ میللــەتی خۆمــان بکــەین، ناکــەین. کەوابوو مەرحەلە بە مەرحەلە دەبیٚ بچینە پیٚشیٚ. یەکیٚك لە فیلسووفەکانی گـەورەی تاریخ شتیٚکی گەورەی گوتووە، دەڵیٚ: ئەو هیٚزە سیاســیانەی کـە بیانـەویٚ بـە سـەر مەرحەلەکاندا باز بدەن، وەزعی واقعیی وڵاتی خۆیان لە نــەزەر نـەگرن، ئەگـەر بـاز بدەن دەکەونو ئەژنۆیان دەشکیٚ. ئیٚمە نامانەویٚ بکەوینو ئەژنۆمان بشــکیٚ. دەزانــین چین، لە چ مەرحەلەیەك داین، بۆیە ئیٚستا باشە هەڵگرم تەزاهوریٚك ساز بکەین ئیٚمە، لە ئالاٚیەك "مەرگ بەر سەرمایەداری" چی‌یە لە کویٚیە ئەم سەرمایەداری‌یە؟ کیٚیــە ئەم سەرمایەدارە؟ ئەمن لە نیویۆرك دانیشتووم؟ لە شیکاگۆ دانیشتووم؟ لە تۆکیۆ لە پاریسیٚ، لە لەندەن کیٚها لەمانە؟

هەر حیزب، ئەمن ئیٚستا موبــاریزەم زیــددی ریٚژیمــە، لــە مەرحەلــەی موبــارزەی میللی دیٚموکراتیك بۆ وەرگرتنی حەقی خودموختاری، وەرم گرت ئــەو وەختــەش بـە نەزەری من سەرمایەداری دەڕوا لە لای من. بــەڵام ئیـدی نایــەڵم پیٚبگـات، نایــەڵم ئیدی، ریٚگای بۆ خــۆش ناکـەم. هـەر ئـەو خـوردە بورژوازیـەش کـە هەیـە خـوردە سەرمایەداریە ئەویش مەحکووم دەکەم. ریٚگای سۆسیالیزم دەگرم، هەرچی درووســت کەن دەبیٚ لە ریٚگای سۆسیالیستی‌یەوە بیٚت. بــەرەو سۆســیالیزم دەڕۆم. بــەڵام بــەرەو سۆسیالیزم رۆیشتن خۆ درووست کردنی سوسیالزم نیە کاکە گیــان. ئـەوە واقعبینانـە دەبیٚ تەماشا بکەین. ئەو نەسلەی ئیٚمە ـ ئەمن باسی خۆم دەکــەم، ئیٚـوە نەسـلیٚکی دیکەشتان لە پیٚشە ـ نەسلی دیٚموکراسیو خودموختاری‌یە. نەسلی ئیٚــوە مومکینــە نەسلی سۆسیالیزم بیٚت، مومکینە ئەوەش بیٚ.

لەگەڵ ئاغای بەنی‌سەدر کە رۆیی کیٚشەمان هەبوو، دەی‌گوت: "ئیٚوە ئیٚستا دەڵیٚن خودموختاری نەسلیٚکی دیکە داوای ئیستیقلال دەکا، جودا دەبیٚتەوە." گوتم یانیٚ تۆ دەتەویٚ من لە ئیٚستاوە مەسئوولی کاری نەسلی داهاتوو بم، ئەتۆ دەتوانی مەسئوولی کاری نەسلی داهاتوو بیت؟ ناتوانی! داوایەکی زۆر بیٚمانایە. وەڵا مــن پیٚـم ئاوایــە، مومکینــە نەســلی داهــاتوو نەســلی سۆســیالیزم بیٚــتو نەســلی ئیســتیقلال بیٚــت، ئیستیقلالی کوردســـتان وەرگـریٚ. ئــەمن لــە ئیٚســتاوە، ئــەمن وەزیفــەی خــۆم وەك ئینسانیٚکی سیاسی لە داخلی ئەو حیزبەدا هەتا هەم ئــەنجام دەدەم لــە پــاش منیــش

ئەوانە کە دێن ئینشائەڵا ئەوان باشتر لە ئێمەش ئەنجامی دەدەن، بەڵام مـن تـەکلیف بۆ ئەوان دیاری ناکەم. باشە ئەوانەی رابردوو تەکلیفیان بۆ ئێمە دیاری کردووە ئێمـە چ داوا بکەین، هەتا ئێمە تەکلیف بۆ ئەوانەی داهـاتوو دیـاری بکـەین. بـەڵام ئـەو نەسڵە نەسڵی خودموختاریو دێموکراسی‌یە، موبارزەش بە پەلە نابێ. برادەری وامـان هەیە ئێستا لێرە دانیشتووە ٥ ساڵی پێش کە ئەمن دەمگـوت ئـەو موبارزەیـە دوورو درێژە، درێژخایەنە، مومکینە ٢٥ ساڵی پێبچێ، مومکینە، بیسـتووتانە زۆر کـەس پێکەنینی دەهات. دیارە ئەوە واریدی شەشەمین ساڵ بووین ئەمن خودا خودامە قـەد ٧ سالیشی پێنەچێ. باشە بەڵام دەبێ ئینسان بۆ موبارزەی دوور خـۆی حـازر بکـا. ئەگەر زووتریش سەرکەوت چ باشتر خۆ زەرەری نیە.

جا من لێرەدا ئەو باسە دەکەم چونکە ئەزانم کە وەخـت کەمـە. بـەڵام بەداخـەوە نەمتوانی باسی ئیقتیسادی تێکەڵاو بکەم. جا ئەگەر فورسەت هەبوو یا ئەمشـەو یـا سبەینێ، ئەقەلەن نیوسەعاتێ ئیجازە بدەن کە باسی ئیقتیسادی تێکەڵاویش بکـەم. چونکو نەڵێن ئیقتیسادەکەمان ماس‌ماڵی کردوە. چووینە سـەر مەسـایلی سیاسـی. بەڵام پێم‌وایە لە مەسەلەی سۆسیالیزم‌دا ئەوە موهیم بوو.

***

باسی ئیمپریالزممان کرد، ئەگەر لەبیرتان مابێ. باسی ئەوەمان کرد کە ئیمپریالیزم پێنج خاسییەتی تایبەتی خۆی هەیەو گوتمان کە ئـاخر مەرحەلـەی سـەرمایەداری‌یە. ئیمپریالیزم مەرحەلەی دوایی سەرمایەداری‌یە، مانای ئەوەیە کـە پـاش ئیمپریـالیزم ئیدی سەرمایەداری نیە، پاش ئیمپریالیزم رێژیمێکی دیکە، سیستمێکی دیکـە دێتـە مەیدانێ کە ئەویش سۆسیالیزمە. کەوابوو کە باسـی سـەرمایەداری دەکـەین ئێمـە، ئیمپریالیزم بەشێکە لە سەرمایەداری، جـودا لـە سـەرمایەداری نیـە، بەشـێکە لـە سـەرمایەداری، بـەڵام ئـاخرین پلـەی سـەرمایەداری‌یە، ئـاخرین مەرحەلـەی سەرمایەداری‌یە. لە زەمانی سەرمایەداری‌دا ناتەبایی، تەزاد لە نێو سـەرمایەو کـار رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێ. ئەگەر ئەسڵەکەتان لەبیر مابێ، ئێمە گوتمـان کـە ناتـەبایی یـا تەزاددی سەرمایەداری لەوەڕا دێ کە ماوەی کارمان، کە ئەگەر ٨سەعات بێ تەقسیم کرد بە دوو بەش، بەشێکی ماوەی کاری لازمەو بەشـێکی مـاوەی کـاری زیادی‌یـە،

دیاره ماوەی کاری زیادی ئەو بەشەیە کە ئەرزشی ئـیزافی بەرهـەم دێنـێ، ئەرزشـی ئیزافی تەولید دەکا، کە ئەساسی چەوساندنەوەو ئیستیسماره لە سەرمایەداری‌دا.

مەسەلەکەش زۆر روونە هەرچی کرێکارە، هەولْ دەدا بۆ ئەوە کـە بەشـی مـاوەی کاری لازم زیاتر بکا، یانێ زیاتر وەربگرێ، هەرچی سەرمایەدارە عەکسـی ئـەوە لـە موقابیلی راوەستاوە، چونکو هەرچی لـە ماوەیـەکی کـەمتردا کرێکـار ئـەو بەشـەی تەولید بکا کە کافی‌یە بۆ تەجدیدی هێزی ئـەو، هـەرچی لـەو ماوەیـە کـەمتر بێـت ئەوەندە قازانجی زیاترە بۆ سەرمایەدارو لـە حـاڵێکدا کرێکـار دیـارە ئەگـەر ئـەوەی دابنێین کە مەسەلەن لە ماوەی ٨سەعاتاندا کـە کـار دەکـا هـەر سـەعاتێ ١٠تمـەن وەردەگرێ کە دەکاتە ٨٠تمەن، شـتێکی وازحـە ئەگـەر چـڵو چـل بـێ سـەرمایەدار تێدەکۆشێ کەمتر لە چلی بداتێ، کرێکاریش تێدەکۆشێ زیاتر لـە چلـی وەربگـرێو ئەوە ئەو تەزاددەیە کە هەتا سەرمایەداری مابێ لە بـەینی کرێکـارو سـەرمایەداردا هەیە.

ئەوە شتێك نیە کە زهنی بێت، شتێك نیە کە بۆ وێنە سەرمایەداری باش هـەبێو سەرمایەداری خراپ هەبێت، ئەوە هیچ پەیوەندیی بـەوە نیـە، ئـەوە پـەیوەندیی بـە ئەساسی سەرمایەداری‌یەوە هەیە، هەتا سەرمایەداری مابێ ئەوەش هەیـە، لـە بـەر ئەوەشە کە جاری پێشوو پێم‌وایە باسمان کرد کە گوتمان لە هێندێك ولاٚتو بە تایبـەتی لـە ئالْمـانی رۆژئـاوا پـاش شـەڕی دووهـەمی جیـهانی زۆر هـەولْ درا بـۆ ئـەوە سـەرمایەداری‌یەکی ئـەوتۆ پیـادە بکـەن کـە نێـوی بنێـن سـەرمایەداریی گـەلی، "سرمایەداری مردمی"و ئـەوە یـەکێك لـە تیئۆری‌زانـەکانی زۆر باشـی ولاٚتـەکانی سۆسیالیستی کە لە مێژە وەفاتی کردووە لە جوابی ئـەوەدا گوتـی: "سـەرمایەداریی گەلی وەکوو سەهۆڵی برژاو وایـە، ئەگـەر سـەهۆڵی برژاوتـان دیـوە سـەرمایەداریی گەلیش مومکینە، سەهۆلْ ئەگەر ببرژێ لەبەین دەچێ، سەرمایەدارییش ئەگەر بوو بە گەلی ناتوانێ وەکوو سەرمایەداری بمێنێتەوە." دیارە ئـەو ناتەبایی‌یـە دەبێتـە هـۆی لەبەین چوونی سەرمایەداری‌و چونکە ئەوە بۆخـۆی فەسـڵێکی زۆر دوورو درێـژە کـە یەکەم شۆڕشی سۆسیالیسـتیش هـەروەها کـە دەزانـن لـە رووسـیە بـووە، شۆڕشـی ئۆکتۆبرە، ئەوە پێم‌وانیە ئیدی پێویست بێ کە من زۆر لە سەری بڕۆم.

بەڵام یەك: لە تیئۆری‌دا هێندێ فەرقو جیاوازی دەرکەوت لە شۆڕشی سۆسیالیستی‌دا، ئەویش ئەوە بوو "مارکس"و "ئەنگێلس" ـ کە دیارە پایەگوزاری سۆسیالیزمی عیلمین ـ نەزەریان ئەوە بوو کە سۆسیالیزم لەو ولاّتانە سەردەکەوێ کە لە باری سەنعەتی‌یەوە، لە باری پەرەئەستاندنەوە لە هەموان لە پێشترە، نەزەریان ئاڵمان، ئینگلستان، فەرانسە، ئەمریکا تا رادەیەك ـ ئەو وەختە ئەمریکا ئەوەندە لەپێش نەبوو ـ ئەو ولاّتانە بوون، لە پاشان نەزەریان ئەوە بوو کە سۆسیالیزم دەبێ لە چەند ولاّتی پێشکەوتوودا سەرکەوێ، بەڵام عەمەڵەن سۆسیالیزم ئەوەڵەن لە یەك ولاّتدا سەرکەوت، لە پاشانیش لە ولاّتێكدا سەرکەوت کە یەکێك لە پاشکەوتووترین ولاّتەکانی سەرمایەداریی ئەو سەردەمە بوو، یانێ لە رووسیە.

دیارە ئەو وەزعە کە لە نەتیجەی شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا پێکهات، بوو بە هۆی ئەوەی کە مارکسیستەکان ئەوە روون بکەنەوە، لنین ئەوەی روون کردەوە کە لە جەرەیانی عەمەلدا دەرکەوت کە سۆسیالیزم دەبێ لەو جێگایە سەرکەوێ کە ئیمپریالیزم لە هەموو جێگایەکی دیکە زەعیفترە، نە لەو جێگایە کە سەرمایەداری لە هەمووان پێشکەوتووترە. ناتەبایی‌یەکان، تەزاددەکان لە رووسیە کۆ ببوونەوە، وەکوو ناتەبایی بەینی سەرمایەو کار، لە لایەکەوە ئەو چەوسانەوەو ئیستیسمارە کە لە رووسیە بوو لە هیچ ولاّتێکی سەرمایەداریی پێشکەوتوودا نەبوو، پاشان رووسیە ولاّتێکی دیکتاتۆری بوو، ولاّتێکی ئیمپریالیستی بوو، ولاّتێکی ئیستیبدادیو نیزامی بوو، ئەوانە هەموو تەزاددەکانیان ئەوەندە توندو تیژ کردبوو کە رووسیە بوو بە ئەو ولاّتە کە بڵێین ئەڵقەی هەرە زەعیفی سەرمایەداری بوو، ئیمپریالیزم بوو، لەوێ شۆڕشی ئۆکتۆبر سەرکەوت. چونکو شۆڕشی ئۆکتۆبر شتێکە کە زۆر دەبێ لە سەری بدوێینو باسی شتێکی دیکەیە، ئەوە نایەتە نێو ئەو دەرسەی کە ئێمە هەمانە. ئەگەر بمانەوێ خەریکی شۆڕشی ئۆکتۆبر بین دەرسی ئەسڵیمان مومکینە لەکیس بچێ، ئیقتیسادی سیاسیمان مومکینە لەکیس بچێ، جا ئەوە وا دادەنێین کە هەموومان شارەزاین لەوە کە شۆڕشی ئۆکتۆبر چۆن سەرکەوتو لە نەتیجەدا ئێستا ئێمە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبرینو پاش شۆڕشێکی سۆسیالیستیینو خەریکین سۆسیالیزم دادەمەزرێنین، خەریکین سۆسیالیزم دروست دەکەین.

جا با بزانین سۆسیالیزم چۆن پێك دێ؟ شۆڕشی سۆسیالیستی دوو فەرقی ئەساسیی هەیە لەگەڵ شۆڕشی بورژوازی کە لە فەرانسە ببوو، باسمان کرد ئەگەر لەبیرتان بێ، لە ئینگلستان بوو، لە هۆلەند بوو، یەکێکیان ئەوەیە ـ کە ئەو شۆڕشە یەعنی ئەوە فەرقی لەگەڵ هەموو شۆڕشەکانی پێشووشە ـ کە شۆڕشی سۆسیالیستی ئەساسی ئیستیسمار لەبەین دەبا، ئەساسی چەوسانەوە لەبەین دەبا، بە هۆی ئەوە دیارە شۆڕشێکی زۆر قاتعە لە تاریخی بەشەرییەتدا، لە حالێکدا شۆڕشی گەورەی فەرانسە نەتیجەی سەرکەوتنی ئەوە بوو کە فیئودالیزم رووخا، بەلاّم سەرمایەداری سەرکەوت. لە نەتیجەدا لەباتی ئیستیسماری فیئودالەکان، ئیستیسماری سەرمایەدارەکان هاتە جێی.

لە شۆڕشی سۆسیالیستیدا ئیستیسمار بە یەکجاری لەبەین دەچێ، لە جێی ئیستیسماری سەرمایەدارەکاندا ئیستیسمارێکی دیکە پەیدا نابێ، ئیستیسمار لەبەین دەچێ. ئەوە بۆ موتالیعەی درووست کردنی سۆسیالیزم زۆر موهیمە لە حالێکدا لە جەرەیانی، لە بەتنی بلێین لە زگی فیئودالیزمدا پەیوەندییەکانی سەرمایەداری درووست ببوو، بورژواشمان هەبوو، سەرمایەداریشمان هەبوو، کرێکاریشمان هەبوو، کارخانەمان هەبوو، باسمان کرد کە مانۆفاکتۆرمان هەبوو ئەگەر لە بیرتان بێ. لە سۆسیالیزمدا لە پێشدا دەبێ رووبەنای سیاسی بگۆڕدرێ لە پاشان ژێربەنای ئیقتیسادی ـ ئیجتیماعیی سۆسیالیستی پێك بێ. لە سەرمایەداریدا بەرعەکس، لەوێ لە پێشدا ژێربەنای ئیقتیسادی ـ ئیجتیماعیی سەرمایەداری پێکهاتبوو و ئەوە بوو بە هۆی ئەوە رووبەنای سیاسیی فیئودالیستی بگۆڕدرێو ببێ بە سەرمایەداری.

لە سەرمایەدارییەوە بۆ سۆسیالیزم مەسەلەکە عەکسە، لە پێشدا شۆڕشی سۆسیالیستی بۆ ئەوە دەکرێ کە دەسەلاّتی سیاسی لە دەستی سەرمایەدارەکان بێتەدەر، بچێتە دەستی زەحمەتکێشان، لە پاشان زەحمەتکێشان مەجبوورن رەوابتی ئیقتیسادیی سۆسیالیستی پێكبێنن. یەعنی ژێربەنای ئیقتیسادیو سیاسیی سۆسیالیستی پێكبێنن، چونکو فەرز دەکەین کە ئەورۆ رۆژی ٢٤ یان ٢٥ی ئۆکتۆبرە کە شۆڕش سەرکەوتووە، دیارە جارێ رەوابتی ئیقتیسادیو ئیجتیماعی نەگۆڕاوە، جارێ کارخانەکان لە دەست سەرمایەدارەکانن، جارێك زەوی لە دەست

مالکەکانەوەیە، ئەوە رووبەنای سیاسی‌یە، دەسەلاتی سیاسی‌یە کە دەی‌گۆڕێ، یەعنی کارخانەکان میللی دەکا، زەوی دابەش دەکاو زۆر شتی دیکەش. کەوابوو ئەو فەرقە زۆر موهیمە لە باری بە تایبەت درووست کردنی سۆسیالیزمەوە.

ئێمە ئەگەر ئەمڕۆ فەرزکەین دیارە لە ولاتێکی وەکو فەرانسە یان ئالمان، ئەگەر شۆڕشێکی سۆسیالیستی ببیٚو تەبەقەی کرێکار سەرکەویٚو تەبەقەی کرێکار دەسەلاتی سیاسی بە دەستەوە بگرێ، تازە مەجبوورە لە پاش ئەو شۆڕشە دەست پیٚبکا بەوەی کە ژێربەنایەکی ئیقتیسادیو ئیجتیماعی بۆ ئەو رووبەنا سیاسی‌یە دروست بکا. واتە چ بکا؟ کارخانە میللی بکاو نازانم زەوی دابەش بکا، بانکەکان میللی بکا، بیرەکان میللی بکاو زۆر شتی دیکە، ئەو فەرقە زۆر فەرقێکی موهیمە. ئەوەش لەوەڕا دێ کە هەتا رووبەنای سیاسیی شۆڕشی سۆسیالیستی کە مەبەستی لەبەین بردنی چەوسانەوە یان ئیستیسمارە، بە یەکجاری، هەتا رووبەنای سیاسی، دەسەلاتی سیاسی نەگۆڕێ، ئیمکانی لەبەین بردنی ئەو ئیستیسمارە لە واقیعدا نیە، ئەوەیە ئێستا گەیشتووینە ئەو جێگایەی کە بەڵێ چینی کرێکار شۆڕشی کردووەو دەیهەوێ سۆسیالیزم پیادە بکا.

جا پاش شۆڕشی سۆسیالیستی ئێمە تەرەفین لەگەڵ هێندێك مالکییەتی موهیم. یەکێکیان مالکییەتی گشتی‌یە: پاش ئەوەی کە شۆڕشی سۆسیالیستی سەرکەوت کارخانە گەورەکان لە پێشدا میللی دەکا. لە نەتیجەی ئەوەدا مالکییەتی عمومی بەوجوود دێ کە نەبوو یا مەسەلەن رێگای ئاسن یان مەسەلەن هێندێك شتی دیکەی بەشی ئیقتیسادی هەر لە پێشدا بە دەستی دەوڵەتەوە بوو، دەوڵەتی شۆڕشی سۆسیالیستی سەردەکەوێ دەبێتە مالکییەتی عموومی. ئەوە یەك نەوع مالکییەتە کە مالکییەتی عموومی لە پاشان دیارە پاش شۆڕش دەبێتە مالکییەتی عموومیی سۆسیالیستی. لە پاش ئەمە دیارە هێندێك رشتەی ئیقتیسادیمان هەیە، هێندێ بەشی ئیقتیسادیمان هەیە کە لەوێ عموومی کردنی وەسایلی تەولید زەحمەتە. لە پاش ئەوەی کە شۆڕشی ئۆکتۆبر سەرکەوت زۆرکەس پێشنیاریان کرد کە زەوییش میللی بکرێ، ببێتە مالکییەتی عموومی. بەلام لە پاش تەحقیقێکی عیلمی لنینو چەند کەس گەیشتنە ئەو نەتیجەیە کە ئەو میللی کردنە عەمەلی نیە، چونکو وەسایلی تەولیدئاوەر بە دەستەوە نیە کە بتوانین بە کاری بێنین. رووسیە زۆر پاشکەوتوو بوو،

زەوی‌و ئەو وەسایلە کە بەکاریان دەهێنا بۆ کێڵانــی زەوی زۆر زۆر پاشــکەوتوو بــوو، گاو ئەسپ‌و شتی وابوو کە ئەسڵەن بەوە میللی کردنــی زەوی هــەر بــە تەســەوریش‌دا نەدەهات، لە نەتیجەدا شتێکی دیکەیان هەڵبژاردو ڕێگای مالکییەتی دەستەجەمعی هاتە گۆڕێ، مالکییەتی تەعاوەنی، مالکییەتی "کۆئۆپراتیڤ"، ئــەوەی کــە دەڵێــن مالکییەتی تەعاوەنی. دیارە بە سەرکەوتنی شۆڕشی سۆسیالیستی هــەر دەســتبەجێ مالکییەتی خسووسی لەبەین ناچێ. لە زۆر کارگە، لە زۆر کارخانەی چکۆلەدا یا لــە زۆر مــەغازە لــە زۆر شــتی بڵێــین خوردەپــای ئیقتیســادی‌دا مالکییــەتی خسووســی وەسایلی تەولید دەمێنێتەوە. کەوابوو ئێمە مالکییەتی خسووسیشمان لێرە هەیە.

من جاری پێشوو باسی فەرقی مالکییەتی خسووسی‌و شەخسیم کرد، ئەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لێرە نەبوون تیکراری دەکەمەوە، مالکییەتی خسووســی مەربووتــە بــە وەسایلی تەولید لە حاڵێك‌دا مالکییەتی شەخسی مەربووتە بەو شتانەی کــە شــەخس هەیــەتی. مەســەلەن مومکینــە شــەخس ســێ ئۆتۆمۆبیلــی هــەبێ لــە وڵاتێکــی سۆسیالیستی‌دا بەڵام هی خۆی بن، بە کاریان نەهێنێت بۆ ئیستیسمار، ئــەوە حــەقی ئەوەی هەیە، ئیمکانی هەیە. بەڵام ئەگەر یەك ئۆتۆمۆبیلیشی هــەبێ کــە بــە کــاری بێنێ بۆ ئیستیسمار، حەقی ئەوەی نیە. یەك ئۆتۆمۆبیل دەتوانێ ببێتــە مالکییــەتی خسووسی ئەگەر بەکار بێ بۆ ئیستیسمار، بەکار بێ بۆ ئەوەی کەسێکی دیکە کــاری پێ‌کردو هەر ئەو ئۆتۆمۆبیلە ئەگەر ئەوەی پــێ نەکــەی دەتوانــێ ببێتــە مالکییــەتی شەخسی کە ئەتۆ هەتە، هی خۆتــە، بۆخــۆت بــەکاری دێنــی، کەســێك ئیستیســمار ناکەی.

ئێستا ئەو سێ شێوە مالکییەتە کە هەیە، دیارە سۆسیالیزم هەرچی بچێتە پێشتر ئەو مالکییەتە زیاتر دەبێ، مالکییەتی عموومیی سۆسیالیستی زیاتر پەرەدەســتێنێ هەم لە باری کەمی‌یەوە هەم لە باری کەیفی‌یــەوەو ئەوەیــە مالکییــەتی تــەعاوەنیش هەروا پەرە دەستێنێ، تــەکامۆڵ دەکــا، هــەم لــە بــاری کەیفی‌یــەوە هــەم لــە بــاری کەمی‌یەوە، مالکییەتی خسووسی ڕۆژبەڕۆژ مەحدوودتر دەبێ‌و سۆسیالیزمی تێئۆریك کە ئێمە باسی دەکەین، چونکو مارکس لە "کاپیتال"، لە کتێبی مەشهووری خۆی‌دا باسی سەرمایەداری، لە واقیعدا تەئکید دەکا سەرمایەداری لە کتێب‌دا هەیە نــە لــە واقعییەت‌دا. بۆ ئەوە تێئۆری‌یەکە روون کاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە مارکس وا دادەنێ

کە یەك تەبەقە سەرمایەداری هەیە یەك تەبەقە کرێکاریش هەیە، ئیدی کەسی دیکە نیە، سەرمایەداری سێرفە. ئەوە لە عەمەلدا وجوودی نیە، بەلاّم بـۆ روونکردنـەوەی تیئۆری موهیمە. ئەگەر ئێمەش بمانەوێ ئاوا بڕۆین دەبێ لە سۆسـیالیزمدا وا دابنێـین کە سۆسیالیزمی سەدی سـەدە، سۆسـیالیزمی سـەدی سـەدیش مانـای ئەوەیـە کـە مالکییەتی خسووسیی وەسایلی تەولید تێدا ئەسڵەن وجوودی نەبێ.

ئێستا بزانین لێرە ئەو مەسەلەیە مەسەلەیەکی زۆر گرنگەو چونکو ئەکسەرەن لـە کتێبو شتی وا باسی ناکرێ، تکاتان لێدەکەم ئێسـتا بڕێـك بـاش دیققـەت بکـەن. ئەسڵەن بۆچی ئێمە لێرە دوو مالکییەتمان، کە باسمـان کـرد دوو مالکییـەتمان هەیـە، ئایا ئەو دوو مالکییەتە مانای چیە لە سۆسیالیزمدا؟ دیارە ئەوە مانـای ئەوەیـە کـە مالکییەتی عموومی پەیوەندی بە چینی کرێکـارەوە هەیـە، مالکییـەتی تـەعاوەنی زیاتر پەیوەندیی بە جووتیارانەوە هەیە. لە واقیعدا ئێمە دوو تەبەقەمان هەیە یەعنی لە سۆسیالیزمدا، جووتیارانێك کە لە سەرمایەداریدا یەك تەبەقە نەبوون، چەند قشـر بوون لە واقیعدا، خوردە مالکی تێدا بوو، قەرەی تێدا بوو، دێهقانی متەوەستی تێـدا بوو، لێرە دەبن بە یەك تەبەقە. چونکە هەموویان فەرز دەکەین هەموویان کەلخۆزین. شیرکەتی تەعاوەنی یا مالکییەتی تەعاوەنی دەبێ یەعنی "کـەلخۆز". کـەلخۆزیش ئەسڵەن کەلیمەیەکە لەوێڕا هاتووە یەعنی مالکییەتی ئیقتیسادی دەستەجەمعی، لە موقابیلی ئەوەدا حەتا لە دێهاتیشدا سـەلخۆزمان هەیـە، ئەوەشـتان بیسـتووە کـە سەلخۆز یەعنی مالکییەتی عموومی، ئیقتیسادی عموومی.

جا ئێستا بوونی ئەو دوو تەبەقەیە لە کوێڕا هاتووە؟ بوونـی ئـەو دوو تەبەقەیـە ئەسڵەن دەبێتـە هـۆی دیـارە زۆر مەسـەلەو گـیروگرفتی موهیمـی ئیقتیسـادی لـە سۆسیالیزمدا. مەسەلەن ئەگەر ئێستا پێتان بڵێم ئەسڵەن یەکێك لە هۆیەکانی بوونـی دراو لە ئیقتیسادی سۆسیالیستیدا بوونی ئەو دووانەیە، چونکو ئەگەر فەرزکەین کـە ئەوەیان نیـە ئـەوەشمان هـەر لـەغو کـردەوە ، ئـەو وەختـە مالکییـەتی عموومیـی سۆسیالیستیمان هەیە، مالکییـەتی عموومیـی سۆسیالیسـتی ئەوەیـە کـە کرێکـار بەرهەمی دێنێ بۆ خۆشـی مـالکی هـەموو کارخانەکانـە، دیـارە ئـەو مالکییـەتی عموومیی سۆسیالیستییە مانای ئەوەیە هەرکەس بە تـاقی تـەنیا مـالکی هـەموو کارخانەکانی ولاّتە، بەلاّم هەر لەوکاتەدا مـالکی هیچیـش نیـە، ئێمـە دەبـێ لـەوە

دیققەت بکەین. هەم بە گشتی وەکو تەرەفی مالکییەت، مالکی هەموو کارخانەکانی ولاتە، بەلام مالکی هیچیش نیە چونکو فەرقی کارخانەو کەلخۆز لە ئیقتیسادی سۆسیالیستیدا لەوەدایە کە کەلخۆز ئی ئەو کەسانەیە کە لەویدا کار دەکەن یانێ مالکییەتی دەستەجەمعییە لە حالێکدا کارخانە ئی ئەو کەسانە نیە کە تێیدا کار دەکەن، کارخانە ئی هەموو خەلکی شوورەوییە لە ئەساسدا، ئی هەموو دەولەتە.

ئەو دووانە یەکێکیان کەلخۆزە، مالکییەتی دەستەجەمعییە، ئەوەی دیکەیان مالکییەتی عموومییە. ئەگەر ئەوە نەبێ دیارە مالکییەتی عموومیی سۆسیالیستی کرێکارن، بۆخۆیان تەولید دەکەنو بۆخۆشیان دەتوانن بەرهەمی خۆیان بەکار بێنن، یەعنی ئەگەر زۆر بڕۆین لێرەدا خەریدو فرۆش هیچ مانایەکی نابێت، چونکو ئەمن کە مالکی شتێکم، خۆ ئیدی شتەکە بە خۆم نافرۆشم، مومکینە نەوعێك تەوزیعو پەخش دابنێین کە عادیلانە پەخش بێ، دیارە ئەوە یەك هۆی دیکەی هەیە کە ماوە بۆ ئەوەی کە بتوانین عادیلانە یا بە کەیفی خۆمان پەخشی کەین، ئەویش تەکامولی یەکجار زۆری وەسایلی تەولیدە کە بازدەهی کار ئەوەندە زۆر بێ کە بە ئەندازەی کافی شت تەولید بکەین بۆ هەموو کەس، بەلام هەتا ئەو وەختەیش دیسانەکە خەریدو فرۆش هیچ مانایەکی نابێت، بەلام ئێستا خەریدو فرۆش مانای هەیە، چونکو هەرچی بێت ئەوە جووتیارەو ئەوە کرێکارە، ئەوە شتومەکی کارخانە بەرهەم دێنێو دەیانفرۆشێ بە جووتیاران، جووتیاران شتومەکی کەشاوەرزی بەرهەم دێننو دەیفرۆشن بە کرێکاران.

ئاوا کە لە ئیقتیساددا وەك دەزانین لە ئیقتیسادی دیارە مارکسیستیدا روونە، کەسێك کە دەچێتە بازاڕێ شتێکی زۆر تەبێعییە کە بلێین ئەوە خەریدارە، ئەوەش فروشەندەیە. دەبینین لەوێ ئەو کەسەی کە دەیهەوێ بکڕێ، حەتمەن دەیهەوێ بە هەرزان بیکڕێ، ئەو کەسەش کە دەیهەوێ بیفرۆشێ حەتمەن دەیەوێ بە گرانتری بفرۆشێ. ئەوە دیسان زیهنی نیە، ئەوە شتێکە کە ئەگەر گەیشتینە ئیقتیساد لە مەسەلەی ئەرزشدا ئەوە روون دەکەینەوە، ئەوە یەکێك لە ناتەباییيەکان، لە تەزاددەکانی داخلی ئەسلەن خودی کالایە، خودی شتومەکە کە لێرە ئاوا خۆی دەنوێنێ. بەلام ئەوە شتێکی وازیحە لە بازاڕێدا، هەرکەس دەچێتە بازاڕێ دەیهەوێ

شت هەرزانتر بکڕێ، ئـەویتریش دەیهـەوێ گرانـتر بیفرۆشـێ. جووتیـار دێتـە ئـێرە شتوومەکی کەشاوەرزیی خۆی دێنێ دەیهەوێ گرانتر بیفرۆشێ، کرێکاریش دێتە ئـێرە دەیهەوێ شتومەکی سەنعەتیی خۆی گرانتر بفرۆشێو هەرزانتر بکـڕێ، لـە نەتیجـەدا تەزادد لە بەینی ئەوانەدا هەیە.

کەوابوو لـە جامیعـەی سۆسیالیسـتیدا حـەتا ئەگـەر سۆسیالیسـتیی سـێرفیش حەسێب کەینو ئەو خسووسیاتە وەلا بنێین، بلێین ئەسڵەن نیە، دیسـانەکە لـە بـەینی ئەوانەدا تەزادد هەیە، تەزاددەکەش لە بەینی مەنافێعی دێهقانو مـەنافێعی کرێکـار دایە. بەلاّم ئەو تەزاددە لە چوارچێوەی سۆسیالیزم دایە چونکو هەر دوو مالکییەتەکە سۆسیالیستییە. ئەوە پێی دەڵێن ناتەباییەکی غەیر موتەناقیز، یەعنی ئەوە نیە کە وەکو سەرمایەدارو کرێکار بۆ ئەوە ئەو تەناقوزە لە بـەینی سـەرمایەدارو کرێکـاردا لەبەین بچێ، دەبێ سەرمایەداری لەبەین بچێ. لـێرەدا ئـەوە ئـەو تـەناقوزە ئـەوەی ناگەیەنێ چونکو ئەگەر وا دابنێین کە شـێرکەتی تـەعاوەنی کـە کـەڵخۆزە بەرەبـەرە تەکامولێ پەیدا بکا ببێتە سەڵخۆز کە دەبێتە مالکییەتی عموومی، لـە دێـهاتیشدا کەمکەم ئەو تەناقوزەش لەبەین دەچێ، بەلاّم ئەوە دیـارە ماوەیـەکی زۆری دەوێ. لـە زەمانی "خرۆشچۆف"یشدا یەکێك لە ئیشتباکانی ئـەوە بـوو کـە دەیانەویسـت کـە توندتر بەرەو ئەوە بڕۆن کە عەمەلـەن دەرکـەوت کـە زۆر زەحمەتـە، هـەتا ژێربـەنای ئیقتیسادی بە تەواوی ئامادە نەبێت تـەبدیلی کـەڵخۆزەکان بـە سـەڵخۆز زەحمەتـە. فەرقیان ئەوەیە کە دیارە لە کەڵخۆزدا کابرا ئەوەڵەن بەشێکی کرێ وەردەگرێ زۆر کەم لە چەند مانگان، لە پاشانیش بەشێکی جێنسی وەردەگرێ، گـەنم وەردەگـرێ، نـازانم میوە وەردەگرێ، لە حاڵێکدا مالکییەتی عموومـی حـەتا ئەگـەر سـەڵخۆز بـێ لـە دێهاتێکدا ئەو کاری بەوە نیـە کـە مەحسـوول چیـە، ئـەو حقـووق وەردەگـرێ وەك کرێکارێك، راست وەکوو کرێکارێك رەفتاری لەگەڵ دەکەن. لە حـاڵێك ئـی کـەڵخۆز بەستراوە بەوەی کە ئەگەر کەڵخۆز قازانجی زۆر بوو یا کەم بوو، ساڵێك قازانجی زیاترە ساڵێك کەمترە، هی سەڵخۆز وا نیە. دیارە ئەوانیش ئێستا ئەوەیان لە نـەزەر گرتـوە ئەو مەسەلەیە کە ئەگەر وا بکەن کە سەڵخۆزیەکان باشتر کارێ بکەن بۆ ئـەوەی کـە نەتیجەیەکی باشتر وەربگرن. بەلاّم لە ئەساسدا ئەوەیان {کـەڵخۆز} دەسـتەجەمعی دەمێنێتەوە، ئەوەیان {سەڵخۆز} عموومی. ئەوە ئەساسی سۆسیالیزمە.

ئێستا بزانین ئەساسی سۆسیالیزم لە باری ئیقتیسادی‌یەوە چیە؟ ئەو ئەسڵەیە کە هەمووتان حەتمەن بیستووتانە بە هەر کەس بە پێی قابلیەتی کار دەدەن، هەرکەس بە ئەندازەی کاری خۆی حقووق وەردەگرێ. ئەوە لە کومۆنیزمیش کە پلەی ئاخری سۆسیالیزمە فەرقی ئەوەیە کە لێرەدا {لە سۆسیالیزمدا} بە پێی قابلییەت کار دەدەن، بەلاّم لەوێدا {لە کومۆنیزمدا} بە پێی ئیحتیاج دەدن. لێرە ناتوانن بە پێی ئێحتیاج بدەن، ناکرێ ئەوەندە زیاد بدەن چونکە ئەوەندە زیاد نیە. دەبێ ئەوەندە زۆر بێ، ئەوەندە تەولید زۆر بێ کە بتوانن بە پێی ئێحتیاج بدەن، ئەوە ئەسڵی بلّێین سۆسیالیزمە. ئەوانەیش شتێکن کە ئەکسەرەن هەموو حەتا ئەوانەی کە رۆژێ مەسەلەن حەفتەیێ چوار جار هاتووچۆی مەیدانی حەیوانان دەکەن لە سابلاّغ ئەوانە ئەوەیان بیستووە دەزانن‌و هێندێك شتی دیکە هەیە تێدا نیە جا با باسی ئەوەی بکەم، ئەوەیە کە ئەساسەن ئیقتیسادی سۆسیالیستی لە سەر چ ئەساسێك کار دەکا. نەك چیەو هەرکەس بە پێی چی حقووق وەردەگرێ، بلّێین لە سەر چ ئەساسێك کار دەکا.

ئەویش ئەوەیە کە ئێمە لە ئیقتیسادی سۆسیالیستی‌دا لە ولاّتەکانی سۆسیالیستی‌دا لە نەزەر بگرین، دوو نەوعە هەڵسووڕانی سۆسیالیزمان بەرچاو دەکەوێ. یەکێکیان ئەوەیە کە پێی دەڵێن شێوەی هەڵسووڕانی سانترالیستی، ئەوی دیکە غەیر سانترالیستی‌یە. ئێستا روونیان دەکەینەوە سانترالیستی‌و غەیر سانترالیستی. دیارە شێوەی سۆڤیەتی، شێوەی شوورەوی کە پێکهاتوە هەم لەبەر پاشکەوتنی ولاّتەکەو هەم لەبەر وەزعی ئەو وەختە کە لە موحاسیرەی ئیقتیسادی‌دا بوو، لە باری سیاسی‌یەوە، لە باری نیزامی‌یەوە حەتا لە باری ئیقتیسادی‌یەوە، بۆتە هۆی ئەوەی کە هەم لەبەر نەبوونی کادر لە کارخانەکاندا، لە جمهووری‌یەکاندا، لە مەرکەزەوە ئیقتیسادەکە ئیدارە کراوە، پێی دەڵێن شیوەی سانترالیستی. ئەوەی کە هێندێك سەلاحییەت دەدا بە کارخانەکان ئەوە پێی دەڵێن غەیری سانترالیستی. جا با بزانین ئەو سانترالیستی‌و غەیر سانترالیستی‌یە فەرقەکەی لە کوێڕا دیاری دەکا؟ لە هەر دووکیاندا تەسمیمی ئەساسی بەرنامەڕێزی، نەخشەکێشان لە مەرکەزراپە. لە هەردووکی چ سانترالیستی بێ چ غەیر سانترالیستی بێت نەخشەی ئیقتیسادی ولاّتەکە لە مەرکەزەوە دەکێشرێ. کەوابوو لەوەدا فەرقێکیان نیە. لە هەردووکیاندا

بازاڕ هەیە، خەڵك دەچن شت دەكڕن، لەوێ تەسمیمەكە فەردییە. مەسەلەن ئەمن كارمەندم یا كارگەرم دەچمە بازاڕ پێمخۆشە لە فلاَن لا شت بكڕم، یا فلاَنشت نەكڕم، لەوێ فەردیەو لێرە مەركەزیە، لەم دووانەدا فەرقیان نیە.

نە لە مەسەلەی مەركەزیدا فەرقیان هەیە، نە لە مەسەلەی بازاڕدا فەرقیان هەیە، فەرقەكەی لە نێوەڕاست دایە. لە حاڵێكدا ئەوەی كە مەركەزییە سانترالیستییە، بونگاهە كە هەموو رەهنموودێكی، هەموو دەستوورێكی لە مەركەزەوە بۆ دەچێ، ئەوەندە دەبێ تەولید بكا، ئەو شتانە دەبێ تەولید بكا، بۆی دیاری كراوە. لە غەیر سانترالیستیدا بۆنگا بۆخۆی تەسمیم دەگرێ. تا رادەیەكی زۆر سەلاحییەتی، ئیختیاراتی هەیە، دەبێ بۆخۆی تەسمیم بگرێ چ تەولید بكا، چ تەولید نەكا.

ئێستا ئەگەر بێین‌و ولاَتەكانی سۆسیالیستی بە پێی ئەوە تەقسیم بكەین، دیارە فەرقیان هەیە، ئیوا هەیە لە نێوەڕاست دایە تا رادەیەكی زۆر، بەلاَم دەتوانین بلێین ئەوەی نموونەیەكی غەیر سانترالیستی یوگۆسلاڤییە، نموونەی سانترالیستی خودی شوورەوی، خودی شوورەوی بوو زوو، تا رادەیەكی زۆر ئێستا وەزعەكە گۆڕاوە. ئەویش دیارە گۆڕانی ژێربەنای ئیقتیسادی‌و ئیجتیماعییە كە كەم‌كەم وەزعێكی وا پێك دێنێ‌و لە بەر پەروەردە بوونی كادر كە هەم ئیمكانی ئەوە هەبێ بە شێوەیەكی غەیر سانترالیستی ئیدارە بكرێ، جمهوورییەكان‌و بۆنگاكان‌و كارخانەكان‌و هەم عەدەمی ئیمكانی ئەوە پێك دێنێ كە ئیقتیسادێكی ئاوا پان‌و بەرین لە یەك مەركەزەوە ئیدارە بكرێ. لە بەر ئەوە لە شوورەویدا هێندێ تەسمیماتی موهیم ئێستا دراوە بە بۆنگاكان، ئەوە دیارە باس دەكەین.

دیارە ئیقتیسادی سۆسیالیستی لە سەر ئەو ئەساسە هەڵدەسووڕێ كە دەوڵەت بەرنامەیەكی دادەنێ، بەرنامەڕێژی دەكا، نەخشەیەكی ٥ساڵە دادەنێ، ئێستا ئەگەر بپرسن بۆ ئەوەی كە بزانن بۆ ٥ ساڵە نە كەمتر نە زیاترە؟ چی ئەو ٥ساڵە دیاری دەكا؟ بۆ نەخشەكان ئەكسەریان ٥ ساڵەن؟ بیستووتانە ئیدی نەخشەی ئیقتیسادی ئەكسەریان ٥ ساڵەن. ئەوانەی كە لە كەشاوەرزیدا كاریان كردوە دەبێ ئەوانە تەجروبەیان هەبێ، نە مەسەلەن بۆ پكنیك چووبن، دەزانن‌و ئەكسەرەن ئەوانەكە جەوانن دەڵێن كە مەسەلەن ئەتۆ بلێی دێیەكەی كە بە ئیجارە دەدا یا زەوییەكەی

پێت دەڵێ کە مەسەلەن ئەوەندەیە سەقفی ئیجارەکەی، بەڵام پارەکە ناڵێ، ئی دوو سێ ساڵ لەوەی پێش ناڵێ، ٥ساڵی لەوەی پێش خڕ دەکا، تەقسیمی دەکا، موعەدیلەکەت پێ دەڵێ، چونکو دەبێ وابێ مەخسووسەن لە کشتوکاڵدا، چۆن ساڵێك باران زیاترە حاسڵ باشترە ساڵێك وشکەساڵە ئاو کەمە یا مەعموولەن ئافات هەیە ٥ساڵی خڕ دەکەنەوەو موعەدیلەکەی دەڵێن. بەڵام دیارە لەوە موهیمتر لە باری ئیقتیسادی‌یەوە ئەو شتە کە پێیان دەگوت چەرخشی سەرمایە، دەوەرانی سەرمایە لە سەنعەتدا ئەو دەوەرانە مەعموولەن لە دوای ٥ساڵان نەتیجە دەدا واتە ئێمە ئێستا لە کارخانەیەکدا سەرمایەگوزاریمان دەکرد، پاش ٥ساڵ نەتیجەمان وەردەگرت.

پاش ئەوەی کە نەخشەیان دانا بەپێی ئەو نەخشەیە وەزیفەکە تەقسیم دەکەن لە داخڵی شتەکاندا، لە داخڵی جمهووری‌یەکاندا، لە داخڵی شارەکاندا، لە ئەیالەتەکانداو پێیان دەڵێن هەرکەس بە پێی وەزعی خۆی چی تەولید دەکا، بکات. ئەوانە هەموو زۆر ئاسانن ئینسان دەتوانێ وا بکا مەسەلەن لە سەر کاغەزیش دایان بنێ. بەڵام ئەوەی کە لە هەمووان موهیمترە ئەوەیە هەتا ئێستاش لەگەڵ هەموو سەرکەوتنەکانی کە سۆسیالیزم هەیەتی نەیتوانیوە بە تەواوی حەللی بکات رابیتەی بەینی رشتەکانە. دەتوانین بۆ سەنعەت وەزیفە دابنێین، مەسەلەن بەرهەمی ئەوەندە بچێتە سەرێ لە ساڵدا. بەڵام دەبێ فەرز دەکەین کە ئێمە وا دادەنێین کە سەنعەت بەرهەمی ١٠٪ بچێتە سەرێ، جا من فەقەت یەك رابیتەتان بۆ باس دەکەم بۆ ئەوەی بزانن کە چەند مەربووتن پێکەوە، ١٠٪ دەڵێین سەنعەت بچێتە سەرێ، وا دابنێین کە حقووقی ئەو کەسانە کە لە سەنعەتدا کار دەکەن ١٠٪ بچێتە سەرێ مەسەلەن کرێکارانو کارمەندانی سەنعەتیو موهەندیسو ئەوانە، ئەوانیش ١٠٪ هەموو دەبێ زیاتر وەرگرن. دیارە وایان دانابوو، ئێستا من زۆر دەڵێم، هەر ١٠٪ چووە سەرێ ئەوان ١٠٪ ناچێتە سەرێ، بەڵام وا دادەنێین کە ١٠٪ بچێتە سەرێ. کە ١٠٪ چووە سەرێ ئەو خەڵکە کە لە سەنعەت کارێ دەکەن، دەتوانن ١٠٪ زیاتر شت بکڕن. ئەمە وا، جا ئەگەر لە موقابیلی ئەمەدا مەسەلەن ١٠٪ خەڵك دەتوانن هێلکە زیاتر بکڕن. ئەگەر لە موقابیلی ئەمەدا هێلکەش ١٠٪ بەرهەمی زیاتر نەبێ، نەتیجە دەگرین کە پووڵەکە دەمێنێتەوەو هێلکەش لە بازاڕ نیە. نەتیجە ئەوەیە ئەوە کە بیستووتانە کە

لە ولاٚتانی سۆسیالیستی سەف هەیە ئەوە لە واقیعدا لەوەڕا دێت. ئاسانیش نیە ئێمە دەڵێین، گوتنەکەی ئاسانە بەلاٚم جیٚبەجیٚ کردنەکەی وا ئاسان نیە.

دەبینی جارێك بۆ هێلکە سەف هەیە، جارێك بۆ مەسەلەن گۆشت هەیە، جارێك بۆ شتی دیکە هەیە، چونکە ئەو رەوابیتە ئۆرگانیکە، جاریٚ بە تەواوی حەل نەبووەو زۆر ئیشکالیش دێتە پێشیٚ. دیارە زۆرجار ئەوانەی کە کار بەدەستن لە مەسەلەن کشاوەرزیدا ئەوانە دەخەنە سەر ئەوەی کە پێی دەڵێن شەرایەتی عەینیو مامر شەرایەتی عەینییە، لە بەر ئەوە جۆکیشیان زۆر لە سەر داناوە، مەسەلەن بۆچی کەشاوەرزی شوورەوی سەرناکەویٚ مەجبوورە کە لە ئەمریکا گەنمی بکڕیٚ، دەڵیٚ چوار مانیعی گەورەی هەیە: یەکێکیان بەهارە، یەکێکیان هاوینە، یەکێکیان پاییزە، یەکێکیان زستانە!

چونکە مەسەلەن ئەوانەی کە مەسئوولن لە بیری ئەوەن کە مەسەلەن دەڵێن وەلاٚ ئیمساڵ زستان سارد بوو. مەقسەدم ئەوەیە ئەگەر مەحسوولەکە کەم بوو دەڵێن لە بیری ئەوەن کە مەسەلەن ئیمساڵ بەهارەکە وابوو. جا ئەوە بۆ جوك ئەوەیان گوتووە. بەلاٚم واقعییەت ئەوەیە کە ئێستا حەتتا ئەمە سەنعەتو کەشاوەرزیمان هەیە، بەلاٚم باش ئەوەیە بزانین کە چەند ئەوە بە ئیسلاح حەتتا لەوە ئاڵۆزترە وەزعەکە، میسالێکی دیکە بێنین.

فەرز دەکەین کە دامانناوە کە لە کەشاوەرزیدا هەموو ساڵێك بەرهەمی کەشاوەرزی ساڵیٚ ٣٪، ٤٪ بچێتە سەریٚ، ئەوانەی لە ئیقتیساد شارەزان دەزانن کە کەشاوەرزی لەوە زیاتر زۆر زەحمەتە. لە سەنعەت ١٠٪ مومکینە، بەلاٚم لە کەشاوەرزیدا زۆر زەحمەتە. بەلاٚم وا دادەنێین کە ئەوە دەچێت. باشە، ئێستا بۆ ئەوە وا بچێتە سەریٚ دەبیٚ تەقسیمی بکەین، ئەو ٣٪ە کە دامانناوە بچێتە سەریٚ بۆ سەدی یەکی ئەوەیە کە مەسەلەن زەوی تازە، زەوی بایر هەبووە پێشتر، ئەوە دەیکێڵنو لە ئەوە کەڵکی دیکە وەردەگرین. ١٪ی لەوەدایە کە مەسەلەن ماشین بەکار دێنین، کۆمباینو تراکتۆر بەکار دێنین، ماشینی کەشاوەرزی بەکار دێنین لە زەویدا، باشتری دەکێڵینو ئەوانە. ١٪یشی ئەوەیە کە کارەکە زیاتر بکەین یانیٚ کاری ئینسانی تێدا زیاد دەکەین.

جا ئێستا ئێمە بێین ئەو سەدی دووی ئەخیری باس بکەین. ئەگەر بمانـەوێ ماشـین زیاتر بێ، دەبێ تراکتۆر زیاتر بێ. ئەگەر بمانەوێ تراکتۆر وەکوو مەسـەلەن ولاتێکـی وەکوو شوورەوی گەورە تراکتۆر زیاتر بەرهەم بێنـین دەبـێ دیـارە زیاتریشـی تـەولید بکەین، مەخسووسـەن کـە ئـەم ولاتـە موحاسـرە کـراوە لـە بـاری ئیقتیسـادی‌یەوە نەی‌دەتوانی لە دەرەوە تراکتۆر وارید بکا. دیارە ئەو وارید کردنە لە دەرەوەڕا ئـەویش بۆخۆی ئیشکالێکی دیکەیە، بەو هاسانی‌یە نیە ئەگەر رێگاشـیان دابـا کـە واریـدی کردبا، دیسانەکە هەر نەی‌دەتوانی.

بەلاّم فەرزکەین کە سبەینێ لە دەرەوەڕا وارید بکا، باشە، یان لە دەرەوەڕا واریـد ناکا بۆخۆی تەولید دەکا. دەبێ ١٪ی هەموو ساڵێ تراکتـۆر زیـاتر تـەولید بکـا بـۆ ساڵێ، ئەگەر حەتتا ئەو وەختە مەسەلەن یـەك میلیـۆن تراکتـۆری تـەولید کـردووە ساڵێك دەبێ دەهەزاری دیکەش زیاتر لە جاران تەولید بکات. باشە، بابە خۆ تراکتۆر تەولید کردنەکە لێرە شەرت نیە بۆ ئـەو هـەم ئاسـنی دەوێ، موتەخەسێسـی دەوێ، کارخانەی تازەی دەوێو لە پاشانیش سووختیشـی دەوێ. سـووختی تراکتـۆری دەوێو ئەو یانێ هەر ئەو تراکتۆر زیاد کردنی تەولید کردنی تراکتـۆر مـەربووت دەبێـت بـە چەند رشتەی ئیقتیسادی‌یەوە، یان لەوە زیـاتر رانـەندەی تراکتـۆری دەوێ کـە دەبـێ تەربیەت بکرێ کەوابو موعەلیمی دەوێ بۆ ئەوەی رانەندەی تراکتۆر تەربیـەت بکـا، کەوابوو دەبێ مەدرەسە درووست بکا بۆ ئەوە کە رانەندەی تراکتۆر تەربیەت بکا، بـۆ مەدرەسە درووست کردن ئیحتیاجی هەیە بـە وەسـایلی سـاختمانی. کـەوابوو دەبـێ تولیدی سیمان زیاتر بکا بۆ ئـەوەی بتوانـێ مەدرەسـە درووسـت بکـا. هـەروا دەڕوا هەموو موشکڵە. بۆ ئەوەی کە دەبێ کە نەخشە تەرحریزی دەکەی هـەمووی پێکـەوە دابنی‌و ئاوای دابنێ چونکە ئەگەر یەك حەلقە لەوانە تێك بچێت ئەوانی دیکەش تێك دەچن.

ئێستا مومکینە ئەو پرسیارە بێتە پێـش باشـە بـۆ سـەرمایەداری ئـەوەی حـەل کردووە؟ بۆ لەوێ ئەو مەسەلەیە نایەتە پێش؟ ئەوە لەوێ فەرقەکـەی لـە یـەك شـت دایە، سەرمایەداری مقدارێکی زۆر لە هێزی ئیمکانی، لە هـێزی پشـتیوانی بـەرباد دەدا. ئەسڵەن بە خۆڕایی لە بەینی دەبات. چونکە مەسەلەن شتومەکێکی کابرایەکی ئەوتۆ تەولید دەکا کە مەسەلەن چەندین ساڵە لە بازاڕێ دەمنێنێتـەوەو ئاخرەکەشـی

بەکاری هیچ نایە، زیادی تەولید کردووەو لە پاشان لەویٚ دیارە ئەوەی کە ئێمـە پێـی دەڵێین قانوونی عەرزەو تەقازا کە لە بازاڕیٚ هەیە ئـەو تـەنزیمی دەکـا. سـەرمایەدار ئەگەر تەماشای کـرد تراکتـۆر کەمـە کارخانەیـەکی دادەنـیٚ پـتر تـەولید دەکـات، سەرمایەکەی دەبات لە تەولیدی تراکتۆردا بـە کـاری دێنـیٚ. بـەڵام ئەگـەر وا هـات دیسـان تراکتـۆر ئـەوەندە زۆر بێـت کـە قـازانج نـەکا ئـەو وەختـە سـەرمایەدار، سەرمایەکەی دەبات لە جێگایەکی دیکە بە کاری دێنیٚ.

قەوانینی عەرزەو تەقازا لە سۆسیالیزمدا نیسبەت بە وەسـایلی تـەولید وجـوودی نیە. ئەوە وەکوو چیە؟ ئێستا ئەگەر مەسەلەن مالکییەتی سۆسیالیستیو مالکییەتی دەستەجەمعی بە مالکییەتی عموومی شتەکانی خۆی، شتی خۆیان دەبەنـە بـازاڕیٚو لەوێش بە ئەفرادی دەفرۆشن. وەسایلی تەولید لە واقیعدا تەنیاو تەنیا لە بەینی ئـەو دوانە هەیە: "مالکییەتی عموومی"و "مالکییەتی دەستەجەمعی". یانیٚ هیچکەس لە ولاتێکی سۆسیالیستیدا، ئەگەر سۆسیالیستی تەواو بیٚ، ئەڵبەتە بە تیئۆری فەرز ئەکەین تەواوە، تراکتۆر بە هیچکەسێك نافرۆشیٚ. تەنیا ئەیفرۆشیٚ بە کـەڵخۆزی، بـە سەڵخۆزی. جا کەوابوو ئەو مەسایلی تەولید تەنیا لـە بـەینی خـودی بونگاهـەکانی سۆسیالیستیدا ئاڵوگۆڕ دەکـریٚ. بۆنگایـەکی سۆسیالیسـتی دەیدا بـە بۆنگایـەکی دیکەو عەمەلەن ئێستا بۆخۆی باسو کێشەیەکی زۆر گەورەیە کە ئایا قـەد قیمـەتی هەیە یا هـەر ئـاڵوگۆڕ دەکـریٚ. بـازاڕی ئـازادیش هـەیبوو عەمەلـەنیش قیمـەتێك پێكنایەو ئەوە ئیشکاڵی کارەکە لەوەی دایە.

لە نەتیجەدا حەتتا جارجـار ئەرزشەکەشـی بـە تـەواوی حەسـێب نـاکریٚو دەبـیٚ حەسێب بکریٚ کە بازاڕی عەرزەو تەقازا نەبوو، ئەرزشی بە تەواوی حەسـێب نـاکریٚ. نەبوونی عەرزەو تەقازا لە بازاڕی سۆسیالیستیداو نەبوونی بازاڕ بەو شێوەیە کـە لـە ولاتی سەرمایەداریدا هەیە، نەتیجەی ئەوەیە کە لە ولاتی سۆسیالیسـتیدا زۆرجـار دەبینی کونێك پەیدا دەبیٚ یا شتێك تێكدەچیٚ، ئەڵقەیەك تێكدەچیٚ کە زۆر ئەڵقـەی دیکەش تێك دەدا. هەرچی ئیمکانی تەرحڕیزی بەرنامەکە کـامڵتر بێـتو هـەرچی واقعییەتەکە باشتر لە نەزەر بگیریٚ، ئەوەندە ئیمکانی ئەو ڕێی ئینحیرافە کەمترە. بە پـەیداکردنی مەسـەلەن کـامپیوتێر ئێسـتا زۆر لـەو مەسـایلەیان حـەل کـردووە یـا بەکارهێنانی "سایبرنێتیك" کە زۆر کاری هاسان کردووە.

تەماشا بکە ئێستا یەکێك لەو مەسائیلەی کە لە تەرحڕیزیدا موهیمە ئینتیخابی جێگایە. فەرز دەکەین ئێمە دەمانەوێ لە مەهاباد ئەوڕۆ لە جێگایەك کارخانەیەکی سیمان درووست کەین، دەبێ زۆرشت لە نەزەر بگرین بۆ ئەوەی ئەو کارخانەی سیمانە لە ئەوەی کە پێی دەڵێن "ئۆپتیمۆم" بێ، یەعنی باشترین کارخانەی مومکین لە ئەو جێگایە کە هەڵیدەبژێرین باشترین جێگای مومکین بێ. دەبێ لە نەزەر بگرین کە ئایا ڕێگایەك هەیە بۆ شارێ، ڕێگای هەیە بۆ دەرەوە کە ئەگەر سیمانەکەمان تەولید کرد بیبەینە دەرێ، زۆر جار هەڵکەوتووە (مومکینە پێبکەنن) کە نمایەندگانی وڵاتەکانی سۆسیالیستی لە وڵاتی پاشکەوتوو کارخانەیان درووست کردووە بێ ئەوەی کە لە نەزەر بگرن کە مەسەلەن ئایا ڕێگای هەیە بۆ ئەوە مەسەلەن ئەو شتومەکە ببەن بۆ جێگایەکی دیکە، کارخانەکە درووست کراوەو پاشان ماوە، لە پاشان تازە دەستیان کردوە بە درووست کردنی ڕێگا. چونکە لە نەزەریان نەگرت. لە پاشان ڕێگا هەیە، ئایا نیروی کاری هەیە؟ نزیکترە؟ دەبینی کە یەکێك لە بەینی ئەو دووانەدا دانەی ئەوەڵی ئینتیخاب کرد. ئایا ئەو جێگایە لە نەزەر بگرێ کە نزیکە بۆ ڕێگا یا ئەو جێگایە کە نیروی کاری هەبێ؟ کێهەیان باشترە؟ ئەوە خۆی مەسەلەیەکە ئەو کاتە جێگاکە نا نیروی کار؟ لە پاشان لەوەی موهیمتر مەوادی خامەکەی لە کوێڕا دێنن؟ هەر لەو جێگایە کارخانەکە دابنین کە مەوادی خامی لێ نزیکە یا نیرووی کار؟ یا لە نێوەڕاست دایبنین. جا ئەو وەختە مومکینە ڕێگا درووست بکرێ؟ ئەوە ئێستا کامپیوتێرو سایبرنێتیك ئەوە جوانترو زۆر بە ئاسانی، جاران ئەبوایە دە، پانزدە کەس دابنێن چەندین ڕۆژ خەریك بن هەتا ئەوەی پێی دەڵێن "ئۆپتیمۆم"ەکە بیبیننەوە، بەڵام ئەو ئێستا ئیدی تا ڕادەیەکی زۆر کامپیوتێرو سایبرنێتیك، ئەگەر تۆ بەرنامەکەی جوان یەعنی حازر بکەی، بیاندەیەی، ئەوان بۆخۆیان جوابی دەقیقت دەدەنەوە. یانێ ئەوە زۆر دیارە، زۆر چوەتە پێش، زۆر شتیشی حەل کردووە، بەڵام دیسانەکە زۆری ماوە. لە پاشان یەك شتی دیکەش دەبێ بگوترێ بە قازانجی سۆسیالیزمە، ئەویش ئەوەیە کە، سەرمایەداری ١٥٠ ساڵە هەیە بەڵام دیسان تووشی هەزاران بوحرانو کێشە دەبێ، بەڵام سۆسیالیزم تەجروبەی کەمە، تەجروبەشی لە یەك وڵاتدا بووە زیاتر، ئێستاش لە چەند وڵاتی دیکەشدا خەریکە تەجروبەی دەست دەکەوێ، جا دیارە ئەوە ماوەیەکی زۆر مومکینە قەڕنێکی بوێ، سەد ساڵێکی بوێ

بۆ ئەوەی کە جێگـای خـۆی، جێـی خـۆی بگرێتـەوەو ئۆسـوولّی خـۆی بـە تـەواوی دابمەزرێنیّ، هەتا ئێستا بە تەواوی دانەمەزراوە.

ئێستا بەلاّم یەك مەسەلەی ئەساسی دێتە پێـش، یـەکێك هـاتوو پرسـیاری کـرد فەرقی سەرمایەداریو سۆسیالیزم چیە؟ جواب بزانە دەبێتە چـی؟ دیـارە ئـەو جوابـە نابێت کە یەکێکیان لە یەکێکیان پرسی گوتی فەرقی ئەوەیە کە لـە سـەرمایەداریدا ئیستیسماری ئینسان لە ئینسان هەیە لە حالّێکدا لە سۆسیالیزمدا بەرعەکسە، ئـەوە جۆکە، ئەوە هیچ. بەلاّم لە ئەساسا فەرقێکی لە هەڵسووڕاندنی سەرمایەداریدا دیارە گوتمـان لـەویّ ئیستیسـمار هەیـە لـەویّ نیـە، بـەلاّم لـە مەسـەلەی هەڵسـووڕانی سەرمایەداریو سۆسیالیزمدا فەرقی ئەساسـی هەیـە لـە دوو مەقوولەیـە: بەرنامـەو بازاڕە کە لە هەر دوو ئیقتیسادەکەدا هەیە فەرقی ئەوەیە کە لە حالّێکدا کە ئـەوەی کە دەگوترا لە سەرمایەداریدا ئەوە بـازاڕە کـە ئیقتیسـادەکە تـەنزیم دەکـا، بـازاڕ ئاوێنـەی ئیقتیسـادەکەیە، لـە ئیقتیسـادی سۆسیالیسـتیدا ئـەوە بەرنامەیـە کـە ئیقتیسادەکە تەنزیم دەکا، لە ئیقتیسادی سۆسیالیستیدا بازاڕ تابیعی بەرنامەیە، لە ئیقتیسادی سەرمایەداریدا بەرنامە تابیعی بازاڕەو ئەوە ئەساسی فەرقەکەیەتی.

دیارە ئێمە ئێستا باسمان لـە سـەرمایەداری مودێڕنـی ئێسـتایە، سـەرمایەداری کلاسیکی زەمانی مارکس، بەرنامەی تێدا نەبووە ئەوە بێ بەرنامە بووە، بـەلاّم هـی ئێستا باس دەکەین کە بەرنامەی هەیـە. لـە ئیقتیسـادی سـەرمایەداریدا بەرنامـە تابیعی بازاڕە لە حالّێکدا لە ئیقتیسادی سۆسیالیستیدا بازاڕ تابیعی بەرنامەیە ئەوە شتێکی وازیحە، چونکو سود لە سەرمایەداریدا لـە بـازاڕ دیـاری دەکـریو ئەساسـی ئیقتیسادەکە سوودپەرستییە. لە حالّێکدا ئیقتیسادی سۆسیالیستی ئەساسەکەی بـۆ ئەوەیە کە ئیقتیسادەکە پێشڕەفت بکا لە سەر رووی بەرنامەیەك. ئەوە هیـچ ئەسـلّی مەسەلەکە ناگۆڕیّ کە لە فلاّن رشتەی ئیقتیسادیدا سۆسـیالیزم بـە تـەناقوز بچێتـە پێـشو سـەرمایەداری باشـترە، ئـەوە ئەسـلّی مەسـەلەکە ناگەیـەنیّ، ئـەوە ئـەوەی دەگەیەنیّ کە سۆسیالیزم جاریّ هەروا بە تاقیکردن جاریّ نەیتوانیوە بـەو جـۆرە کـە پێویستە رێگای خۆی خۆش بکا. بەلاّم دیارە ئەوە یەکێك لە هۆیەکانیشی ئەوەیە کە سۆسیالیزم لە پێشدا لە ولاّتێکی سەرکەوت کە عەکسی، بە پێچەوانـەی پێشـبینیی مارکسو ئەنگێلس، یەکێك لە پاشکەوتووترین ولاّتەکانی سەرمایەدارییە. ئەگەر لە

ولاٚتێکی پێشکەوتووی تەواودا سەرکەوتبا مومکین بوو ئێستا سۆسیالیزم نموونەیەکی دیکە بداتە دەست.

لە سەر ئەو ئەساسە، کەوابوو باسی سیستمی سۆسیالیستی دەکەین، یانیٚ سیستمی ئیقتیسادیی سۆسیالیستی کە رەوابتی تەولیدیی سۆسیالیستیی تێدا سەرکەوتووە، ئەوە بە هێندێك ئۆسوولْی زۆر کورت دەتوانین خولاسەی بکەینەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە دیارە چەوساندنەوە، ئیستیسمار نەماوە، وەسایلی تەولید بە گشتی یان مالکییەتی عموومی‌یە یان مالکییەتی دەستەجەمعی‌یە. ئەوە مانای ئەوە نیە کە لە سۆسیالیزمدا عەمەلەن، مالکییەتی خسووسی نیە، لە ماوەیەکی زۆر کە پێی دەلْێن دەورانی تێپەڕبوون، سەردەمی تێپەڕبوون، لەو ماوەیەدا دیارە مالکییەتی خسووسیش هەیەو ئێستاش مومکینە مابیٚ ئەوی دیکە مالکییەتی شەخسی‌یە، دیارە مالکییەتی خسووسی لە سۆسیالیزمی پێشکەوتووی سۆڤیەتیی ئێستا لە یەك شتدا هەر ماوە، مالکییەتی خسووسی ئەویش ئەوەیە کە لە دێهات هەر یەك لەوانە کە لە کەلْخۆزێك کار دەکەن بێجگە لەوە لە دەورو بەری مالْی خۆیدا مەعموولەن نیو هێکتار یان هێکتارێکی زەوی هەیە، کە بۆخۆی شتی بۆخۆی دەچێنیٚ، مەسەلەن فەرزکە وەکو نازانم میوەو ئەوانەو حەقی ئەوەشی هەیە کە بیانفرۆشیٚ.

کەوابوو لەویٚدا مالکییەتی خسووسی هەر ماوە یانی چ لەویٚ کە لە دەوروبەری مالْی خۆیدا لە هەر کەلْخۆزێکدا بێجگە ئەوە کە شتەکە دەستەجەمعی‌یە، زەوی‌یەکانو هەموو لەویٚ کار دەکەنو نەتیجەکە هی هەمووانە لە بەینی هەموویانا دابەش دەکریٚ، بێجگە لەوە بۆخۆی پارچە زەوی‌یەکی چکۆلْەی هەیە کە لەویٚدا بۆخۆی میوەو سەوزیو شتی وا بار دێنیٚ کە ئەوە نەتیجەکە هی خۆیەتیو حەقی ئەوەشی هەیە بیفرۆشیٚ.

بەلْیٚ ئەوە بە عینوانی ئەوەیە کە حەق نیە مەسەلەن کابرایەك کە لە دێهاتی دەژی مەسەلەن بچیٚ پیوازی بکڕیٚ. حەقی ئەوەی هەیە پیوازەکەی ببیٚ یا ئەگەر بۆخۆی نایەویٚ پیوازەکە مەسەلەن هەمووی بخوا یا بەشێکی بفرۆشیٚ یا ئەوە، ئەوە ئیدی حەقی موسەللەمی خۆیەتی. قانوونیش هەموو حەقێکی لیٚ زەوت ناکا. بەلْیٚ ئەوەش هەیە دیارە ئیدی، بەلاٚم ئایا لە واقێعیشدا ئەوەیە؟ ئێستا مەسەلەی ئەساسەن پێکهێنانی کەلْخۆز بۆخۆی مەسەلەیەکی زۆر "پیچیدە"یە. لە زەمانی

ئێستالینڕدا هەر چەند بەگوتن یانیٚ بە قسە دەگوترا کە هەرکەس کە داخڵی کەڵخۆز دەبیٚ، دەبیٚ داوتەڵەبانە بیٚ، دەبیٚ بۆخۆی داوا بکا. ئەویش ئەوە بوو کە شتەکە یانی تیئۆرییەکە بەو جۆرە بوو کە بڵێین کابرایەکی جووتیار، لێرە زەویی هەیە، هی خۆی کەڵخۆزێکیش لێرە، دەبوایە کەڵخۆزەکە لە باری ئیقتیسادییەوە ئەوەندە باش هەڵسووڕیٚ کە داهاتی هەر یەك لەوانە کە لە کەڵخۆزی کار دەکەن زیاتر بیٚ لە داهاتی فەردیی ئەو کەسە، بۆ ئەوە، ئەوە داوتەڵەبانە دێم بۆ لاتان، من بۆخۆم ئیدی خەریك نابم دێم لەگەڵتان دەکەوم.

بەڵاٚم عەمەلەن وانەبوو. بە دوو عیللەت وانەبوو. یەکێکیان ژێربەنای ئیقتیسادیو ئیجتیماعی ئەوەندە بە قووەت نەبوو لە وڵاتی سۆسیالیستیدا. لە شوورەوی ئەو وەختەدا کە لە ساڵی ١٩٤٩ عەوەز کرا، ماشینی کەشاوەرزیو تراکتۆرو کۆمباینو ئەوانەی یەکجار زۆر کەم بوو، لە نەتیجەدا دیارە نەیاندەتوانی زیاتر تەولید بکەن، ئەوەندە کە کابرا نەفعی تێدا هەبوو. یەك شتی دیکەش هەبوو ئەویش مەسەلەی سوننەتو پراکتیکە. چۆنە، کابرا ماوەیەکی زۆر کە لەویٚ پووڵ بخوا، حەتتا ئەگەر دەبینن ئێستەش یانیٚ کەڵخۆزیش داهاتەکەی زیاتر بووبیٚ نەدەچوو. دەیگوت زەوی خۆمەو بۆ خۆمە زەوی، یانی بە شتێکی، بە چاوێکی غەیری ئیعتیمادەوە تەماشای کەڵخۆزەکەی دەکرد ئەوە شتێکی تەبیعییە، ئەوەشی تێدا بوو کە ئۆسووڵەن کە هەتا زەوییەکە هی خۆی بوو زیاتر کاری تێدا دەکرد. یانیٚ حەتتا مەسەلەن ماڵو منداڵی خۆی مەجبوور دەکرد کە هەموویان بچن لە زەویدا کار بکەنو لە نەتیجەدا کارێکی زۆر لە هێکتارێکی کەمو بەرهەمێکی زیاتر دەبوو.

لە واقیعدا ئەوە بۆ ئێمە دەرسێکیشە، مەسەلەن لەو تەحلیلەی کە لە ئیقتیسادی ئێرانو کوردستان وای کردووە من بۆخۆم گەیشتمە ئەو نەتیجەیە کە لە ماوەی تێپەڕبووندا بۆ ئێمە ئەو شتە کە پێی دەڵێین ئیقتیسادی خانەوادەگی زۆر ئەهەمییەتی هەیە بۆ ئەوە کە ئەوە تەولیدی، بەرهەمی کەشاوەرزی، کشتوکاڵی نەهێنێتە خواریٚ، نزم نەبێتەوە باشترین ڕێگا ئەوەیە کە بۆ ماوەیەکی هەتا ئەو وەختە کە لە باری ماشینو کۆمباینو تراکتۆرەوەو لە باری کادرەوە خەڵك تەربیەت دەکەینو کەڵخۆزەکان ئەوەندە بەرهەمیان زۆر دەبیٚ کە خەڵك داوتەڵەبانە بێت داخڵ بیٚ، هەتا ئەو وەختە ئیقتیسادی خانەوادەگی یانیٚ خانەوادەکە وای لیٚبکەی کە

عەرزێکی بویَ نازانم چەند هێکتاری بۆخۆی بیکێڵێ بەلاّم بە کەیفی خۆی هەموو خانەوادەکە تێدا کار بکا زۆر قازانجی هەیە. هەم بەرهەمەکە دەچێتە سەرێ هەم بێکاری زۆر کەم دەبیّ. چونکە ئەوەش تەسەور بکەین ئێستا مەسەلەن دێیەکی کوردستان کە لەویّ کاری دەستییە، یەك دوو تراکتۆر بەریە ویّ، مانای ئەوەیە کە نیوەی خەڵکەکە بێکار دەبیّ. یانیّ ئەوەی یا دوو ماشینی کەشاوەرزی دیکە بەرین نیوەی خەڵکەکە بێکار دەکەین.

ئەوە دیارە بۆ ماوەی تێپەڕبوون، بۆ ماوەی گوزار بۆ ئەو مەرحەلەیە زۆر موهیمە بەلاّم لەو وەختەدا شتێکی دیکە پێکهات بەداخەوە ئەوەش ئەوە بوو زەمانی دیارە سەرەتای دیکتاتۆریی ئێستالین بووکە بە زۆر خەڵکیان وادار دەکرد بۆ کارەکە، جا ئەوە ئیسلاحێك پەیدا بوو کە حەتا نە لە دەرسی خۆمان لە ولاّتی سۆسیالیستی بە کارمان دەهێنا، فشە ناکەم، باوەڕ کە بە کارمان دەهێنا بەلاّم بە زۆر، کەڵخۆزەکان، جووتیارەکانیان وادار دەکرد کە داوتەڵەبانە واریدی کەڵخۆز بن! بە زۆر واداریان دەکرد کە داوتەڵەبانە واریدی کەڵخۆز بن! ئەوە عەمەلەن وابوو ئەوە نەتیجەیەکی زۆر خراپی هەبوو. چونکو شتی، لەوازمی ئیقتیسادی بە تەواوی ئامادە نەبوو، ئەوە عەینی وەکوو ئەوەیە کە لە مەسەلەن دوو، لە شاری کە ئەوە ئێمە بڵێین ئەوە مەغازەیەکی گەورەیە ئەویش مەغازەیەکی بچکۆڵەیە مالکییەتی خسووسییە، باشە شێوەی لەنێو بردنی ئەو مەغازە بچکۆڵەیە چیە؟ شێوەی ئەوەیە کە تۆ بێنی ساحیبەکەی بگری، وەدەری نێی دووکانەکەی موسادرە بکەی؟ یا ئەوەیە کە ئەو موغازە گەورەیە ئەوەندە باش کار بکا، ئەوەندە هەرزانترو باشتر بفرۆشیّ کە ئەو مەجبوور دەبیّ بڵێ ئەمن دەبم بە کارمەندی ئەو موغازەیە دووکانەکەم دەفرۆشم، کێهایان؟ ئەوە ئەوەیە ئیدی یانیّ چی؟

یانیّ دەبیّ بە ئیقدامی ئیقتیسادی مەسەلە حەل بکەی نە بە ئیقدامی ئیداری تەسمیم بگری کابرا حەبس بکەی. کە دەبیّ حەددێك بۆ ئەوە دابنێین، کە دەبیّ بە شێوەی سانترالیزم یەك یا چەند، لە سەر یەك نەتیجەکە دیارە مەنفی بووە، نەتیجەکە بە داخەوە مەنفی بووە، ئێستاش کە ئێستایە دەبینین لە کشتوکاڵی شوورەویدا ئیشکالاّت زۆرە ئی ئەو وەختەیە. چونکە ئەساسەکەیان غەڵەتە، ئێستاش نەیانتوانیوە بە تەواوی ئاساری ئەو جەرەیانە لەبەین بەرن. لە حاڵێکدا ئێوە خۆتان

دەزانن مەسەلەن ئۆكراين مەشهوور بوو بەوەی کە گەنمی دونیا دەدات، وەك چۆنە ئێستا شووروەوی بەرهەمی ئیقتیسادیی هێندە دەڕوا، دیارە ئەوە دوو دەلیلی بخسووسی هەیە کە دەبێ بە حەق بگوترێ، یەکێکیان ئەوەیە کە خەڵك سەتحی ژیانی چوەتە سەرێ، زۆر زیاتر شت یەعنی مەسرەف دەکا، یەکێ دیکەشیان جەمعییەتی زۆرتر بووە. هەردووکی ئەوە هەیە بەڵام بە پێی ئەو نیسبەتە دیارە تەولید تا ئێستا بازرگانی شوورەوی دەبێ تەحەمولی ئەوە بکا کە زۆر شت بفرۆشێ بۆ ئەوەی بتوانێ کە ئەو گەنمە کە کەمە لە دەرەوەڕا بکڕێ، لە حاڵێکدا چونکو وڵاتەکە پانو بەرینە، ئیقتیسادەکە باشتر لە کەشاوەرزیدا ئیدارە بکرێ دەتوانێ ئەو مەسەلەیە حەل بکاو زۆریش توول نەکێشێ، بەڵام چونکە لە ئەساسەوە، ئەساسەکە تێکدراوە مەسەلەن لە ساڵی ١٩٢٩ ئەوەندە کە ئێستا ئامار دراوە چەندین میلیۆن حەیوانیان کوشتووەو خستوەتە ژێر زەوی، عیللەتەکەشی ئەوە بوو هیچ قازانجی نەبوو بۆ ئەو بازرگانە. دەهاتن ئەوانە کە بە ناوی دەوڵەتەوە لێیان داگیر دەکردن کابرا دەیگوت؛ جا ئەو دەزانن حەیوانیش خۆ ئەوە نیە، خۆ مەسەلەن گۆرەوی نیە کارخانە تەولیدی بکا. ساڵەهای ساڵ وەخت لازمە کە دیسانەکە ئەو شتە ئەو میقدارە مەسەلەن ببێت. بە تایبەتی کە شەڕی دووهەمی جیهانیشی بە سەردا هات، بەشێکی زۆری شوورەوی کەوتە ژێر ئەشغاڵی فاشیستەکانو ئەوانیش هەرچی شت بوو بردیان بە گەنمو بە حەیوانو بە هەموو شتێکەوە. ئەوە ئەو دوو عیللەتە بۆتە هۆی ئەوە کە هەتا ئێستاش نەیانتوانیوە ئاساری ئەو ئیشکالاتە لەبەین بەرنو دیارە ئەوە پێموابێ وەختێکی دیکەشی هەر دەوێ، چەند ساڵێکی دیکەشی هەر دەوێو شایەد هەتا ساڵی ٩٥ بتوانن ئەو مەسەلەیە بە یەکجاری لە شوورەویدا حەل بکەن. بەوە کە تەجروبەیان زیاتر بێ لە کاروباری کشاوەرزی، ئاگا بە عیلمو موتەخەسێسی کەشاوەرزیو ئەوانە ئەوەندە زۆرە کە بە نیسبەتی عەرزەکەش هەتا لە زۆر وڵاتی دیکە زیاترە، فەقەت دیارە جارێ ئەو رەوابتی ئیقتیسادی کەشاوەرزیە جێی خۆی هەر نەگرتووە، یانێ ئەو تەئسیرە کە ئەو وەختە کراوە ئێستاش هەر ئاساری ماوە.

# ئابووریی تێکەڵاو

ئێمە باسی ئابووریی سۆسیالیستیمان کرد، باسی ئابووریی سەرمایەداریمان کرد. باسی ئابووریی تێکەڵاو بۆ ئەوە دەکەین کە زۆر لەو وڵاتانە وەکو وڵاتی خۆمان کە پێیان دەڵێن وڵاتی جیهانی سێهەم، زۆر جار بووە شۆڕشێك پێكهاتووە لەو وڵاتانە وەزعەکە گۆڕاوە. بەڵام مەعلووم نەبووە کە ئەو وڵاتە بە کوێدا بە چ ڕێگایەکدا دەڕوا، بەرەو چ سیستمێك دەڕوا. مەسەلەن ئەلان خۆمان بە چاوی خۆمان دیتمان کە پاش ئەوە کە شۆڕشی ئێران سەرکەوت، جارێ دەرنەکەوتبوو ڕێژیمی جمهووریی ئیسلامی چی دەوێ، دەیەوێ چی بکات. نەماندەزانی ئەو ڕێژیمە بەرەو کوێ دەڕوا، بەرەو سۆسیالیزم دەڕوا لە باری ئیقتیسادییەوە، ئایا بەرەو سەرمایەداری دەڕوا.

دیارە ئەوە زیاتر دەگەڕێتەوە سەر دەسەڵاتی سیاسی. دەسەڵاتی سیاسی بەدەس هەرکەسەوە بێت ئەگەر لایەنگری سۆسیالیزم بێ، بەرەو سۆسیالیزمی دەبا پاش ئەوە شۆڕشەکە سەرکەوت. ئەگەر بە دەست ئەو کەسانەوە بێ کە پێیان خۆش بێ سەرمایەداری سەرکەوێ بەرەو سەرمایەداریی دەبەن. لە ماوەی پاش شەڕی دووهەمی جیهانیدا تا حاڵی ئێستا تەقریبەن دەکاتە ٤٠ ساڵ، لەو ٤٠ ساڵەدا بە دەیان شۆڕشی ئاوا لە وڵاتەکانی جیهانی سێهەمدا پێكهاتووە، بەڵام زۆر کەمیان بەرەو سۆسیالیزم ڕۆیشتوون، زۆربەیان بەرەو سەرمایەداری ڕۆیشتوون.

دیارە ئەوەڵەن ئەو وڵاتانە ئەگەر بەعزێکیان ویستوویانە لە باری ئیقتیسادییەوە ڕێگای خۆیان جودا کەنەوە لە سەرمایەداری؛ لە نێو سیستمی سەرمایەداریدان، یانێ

ئێستا ئێمە گوتمان وڵاتەکانی سۆسیالیستی هەن، دوێنێ باسمان کرد لە پاشان وڵاتەکانی سەرمایەداریمان ناو برد، بەڵام گوتمان ئەوی دیکە جیهانی سێهەمە. بەڵام ئەو جیهانی سێهەمە بۆخۆی بەشێکە لە سیستمی سەرمایەداری. یانێ ئەوە سیستمی سەرمایەداری‌یە کە لەو بەشەدا حاکمییەتی هەیە. کەوابوو ئەوە بۆخۆی شتێکی موهیمە، مانعێکی موهیمە. دەوڵەتێك لێرە مەسەلەن فەرز دەکەین ئێستا نیکاراگوئە لە نزیك ئەمریکا خەریکە رێگای سۆسیالیستی بگرێتە پێش، بەڵام هەزار تەنگو چەڵەمەی لە پێشە، چونکو لە نێو سیستمی سەرمایەداری دایە بۆ ئەو زەحمەتە. لە حاڵێكدا ئەگەر لەوێدا با دیارە ئاسانتر دەبوو و هەروەها کووبا هەتا گەیشتە ئەو رادەیەی خۆی تەسبیت بکا بە وڵاتێکی سۆسیالیستی زۆری پێچوو، بەڵام توانی خۆی تەسبیت بکا چونکو ئەویش لە سیستمی سەرمایەداری‌دا بوو.

بەڵام بە گشتی مەسەلەکە وای لێدێ کە لەو وڵاتانەدا پاش ئەوە کە شۆڕش سەردەکەوێ تووشی ئەو سێ رشتە ئابوورییە دەبین. یەکێکیان سەرمایەداری‌یە. مەعموولەن لەو وڵاتانەدا کارخانە هەیە، کارگا هەیە کە بە دەس سەرمایەدارانەوە ئیدارە دەکرێ، پاش ئەوە کە شۆڕشەکە سەردەکەوێ دیارە رشتەی بەشی سەرمایەداریی ئابووری لەو وڵاتانەدا هەیە، کەوابوو یەکەم بەش بەشی سەرمایەداری‌یە. لە هێندێ وڵاتدا بەشی سەرمایەداری گەشەی کردوە، پەرەی سەندوە، هێندێ وڵاتی واش هەیە وەکو کوردستانی خۆمان بڵێین بەشی سەرمایەداری گەشەی نەکردوە، بەڵام هەیە، هەیە زۆر کەم.

بەشی دووهەم: بەشی دووەمی لە زۆربەی ئەو وڵاتانە بەشی دەوڵەتیش هەیە، زۆر شت بە دەس دەوڵەتەوەیە. ئێستا لە ئێرانی خۆماندا ئێمە دەبینین رێگای ئاسن، تەلەفوون، نازانم زۆر شت، شیرکەتی نەوت بەدەس دەوڵەتەوەیە. کەوابوو سەرمایەدارییش هەیە بەشی دەوڵەتییش هەیە. دیارە شتێکی زۆر تەبیعیە، بەشی تایبەتی هەیە، بەشی خسووسیش هەیە کە هی خەڵکی‌یە. ئەگەر سەرمایەداری بوو، جوزوی سەرمایەداری حەسێب دەکرێ، ئەگەر هی کەشاوەرزی بوو جارێ لێی دەگەڕێین پاشان باسی لە سەر دەکەین. بەڵام بەشی دیکەش هەیە کە حەتا لە زەمانی شا لە ئێرانێ پێكهاتبوو، گەشەشی کردبوو و ئێستاش ئیمکانی گەشەکردنی هەیە، ئەویش بەشی تەعاونی‌یە. جا ئێستا ئەو سێ بەشەمان دیارە ئەساسین. بەشی خسووسی ئەوە

کە هەرکەسێك ساحێبی زەوی خۆیەتی. ئەوە لە زەراعەتدا، لە کشتوکاڵدا باسی دەکەین.

بەڵام لەو سێ بەشە بزانین ئەوە ئێستا حکوومەتێك هاتۆتە سەر کار، شۆڕشێك بووە لە وڵاتێکی وەك ئێراندا، چی لێ دەکا لەوانە؟ ئەگەر ئەو بەشی سەرمایەداری‌یە بکا بە دەوڵەتی، دەوڵەتی‌یەکەشی کە هەیە، ئەوە دیارە بەشی دەوڵەتی بە قووەتتر دەبێ، بەقووەتتر لە جارانیش دەبێ. لە واقیعدا میللی کردنی بەشی سەرمایەداری‌یە. بەشی تەعاونیش یارمەتی پێ‌بدا. بەشی تەعاونی ئەوەیە کە دیتووتانە لە شیرکەتەکانی تەعاونی زەراعەتی‌دا هەبووە لە ئێراندا، کە چەند کەس کە ئەوە بە کوردی خۆمان پێی دەڵێن "هەرەوەز" لە واقیعدا پێکەوە هاوکاری دەکەن بۆ ئەوەی ئیقتیسادەکە بەرێوە بەرن، چونکی هەریەك لەو جووتیارانە بە تاقی تەنیا ئەو ئیمکاناتەی نیە. مەسەلەن دەیانهەوێ تراکتۆرێك بکرن، هەرکەس ناتوانێ تراکتۆرێکی بۆخۆی بکڕێ یا کۆمباینێکی بۆخۆی بکڕێ، پێکەوە شەریك دەبن‌و تراکتۆرێکی دەکرن‌و کۆمباینێکی دەکرن‌و "بالاخرە" تەعاون دەکەن، هاوکاری یەك دەکەن.

ئەوەش ئێستا بە چی دەزانین، ئێمە لە کوێ‌ڕا دەزانین کە ئەو رێژیمە لە باری ئیقتیسادی‌یەوە بەرەو سۆسیالیزم دەڕوا یا بەرەو سەرمایەداری دەڕوا؟ ئێستا ئەو ئیقتیسادە چی پێ‌دەڵێن ئێمە؟ تێکەڵاو. ئەو ئیقتیسادە هەم بەشی خسووسیی تێدایە، هەم بەشی دەوڵەتیی تێدایە، هەم بەشی تەعاونیی تێدایە. هەرسێکی تێدایە. لەوەدا دەزانین ئەگەر ئەوانەی کە لە سەر کارن بێن بەشی دەوڵەتی‌یەکە تەقوییەت بکەن، بەشی سەرمایەداری‌یەکە مەحدوود بکەن ناڵێم لە بەینی بەرن، بەو هاسانیە لە بەین ناچێ، چونکو زۆر دوورە. مەسەلەن ساحیب دووکان هەیە، ساحیب میوانخانە هەیە، ناتوانی رۆژی ئەوەڵ هەموویان، هەموو ئەوانەیان لێ بستێنیەوە، لزوومیشی نیە ئەو کارە بکەی تۆ. بەڵام بە گشتی بەشی دەوڵەتی تەقوییەت بکە، بەشی سەرمایەداری گەورە ئەگەر هەیە، مەسەلەن لە ئێران ئەگەر ببێ ئەوانەی کە کارخانەی گەورەیان هەیە، ئەوانە میللی بکەی. وا هاسانترە، هەموو وەختێ، کارخانەیەك ٥هەزار کرێکاری هەیە، بەدەس سەرمایەدارەوەیە، میللی کردنی زۆر هاسانترە لەوە کە تۆ بچی دووکانێکی چکۆلە لە یەکێکی بستێنیەوە. بەڵام دوای چی لێ بکەی؟ ئەگەر

ئــەوەی میللــی بکــا ســـــەرمایەداری گـــەورە، دەوڵەتیەکـــەش تەقوییـــەت بکـــا، تەعاونی‌یەکەشی تەقوییەت بکا. لە باری سیاسیشەوە خەتێکی گشتیی سۆسیالیستی بدا بە کۆمەڵ، ئەوە دەبێتە رۆیشتن بەرەو سۆسیالیزم.

یانێ ئێستا ئەگەر حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بێتە سەرکار ئاوا دەکا. سەرمایەداری‌یەکە مەحدوود دەکا، ســـەرمایەداری گـەورە لەبـەین دەبـاو چکۆلەکەشی مەحدوود دەکا، بەڵام لەبەینی نابـا، چونکـو نـاتوانێ لەبـەینی بـەرێ، چونکە لە باری ئیقتیسادی‌یەوە شەرایەت ئامادە نـــەبووە. دەوڵەتی‌یەکـە تەقوییـــەت دەکا لەمەوبەدوا هـــەرچی بکـا بـە نـاو دەوڵەتـەو دەیکـا. هـەر کـارێکی گـەورەی ئیقتیسادی بکا دەوڵەت دەیکا. تەعاونی‌یەکەش بە تایبـــەت لـە دێـهات تەقوییـــەت دەکا بۆ ئەوەی کە جووتیاران پێکـــەوە هاوکـاری بکـەن. ئـەوەی کـە لـە پاشـان لـە وڵاتێکـی وەك شـوورەوی‌دا بۆتـە "کـەڵخۆز"، بناغـەی ئـەوە دادەنـێ، دیـارە بـــە سـووورەتێکی شـایەد باشـتر، بـە دەرس وەرگرتـــن لـــە تەجروبـــەکانی وڵاتـــەکانی سۆسیالیستی بۆ ئەوەی کە تووشی ئەو تەنگو چەڵەمەیە نەبین کـــە ئـەوان تووشــیان بوون. ئەوە ئەو وەختە دەبێتە بەرەو سۆسیالیزم رۆیشتن.

مومکینە بەڵام ئەوە حیزبی دێموکرات نیە کە هاتۆتە سەرکار. فەرزدەکـەین وەك جمهوریی ئیسلامی ئیسباتی کرد پاش شۆڕشی ئێران هاتە سەرکار، ئێســتا بەرەبـەرە سـەرمایەداری تەقوییـەت دەکـا. دەوڵـەتی لـە جێگـای خۆیـەتی، جـاری وا هەیـە تەقوییەتی دەکا جاری وا هەیە نایکا. تـــەعاونیش هەیـە. ئـەو تەعاونی‌یـە بۆخـۆی خاسییەتێکی تایبەتیی هەیە. تەعاونی‌یەکە بۆخۆی هیچ نیشـــان نـادات، ئەگـەر لـە وڵاتێـك‌دا تـەعاونی زۆر بـوو هیـچ نیشـان نـادات کـە ئـەوە سۆسیالیسـتی‌یە یـــا سەرمایەداری‌یە. ئـەوە بەسـتراوەتەوە بـەوە کـە تـابیعی دەوڵەتی‌یەکـە بـێ. ئەگـەر دەوڵەتەکـە سـەرمایەداری‌یەو حکوومـەتیش سـەرمایەداریە، دیـارە ئـــەو وەختـــە تەعاونی‌یەکەش تابیعی سەرمایەداریە. ئەگـــەر دەوڵەتەکـە سۆسیالیسـتی‌یە، بـەرەو سۆســیالیزم دەڕوا، تەعاونی‌یەکـەش تـابیعی سۆســیالیزمەکەیەو بـەرەو سۆســیالیزم دەڕوا.

یانێ تەعاونی، شـیرکەتی تـەعاونی جووتیـاران بەتایبـەتی، هیـچ وەخـت خـۆی سەربەخۆ نیە بە تەواوی. سەربەخۆش موشەخەساتی ئەو سیســتمە یـان ئـەو رێژیمـە

دیاری ناکا. هەروەها کە لە تاریخدا بە گشتی هیچ وەخت نابینینەوە کـە جووتیـاران بۆخۆیان بەڕێوەبەری هیچ شۆڕشـێکی بـن، یـا لەگـەڵ بـورژوازیدا ڕێـك کـەوتوون، سەرمایەداران بـەڕێوەیان بـردوون، وەکـو شۆڕشـی گـەورەی فەرانسـەو زۆر شۆڕشـی بورژوازی دیکە یا کرێکاران بەڕێوەیان بردوون وەکو شۆڕشی ئۆکتۆبر. بەڵام بۆخۆیـان ئەسڵەن ئەو نـەزمی کەشـاوەرزیو کشـتوکاڵە ڕێگـا نـادات هـەتا ئەوانـە بۆخۆیـان بەڕێوەبـەری شۆڕشـێك بـن. هـەموو وەختێـك تـابیعی یـەکێك لـەوانن. لـە ئیقتیسادەکەشدا هەر وایە یا تابیعی سەرمایەدارین ئەگەر دەوڵەتەکەی بە دەسـتەوە بێ، یان تابیعی ئەوانەی کە کاری دەسەلاّتیان بە دەستەوەیە کە دەیانهەوێ ڕێژیمەکـە بەرەو سۆسیالیزم بەرن، تابیعی ئەوانەن، کە ئەوانیش دەوڵەتەکەیان بە دەستەوەیە.

کەوابوو ئیقتیسادەکە بە تاقی‌تەنیا مەسەلەکە حەل ناکات، چونکە ئیقتیسادەکە وەك خۆیەتی، بەستراوەتەو بەوە کێ پاش شۆڕش هاتۆتە سەرکارو دەسەلاّتی سیاسیی بە دەستەوە گرتووە. ئەوە کە دیاری دەکا بەرەو کوێ دەڕۆن، ئـەوە کـە دیـاری دەکـا بەرەو سۆسیالیزم دەڕۆن یا بەرەو سەرمایەداری دەڕۆن. بەڵام ئێستا بێین ئێمە چونکـو گوتوومانە بەرەو سۆسیالیزم دەڕۆین، ئێستا بۆ کوردستانی خۆمـان هـاتووین یـا لـە ئێران ئەو کارەمان کردوە، ئایا ئەوە مانای ئەوەیـە کـە ئێمـە دەتوانـین دەسـتبەجێ شیعاری سۆسیالیستی بدەین، بڵێین کە ئەوڕۆ سۆسیالیزم درووست دەکـەین. پێموایـە نـاتوانین چونکـە سۆسـیالیزم دروسـتکردن یـانێ پێکـهێنانی پێوەندییـەکانی سۆسیالیسـتی، یـانێ لابردنـی چەوسـاندنەوە ئـەوەی کـە باسمـان کـرد. لابردنـی چەوساندنەوە کارێکی هاسان نیە، وەختی دەوێ، بەوە نیە خۆ من دانیشم بڕیار بدەم.

ئێستا مەسەلەن نموونەتان بۆ دێنمەوە فەرز دەکەین ئێمە، لە دێیەك یەکێك هەیە کە چەند هێکتار زەویی هەیە، بۆخۆی بە تاقی تەنیا، ئەوەی کـە ئێمـە پێـی دەڵێـین خوردە مالیك، بۆخۆی بە تاقی تـەنیا کـار ناکـا لـە سـەر زەوییـەکانیدا. هێنـدێ کەسیشی بەکرێ گرتووە، ئەوانیش کاری بـۆ دەکـەن، ئێسـتا جـا تراکتـۆری هەیـە، گاجووتی هەیە یا هەرچی. باشـە ئێـوە پێتـان وایـە ئـەمڕۆ سـەرکەوتین ـ سـەریش کەوتبووین لە بەشەکانی رزگار کراوی کوردستاندا ـ دەتوانین دەستبەجێ ئەو کابرایە قـانیع بکـەین کـە بۆخـۆی لـە سـەر زەوییەکـەی کـار بکـات یـان زەوییەکـەی لێبستێنینەوەو بیدەین بەوانی دیکە؟ ناتوانین. ئەگەر کابرایەکی وا هـەبێ مالکێکـە

بە سەدان هێکتار زەویی هەبێ، بۆخۆشی بە تاقی تەنیا بێ، ئەوە هاسانە، دەچین مومکینە بەشێکی بدەین بە خۆی بڵێین بابا ئەوە ٢٠ هێکتاریش بۆ خۆت، ئەوەی دیکە دەبێ بیدەی بە خەڵکی دیکە. بەڵام یەکێك کە ٢٠ هێکتاری هەیە لە سەر ئەو ٢٠ هێکتارەش ٥، ٦ کەس کاریێ دەکەن ئێمە بچین ئەو ٥، ٦ کەسە دەربکەین بڵێین دەبێ ئەتۆ بە تاقی تەنیا ئەوە ئیدارە بکەی ئەوە عەمەلی نیە. ئەوە رەوەندێکی زۆر درێژی دەوێ کە ئێمە بتوانین بەرەبەرە، "بتدریج" ئەو کارە بکەین. ئەوەڵەن دەبێ شتی مۆدێرنی بۆ بێنین، تراکتۆری بۆ پەیدا بکەین، نازانم کۆمباینی بۆ پەیدا بکەین، ماشینی بۆ پەیدا بکەین، سانیەن دەبێ خەڵکەکە بەوە قانێع بکەین، سالسەن ئێمە لە کوردستاندا دەژین، کوردستانێکی عەشیرەتی، کە رەوابتی عەشیرەتیی هەیە، ئەو چەند کەسەی کە کاری بۆ دەکەن ئەسڵەن خزمو کەسو کاری خودی ئەو کابرایەیە، حازر نین بەجێی بێڵن کاری بۆ نەکەنو زۆر مەسائیلی دیکەش هەیە.

کەوابوو ئێمە ناتوانین بە هاسانی ئەوەی کە دەڵێن پێوەندیەکانی سۆسیالیستی لەو بەشەدا کە پێی دەڵێن بەرهەمهێنانی وردە کە ئەوە هەم لادێ دەگرێتەوەو هەم شاریش دەگرێتەوە، بەرهەمهێنانی وردە، لێرە پێکهێنانی سۆسیالیزم زۆر زۆر زەحمەتەو وەختێکی یەکجار زۆری دەوێو ئەوە لە شاریشدا وایە.

جا مەسەلەن بە پێی ئۆسوولی عیلمی ئەو کەسەی کە دووکانی هەیە، دووکانەکە هی خۆیەتی، ئەوە شتێکی غەیر سۆسیالیستییە، ئەوە مالکییەتی خسووسییە، مالکییەتی شەخسی نیە. مالکییەتی خسووسییە چونکو دووکانەکە وەسیلەی کەسبیەتی، وەسیلەی داهاتیەتی. باشە ئێستا ئێوە فکر بکەنەوە لە شارێکی مەسەلەن وەك مەهاباد ئێمە بێین هەموو ئەو دووکانانە میللی بکەین، یانێ چی بکەین؟ ساحێبەکەی بۆخۆی لە سەر دووکانەکە دانیشتووە، یانێ ئەمن دەمەوێ ئیدارەیەکی وا پانو بەرین درووست بکەم کە هەر ئیدارەکە کارمەندێکی بێنێ لە دووکانەکە دایبنێ، دووکانەکە میللی بکەمو وەدەری بنێم یەکێکی دیکە لە جێگای ئەو دابنێم هەتا بە شێوەیەکی سۆسیالیستی ئیدارەی بکا. دووکانەکە هی خۆی نەبێ ئەوەی دەیفرۆشێو ئەوی دەیکڕێ یادداشتی بکاو بینووسێو ئیدیعا بکەم ئەو وەختە بۆتە سۆسیالیستی.

ئەوە چەند زەرەری هەیە، ئەوەڵەن ئەوەیە کە دەوڵەتێك کە تازە هاتۆتە سەرکار، مەعمولەن ئیقتیساد زۆر باش نازانیٚ، قازانجی خۆشی زۆر باش نازانیٚ، نە تیجە ئەوە دەبیٚ کە هەموو ئەو دووکانانە زەرەر بکەن. ئەوە تەجروبەمان هەیەو ئەوە حەتا ئێستا ئەگەر دەمانەویٚ شتێکی مەسەلەن برادەرانی حیزبی خۆمان کە تەجروبەیان نیە بۆخۆیان کارێکی ئیقتیسادی بکەن هەموو وەختێك زەرەر دەکەین. بەلاٚم ئەگەر مەسەلەن دەمانەویٚ لێرە قاوەخانەیەك دانێین. برادەرێکی حیزبی دەبەین لە سەر قاوەخانەکە دایدەنێین دەڵێین ئەتۆ قاوەچی بە، هەموو شتەکە ئێمە دەیدەین خەرجەکەشی ئێمە دەیکێشین، قازانجەکەشی هی حیزبە، پاش ماوەیەکی ئەبینین کە زۆر قازانج ناکات. نامهەویٚ موتەهەمی بکەم کە دزی دەکا یا ناکا بەلاٚم یەك شتی دیکە موهیم هەیە ئەوەیە کە عەلاقە نیشان نادا ئەو برادەرە بۆ ئەوەی کە قاوەخانەکەی باش کار بکا. مەسەلەن دامانناوە کە مانگیٚ ٢٠٠٠ تمەنی دەدەینیٚ، جا ئەگەر "مشتری" بۆ دیٚ بە روویەکی خۆشو دەم بە پێکەنینەوە پێشوازی لیٚبکا ئەو هەر ٢٠٠٠ تمەنەکە وەردەگریٚ، جنێویشی پیٚبدا هەر ٢٠٠٠ تمەنەکە وەردەگریٚ. بەلاٚم ئەگەر هی خۆی بیٚ، دەزانیٚ ئەگەر بە روویەکی خۆش ئیستیقبال لە "مشتری" بکا "مشتری"ی زیاتر دەبیٚو قازانجی زیاتر دەبیو لە ٢٠٠٠تمەن زیاتری دەست دەکەویٚ. چونکە جاریٚ فیکری سۆسیالیستیو فەرهەنگی سۆسیالیستی لە مێشکی میللەتدا جێگیر نەبووە.

دیارە عەمەلەن دەرکەوتووە کە ئێمە بە ئیجارەی بدەین، مەسەلەن دەڵێین قاوەخانەیەکی لێرە درووست دەکەین مەسەلەن دەڵێین دەبیٚ مانگیٚ ١٠هەزار تمەن بدەی بە حیزبو ئەوی دیکە هی خۆت، قاوەخانە زۆر باش کار دەکا. یانیٚ چی، یانیٚ حەتا ئێستا ئێمە بۆ خۆمان کە دەتوانین شتێکی سۆسیالیستی دابنین، دایناین، دەیکەینە خسووسی، بۆ؟ چونکو جاریٚ کۆمەڵی کوردەواری بۆ ئەوە ئامادە نەبووە. بۆیە ئێمە کە دەڵێن کە ئێمە بۆچی زوو شیعاری سۆسیالیستی نادەین، خۆ شیعارەکە دەتوانین بدەین بەلاٚم عەمەلی کردنەکەی زەحمەتە چونکو شیعار لە سەر کاغەزە.جارێك سیٚ چوار ساڵ لەوە پێش بوو، چووبوومە "ئۆسلۆ" پایتەختی نۆرڤێژ چەند برادەری کوردی تورکیەو هی سووریەی لیٚبوو، هی ئێرانی لیٚنەبوو، دەعوەتیان کردم لە پاشان شیعارێکیان نووسیبوو بە پووسترێکی جوانەوە لە دیواریان دابوو،

دیاره بەکوردی لاتینی. شیعارەکە ئەوە بوو "بــژی کوردســتانی مــەزنی ســەربەخۆی سۆسیالیستی" منیش سەیری شیعارەکەم کرد گوتیان پێت چۆنــە؟ گــوتم زۆر جوانــە! گوتیان باشە ئەگەر زۆر جوانە بۆچی حیزبی دێموکرات ئەو شیعارە هەڵناگرێ؟! گوتم چونکە حیزبی دێموکرات ئەو هێزو قودرەتەی نیە کارێکی وا جێبەجێ بکا. ئێوە لێرە دانیشتوون دەتوانن. لە نۆرڤێژ چەند دانشــجوویەکن، نــە پێتــان ئــەڵێن بــۆ ئــەوەتان نووسیوە، نە مەســئوولییەتێکتان هەیــە. بــەلاّم ئەگــەر ئێمــە ئــەوە بنووســین دەبــێ جێبەجێی بکەین، ئــەوەمان پێجێبــەجێ نــاکرێ. نــە کوردســتانە مەزنەکــەمان پــێ جێبەجێ دەکرێ، نە سۆسیالیستەکە بۆمان جێبەجێ دەکــرێ. لــە بــەر ئــەوە ئێســتا مەسەلەی شیعار ئاسانە بەلاّم موهیم ئەوەیە کە چۆن بتوانین جێبەجێی بکەین.

ئێمە کە دەڵێین ئێستا ئەگەر خودموختاریمان دەست کــەوێ ٢٠ ســاڵ ٢٥ ســاڵمان دەوێ تا بەرنامەی حیزبی دێموکرات جێبەجێ بکــەین ئــەوە بــە نــەزەری مــن ئــەوە قسەیەکی خۆڕایی ناکەین. هەتا ئەمە بێین ئــەوە کــە دەڵێــین ٤٠ ســەعات کــار لــە حەفتەدا، ئەوە تەسبیت کەین، بیمە تەسبیت کەین، کە هەرکــەس نــەخۆش بــوو بــە خۆڕایی بچێتە نەخۆشخانە، کە ئەوەندە مەدرەسەمان هەبێ کــە هیــچ منداڵێــك لــە سەرتاسەری کوردستان بێمەدرەسە نەمێنێتەوە، ئەوە گوتنەکەی ئاسانە.

ئێستا ئێمە بێجگە لەوە کە سەدی حەفتای میللەتەکەمان نەخوێندەوارن، نیمــەی زیاتری منداڵەکانمان ناچنە مەدرەسە، یانێ بۆخۆمان نەخوێندەوار درووست دەکەین بۆ دوارۆژ، بــا ئــەوە حــەل کــەین. سۆســیالیزم هــەوا نیــە، سۆســیالیزم واقعییــەتێکی مەلمووسە، سۆسیالیزم ئەوانەن: تەئمینی ژیانی خەڵك، ژیانی ماددیو فەرهەنگی. بــا ئەوانە بکەین ئێمە جا ئەو وەختە دەبینن کە چەند زەحمەتە.

ئەوانەی کــە ئــەو جەوانانــەی کــە ئێســتا زۆر ئــەوەیان هەیــە، شــیعاری تونــدو سۆسیالیستیو ئەوە دەردەچــێ، ئــەوە بــە نــەزەری مــن بــە خۆڕاییــیە. بەتایبــەتی حیزبێکی مەسئوولی سیاسی ناتوانێ میللەتی خــۆی فریــو بــدا. حــیزبی دێموکــرات یەکێ لە حوسنەکانی ئەوە بووە کە لە ڕۆژی ئەوەڵەوە ڕاستی بــە خــەڵکی کوردســتان گوتووە. ئەمن بێم بڵێم میللەت ئینقلاب بکەینو ئەوە بکــەینو ئــەوە خودموختــاری وەرگرین، کە وەرمان گرت پاش پێنج ساڵان هەر کوردێك خانوویــەکی چــوار ئوتــاقی دەوێ دەتوانین بیدەین، هەتا دەتوانم درۆ دەکەم کێ بە کێیە؟ بەلاّم ئەو پێنج ســاڵەی

کە رۆیی ئەو وەختی جوابی خەڵکی بە چی بدەمەوە. دەڵێن کوا خانووەکەت؟ جاریٚ بڕوام پیٚدەکەن، دوو جار بڕوام پیٚدەکەن لە پاشان خواحافیز.

حیزبیٚکی سیاسی کە باوەڕی خەڵکەکەی لەدەس دابیٚ ئەو نابیٚتە حیزبیٚکی بەڕیٚوەبەرو ناتوانیٚ کارەکان جیٚبەجیٚ بکا. کەوابوو ئیٚمە وەك ئەوەی کە دەڵیٚن کۆمەڵەکەمان گەیشتوەتە ئاخری فئودالیزمو سەرەتای سەرمایەداری، لە کۆمەڵیٚکی ئاوادا ئەتۆ بە جاریٚ ناتوانی دەست بکەی بە درووست کردنی سۆسیالیزم. ماوەی بیست ساڵت دەویٚ بۆ ئەوە زەمینە، هەلومەرج پەیدا بکەی بۆ درووست کردنی سۆسیالیزم. پاش بیست ساڵان دەس ئەکەی بە درووست کردنەکەی، مومکنیشە عیلم یارمەتی بدا، خەڵك یارمەتی بدا، زووتر خەلاس ئەبی خۆ کەس مونکری ئەوە نیە. بەڵام تەوەقوعیشو بە تایبەتیش خەیاڵو ئەوانەو شوعاری نادرووستو قەوڵی خیلافی واقعییەت نابیٚ بدریٚ بە خەڵك. حیزبیٚکی مەسئوول ئەوەیە. دەبیٚ واقعییەتەکە بە خەڵك بڵیٚ، ئاوا بکا.

باشە، کەوابوو ئەمن پیٚمخۆشە کە ئەو مەسەلەیەش بڵیٚم پاش ئەوەش کە سەریش کەوتین ئیقتیسادیٚکی تیٚکەڵاوەمان دەبیٚ. ئەو ئیقتیسادی تیٚکەڵاوە هەم بەشی تایبەتی (خسووسی) تیٚدایە، هەم سەرمایەداری چ لە شارو چ لە دیٚ، هەم بەشی دەوڵەتی تیٚدایە کە لەو بەشی دەوڵەتیە ئیٚمە دەتوانین لە ئەوەڵەوە بیکەین بە سۆسیالیستی، بەڵام زۆر تەواو نیە چۆن ئیٚمە لە بەشی کوردستان هیچمان نیە، لە باری بەرهەمهیٚنانەوە ("تولید")و بەشی تەعاونی.

وەزیفەی ئیٚمە ئەوەیە کە پشتمان ببەستین بە بەشی دەوڵەتیی سۆسیالیستی. بەشی سەرمایەداری جیٚگای بدەینیٚ، ئەوە کە گوتوومانە کە بەشی خسووسی جیٚگای دەدریٚتیٚ لە ئیقتیسادی دوارۆژدا ئەوە، ئەوەیە جیٚگای بدەینیٚ نموونەشم بۆ هیٚنانەوە، ئەو نموونەیە، نموونەیەکی زۆر تیپیکە. سبەینیٚ ئیٚمە بمانەویٚ سەد "مهمانخانە" درووست بکەین، نە دەوڵەت دەتوانیٚ درووستی بکاو نە ئەفرادی خۆی هەیە لە سەر ئەو "مهمانخانە" دایبنیٚ. خەڵکەکە با درووستی بکاو دابنیٚ، بەڵام لە سەر ئۆسوولیٚك، لە سەر شەرایەتیٚك کە دەوڵەت دیاریی دەکا. کەوابوو جیٚگاو ریٚگا دەدەین بە بەشی خسووسی کە ئەویش جیٚگای هەبیٚ لە ئیقتیساددا بەڵام ناهیٚڵین زۆر

گەشە بکا، ناهێڵێن زۆر تەوسعە پەیدا بکات. زیاتر هەوڵ دەدەین بەشی دەوڵەتی بڕواتە پێش کە بەشی سۆسیالیستی‌یە، بەشی سەرمایەداری تۆزێ مەحدوود دەبێ.

بەشی تەعاونیش یارمەتیی دەدەین کە ئەویش گەشە بکات چونکی ئێمە لێرەشدا بە داخەوە ناتوانین لە دێهات ڕۆژی ئەوەڵ زەوی میللی بکەین ئەوە عەمەلی نیە. ئەبێ لە پێشدا زەوی دابەش بکەین بیدەین بە خەڵکی بە پێی ئەو شیعارە کە هەمانە، زەوی بۆ ئەو کەسە کە کاری لە سەر دەکا. پاش ماوەیەکی، تازە ئەوانە کۆ بکەینەوە کە شیرکەتی تەعاونی درووست بکەین، بەرەبەرە ئەو شیرکەتی تەعاونی‌یە بچێتە دەرەجەی بالاتر وەك کەڵخۆزی لی‌بێو زۆرزۆر چەند ساڵی دیکە مومکینە ببێ بە شتێك کە وەکو ئەوە کە پێمان گوت سەڵخۆز، ئیدی دەبێتە مالکییەتی گشتی، نەك دەستەجەمعی، بەڵکو مالکییەتی گشتی سۆسیالیستی. بەلام لێرەڕا، ئەو وەختە دوورە. لە هێندێ جێگا فەقەت ئەوەی دەکەین. ئەوەی کە ئەملاکی خالیسەیە، ئەوی کە ئەملاکی وەقفە ئەوانە ئەملاکی زۆر باشن، دابەشکردنی هیچ مانع نیە لە بەینی جووتیاراندا ئەوە دەوڵەت دەتوانێ بیانکا بە مەزرەعەی نموونە، بیانکا بە ئەساسێك بۆ پەرەپێدانی سۆسیالیزم لە لادێدا ئەویش حەتمەن دەکا.

حیزبی دێموکرات من دڵنیام ئەویش دەکا، بەلام هەموو بە گشتی ناتوانین بکەین، ساڵەهای ساڵ وەختی دەوێ کە بگەینە ئەو نەتیجەیە. بۆ ئەوەی کە بزانین کە چەن زەحمەتە، بیستووتانە لە بەینی ولاتەکانی سۆسیالیستی لە لەهستان، کۆلۆمبیاو... ئێستا کرێکاران نارازین‌و تەزاهورات دەکەن‌و ئەوانە، کە بەڕاستیش کرێکارانن کە نارازین، بەڕاستیش زۆربەی زۆری کرێکارانن کە تەزاهورات دەکەن. لەگەڵ ئەوەیش کە شتێکی زۆر غەیر مەنتیقی‌یە لە ولاتێکدا کە سۆسیالیزم سەرکەوتووەو کرێکاران کە دەبێ حاکمییەتیان بە دەستەوە بێ بۆخۆیان زیددی حاکمییەتی خۆیان دەبێ ئەو کارە بکەن. بەلام ئەوە واقعییەتێکە مانای ئەوەیە کە لەوێ سۆسیالیزم بەو شێوەیە کە پێویستە بەرێوە نەچووە.

بەلام ئەمن باسی کرێکارانی ئێستا ناکەم باسی جووتیاران دەکەم، ئێستا کە ئێمە لێرە دانیشتووین پاش چل ساڵ کە تەقریبەن سۆسیالیزم لە لەهستان سەرکەوتووە ئێستا سەدی هەشتای زیاتری زەوی بە دەس خودی جووتیارانەوەیە حەتتا تەعاونیش نیە، حەتا کەڵخۆزیش نیە. زەوی خۆیەتی لە سەر زەوی خۆی کار دەکا. لە ساڵی

١٩٥٦، دەبێتە ١٣٣٥ زەویەکان ئەو وەختە کە وەزعی سیاسی لەهستان تێکچوو، زەویەکانیان داوە بە جووتیاران، ئێستاش هەر لە دەستی خۆیانە. ولاتێکی سۆسیالیستیشە نەك هەر سۆسیالیستی‌یە بەلام ئەو سی‌سالەشی تەواو کردوە کە من ئێستا باسی دەکەم. بێجگە لەوە کە ئەو وەختە لەهستان بوو بە سۆسیالیستی لە ئێستای ئێمە چەندین دەسال لە پێشتر بوو. کەوابوو مەسەلەکە واقعبینانە تەماشا بکەین. چل سال ئەوە لەوێ سۆسیالیزم هەیە بەلام ئێستا سەدی هەشتای زەویەکە بە دەس خودی جووتیارانەوەیە، مالکییەتی خسووسی زەویە نە مالکییەتی تەعاونی‌یە نە مالکییەتی سۆسیالیستی گشتی کە هیچ هەر مالکییەتی تەعاونی لەوێ جێگیر نەبووە جارێ.

ئەو مەسەلەی ئیقتیسادی تێکەلاوە زیاتر لەو نوقتە نەزەرەوە خەریك بوو باس بکەم کە بەرادەرانمان بەراستی تەوەقۆیان بێ. یانێ ئێمە ئەوەی کە سبەینێ بتوانین دەسەلاتی سیاسی بە دەستەوە بگرین‌و بتوانین ولاتەکە ئیدارە بکەین، ئەو ئیدارە کردنەی ولاتەکە بەو شێوەیەیە کە ئێمە دەبێ زۆر لەسەرەخۆ بین، بێ ئەوە کە پەلە بکەین، بێ ئەوە کە ئیشتبایەکی گەورە بکەین، دەگەل مەسائلی ئیقتیسادی بەرەورووو بین. وەزعی ئیقتیسادی ولاتەکەمان، شێوەی فیکر کردنەوەی خەلکەکەمان، "مقدسات"ی خەلکەکەمان، هەموو ئەوانە دەبێ لە نەزەر بگرین. ئیشتیبای گەورە زۆرجار نەتیجەی زۆر خراپی هەیەو کراوە لە زۆر جێگادا.

مەسەلەن نموونەیەکی دیکەتان بۆ بێنم لە باری ئیقتیسادی‌یەوە دەلێم، پەروەردە کردنی بەراز لە هەموو حەیوانێك زیاتر قازانجی هەیە، گۆشتەکەشی لە هەموو دونیا لە هەموو گۆشتێکی مەرغووبترە، باشە ئەوە لە باری ئیقتیسادی‌یەوە. مومکینە "متخصص"ێکی ئیقتیسادیمان پەیدا بێ سبەینێ بلێ ئێستا کە وایە منیش لە کوردستان دێنم گۆشتی بەراز پەروەردە دەکەم. باشە مومکینە بتوانێ لە بەینی "ئەهلی حەق"دا ئەو کارە بکا، چونکە ئەوان بۆخۆشیان بەراز خۆرن، باشە بەلام ئەوە کوردستانی مەرکەزی‌و شیمالی‌و لە بەشێکی زۆر لە کوردستانی جنووبی، ئەوەل کاری حیزبی دێموکرات ئەوە بێ بلێ بەراز پەروەردە دەکەم، خەلك دەلێ چی. بلێی کاسبی دەکەم. مەلاش خۆ نەمردووە، دیارە "الحمدلله" کەم بوون بەلام نەمردوون.

مەقسەدم ئەوەیە کە وەزعی ولاَتەکەو ئەوە کراوەو ئەوە وەختێکە کە جمهووریەکانی ئاسیای میانە بوون بە سۆسیالیستی، هێندێ "متخصص" کە لە بەشی رووسیەوە چووبوون ئەو شتانەیان نەدەزانی. بە زۆر دەیانگوت دەبێ بەراز پەروەردە بکەی، خەڵکەکەش دیارە راپەڕین بە زدیان. لەوە چاکتر نابێ، وەزعی خەڵکەکەیان نەدەزانی، نەیاندەزانی خەڵکەکە چۆن فیکر دەکاتەوە. جا مەقسەدی من ئەوەیە کە ئەوە مەسەلەن فەرز دەکەین کابرایەك دێت دەڵێن ئێمە دەمانەوێ میوانخانەیەك درووست بکەین، ئاگای لە ئێمە نەبێ، تەماشا بکە لە هەموو دێیەکی جێگایەکی، ساڵۆنێکی زۆر گەورەی لێیە، زۆریش باشە، میوانخانە بۆ درووست دەکەن؟ ئەوە ئەو ساڵۆنە هەیە ئیدی. بەلاَم ساڵۆنەکە هی کوێیە؟ هی مزگەوتە. بیهەوێ مزگەوتەکان بکاتە میوانخانە. دەبێ؟ لە باری ئیقتیسادییەوە زۆر قازانجی هەیە، چونکە پێویست نیە کە درووستی بکەین، ئەوە هەیە، مەوجوودە. بەلاَم لە باری وەزعی ولاَتەکەمانەوە فەرقی هەیە، کەوابوو دەبێ هەمووی لە نەزەر بگرین، هەمووی بخەینە بەرچاو. هیچ شتێکی وەها نەکەین کە ببێتە هۆی تێکچوونی کۆمەڵی کوردەواری. ئەوەی کە لە هێندێ ولاَتی سۆسیالیستی دەیبینین کە تێكچووە ـ کە لە راپۆرتی کۆنگرەش ئێمە ئیشارەمان پێکردووە ـ ئەوە هەر ئەوەیە کە نەیانتوانیوە، تێنەگەیشتوون لەوە کە ئەو میللەتە چی دەوێ، داخوازەکانی چینو چۆنی دەبێ بۆی جێبەجێ بکەن. نەتیجەی ئەوەیە کە ئێستا دەیبینین.

# وەڵامی پرسیارەکان

* وەسایلی تەولید مالکییەتی سۆسیالیستی هەیە ئەمن هەر لە سەرەتای دەرسەکەمدا ئەوەم نووسی:

یەك؛ مالکییەتی عمومی سۆسیالیستی، دوو؛ مالکییەتی دەستەجەمعی یا تەعاوەن فەرق ناکا ـ "ئۆپراتیڤ"ی پێ دەڵێن ـ، کە ئەو دووانە فەرقیان هەیەو حەتتا لە موقابیلی یەکتریش دانەو تەززادێك لە بەینی ئەوانەدا هەیە. چونکە ئەو تەززادە لە کوێ خۆی دەردەخا؟ لە بازاڕ.

ئەوانە، شتی دێهقانان بەرهەمی کشتوکاڵی دەبەنە بازاڕێ کە ئی خۆیانە ئی هەموو کەس نیە، ئی ئەوانە ئی خۆیانە، ئی کەڵخۆزێکە لە حاڵێكدا دەوڵەت کە نمایەندەی دەستەجەمعی‌یە ئی کرێکارانو ئی هەموو وڵاتەکە دەباتە بازاڕێ، ئەویش قیمەتی فەرزی‌یەو ئەوانەش بمانەوێو نەمانەوێ لە موقابیلی یەکتردا هەن، یەکێك دەبێتە خەریدارو یەکێك دەبێتە فرووشەندەو لە بەینی ئەو دووانەدا تەزادد هەیەو ئەو تەززادەش لەوێڕا دێ کە ئەساسەن لە خودی کالاّدا تەززاد هەیە کە دیارە ئێمە وەختمان نەبووە ئەوەی روون کەینەوە کە شتومەك یا کالاّ هەر لە سەرەتاوە لە خودی داخڵی ئەو کالاّدا تەززاد هەیە، بەینی شتێك کە ئێمە پێی دەڵێین ئەرزشو شتێك کە پێی دەڵێین ئەرزشی مەسرەف، وادیارە مەجبوور دەبم ئەو تەزاددە روون کەمەوەو ئێستا لە هەر کالاّیەکی کە لە نەزەر بگرین کە دەیبەینە بازاڕێ دەڵێین مەسەلەن

کات، بلێین یەك ساڵە قیمــەت، ئــەو کەســەی کــە لــێرە دەکــڕێ، ئــەو کەســەی کــە دەیفرۆشێ، لێرە برێك دیققەت بکەن ئەوە زۆر زەحمەت نیە هەرچــەند ئــەوە ئەساســی تیئۆری مارکسە، لە ئەساس‌دا خەڵك پێیان وایە کە زۆر زەحمەتە بەلاّم ئەگەر دیققەت بکەن زۆر زەحمەت نیەو زۆر شتیان بۆ روون دەکاتەوە.

ئەو کەسەی کە دەیفرۆشێ تەماشای چی کالاَکەی دەکا؟ بۆ وی ئەوە موهیمە کــە ئایا مەسەلەن بە سەد تمەنی بفرۆشێ یا بە سەدو بیستی بفرۆشێ. بــەلاّم ئــەوەی کــە دەکڕێ با وەسفی ئەوە کە ئەویش پێی خۆشە قیمەتەکە کەمتر بێ بەلاّم بۆ ئەو کالاّیە دەکڕێ؟ تەماشای لای مەسرەفیی ئەو کالاّیە دەکا، یانێ ئەرزشی مەســرەفیی کــالاّ، کە بە کاری چی دێت؟ چونکە ئەگەر بەکاری نەیەت نایکڕێ. زۆر جار هەڵدەکەوێ کە لە بازاڕێکی بەرین‌دا لەوێ دەبینین یەك نەفەر حازرە قیمەتی دوو هێندە بدا، چونکــە زۆری پێ‌خۆشە ئەو شتەی هــەبێ، ئەرزشــی مەســرەفیی هەیــە بــۆ وی، یــا دەبینــن مەسەلەن شتێك کە بە کاری بــێ زۆر مومکینــە ئەرزشــی زۆر بــێ بــەلاّم بــۆ کــاری کەسێك نەیە نایکڕێت، مەسەلەن دەبینی لەو پادگانە زۆر شتیان بردبوو کە ئەگەر لە جێگایەکی دیکە، لە جێی خــۆی بــا زۆر ئەرزشــی هــەبوو، بــەلاّم چونکــە ئەرزشــی مەسرەفیی نەبوو بۆ ئەو کەسە کە بردبووی گوێی نەدەدایە ئەرزشەکەی.

کەوابوو لێرەدا ئەوەیە جارێکی دیکە ئەوەی کە فرووشــەندەیە تەماشــای ئــەرزش دەکات یانێ کەمییەتی، ئەوەی کە خەریدارە تەماشــای ئەرزشــی مەســرەف دەکــات یانێ کەیفییەتی‌و ئەوە ئەو تەزاددەیە کە لە کالاّدا هەیەو لە پاشان مــارکس زۆر بــە جوانی ئیسبات دەکا کە بوحرانی ئیقتیسادی سەرمایەداری ئەساسەن لەوەو هــاتووە. جا ئەو تەزاددە دیارە لە بەینی خەریدارو فرووشەندەیدا هەموو وەختێك هەیە.

هەموو وەختێك ئەو تەزاددە هەیە، حەتا لە سۆسیالیزمیش‌دا، لــە سۆســیالیزم‌دا عەرزەکە دەچێتە بازاڕی پوولْ، هەتا پوولْ هەبێ. کە ئاوێنــەی ئــەو تــەزاددە پوولــە. ئەسڵەن پووڵیان بۆ ئەوە کەشف کردووە کە ئەو تەزاددە حەل بکا. بەلاّم خۆ پوولْ هەر بۆ ئەوە پێکهاتووە کە ئەو تەزاددە حەل بکا. چونکو لــەپێش‌دا چ بــووە؟ لــە پێــش‌دا ئەوە بووە کە مەسەڵەن عەشیرەتێك شوان بووە، عەشــیرەتێکیش کــاری کەشــاوەرزی بووە، تووشی یەکتر بوون بە تەسادف هێندێ کالاّیان ئاڵوگۆڕ کردوە، یانێ چەند کالاّ، ئاوا بوو چەند شتومەك لە موقابیلی چەند شتومەك. کەم‌کەم کە ئەم ئاڵوگۆڕە زیــاتر

بووەو ئیمکانی ئەوە نەبووە کە مەسەلەن هەروا بە تەسادف یەکتر ببینن بەڵکو قەراریان داناوە لە فلان جێگە لە بازاڕ، ئەوانیش شوان بوونو مەڕیان هەبووە ئەوان هاتبوونە ئەوێ، ئەوانی شتومەکی کەشاوەرزیان هەبووە ئەوانیش چوونە ئەوێو پێکەوە لەوێ ئاڵوگۆڕیان کردووە ئەوە ئی تەسادفی نیە، ئەوە شتێکە کە پێشبینی کراوە.

لێرەدا کەمکەم هاتوونەتە سەر ئەوە کە ئیمکانی ئەوە نیە کە مەسەلەن ئەمن دەمهەوێ بڵێین جووتێ کەوشی بکڕم بچمە لای ئەو کەسەی کە کەوشی پێیە، بڵێم کەوشم دەوێو پووڵیش لە گۆڕێدا نیە، دەڵێ ئەمن کەوشت دەدەمێ ـ بەلام پێموابێ لە کوردەواریدا ئەوە بە حەیاتیشی نابێ ـ کەوشی دەدەمێ مەسەلەن بچۆ فلان شتم بۆ بێنە، نازانم دایان بە داپیر، داپیر دای بەکێ، ئەوە ئەوەیە دەچێ لە لای یەکی دیکەدا دەڵێ ئەمن ئەوەت دەدەمێ بەلام تۆش بچۆ فلان شتم بۆ بێنە، دەبێ دوو سێ شتومەکی بکڕێو عەرزەیان بکا تا بچێتە لای ئەو کابرایە کە لە موقابیلی کەوشدا مەسەلەن بڵێین چەقۆی دەوێ....

کەوابوو شتێکی کە ئەرزشی هەبێ خۆی یا پێموایە یا شتێکی ئاوا بووە، کالایەك هەبووەو ئەرزشی هەبووە. کەمکەم ئەوەش دیارە کە دەری‌ناهێنێ. مەسەلەن ئەتۆ دەتەوێ کالا زۆرتر ببێ، بەرهەم زیاتر ببێ. ئیدی ناکرێ تۆ مەسەلەن مەڕێکیان داناوە وەك ئەرزشێکی موتعادیل بۆ هەمووان، ئەو هەموو مەڕە وەبەر خۆت دەی. چ دەکەن؟ شتێکی وا پەیدا دەکەن کە هەم ئەرزشی هەبێو هەم حەملۆ نەقلی ئیمکانی هەبێو لە زۆر جیگاش هەبێ ئەوە مەسەلەن زێوە لە پاشان زێڕە. دیارە زۆر پرسیاری دیکەش هەیە بۆچی زێڕ بۆتە ئەو پووڵە کە بۆتە بڵێین ئەرزشی عوومومی یا موعادیلی عوومومی بۆ هەموو کەس، بۆ هەموو شتومەکێ؟ ئەوە نەتیجەی ئەو تەکامولەیە کە لە نەتیجەدا ئەسلەن بە پێکهاتنی ئەوە کە پوول بەوجوود دێ، بۆخۆشی ئەرزشی هەیە لە موقابیلی هەموو شتومەکێكدا پوول هەبوو، دیارە پووڵی کاغەزی باس ناکەم ئەمن پووڵی زێڕ باس دەکەم. هەم ئەرزشی هەیە، هەم دەچێتە بازاڕێو ئەوە تەزاددەکەی حەل دەکا. هەرکەسێك شتومەکێکی دەدا پووڵێ وەردەگرێ دەزانێ کە ئەو پووڵە، بەو پووڵە دەتوانێ هەر کالایەکی دیکە بکڕێ. ئەوە تەزاددەکەی حەل کردووە تا رادەیەکی زۆر، هەر لەو وەختەشدا دیارە هەر بۆیە هەتا

پوولّی زێڕ هەتا ئەو وەختە هیچ بوحرانێکی ئیقتیسادی لە سەرمایەداری‌دا نابیندرێ. بوحرانی ئیقتیسادی ئەو وەختە پێك‌دێ کە پوولّی کاغەزی جێگای پوولّی زێڕ دەگرێ‌و ئەوە ئیدی تەنیا چ ئەرزشێکی هەیە ئەو پوولّە کاغەزی‌یە؟ ئەرزشی ماددی. تەنیا ئەرزشی ماددی هەیە، ئەرزشی هیچ شتی نیە. ئەرزشی لە واقیع‌دا مەسرەفی هەیە، ئەرزشی نیە، هیچ ئەرزشێکی نیە. ئەوە پارچە کاغەزێکە قەراردادی عەکسێکێشیان پێوە ناوە کردوویانەتە سەد تمەنی. ئەگەر ئەو کاغەزە هەر وەکوو کاغەز بفرۆشرێ سەد تمەن ناکا مومکینە پێنچ تمەن بکا.

* دەبێ دیققەت بکەن لە حالێك‌دا مالکییەتی عموومیی سۆسیالیستی مالکیەتی گشتیی دەوڵەتی‌یە، مالکیەتی "کەڵخۆز"ی مالکیەتی ئەو کەسانەیە کە بۆخۆ کار دەکەن. ئەوە دەوڵەتە، دەوڵەت پاتۆڵیان پێ‌دەفرۆشێ ئەوانەش بە پوولێ! لە حالێك‌دا دەوڵەت لە نیزامی سۆسیالیستی کە مەسەلەن ماشینێکی دەدا بە بۆنگایەکی دیکە هەتا ماوەیەکی ٢٠ ـ ١٠ میلیۆن تمەن پوولێ ئاڵوگۆڕ دەکرێ، بەلاّم دەوڵەت هەرچی بدا بە کەڵخۆزەکان پوولّیان لێ‌دەستێنێ یانێ دەوڵەتی نیە.

پێم‌خۆشە ئاگاتان لێ‌بێ لەوە ئەگەر بیستووتانە حەتمەن، یەکێکیان هەیە پێی دەڵێن "کەڵخۆز" یەکێکیان "سەڵخۆز". کەڵخۆز (COLECTINE) یانێ دەستەجەمعی. کەلێکتین ئی سۆسیالیزمە یانێ ئیقتیسادی دەستەجەمعی. ئیقتیسادی سۆسیالیستی دیارە یەك شتیشی لەگەڵە. بەلاّم سەڵخۆز یانێ هەموو، گشتی. جا کەوابوو هەردووکی سۆسیالیزمە، یەکێکیان دەستەجەمعی‌یە یەکێکیان دەوڵەتی‌یە. یانێ لە حالێك‌دا ئەوەیان دەستەجەمعی‌یە، ئەوەیان ئی دەوڵەتە. ئەوە وەکوو کارخانە وایە هەرچەند لە دێهاتیش‌دا بێ. وەکوو کارخانە ئی هەموو دەوڵەتی‌یە بەلاّم کەڵخۆز ئێ هەموو کەس نیە، ئی ئەو کەسانەیە کە شێرکەتێکی تەعاوەنیان پێك‌هێناوەو لە ئەساس‌داو ئی ئەوانە کە عوزوی ئەو شیرکەتەن.

بازاڕێکی گشتی هەیە چۆن تابیعی خۆیانە، دیارە قیمەتەکان لێرە تا رادەیەکی زۆر دەوڵەت تەعینیان دەکا بۆ هەردووکیان. ئەوە یەکێك لە ئیشکالە ئیقتیسادی‌یەکانی سۆسیالیزمە. چونکو ئەگەر دەوڵەت قیمەتەکەی کەم دابنێ، کەڵخۆز ئەوەندە عەلاقەی نیە مەسەلەن بلێین یەرەڵماسی تەولید بکا، جا ئەوەیە یەرەڵماسی دەبینین کەم بووە جا دەوڵەت مەجبوورە قیمەتەکەی زیاتر بکا بۆ وەی کە

کەڵخۆزەکان عەلاقەدار بن بۆ وەی کە یەرەڵماسی زیاتر تەولید بکەن. ئەوە مەسەلەی قیمەتە لە وڵاتی سۆسیالیستی‌دا لـــە واقیێـعدا بێجگــە لــە هێنـدێ شـتی زۆر کــەم، هەمووی دەوڵەت دیاریی دەکا. هی شتومەکی سەنعەتی ،هی شتومەکی کشتوکاڵی، هی شتە کەمەکان ئەوانەی کە شتی فەســڵیان هێنـاوە، مەســەلەن فەرزکـە ســەوزی دەفرۆشیێ، دەوڵەت ئیدی لەوێ حدوودێك دادەنێ چواچێوەیەك دادەنێ. لەمەوبەدوا لە بەینی ئەو چوارچێوەیە مەسەلەن دەتوانێ زیاتر بفرۆشێ، یانێ قیمەتەکەی زیاتر یـــان کەمتر بکاو ئەوە مەربووتە بە عەرزەو تەقازای رۆژ. ئەوە هەیە بەڵام ئەوە مەربووتــە بە هێندێ شتی زۆر کەم.

مەسەلەن فەرزکە گیلاس تازە هاتووە، نۆبەرە ئـــەوە ئیـدی قیمەتــەکان بۆخۆیـان دیاری دەکەن، گرانترە چوار رۆژی دیکــە هــەرزانتر دەبــێ ئــەو جـۆرە شـتانە. بــەڵام مەسەلەن ئەگەر ئۆتۆموبیل بێ دیارە دەوڵەت قیمەتەکەی لەپێش‌دا دیــاری کــردووە. ئەگەر گەنم بێت دەوڵەت لە پێش‌دا قیمەتەکەی دیاری کردووە یا لۆکە بێ یـــا خــوری بێ ئەو جۆرە شتانە. بەڵام ئەو شتە فەسڵیانە جارجــار رێگایــان دەدەنــێ بــۆ ئــەوەی تەشویقی کەن کە لە فەسڵی‌دا هەبێ هێندێك ئازادی‌یان هەیە کە لــە چوارچێوەیــەکی موعەییەن‌دا قیمەتەکە کەم‌و زیاد بکەن.

* مالکییــەتی خسووســی، مالکییــەتی وەســایلی تــەولیدە بــەڵام مالکییـــەتی شەخسی: کراس، ماشێن، خانوو، ئەوانەی کە من هەمە. مەسەلەن ئێستا لە وڵاتـــی سۆسیالیستی تـــۆ ٥٠٠ دەســت لیباســت هــەبێ کــەس هیــچ نــاڵێ، بــەڵام فەرزکــە وانێتێکت هەبێ، وانێتەکە بەکار بهێنی بۆ ئەوە یـــەکێکی پــێ ئیستیســمار بکــەی. کارت بۆ بکا، بارت بۆ بکێشێ، ئەوە مالکیەتی خسووسی‌و ئەگەر وانێتەکە بۆخــۆت بەکاری بێنی دەبێتە مالکییەتی شەخسی. یانێ موهیم ئەوەیە کە ئەرکی ئـــەو شــتە کە تۆ هەتە چیە نە ئەوە بۆ خۆی بێ. حەتتا مەسەلەن بیســـتوومە کــە لــە هێندێــك کەڵخۆز خانەوادەی وا هەبووە کە دوو، سێ خانەوادە پێکەوە ئۆتوبووسێکیان کڕیـــوە، ئەوەندە زۆرن بە یەك ماشێن ناتوانن هاتوچۆ بکەن بە ئۆتوبووس هاتوچۆ دەکەن. بەڵام ئۆتوبووسەکە ئیدی بە کرێ نادەن یانێ کەس پووڵ نادا چوونکە ئی خۆیانە. کـــەوابوو ئۆتوبووس دەتوانێ مالکییەتی شەخسی بێ. بەڵام ماشــینێکی شەخســی ئەگــەر تــۆ

بیکەی بە تاکسی بەکاری بێنی یا شۆفێرێکی لە سەر دابنێی ئیستیسماری بکەی ئەوە ئیدی مالکییەتی خسووسیە.

زۆر کەس هەن کە مالکییەتی شەخسیو خسووسی تێکەڵاو دەکەن. شەخسی ئەوەیە کە هی خۆیەتی، ئیستیسماری تێدا نیەو حەتتا دەتوانێ هەرچی پێی خۆش بێ هەیبێ.

کتێبێك هەیە ـ ئەگەر رۆژێك تەرجومە کرابێتەوە کتێبێکی زۆر باشە ـ یەکێك لە کتێبە هەرە باشەکانی شوورەوی لە باری ئیجتیماعیو ئیقتیسادیەو زۆر خۆشیشە. دوو نەفەر نویسەندە نووسیویانە کە یەکێکیان ناوی "میخایل"ەو یەکێکیان ناوی "ئێدوارد"ە. ئەو کتێبە کە لە سەر کابرایەکی فێڵەباز نووسراوە نێوی "بەندەرە". ئەوە زۆر لە شوورەوی‌یە بەڵام زۆر فێڵەبازە، ئەوەندە فێڵەبازە کە پاش ماوەیەکی زۆر، ١٠میلیۆن روبڵی هەیە، ئێستا تەواوی هەمی ئەوەیە کە ئەو ١٠میلیۆن روبلە چۆن خەرج بکا. باشە بیداتە چی؟ هەر بۆخۆی خانوو دەکڕێ، بۆخۆی ماشێن دەکڕێ، خانووی یەیلاقی درووست دەکاو هەمووی بە کەیفی خۆی خەڵاس دەکاو تەواو دەبێ. ئەوەی دیکەش کە دیارە ئەوەندە سەد رووبل قیمەتی زۆر زۆرە، ئەوی دیکە هەرچی دەکات چۆنی خەرج بکا، نە دەتوانێ کارخانە دابنێ، نە دەتوانێ لە بانکی دابنێ، ببێ بە سەرمایەدار، هیچ ناتوانێ بکا. مەقسەدم ئەوەیە کە ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئەوەندە ئیمکان هەیە بۆ مالکییەتی شەخسی ئیدی بۆ مالکیەتی خسووسی ئیمکانی نیە ئەوە.

ئێستا ئەگەر بمانەوێ لە بارێکی دیکەوە ئیقتیسادی پێشکەوتووی سۆسیالیستی لەگەڵ ئیقتیسادی پێشکەوتووی سەرمایەداری موقایسە بکەین، فەرقێکی دیکەشی هەیە. فەرق ئەوەیە کە مەسەلەن بچیە مەغازەی "لافائیت"ی پاریس کە یەکێك لە مەشهوورترین مەغازەکانی دونیایە دەبینی ـ دیارە جاران پڕ بوو لە ئێرانی ئێستا ئێرانی کەم دەچن ـ تەقریبەن بەتاڵە دەتوانی بە ئاسانی بچی هەموو شتێك بکڕی. بەڵام ئەگەر بچیە مەغازەی "هوم"ی مۆسکۆ کە ئەویش مەغازەیەکی گەورەیە لە مۆسکۆ، ئەویش مەشهوورە، جێگا دەست ناکەوێ. ئەوەندە زۆرە یانێ لە موقابیلی ئەو شتومەکە کە لە بازاڕدا هەیە لە وڵاتی سەرمایەداریدا خەڵك ئەوەندە پووڵیان

پیێ نیه، دیاره ئیشکالّه بۆ کڕین. له حالێکدا له ولاتی سۆسیالیستیدا پوولیان پیێه شتوومه‌که‌که ده‌کڕن.

ئه‌وه‌یه که زۆر ئیقتیساددانی سه‌رمایه‌داری هاتوونه‌ته سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕه که ئیقتیسادی سۆسیالیستی ئیقتیسادێکی ته‌قازاییه تا ته‌قازا نه‌دریێ شته‌که نیه. ئیقتیسادی سه‌رمایه‌داری ئیقتیسادێکی عه‌رزه‌ییه یانیێ شت زۆره به‌لاّم خه‌ڵك که‌متر شت ئه‌کڕن. که‌وابوو ئه‌گه‌ر سۆسیالیزم بتوانیێ ئه‌و مه‌سه‌له، که مه‌سه‌له‌یه‌کی زۆر حه‌ساسه حه‌ل بکا، یانیێ ئه‌گه‌ر بتوانیێ شتومه‌ك به ئه‌ندازه‌ی کافی به‌رێته بازاڕیێ، چونکه ئه‌من به چاوی خۆم دیومه که مه‌سه‌له‌ن له پراگیێ ژیاوم، ده‌بینی مه‌سه‌له‌ن ته‌له‌ڤیزیونی ره‌نگی مه‌خسوسیان هێناوه، هه‌ر ئه‌و وه‌خته‌ی که هێناویانه مه‌غازه‌ی، ئه‌من که مه‌سه‌له‌ن ئوستادی دانشگا بووم له گیرفانم ئه‌گه‌ر ٥٠ کرۆنم هه‌بووه زۆر بووه ئه‌و خه‌ڵکه‌ی که به‌ویێدا رۆیشتووه سه‌ف راوه‌ستاوه کڕیویه‌تی. که هه‌ر ده‌ستبه‌جیێ ئه‌گه‌ر سه‌د ته‌له‌ڤیزیونیان هێناوه هه‌ر ده‌ستبه‌جیێ که کالاّیه‌کی تازه‌و جوان بووه بیێ ئه‌وه‌ی بچنه مالیێ پوولی بێنن یا بیبه‌نه‌وه هه‌ر ئه‌وه‌نده پوولیان له گیرفاندا هه‌یه که "بلافاصله" بتوانن ئه‌وه بکڕن. دیاره ئه‌وان زۆرتر ده‌قیقن له خه‌رجکردندا له سالێدا.

شتێکی زۆر ده‌قیقی ئیقتیسادی بۆ من ده‌رکه‌وت له‌ویێ که مه‌شرووباتی ئالکۆلی زۆرتر ودکاو ویسکیو ئه‌وانه سه‌دی بیست گران کرا ـ جا بزانین ئه‌و میلله‌ته چه‌نده ده‌قیقه که ـ پاش سالێك که حیسابیان کرد سه‌دی بیست مه‌سره‌فی ئه‌و مه‌شرووباته هاتبووه خواریێ. سه‌دی بیست گرانیان کرد سه‌دی بیست لیستی مه‌سره‌فه‌که‌ی هاته خواریێ. یانیێ ده‌قیق دایانناوه چه‌ندی خه‌رج بکه‌ن. دیاره ئه‌من له ئیقتیسادی گه‌وره، ئیقتیسادی ئیداره کردنی ولاتێك له‌وه زۆر باش ده‌زانم به‌لاّم له ئیقتیسادی خۆم زۆر خراپ ده‌زانم. له‌به‌ر ئه‌وه هه‌موو وه‌ختیێ گالته‌یان دێت.

مه‌سه‌له‌ن ئه‌من دۆستێکم هه‌بوو یه‌عنی ئه‌وه‌ی که من مه‌سه‌له‌ن ده، دوازده دۆستێکم هه‌بوو که له‌گه‌لێ من کاریان ده‌کرد. ئه‌من که ده‌چووم کارم ده‌کرد ئه‌وانیش ده‌هاتن. مه‌سه‌له‌ن هه‌موو جاریێ ئه‌وان بوون که پوولیان به قه‌رز ئه‌دا به من، له حالێکدا که من هه‌موو جاریێ سیێ، چوار به‌رانبه‌ری ئه‌وانم وه‌رده‌گرت. فه‌قه‌ت مه‌قسه‌دم ئه‌وه‌یه ئه‌وان ئه‌وه‌نده ده‌قیقن له پاشان به‌ڕاستی ئه‌و پووله هه‌یه.

* لە ولاتانی سۆسیالیستی بە گشتی بەلام لە چێکۆسلۆواکی بە هەر یەك نەفەر بە مندالەوە یەکێ ٢٠٠٠٠ تا ٢٥٠٠٠کرۆن، دیارە ئەوە وەك ئەمن وایە کە لە بانكدا هەیە، خانەوادەیەکی چوار نەفەری ١٠٠٠٠٠کرۆنی هەیە ئەگەر تەقسیمی کردووە ئیوا هەیە زیاتری بووە، ئیوا هەبووە کەم بووە. دیارە فەرقێکی دیکەی سۆسیالیزم ئێستا کە باسی دەکەین ئەوەیە کە دەگەڵ ئەوە دوو نەوعن یەکێکیان هەیە کە سوودیان ناوێ فەقەت دایدەنێن بۆ ئەوەی کە نازانم جارجار مەسەلەن قورعەکەشییەکی دەکەن شتێکیان دەدەنێ جارجارێکیش زۆر کەم نازانم چەندە دوو سێ لە سەدە زۆر کەم دەدەن بە کەسی نەناس زۆر کەم دەدەن چووزانم چونکە ئەمن وەکو خۆم بەڵێ نیسبەتی هەیە.

واقعییەت ئەوەیە کە لە ولاتی سۆسیالیستیدا بە دوو عیللەت تەوەڕوم پەیدا دەبێ. یەکێکیان ئەو هۆیە کە باسم کرد کالاکە کەم بوو و پوول زۆر بوو تەوەڕوم پێك دێ. یەکی دیکەش بیانەوێو نەیانەوێ جاریێ ئیقتیسادی سۆسیالیستی لە ژێر تەئسیری هێندێ قەوانینی ئیقتیسادی سەرمایەداری دایە. چونکە لە بازاری جیهانیدا ئیقتیسادی سەرمایەداری خەت ئەدا، نیشان ئەدا. لە نەتیجەدا تەوەڕومی ئیقتیسادی سەرمایەداری تەئسیر دەکاتە سەر ئیقتیسادی سۆسیالیستی.

بەو دوو عیللەتە لە ئیقتیسادی سۆسیالیستیدا تەوەڕوم پێكدێ. بەلام تەوەڕومەکە زۆر سەبرتر، زۆر کوندترە لە ولاتی سەرمایەداری. یەکجار زۆر فەرقی هەیە. مەسەلەن فەرزکەن لە ١٥سالاندا قیمەتی نان نەگۆڕاوە، مەبەست ئەو شتانەی کە دەوڵەت پێی وایە کە شتی ئەساسین. تەقسیمی دەکەن بە شتی ئەساسی، بە شتی لوکس. لە شتی لوکسدا قیمەت کەمتر دەچێتە سەرێ. مەسەلەن فەرزکە ماشێن ئێستاش لەو ولاتانە بە شتی لوکس دانراوە جا لەبەر ئەوە ئوستادێکی دانشگا مەسەلەن دەبێ ١٠ مانگ کارێ بکا تا ماشینێك بکڕێ. لە حالێكدا لە غەرب مومکینە بە مانگێك یان دوو مانگان بتوانێ ماشینێ بکڕێ. ئەوە ماشین بەلام لە موقابیلدا مەسەلەن ئەمن لە بیرمە کە بە ١٥ سالان جارێك قیمەتی گۆشت، شیر، پەنێرو نانو ئەو جۆرە شتانە، کرێخانوو و ئەوانە دەگۆڕدرێ.

ئەوە ئیدی شتی، بۆچوونی ولاتی سۆسیالیستی یانێ ئیقتیسادی سۆسیالیستی، ئیقتیسادی سەرمایەداری لەو شتانەدا زۆر فەرقی هەیە. ئەوەی دەوڵەت دەیدا لە

ولاتی سۆسیالیستیدا فەرق دەکا، لــە حــالێکدا ئــەوەی دەوڵــەت دەیدا لــە ولاتــی سەرمایەداری زۆر فەرقی هەیە. ئەوەی کە فەردیـیــە، مالکییــەتی خسووســیـیە لــە ولاتی سەرمایەداریدا، چونکو رەقابەت هەیە هەرزانترە، مەسەلەن کرێخانوو ئەسڵەن قابیلی موقایسە نیە لە ولاتـــی سۆسیالیســتی زۆر کەمــە، هــەروا ســینەما، هــەروا فەرهەنگ بە گشتی هەروەها لە موقابیلدا مەســـەلەن لیبــاسو حــەتا خــواردنو زۆر شتی دیکە بە تایبەتی خواردنی باشتر لە ولاتی سەرمایەداری زۆر هەرزانترە.

ئــەوە دیــارە شــتێکە کــە بۆخــۆی قــانوونێکی هەیــە مەســەلەن هـــــەرچی ولات پێشکەوتووتر بێت خەڵك کەمتر لە داهــاتی ســەرانە دەدا بــە خــواردن. فەرزکــە لــە دێهاتی کوردستان مومکینە ئەو زەریبە سەدی نەوەد بێ، سەدی دەی داهــاتی خــۆی دەدا بە شتی دیکە، شتی دیکە دێنێ کە زۆر کەمە بـــاقی هــەموو دەمێنێتــەوە بــۆ خواردن. هەرچی فەقیرتر بێت، لــەو مەحەوەتانــە خانەوادەیــەکی فــەقیری دە، دوازدە نەفەری بێ، داهاتی مەسەلەن بڵێین مانگێ هـــەزار تمــەن بێــت لــەوە ٨٠٠ الی ٩٠٠ تمەنی دەچێ بۆ خواردن. بەلاّم مەسەلەن دەبینین لە ئامریکا ئێستا ئەوە سەدی بیستی داهاتەکــەی دەچــێ بــۆ خــواردن. ســەدی هەشــتای دەمێنێتـــــەوە. مەســـــەلەن لــــە چێکۆسلۆواکی ســـەدی چلــی داهاتەکــە دەدا بــە خــواردن. فەرزکــەین چێکۆســلۆواکی موقایسە بکەین لەگەڵ فەرانسەدا، ئەتۆ بتهەوێ لیباس، کەوش بۆ منداڵەکەت بکڕی زۆر هەرزانترە لە چێکۆسلۆواکی هەتا لــە فەرانســە. بــەلاّم تــۆ ئەگــەر مەشــرووباتی ئەلکولی بکڕی لە فەرانسە زۆر هەرزانترە تا چێکۆســلۆواکی، چوونکــە ئــەو قیمــەتی مەشرووبی توند مەسەلەن "وتکا" دەباتە ســـەرێ، دوو ســێ هێنــدەی دەکــا بــە دوو دەلیل، چوونکە نایهەوێ خەڵکەکە مەشرووبی زۆر بخواتەوە، مەخسووسەن مەشرووبی توند زۆر بخواتەوەو لە پاشان دەیهەوێ لەوە ئیستیفادە بکا پارەیەکی، پوولێکی زیاتر دەست کەوێ بۆ ئەوەی فەرقی ئــەوەی کــە مەســەلەن لیباســی منــدالاّن بــە هــەرزان دەفرۆشێ، لەوێ فەرقەکەی لابا.

ئەوە بۆچوونێکی دەوڵەتییــە، نــیزامی سۆسیالیســتییە. چــون مەســەلەکە ئــاوا مەترەحــە دەوڵــەتیش تــەسمیم دەگــرێ ئــەوەی دەکــا بــەلاّم خــۆ ئــەتۆ لـــــە ولاتـــــی سەرمایەداریدا ئەوەی ئــەلکولی دەفرۆشــێ یــەکێکی دیکەیــەو ئــەوەی کــە جلکــی مندالاّن دەفرۆشێ یەکێکی دیکەیە. ئەوە ناتوانێ لەوێ جێبەجێی بکا. ئــەوە فــەرقی

هەیە، یانیٚ هیٚندیٚ شت زەروریاتــەو ئەساســی‌یە لەوانــەدا. تیٚ‌دەکۆشــن قیمەتەکــە هەرچی کەمتر بیٚت باشترە، هەرچی سابت‌تر بمیٚنیٚ باشترە. مەســەلەن فەرزکــە ئــاوە، بەرقە، تەلەفوونە، پۆستە، بیٚهداشتە، بیٚهداشت تەقریبــەن لــەو ولاٚتانــەدا مەجانیــە، ئەوانە سابیتن. مەسەلەن کتیٚبە، کتیٚب چاپ ناکریٚ، من بۆخــۆم تــا ئــەو وەختــە لــە ئورووپا بووم چی کتیٚبیٚکی ئەوەی کە مەربووت بوو حەتا لە دوورەوەش، ئەدەبیش با دەرچووبا لە پیٚشەوە خەبەرم دەدا بە ئیســتیلاح کــە بــۆم بنــیٚرن، پوولــم دەدا. بــەلاٚم ئەگەر یەك چوارەمی ئەوە بمویستبا لە فەرانسە بکڕم دەبوا هەموو شتیٚکمان دابا بــە کتیٚب‌و پالٚم دابایەوە. چونکو قیمەتیان زۆر فەرقی هەبوو.

کتیٚب‌و ڕۆژنامە، فەرهەنگ مەسەلەن، سینما، تەئاتر، تەئاتریٚکی کە دەچــی لــە پاریسیٚ دەبیٚ مەسەلەن ١٠٠ فرانك بدەی، لە حالیٚك‌دا ئەو تەئاترە سەبکیٚکی کۆنە. بۆ یەکیٚك دەبیٚ کە "روشنفکر" بیٚ‌و زیاتر بە فەرهــەنگی بــژی، نــانی کــەمتر بخــواو ئەنواع گۆشتی نەبیٚ وەکوو لە فەرانسە هەیەو ئینســان نیٚوەکانیشــیان نــازانیٚ. ئــەوە بۆوان باشترە. ئەگەر مەسەلەن یەك، دوو کیلو مەسەلەن خواردن‌و خواردنەوەو ئەوانــە بیٚ دیارە ئەویٚ باشترە. ئەوە ئەو فەرقە بوو کە دەبیٚ عەرزتان بکەم.

لە حالیٚك‌دا لە ئیٚرانی خۆمان یا لە فەرانسە فەرقەکە جاری وا هەیە لە یەکەوەیــە هەتا هەزار. یانیٚ ئەوە کە دەبینی یەك نەفەر هەیە کە داهاتی هەزار تمەنە مــانگیٚ، ئی دیکەش هەیە کە داهاتی یــەك میلیــۆن تمەنــە مــانگیٚ. یــانیٚ هــەزار بەرابــەری ئەوەی‌دی‌و ئەوە لە ئالٚمانیٚ کەمیٚ کەمتر، لە سوئیٚدیٚ زۆر کەمترە، لــەویٚ توانیویانــە تا ڕادەیەك مەحدوودتری بکەن. بەلاٚم لە چیٚکۆسلۆواکی مەسەلەن حەدی‌ئەکسەر یەك هەتا دەیە. ئیستیسنائەن لەوە زیاتر جاری وا هەیــە ١٠٠٠ تمــەنی هەیــەو یــەکی‌دی ١٠٠٠٠ تمەنی هەیە. نووسەریٚکی زۆر مەسەلەن موهیم، مەسەلەن هونەرپیشــەیەکی زۆر موهیم یــا نووســەری کتیٚبیٚــك کــە کتیٚبەکــەی مەســەلەن ١٠٠٠٠٠ نوســخەی دەفرۆشریٚت یا عالمیٚك کە مەسەلەن شــتیٚکی کەشــف کــردووە مومکینــە مەســەلەن بگاتە ٢٠٠٠٠ یا زیاتر. بەلاٚم ئەوە ئیستیســنایە، ئــەوە یــانی لــە ســەدی یــەکیش کەمترە. بەلاٚم ئەوی حەدەئەقەل وەردەگــریٚ‌و ئــەوی‌دی دەیــە، فەرقەکــە زۆر کەمــە. داهات فەرقی هەیــە هــەموویان وەك یــەك نیــە بــەلاٚم فەرقەکــە زۆر کەمــە، وەزیــر ١٠٠٠٠کرۆن وەردەگریٚ، فرووشەندەیەك (کچیٚکی ١٦ـ١٥ سالٚە کە تازە دەچیٚتە نیٚو

کار) داهاتی کەمتر وەردەگرێ. بەڵام ئیدی یەك بە هەزار نیە. لە پاشـان یـەك شـتی دیکەش کە پێموایە موهیمە ئەوەیە کە سەدی دەی خەڵکەکە لە بەینی ئەوانەیـە کـە لە هەمووان کەمتر وەردەگرێ، سەدی دەش لەوانەیـە کـە زۆرتـر وەردەگـرێ، سـەدی هەشتا داهاتیان مەسەلەن بـەینی ٢٥٠٠ تـا ٤٠٠٠ە، یـانێ تەقریبـەن وەك یەکـە. سەدی دە مەسـەلەن ١٠٠٠٠، سـەدی دەش ١٠٠٠، بـەڵام ئیـدی سـەدی هەشـتای خەڵکەکە داهاتیان لە نێوەنج دایەو ئەوە یەك شتی هەیە مومکینە داهات کەمتر بێ لە سۆسیالیزمدا. وڵاتانی سۆسیالیستی ئەگەر چێکۆسـلۆواکیو ئاڵمـانی شـەرقی لـە نەزەردا بگرین، یانێ ئەو وڵاتانە پاشکەوتوو بوون لـەپێشدا. بـەڵام هـەرچی داهـات هەیە زۆر عادڵانەتر دابەشی دەکەن. زۆر عادڵانەتر لە وڵاتـی سـەرمایەداری دابـەش دەکرێ.

چێکۆسلۆواکیو ئاڵمـان فـەرقیان هەیـە لەگـەڵ زۆر وڵات بـەڵام فەرقەکـە لـێرە کەمترە، فەقەت لە شوورەوی ئەو فەرقە جاران زیاتر بـوو، رۆژبـەڕۆژ کـەمتر دەبـێ. ئێستا مەسەلەن یەك هەتا پانزدە مومکینە مەسەلەن حەتا ئەکسەرییەتی کـەمتریش بێ ئێستا. کەمتر بوونەکە ئەوەیە کە ئی سەرێ کەم ناکەن، ئی خوارێ، یانێ ئـەوەی هەزارەکە وەردەگرێ ئەوی رۆژبـەڕۆژ پووڵـی زیـاتر، توندتـر دەچێتـە سـەرێ. ئـەوی دیکەیان یان ناچێتە سەرێ یان زۆر کەم دەچێتە سەرێ. بەڵام ئەگەر ئینسان حەق بڵێ ئەگەر ماڵیاتەکەی حەسێب بکەین، ئێستا وڵاتێکی وەك سوئێد کە سـەرمایەدارییە لـێرەشدا ئەگـەر ئیستیسـمارو سـەرمایەدارەکانو ئەوانـەی لێ دەرکـەین فەرقەکـە کەمترە. ئەوانەی حقووق بگرن فەرقەکـەیان هـەر تەقریبـەن ئەوەندەیـە. جـا ئیـدی مەسەلەن لە ئامریکا لە وڵاتەکانی دیکە بە تایبەتی فەرانسە لە ئاڵمان باشـترە، لـە فەرانسە فەرقەکە زۆر زۆرترە. ئیوا هەیە بەڕاستی داهاتی ١٠میلیۆنە لە مـانگێدا، ١٠میلیۆن فرانك. ئـیواش هەیـە ١٠٠٠ فرانـك یـانێ یـەك بـە دەهـەزارە ئـەوەش فەرقیانە.

* لە سۆسیالیزمدا سێ شت لە نەزەر ئەگرن بۆ ئەوەی حقووق بدەن بە کەسـێکی. یـەکێکیان کەمییـەتی کارەکەیـەو یـەکێکیان کەیفییـەتی کارەکەیـەو یـەکێکیان ئەهەمییەتی کارەکەیە. بە پێی تیئۆریی مارکسیستی دەبـێ لـە رووی کەمییەتـەوە بدەین، بەڵام مارکس کار تەقسیم دەکا بە کاری "سـادە"و کـاری "مرکـب". کـاری

ساده کاری کرێکارێکی سادەیە کە کاری ساختمانی دەکا. کاری "مرکب" کاری ئەو موهەندیسەیە کە کاری ساختمانی دەکا ئەوە ئەو کارەیە کە پێشتر مەسەلەن ٦ ساڵ تەحسیلی کردوە، کاری کردوەو ئەوە کۆبۆتەوەو ئێستا دەبێ حەقەکەی وەرگرێ. ئەوە مارکس بەو جۆرە حەسێبی دەکات. دیارە بەگشتی کرێکارێك دەبێ کەمتر لە موهەندیسێك حقووق وەربگرێ، ئەوەش بەجێیە یانێ ئەگەر کەیفییەتو کەمییەتەکەی لە نەزەر بگیرێ. بەڵام لە هەموو وڵاتێکدا ئەو عامیلی سێهەمەیش تەئسیری خۆی هەردەکا، ئەویش ئەهەمییەتەکەیەتی. ئەهەمییەت چیە؟

... بە فەرزی میسال سێسەد میتر بچیە بن عەرزی لەوێ کاری بکەی وەك پاداش ئەگەر پووڵێکی زۆرتر نەدەی بە کارگەرێك حازر نیە ئەو کارە بکات، چوون کارەکەی زۆر سەختە، حاڵی عەرزم بوون، ئەهەمییەتی ئەو کارە بۆ ئیقتیسادەکە زۆرترە. کەوابوو ئیستێسنائەن کارگەرێکی زوغاڵسەنگ مومکینە لە موهەندیسێکی ساختمانی زیاتر حقووق وەرگرێ.

ئەوەی کە دەڵێن کارگەر زۆرتر وەردەگرێ لە وڵاتی سۆسیالیستیدا، جارجار ئەوەیە، چونکو ئەو کارە کارێکە کە کەس حازر نیە بیکا. وەکوو کارگەی ئۆرانیۆم، دەزانن ئەوانەی کە لەگەڵ ئۆرانیۆم کاری دەکەن ئەگەر فیزیکدان لێرە هەبێ دەبێ کە پێمان بڵێ کە ئۆرانیۆم شۆینی خراپی لە سەر ئۆرگانیزمی ئینسان هەیە. حەتا ئەو دوکتورانە کە کاریان تەنیا رادیۆگرافییە، عەکسبەرداری دەکەن بۆ ئەوانیش خەتەرە ئەگەر مانعێکی گەورە درووست نەکەن تەئسیر دەکا لە سەر ئۆرگانیزمیان. ئەوە خەتەری گیانیی هەیە بۆیان. جا کەسێ کە دەچێ لە مەعدەنی ئۆرانیۆم کاری دەکا، دیارە دەبێ حقووقێکی زیاتر وەربگرێ هەتا حازر بێ بچێ ئەو کارە بکا. چونکو ئەکسەرەن کە دوو ساڵ، سێ ساڵ لەوێ کار دەکەن ئەوێ جێدێڵن. لەو دوو، سێ ساڵەدا کار دەکا دەبێ ئەوەندەی حەوت ساڵان حقووق وەربگرێ، دەنا ناچێ ئەو کارە بکا. چونکە ئەهەمییەتی ئۆرانیۆم بۆ ئیقتیسادی وڵاتەکە یەکجار زۆرە لە سەر ئەو ئەساسە حازر دەبێ بچێ.

کەوابوو تیکراری دەکەمەوە کەمییەتی کارەکە، کەیفییەتی کارەکەو دیارە ئەهەمییەتی کارەکە، ئەو سێ ئەسڵەیە کە حقووقی هەموو ئینسانێك لە وڵاتێکی سۆسیالیستیدا تەعیین دەکات. ئەوە هیچ مەعنای ئەوە نیە کە لە سۆسیالیزمدا

فروفێڵ نیە، ئەویش هەیە، جاری وا هەیە دەبینی مەسەلەن دزی دەکا یا حوقەبازی دەکا یا بە کارێکی کەم، دەبینی مەسەلەن چ دەکا، ئەوەم بە چاوی خۆم دیوە مەسەلەن کابرایەك دادەنیشێ ٥سالاْن زەحمەت دەکێشێ کتێبێك دەنووسێ، شتێکی باشە، کتێبەکە ئەگەر چاپ ببێ مەسەلەن مومکینە پوولێکی زۆریشی بدەنێ، بەلاْم هیواش هەیە کە دەچێ لە دوو سێ کتێبی خارجی هێندێ شت لەم لا کۆ دەکاتەوەو هێندی لەو لا مەسەلەن شتی زۆر ئەوا مەسەلەن یا پەندو مەتەڵە کە زۆر مەرغووبە لە لای خەڵکی لە دوو بەرگان چاپی دەکاتەوە زۆر زۆرتریش دەفرۆشرێ، شتێکی واقعیە مومکینە دووهەزار نوسخە بفرۆشێ، کتێبێك لە سەر کەشفێکی ئەتۆمی چاپ بکەی تۆ مومکینە سەد کەس عەلاقەیان بێ ئەو کتێبە تەماشا بکەن، بەلاْم کتێبی رۆمانێکی شیرینی عاشقانە بێت مومکینە دووسەد هەزار کەس، سێسەد هەزار کەس ئەو کتێبە بکڕن، یا مەسەلەن شتێکی شەرقی بێ داستانی هەزارو یەك شەبی تەرجومە بکەی مومکینە زۆرکەس بیکڕن. جا ئەوەش دەزانن کە ئەوە مومکینە هەر بەڕاستی راستەوخۆ دزی بکا.

مەسەلەن زۆر سەیرە دەوڵەمەندترین ئەشخاسی ولاْتی مەسەلەن سۆسیالیستی ئورووپا کە بژی لەوێ نەك ئەوەی کە لە کتێبەوە شتێك دەربێنن، مەسەلەن سەلمانی یەکێك لەو شوغلاْنەیە ئەویش نە لەبەر ئەوە نرخی گران بێ، نەخێر دوو، سێ فیلمی ئێرانی تەرخان دەکا، بەلاْم ئەو ئەنعامەی کە وەردەگرن ئەوە حقووقەکەی ئەوەندە زۆرە کە دەبینی لە سەری زیادە یا لەو باشتر گارسۆنی ریستوورانە، باشترین کارە چونکو ئەنعامیش وەردەگرێو ئەمن بۆخۆم بە چاوی خۆم دیومە گارسۆنێك هاتووە کە زۆر دەچوومە ئەو ریستوورانەی،ساڵەهای ساڵ لە سەرەتاوە کە هاتبوو هیچی نەبوو، پاش سێ، چوار سالاْن، خانوویشی هەبوو و ماشینیشی هەبوو، پوولێکی زۆریشی هەبوو، بۆ خۆیشی ئاشنام بوو بۆی باس دەکردم، داهاتی سەعاتی تەقریبەن دوو هێندەی داهاتی من بوو کە ئوستادی دانشگا بوومو ئەوە دیارە موخالیفی ئەو سێ ئەسڵەیە، رێگایشی نیە تا ماوەیەکی زۆر ناتوانین پێشی پێبگرین. چونکو ئەو کارە موشەخەسە، ئەوەی لەگەڵە.

مەسەلەن ئەگەر جاران ئەنعام نەبوو، ئەنعام لە ژێر دەسەلاْتی شارەدارێك بوو فەقەتو بەڕاستی دەردەچوو، جا هەرچی حەز دەکەی دانیشەو هەر دانیشە.

نەتیجەشی ئەوە بوو دوو کەس، سێ کەس لەوانەی کە دەیانزانی کـە چیـە، شـتێکی تازەیان بە دزی وەردەگرت، دەبینی ئەتۆ لێرە دانیشتووی، ئاغایەك لێرە دانیشـتووە، تازە هاتووە دەڵێ فەرموو، ئیحترامی بۆ دادەنێ، یا لە سەرماڵەکەوە بێ با راحـەت دانیشێ، هیچ نابێ لە لایەکەوە میوانەکەی برێ لێ‌نزیکە. ئاغا بۆخۆی خۆی تەحریك کردوە، یانێ مەقسەدم ئەوەیە نەوعی کارەکە وایە،ئی سەلمانی وایـە، ئـی خـەیاتیش وایە، هی زۆر شتی دیکەش. بەلاّم مەسەلەن سـاتێ موعـەلیم لـە هـەمووان حـاڵی خراپترە، موعەلیمو جامیعەیە دیاری دەکا چەند وەربگرێ، بە پێی زانسـتی‌یە.جـاران نەبوو، جاران لە بیرمە هیچ نەبوو زۆریش باش بوو، بەلاّم ئێستا ئەوە فێر بـوون. جـا ئەوە مەقسەدم ئەوەیە ناڵێم هەمووی وایە هی‌واش هەیە ئێسـتا وەرنـاگرێ، فەقـەت مەقسەدم ئەوەیە کە هێندێ کار هەیە دەتوانـن. یـا مەسـەلەن سـەوزی فرۆشـی زۆر ئازادە جا زۆر قازانج دەکا میوەکە دێ، خەڵك زۆر رادەوەسـتێ، ئـەتۆش ئیحتیـاجت هەیە، مەحتەڵی ئەوەی کە نۆبەت بێ، ئەوە مۆزە، ئەوە پرتەقاڵە، دەبینی کـە چـۆن سەرقاڵە ئەویش میوەکەی دەفرۆشێ جا ئەویش مەسەلەن لە هـەر کیلـوێ مەسـەلەن بیست گرەم، مەسەلەن بیست گرەمی لادەبا، ئەوە بۆخـۆی دەکاتـە چـەند کیلـۆ. بـە ئەکسەری ئەوانەی میوەفرۆشو بەقاڵو نازانم ئەم جۆرە شتانەن ئەم کارە دەکەن.

* بەڵێ دزی‌یە، ئەکسەرەن دزی دەکەن. ئەو جۆرە شتانە کە دەکرێ ئینحرافە لـە پەدیدەکە کە گوتمان، پەدیدەیەکە میوەفرۆش کەمی دەفرۆشێ. کە ئـەوە دزی‌یـە لـە هەر شوێنێکدا بێ. بەڵێ زۆر جالب بوو، زۆریش، ئەمن جارێك لە شـوێنێکدا لـەوێ بووم، ئەمن دیتم بە چاوی خۆم کە بە تایبەتی لە پووڵەکەدا بـە خەڵکەکـەی دەڵێـی یەکێکە هەمووی تەحسیلاتی لە پێشـە بـەلاّم چـی بـە خەڵکەکـە دەڵـی مەسـەلەن فەرموو، مەسەلەن کیلۆیێ سەدو بیستو حەوت گرەم، ئـەوەندە دەکـا. ئـاخر دەبـێ ئیدی بەڕاستی مەسئوولی فەردی داوەری لێبکا، جا ئەمن چونکـو لەوەکـە ریازیـاتم زۆر باشە کە چوار جـار متەوەجیـە بـووم، کـە ئـەوە زیـادی دەڵـێ. بـەلاّم جـارێك راوەستابووم لەوێ کابرایەك لەوێ راوەستابوو پشتی من، گوتم فەرموو، گوتی؛ قەینا. وتم ئەو خانمەش چونکە پیرە با شتی دەوێ، شـتەکەی بکـڕێ لـە پاشـان گـوتم؛ ئـەو ئاغایەش، پێی سەیر بوو، باشە چۆنە ئەمە رێگا دەدا بە هەموو کـەسو خـۆی لـێرە راوەستاوە، پاشان کە ئەمن چوومو ئـەوی دیکـە چـوو، ئـەوی دیکـە هاتـە پێشـێ،

کاسەکەی هێنا پێشیۆ گوتی ئەمن لەو سێ چوارکەسە کە رۆیشتن لە هەمووانم زیاتر دەوێ، وەلاٚ نەیاندایەو کاسەکەشیان لێ ئەستاندو کابراشیان دەرکردو جەریمەیەکی زۆریشیان کرد.

بەلاٚم ئەوە ئیدی خۆ هەموو وەختێ ناکرێ یانێ دەبێ بۆ بەعزە شوێنێکیش بازرەسی دابنێی. ئەوە زەحمەتە مەسەلەن بەڵێ ئەدی ئەوە هەیە، ئینسانی وا هەیە ئیستیفادە دەکا یا مەسەلەن لە شتی دیکەڕا ئەبینێ مەسەلەن جاری وا هەیە ئیجبارییە، ئیجباری بۆ ئەو کەسەی کە دەیهەوێ، مەسەلەن دەیهەوێ خانوو درووست بکا، پوولێو شتیشی نیە. دەچێ لە جێگایەك لە کارخانەیەك مەسەلەن لەگەڵ یەکێك رێك دەکەوێ پوولێکی زیادی دەداتێ. ئەو لە کارخانەکە دەدزێ سەیری وا زۆر هەیە، مەسەلەن بۆ ئەو جۆرە شتانە مەخسووسەن قسە دەکەم.

بەلاٚم پوولی ئەسڵییەکە لە سەدی ئەقەلەن نەوەدی خەڵکی لە سەر ئەو سێ شتە ئێستا حیساب دەکەن، کەمییەتو کەیفییەتو ئەهەمییەت. کەوابوو ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵی سۆسیالیستی ـ کە دەمەوێ ئیدی تەواوی بکەم چونکو زۆر حاشیە رۆیشتین بەلاٚم پێموایە خراپ نەبوو ـ خولاسەی بکەین بێجگە لەوەی کە هەڵسووڕانەکەمان روون کردەوە، بەرتەریی ئەو کۆمەڵە بە سەر کۆمەڵی سەرمایەداریدا لە دوو شت دایە لە باری ئیقتیسادییەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە رادەی هەڵدانو روشدی زۆرترە لە سەرمایەداری. لە حاڵێکدا لە سەرمایەداری بە متەوەست ساڵێ چوار، پێنج دەرسەد ئیقتیسادەکەی دەچێتە سەرێ، هی سۆسیالیزم لە ساڵێکدا ١٠،٩ دەرسەدە، حەتتا زیاتریشە، بە تایبەتی لە سەرتادا لەوەش زیاترە ئەوە یەك. دووەم ئەوەش کە دەڵێم دەچێتە سەرێ یانێ داهاتی نەتەوایەتی (درآمد ملی) دەچێتە سەرێ، هی ئیقتیسادی سۆسیالیستی حوسنی دیکەی ئەوەیە کە ئەو داهاتە میللییە کە دەچێتە سەرێ ئاگاهانەتریش دابەش دەکرێ کە تەوزیعەکەی زۆر عادلاٚنەترو باشترە، ناڵێم بە تەواوی عادلاٚنەیە، عادلاٚنەترە لە سەرمایەداری، بە تەواوی کەنگێ عادلاٚنە دەبێ؟ ئەو وەختە کە بگاتە کومۆنیزم، کە نەگەیشتووە. ئەوەیە خسووسیاتی سۆسیالیزم دیارە لە حاڵێکدا لە سەرمایەداریدا ئیستیسمار هەیەو مومکینە کەسێك هیچ کارێك نەکا، داهاتێکی زۆری دەست کەوێ، لە سۆسیالیزمدا داهات بە پێی کارە، بە پێی

ئەو سێ ئەسڵە کە باسمان کرد، کەمییەتو کەیفییەتو ئەهەمییەتی کارەکەیە، ئەوە سۆسیالیزمە.

دیارە سۆسیالیزم تەنها مەرحەلەیەکە لە سیستمێك کە ئێمە باسی دەکەین. ئەگەر ئیمپریالیزم مەرحەلەیەك بوو لە سەرمایەداری، سۆسیالیزم مەرحەلەیەکە لە کومۆنیزم، سۆسیالیزم بۆخۆی سیستمێکی تەواو نیە. مەرحەلەیەکی سەرەتاییە لە سیستمی کومۆنیستی، کە ئێستا ئەگەر ئیجازە بدەن دەمهەوێ باسی بکەم، ئەگەر زۆر ماندوو نەبن.

دیارە هەر کەلیمەی کومۆنیزم بۆخۆی لە ولاتی ئێمە وەکو شتێك دانراوە کە سەرەتانە، هەرکەس کومۆنیست بێ خراپە، هەرکەس کومۆنیست بێ لەوێ پێی دەڵێن کافرو زۆر کەسیش ئاوا تێدەگەن کە دژی ملّكو میللەتە، ئەوانە لە جێگای خۆی، بەلاّم لە باری عیلمییەوە، لە باری ئیقتیسادییەوە باسی کومۆنیزم دەکەین.

کومۆنیزم یانێ ئەوە کە هەرکەس بە ئەندازەی قانوونیی خۆی کار بکاو بە ئەندازەی ئیحتیاجی خۆی وەربگرێ، نە بە ئەندازەی کارەکەی خۆی. ئیدی لێرە کەمییەتو کەیفییەتو ئەهەمییەتی کارەکە ڕۆیی، ئەوە کەنگێ مومکینە؟ ئەوە وەختێك مومکینە ئەوەڵەن ئەو دوو مالکییەتە لە واقیعدا لەبەین بچن، ببێتە یەك مالکییەت، مالکییەتی کەلخۆزی نەمێنێت، چونکو ئەسڵی مالکییەتی شیرکەتی تەعاوەنی ئەوەیە کە هەرچی داهاتی شیرکەتی تەعاوەنی زیاتر بوو زیاتری دەوێ. ئەگەر وەزعەکە ئاوای لێهات ئیدی پێویست بەوە ناکا کە مالکییەتی دەستەجەمعی هی چەند نەفەر بێت دەبێتە مالکییەتی هەموو کەس چونکو هەموو کەس دەتوانێ بە پێی ئیحتیاجی خۆی شت وەربگرێ. دیارە ئەو ئیحتیاجە لێرە تەفسیری کوردانەی نیە، ئیحتیاج ئەوە نیە کە من بڵێم وەلا ئیحتیاجیم بە حەفتا میلیۆن تمەن هەیە ئەوە ئیدی کابرا تەواو ئیحتیاجی پێیەتی؟ ئەوە ئیحتیاجی واقیعی نیە. بەلاّم پاشان دیارە ئەسڵیش ئەوەیە کە بەڵکو تەفەکوری خەڵکەکە بگۆڕدرێ. دەنا بازاڕییەکی مەهابادی کە تەواوی خسووسیاتی ئەوەیە کە مالکییەتی خسووسی خۆی بپارێزێ ئەوە ناتوانێ لە نیزامی کومۆنیزمدا لە باری ئەخلاقییەوە بژیتو بڵێ پێمخۆشە کە هەموو شتەکە هی من بێت. ئەوە شتێکی تەبیعییە ئەوە مالکییەتی خسووسی ئەوەندەی تێدا بە قووتە.

ئەوە ئاکامی کومۆنیزمە لە باری ئیقتیسادی‌یەوە تەئسیری داناوە. بۆ ئەوە، ئەوە جیٚبەجیٚ ببیٚ دەبیٚ ئەو مالکییەتە ببێتە یەك، دوویش دەبیٚ ئەوەندە ئیقتیساد، سەتحی ئیقتیسادی، سەتحی بە تایبەتی بازدەهی کار (حاصل بخشی کار) ئەوەندە بچێتە سەریٚ کە بەڕاستی هەموو کەس بتوانیٚ بە ئەندازەی ژیانی خۆی بخواو بە ئەندازەی کافیشی هەبیٚ چونکە ئەگەر وا نەبیٚ ئەوەیە کە پێم‌وایە جارێك لێرە باسم کرد، رۆژێك بە چەند جەوانێك نامەیەکیان نووسیبوو بۆ لنین کە وەختێك رەئیسی جمهووری ئیتیحادی شووروەوی بوو، ئەو لەگەڵ جەوانان زۆر موناقشەی دەکرد، کاغەزێکیان بۆ نووسیبوو کە ئێمە کومۆنیزمان دامەزراندوە چونکو بیست کەسین یەك شەلوارمان هەیە، هەموو رۆژیٚ یەکێك لە ئێمە ئەو شەلوارە لەپیٚ دەکا. ئەویش لە جوابی کاغەزەکەی‌دا نووسیبووی ئێوە لە ئیشتبادان کومۆنیزم ئەوە نیە کە بیست کەس شەلوارێکی هەبێت بەڵکوو هەرکەس بیست شەلواری هەبیٚ.

واتە مەبەستی ئەوە نیە کە خۆ بە تەنیا عموومی‌یەکە شەرت بێت، ئەگەر وابوو قبووڵیان نەبیٚ کە ئیستیسمار نەبن بەلاّم دیتمان وەك چۆن لە کومۆنیستی داهاتوودا ئەوەیە کە کالاّ بە ئەندازەی کافی هەبێتو لە واقیٚعدا ئەگەر دوور برۆین برێك دەبیٚ پووڵیش نەبیٚ کە ئەگەر تەوزیع بکریٚو ئەگەر نەچیٚ لە بازاڕیٚ بکرێو ئەگەر حقووقێکی نەبیٚ بە پێی کەمییەتو کەیفییەتو بە پێی ئیحتیاج بیٚ، دەی پووڵمان بۆچی‌یە؟ کەوابوو یەکێك لە خسووسیاتی ئەوە ئەوەیە کە پووڵ دەبیٚ لەبەین بچیٚ. بە پێی ئەو جۆکە کە عەرزم کردن بەلاّم لە بەر ئەوەیە کە لای هێندێك کەس دەمێنێتەوەو لە لای هێندێك کەس نامێنێتەوە ئەوە جۆك بوو واقعییەت ئەوەیە کە پووڵ لە نێو عمووم لەبەین بچیٚو ئەگەر بەرەو لەبەین چوون بوو، ئەو تەزاددە ئەساسیەش کە هەبوو دیارە ئەویش لەبەین دەچیٚ. چونکە نە خەریدار هەیە نە فرووشەندە. خەریدارو فرووشەندە بۆ ئەوە بوو کە دوو نەوع مالکییەتە، ئەو دوو نەوع مالکییەتە دەبێتە یەك، یەکێك لە ئۆسوولی ئەسڵەن ئاڵوگۆڕی (موبادلەی) کالاّ ئەوەیە کە من ئەو شتە دەتوانم بفرۆشم کە هی خۆمە، مالکم. بەلاّم یەکێك لە ئۆسووڵیش ئەوەیە کە دەبیٚ دوو نەفەر بن کە تا ئەو کەسە کە مالکە بەوی‌تر بفرۆشیٚ، ئەگەر مالك تەنیا بوو خۆ شتەکە نافرۆشیٚ. ئەگەر مالکییەتەکە ببێتە گشتی ئی هەموو کەس، من شتی خۆم بە خۆم نافرۆشم کەوابوو کەس شتی خۆی بە

خۆی نافرۆشێ یانێ مانای ئەوەیە پوولْ لەبەین دەچێو ئەوە دەبێتە جامیعەیەکی کومۆنیستی.

دیارە لە سەر ئەوەیەی کە کۆمەڵی کومۆنیستی چەند ساڵی دیکە پێك دێ، ئایا پێك دێت ئەسڵەن؟ چونکە شتێکە کە زۆر قسەی لە سەر کراوە زۆر کەس ئیقتیسادەکەی بە چاوی خۆی نەدیوە. مەسەلەن ئێستا ئەگەر بڵێین، ئەمریکا ببێتە سۆسیالیستی کە ئیقتیسادەکەی لە هەمووان لە پێشترە ، هێندێ شت دەتوانێ بدا ئەویش یا ئێستا لە ئیقتیسادی ئەمریکا دەتوانێ بەرق بدا بە هەموو کەس بە بێ هیچ، حەتتا لە سوئێدیش دەتوانن ئەوەی بکەن وەکو باسمان لێکرد بۆ هەموو کەسیش دەبێ. ئاوەکە دەفرۆشن لە زۆر جێگا دەتوانن ئاوەکەش بدەن. کەمکەم خانوو مەسەلەن ئەگەر بیانەوێ ئەو وەختە لە سوئێد دەتوانن خانوو بدەن بە هەموو کەس. من تەنیا ولاتێکی ئامریکایم نەدیوە بەلاّم تەنیا ولاتێکی ئورووپایی کە دیومە خانوو زیاترە لەوەی کە هەبێ، بە سەدان خانوو کراوەتەوەو بەتاڵیشن، دەتوانێ خانوو هەیە دانیشێ. دیارە خانووەکانیش هەموویان باشن بەلاّم هەروا لە ولاتی پێشکەوتوو خراپیش هەیە مەسەلەن هێندێ ولات هەیە، ئێستا لە هێندێ ولاتیش هەیە دەوڵەت ئیجازە نادەن خانەوادەیەك لەو خانووانە دانیشن. دەبێ ئەو ئۆسوولەی تێدا هەبێ هەتا ئیجازە بدات، دەبێ ستانداردێکی ببێ سەتحێکی هەبێ. یانێ مەقسەدم ئەوەیە ئەوەندەی ژوور نیە ئیتر هەموو شتێك نا، مەسەلەن هەموو شتێك ناتوانن لە ماوەیەك جێبەجێ بکەن بەلاّم واقعییەت ئەوەیە کە لە ئێستاوە ئیمکانی ئەوە هەیە.

مەسەلەن خودی شوورەویش کە کەمکەم بەرق هەتا ئێستا خەریکن نەخشە دادەنێن بۆ بەرقو بۆ پۆستو بۆ تێلگرافو تەلەفوونو ئەو جۆرە شتانە کە زۆر عموومی‌یە مەسەلەن کەمکەم ئەوانە ئیدی خەڵك ئەسڵەن پووڵی نادەن. یا مەسەلەن هاتوچۆ ئێستا زۆر ئاسانە قابیلی موقایسە لەگەڵ ولاتەکانی سەرمایەداری نیە، بە مێترۆ، مەسەلەن مێترۆی مسکۆ جا ئەوە پێموابێ هێندێ کەس بە من بڕوا نەکەن ئەوانە بە هەرحالْ هەتا لەگەڵ ئەو شتانە کە یانێ ئەو شتانەی پێیان دەڵێن عموومین جارێ ئەو سرویسانە ئەو خەدەماتە کە دیارە لەدەس دەوڵەتەکەی دایە. دەبێتە خۆڕایی لە پاشان شتی دیکە ئەوە.

دوای ئەوە لە هەموو شتێك موهیمتر ئەوەیە کە دەبێ ژێربـــەنای ئیقتیســادی بـۆ ئەو وڵاتە ببێ ئەویش ئەوەیە کە ئێستا کە سەردەم سەردەمی "الکـترونیك"و "اتم"و "کامپیوتر"و ئەوانەیە. بە راســـتیش حـەتا تەســەوری ئـەوەمان هەیـە کـە رۆژێـك جامعەیەکی ئاوا پێشکەوتوو پێك‌بێـت نـاتوانین ئـەو جامیعەیـە لـە تەســەوری ئـەم مێشکانە پێك‌بێنین یانێ لە مێشکی خۆماندا وا تەسەور بکەین. کـەوابوو مەســەلە ئەوە نیە کە ئەگەر خواردن زۆر بوو هەموو کەس بە ئەندازەی کافی خواردنی هــەبوو، ئــەوە بەســتراوە هــەم بــە پێکــهێنانی ژێربــەنای ئیقتیســادیو هــەم بــە پێکــهێنانی ژێربەنایەکی سیاسی، فەرهەنگی ئەوتۆش. یانێ ژێربەنای فەرهەنگی ئەوەیە کـــە لــە حاڵێك هەموو کەس نەك هەر خوێندەوار بێت مەسەلەن لە شوورەوی‌دا، لەو وەختــەدا لەوەدا ســەرکەوتووترن تــا لــە ئیقتیســادەکەدا کــە مەســەلەن پێــش ئــەوە ببــێ بــە کومۆنیسم لە هەموو کەس بێ ئیستیسنا دەبێ ئەوەی کە ئێوە دەڵێن ئێســـتا بوەتــە راهنمایی هەرچی، دەبیرستانە دەبێ بخوێنن. یانێ ئەهدافی ئەوەیە، ئەوە لــە ئــەوەڵڕا دەست نەکەوتووە، ئێستا تەقریبەن نزیکــن لــەوە، لــە حــاڵێك‌دا لــە ئیقتیســادەکەدا پاشکەوتووترن، لە باری فەرهەنگی‌یەوە ئێستا زۆر پێشکەوتووترن نزیکن بەوە. ئــەوە بۆخۆی شتێکە کە خەڵك دەبێ فەرهـــەنگێکی تەواویشــی هــەبێ لــەو بــارەوە دیــارە هێندێکی دیکەش کە مەربووت دەبێ بە بەڕێوەبردنی وڵاتی سۆسیالیزم.

ئێستا کە کــاك عومــەر فــەرمووی: "سۆســیالیزم ئەگــەر ئــەوەندە باشــە بۆچــی کرێکارانی فەرانسە یا وڵاتــەکانی کــە پێگەیشــتوون، هــەموویان دەنــگ نــادەن بــە سۆسیالیزم؟" دیارە ئەوە دوو هۆی هەیــە؛ یــەکێکیان ئەوەیــە کــە چونکــو فەرانســە بۆخــۆی وڵاتێکــی پێشــکەوتوو بــووە، ئێســتاش ئەگــەر کرێکــارێکی فەرانســـەوی کرێکارێکی متەوەست، ئەگەر کاری هەبێ بێکار نەبێ، ئەگەریش بێکار بێ، حقــووق وەردەگرێ، ئەگەر بێکار نەبێو خاوەن کار بێــت، کــار بکــات مەخسووســەن ئەگــەر کرێکارێکی موتەخەسیسیش بێت وەزعی باشترە لـــە کرێکــارێکی شــوان. باشــە لــە حاڵێك‌دا لە ئورووپادا وەزعی ئەوانەی کە لە هەمووان فەقیرترن لە فەرانســـەدا دیــارە خراپترن فەقیرەکان، ئەوانە متەوەستن باشترن، ئەوانە کــە دیــارە دەوڵەمــەندترن ئــەوە لەوان زۆر باشترن.

ئەوە یەکێك، بەڵام دەلیلێکی ئەساسی پێم‌وایە ئەوە نیە بە تەئکیدەو فەرق دەکا. ئەوە بۆ فەرانسەیە من باس دەکەم. مومکینە ئەوە دەلیلی ئەوەڵ بۆ ئاڵمان ئەساسی بێت. بۆ فەرانسە دەلیلی دیکەش هەیە چونکە ئەوە بەستراوە بە خسووسیاتی میللەتەکەیەوە ئەویش دەلیلێکی دیکەم هەبوو، ئەوەیە کە هەست بەوە دەکەن کە لە شوورەوی دێموکراسی نیە.

ئێمە دێموکراسیش کە باس دەکەین بۆیە روون بێتەوە. دێموکراسی ئێمە تەقسیمی دەکەین بە سێ بەش: دێموکراسیی ئیقتیسادی، دێموکراسیی ئیجتیماعیو دێموکراسیی سیاسی. ئەگەر دێموکراسیی ئیقتیسادیو ئیجتیماعی بگرین، پێم‌وایە دێموکراسیی ئیقتیسادیو ئیجتیماعی بە ئەوەی من گوتم، من عادەتم نیە لە سەر وڵاتان قسە بکەم بۆ ئەوەی باش بیانناسم، مەسەلەن ئەو دوو وڵاتە چاك دەناسم؛ "فەرانسە"و "چێکۆسلۆواکی"، مەسەلەن دێموکراسیی ئیقتیسادیو ئیجتیماعی لە چێکۆسلۆواکی زۆر زیاترە تا فەرانسە. ئەویش دابەشبوونی عادڵانەی داهاتە، ئەو "حداقل" زندەگیە کە پێی هاتوەتە دی. بەڵێ ئێستا لە چێکۆسلۆواکی خانەوادەیەك دە منداڵی هەبێ ئەرجەحییەتی هەیە، بیلافاسڵە دەبێ قبووڵی بکەی، دەوڵەت مەجبوورە بیلافاسڵە قبووڵی بکا، لە سەر ئەوەی لە حاڵێکدا لە فەرانسە دێتە بەرچاوی خۆم، پێنج، شەش، حەوت منداڵی هەبووە دەریان کردوە، چونکو نەیتوانیوە پێیان رابگا، قەتیش نەیگوتوە. ئەوە دێموکراسی‌یە، ئەوە دێموکراسیی ئیجتیماعی‌یە.

دێموکراسیی ئیقتیسادی ئەوەیە کە عەرزم کردن کە فەرقەکە زۆرە بەڵام بە هەرحاڵ زۆر عادڵانەتر دابەش دەکرێ، بەڵام دێموکراسیی سیاسی بە تایبەتی فەردی لە حاڵەتی‌دا، بۆ ئەوەش دیارە جۆك هەیە لە بەینی شوورەویو ئەمریکا، دەڵێ شوورەویی‌یەك لەگەڵ ئەمریکایی‌یەك قسەی دەکرد، ئەمریکایی‌یەکە گوتی کە دێموکراسی لە ئەمریکادا زیاترە، چونکە ئەمن هەر وەختێ پێم‌خۆش بێ دەتوانم جنێو بە رەئیس جمهووری ئەمریکا بدەم. شوورەویی‌یەکە گوتی هیچی وانیە، ئەمنیش هەروەخت پێم‌خۆش بێ دەتوانم جنێو بە رەئیس جمهووری ئەمریکا بدەم.

ئەوە عەواقبی ئەوەیە کە دێموکراسی فەردی بەو جۆرە کە پێویستە نیە. ئەوە دیارە لە رووسیەوە، چونکو رووسیە لە تاریخی خۆی‌دا دێموکراسیی نەدیوە، لە

دیکتاتۆری ئیستیبدادی ڕێژیمی تەزاریەوە تەبدیل بوو بە دیکتاتۆری پرۆلێتاریا. دێموکراسی‌یەك نە غەربی نە شەرقی هیچ نەبووە لە تاریخی رووسیە. بەلاّم لە چەند ولاّتێکی وەکو مەسەلەن بلّێین ئەو دیوی ئەو ولاّتانە بەڕاستی دێموکراسی هەبووە. تەنیا ولاّتێك کەوا لەپێش شەڕی دووهەمی جیهانی کومۆنیسم عەلەنی بووە، نمایەندەی هەبووە لە مەجلیس‌دا لە سەرنوشتی شتی هەبووە، یانێ نفووزی هەبووە، ئەو ولاّتە فەرانسەیە. لە شوورەوی کە ئەو دێموکراسی‌یە نەبوو تەئسیری کردۆتە سەر وەزعی سۆسیالیزمیش‌و بە تایبەتی لەم ئاخرەیشەوە سانترالیزمیش کە باسمان کرد لە باری ئیقتیسادی‌یەوە کەمییەت‌و ئەهەمییەت‌و کەیفییەت دادەنێ بۆ کاری. لە پاشان لە هەمووان خراپتر، وجوودی هێندێك ئینسانی وەك ستالین کە ماوەیەکی دوورو درێژ، بەڕاستی ئیستیبدادێکی توندیشی دامەزراندوە لە شوورەوی‌و ئەوە هەموو بووەتە هۆی ئەوە کە ئێستاکە بەرەبەرە کە خەریکین بەخۆشیەوە کە خەریکن هەنگاوی زۆر هەلّدەنێن بۆ ئەوە لە ئیستیبدادەوە بچن بۆ لای دێموکراسی، دەرکەوت کە جامیعەی شوورەوی ئامادەگی نیە، نموونەشی ئەوە بوو خودی خرۆشچۆفیان لابرد، یانێ مانای ئەوە بوو کە خرۆشچۆف زۆر توند بوو، ئێستا بەرەبەرە، کەم‌کەم، گۆڕانی وەزعی ئیقتیسادی ـ ئیجتیماعی خەلّك ئامادە دەکا بۆ ئەوەی کە دێموکراسی فەردیش زیاتر بێت.

ئێستا زۆرکەس هەیە هەست بەو فەرقە ناکا بەلاّم ئێمەمانان کە زەمانی ستالینمان دیوە، مەسەلەن زەمانی ستالین کەس نەیدەزانی کە دەخالّەتێکیش هەبووە. ئەگەر هەبوا لە رۆژی ئەووەلّ سەربەنیستیان دەکرد، کەس ئاگای لێ نەبوو. ئێستا دەخالّەتێك هەیە، خەلّك قسەکانی خۆی دەکاو هەر وجوودیشی هەیە. ئەوە مانای ئەوەیە کە ئێستا گەرچی زۆریشە، ئێستا کەس ناگرن بیکووژن بۆ ئەوە کە مەسەلەن موخالیفی ڕێژیمە. تەعقیبی دەکەن ئەزییەتی دەکەن کە ئەویش روونە.

بەلاّم لێرەش مەقسەدم ئەوەیە کە خالّێکی یەکجار گرینگە، خەریکی ئەوە نیە کە وەکو لە ولاّتی ئەمریکا ئەوەی هەیە کە ئەو پلۆرالیزمە هەبێ، چەندحیزبی هەیە. دیارە کە مەسەلەن ئەگەر بە لادا رۆیی شکایەتی لێ بکا. لە رۆژنامەدا لە سەر خۆی بینووسێ موخالفەتی هەبێ هەرچەند کە دیارە ئەو دێموکراسی‌یە ئەووەلّییەش بۆ ئەوە کە حەق بلّێین مافێکی زۆر گەورەیە کە دێموکراسی تیابێ ئەویش ئەوەیە کە

مافەکەی ئەوەیە کە هەموو کەس ئازادە، هەموو کەس دەتوانێ قسان بکات. فەرد هەموو نەوعە حەقێکی هەیە، بەلاّم حەقیقەتەکە لەگەڵ ئەوەی فەرقی هەیە، ئینسان دەبێ بەڕاستی زۆر چاك بە قووڵی ئەو ولاّتە بناسێت. واقعییەتەکەی ئەوەیە کە ئەوە کە ئەو دێموکراسی بەڕاستی دێموکراسی‌یەکە کە وازیحە، دێموکراسی‌یەکە کە ئیدارە دەکرێ لە پشتەوە، دێموکراسی‌یەکە کە هێندێ ئەهرومی زۆر ئەساسی هەیە کە بە دەس سەرمایەوەیەو ئەو دەیانچەرخێنێ.

مەسەلەن ئێستا گەورەترین رۆژنامەکان لە ولاّتێکی وەکوو ئالّمان کە یەکێك لە پێشکەوتووترین ولاّتەکانی سەرمایەداری‌یە لە واقێعدا ئەکسەری رۆژنامە گەورەکان لەوێ کونترۆڵنو حەقیان نیە هەر شتێ بلّێن کە گەورەترین رۆژنامەکانی ئالّمان ئەو کارەی دەکەن. لە ئەمریکا سالّەهای سالّە ئەو دوو حیزبە پێکەوە موبارزە دەکەن کە مولاحزەتان کردوە کە ئەگەر یەکێکیان سەرکەوێ، فەرقێکی نیە کە ئەوی دیکە سەرکەوێ. یا مەسەلەن لە حەتتا ئینگلستان کە یەکێکیان هەرچی بێت حیزبی کارگەریەو بەڕاستی ئەکسەری کرێکارانی ئێنگلیس دەنگی خۆیان دەدەن بەو بەلاّم کە سەردەکەوێ فەرقێك ناکا. مەسەلەن ماوەیەك لەمەو پێش ئێستا حیزبی موحافیزەکارەکان سەرکەوتووە، میللەتی ئینگلستان ئێحساسی فەرقێکی ئەساسی ناکا، یانێ پێیان وایە لە پشتەوە یەکێك هەیە ئەوەی لەوێ دەنگ نەهێنێتەوە، خەلّکیش پێی وایە کە بەلّێ ئەو ئیحساسە هەیە، کە بەلّێ دەخالّەت دەکاو ئازادە، بەلاّم ئەو ئازادی‌یە بەو جۆرە نیە.

مەقسەدم ئەوە نیە کە نابێ دێموکراسی بێ. بە نەزەری من دێموکراسی سیاسی فەردی لەوە زیاترە. بەلاّم ئەوە دەبێ لە نەزەر بگرین کە هەرچیت پێ‌خۆشە وانیە کە تۆ بە کەیفی خۆت بکەی، نەخێر، نەوەلاّ لە پشتەوە ئەوە ئێستا وەکوو لە ئەمریکادا هەیە کە هەموو شتێك لە واقیعدا بە دەست مونۆپۆلەکانەوەیە، بە دەست ئەو شتەوەیە کە پێمان گوت ئولیگارشی مالّی، یانێ تەسەلوتی سەرمایەی مالّی کە هەرچی لە ولاّت دایە بێ ئیجازەی ئەو نابێ. دیسانەکە من نەزەرم ئەوەیە کە سۆسیالیزم هیچ ئیحتیاجی بەوە نیە کە دێموکراسیی فەردی مەحدوود بکاو بە نەزەری من مەرحەلەیەکە کە تەواو دەبێ. مەرحەلەیەکی وا دێتە پێش کە هەم لە داخلّی حیزبی کومۆنیستا کە تاکەحیزبە ئەکسەرەن لەم ولاّتانەداو هەم لە داخلّی

کۆمەڵەکەدا کە خەڵك بتوانێ قسەی خۆی بە ئازادی بکاتو بەوە بە نەزەری من هیچ زەرەریش ناگەیەنێ بە سۆسیالیزم بەڵکو عەکسی ئەوەیەو قازانجی زیاتر دەبێ. چونکە خەڵك ئیستیعدادی زیاتر بەکار دێنێ، ئیمکانی ئەوەیان هەبێ لە باری فەرهەنگی‌یەوە، لە باری ئیقتیسادی‌یەوە، لە باری هونەری‌یەوە ئازادتر بێنە مەیدانێو ئەوە وەختێ دێتە پێش پێشکەوتنی ئیقتیسادیو ئیجتیماعی بۆ خۆی ئەوەی هەیە.

جا ئەوەیە کە ئێمە لە بەرنامەی حیزبی خۆمان لە وەختێك نووسیومانە سۆسیالیزمی عادلانە، مەبەستمان زیاتر ئەوە بووە. کە دیارە بە نەزەری من کەلیمەکە زۆر دەقیق نیە ئەگەر بمانهەوێ زۆر دەقیقتر بێت، دەبێ بنووسین سۆسیالیزمی دێموکراتیك کە دەقیقترو باشترە. کە داوای سۆسیالیزمی دێموکراتیك دەکەین کە یانێ سۆسیالیزمێك کە بە تەواوی دێموکراسی لەگەڵ بێت.

جا باسی ئەو دێموکراسی‌یەم بۆ ئەوە کرد کە لە هیچ کۆمەڵێکی کومۆنیستی‌دا هیچ کە ئەو دێموکراسیی ئیقتیسادیو ئیجتیماعی‌یە دەگاتە ئەوجی خۆی، وەکوو باسمان کرد لێرە هەرکەس بە پێی نیازی، ئیحتیاجی خۆی وەردەگرێ. بەڵام دێموکراسیی سیاسیش دەبێ بگاتە ئەوجی خۆی، دەبێ قابیلی موقایسەش بێ لەگەڵ ئەو دیموکراسیەش کە لە وڵاتی غەربی‌دا هەیە، یانێ دێموکراسیی فەردیش دەبێ تەواو ببێت بێ ئەو مانیعە گەورەیە کە لەوێ هەیە. کە سەرمایە لە بنەوە شتەکان یانێ وڵاتەکە ئیدارە دەکاتو تا حەدێ دیموکراسیشی دەداتێ. ئەوە یەکێك لە ئەرکەکانی کومۆنیسم یانێ دێموکراسی‌یەکی تەواو لە هەموو بارێکەوە، لە باری ئیقتیسادی، ئیجتیماعیو سیاسی‌یەوە دامەزرێنێ. ئەوە دەبێتە وڵاتێکی غەربی بە ئیقتیسادێکی کومۆنیستی.

دیارە مالکییەتی (کە ئەوەم لەبیر نەچێت) مالکییەتی خسووسی بەتەواوی لادەچێ، شوێنەواری نامێنێ، ئەسەری نامێنێ. بەڵام مالکییەتی شەخسی هەرچی دەڕوا تەکامول پەیدا دەکا. دیارە مومکینە، لەوانەیە کە لە کومۆنیسمدا مەسەلەن زۆرکەسیش هێلی‌کۆپتێری بێت جا دیققەت بکەن بە نەزەری من دوکتور، تەبیب بە پێی ئەو کارەی کە هەیەتی ئیحتیاجی بە هێلی‌کۆپتێرێ هەیە، هێلی‌کۆپتێری مورەتەب لە ئیختیار دایە. ئەوە مەقسەدم ئەوەیە کە مالکییەتی شەخسی نەك هەر مەحدوود نابێتەوە بەڵکو تەکامول پەیدا دەکات.

دیاره من خۆم بیستوومەو زۆرجاریش مەترەحیان کردوه، ئــەویش مەربووتــە بــە کومۆنیسم کردنی رەوابتی ئینسانی کە گوایــە ژن دەگرێتــەوە زیــاتر. ئـەوە کــە لــە مالکییەتی کومۆنیســمدا لــە ســەری نووسـراوە ئـەوە یـەکێك لـە ئیسـتدیلالەکانی بورژوازیی ســەرمایەدارییە عەلەیــهی کومۆنیســم. بــاش لــەو نوکتەیــەدا جوابیــان داوەتەوە کە دەڵێن سەرمایەداری ژن وەکو مەســەلەیەکی تــەولید تەماشــا دەکــاتو چونکە ئێمە وەکو کومۆنیست دەمانهەوێ رەوابتێکی، وەزایفێکی ئیشتراکی بکــەینو کومۆنیستی بکەینو چونکو ئەوان ژنیش وەکو وەسیلەیەکی تەولید لــە کارەکانیــاندا دەزانن پێیان وایە ژنیش شەخسیەتێکی کومۆنیستییە ئەوە جوابێکــی لــە راســتیدا دەندانشکێنە بەو ئیتیهامە.

دیارە ئەو ئیستیقلالی رەوابتی ژنو پیاوانە دەبێ تــەبیعی بێتــەوە لــە جامیعــەدا ئەوە شتێکی زۆر ئەساسییە کە نیوەی خەڵك پیاوە نیوەی ژنە، نیــوەی دانیشــتووانی ولاتێك ژنو هەرچی ئەوان زیاتر بەشداری بکەن لە موبارزەدا، لە ئیجتیماعدا، دیارە ئەوەندەش بــۆ ئێمــە، بــۆ ولاتەکــە پێشــکەوتووترە، ئێســتا لــە بــاری فەرهــەنگیو سیاسییەوە هەرچی ژن زیاتر بەشدار بێت لە ئیدارە کردنی ولاتەکەداو هــەرچی حــەق بڵێین نزیك بێتەوە بە تەواوی بە پیاو، ئەوەندە ئەو ولاتە، پێشکەوتووترە. ئەگەر وایــە دەبێ لە کومۆنیسمدا ئەو مەسەلەیە بگاتە ئەوجی خۆی بێ هیچ ئیختیلافێــك، هیــچ ئەولەوییەتێك لە بەینی پیاوو ژن نەمێنێت نە لە کار، نە لە جامیعەدا نــە لــە هیــچ جێگایەکی دیکەدا. تەنیا ئەو ئیختیلافە بمێنێت کــە مەربووتــە بــە تەبیعــەتی پیــاو لەگەڵ تەبیعەتی ژنو یانێ هێندێك کار کەوا ژن ناتوانێت بیکاو هێندێــك کــار کــەوا پیاو ناتوانێت بیکات.

کەوابوو لــە هــەموو بــارێکی دیکــەوە بەرابــەریی تــەواویان هــەبێتو ئــەوە زۆر موهیمە. کەوابوو وەکو دێموکرات کە ئیحتیرامان بۆ پێڕەوی داهاتووی خۆمان هەیە، بۆ بەرنامەو ئەساسنامەی خۆمان هەیە. ئەساسمان ئــەوە دانــاوە بڵێــین زۆر کــە چــی بکەین، چونکە ئەساسەن زۆرجار دەردەکەوێ کە لە جامیعەدا ئێستا لە مەسەلەی ژن زۆر پێشکەوتووترین، بەڵام کە دەگاتە خۆمانو خــێزانی خۆمــانو خۆشــکی خۆمــانو ئەوانە زۆر پاشکەوتووین، ئەوە دەبێ زۆر کاری لە سەر بکەین. ئەوە خەتای ئێمە نیە وا بار هاتووین، وا فێریان کردووین. ئەمن زۆرجــارم دیــوە مەســەلەن هــەموو کــەس

حازره، پێی خۆشه خۆشكو ژنو نازانم دایكی جیرانەكەی فەعال بیٚ لە سیاسەتا چونكو حیزبەكەی ئەوه داوا دەكاو ئەویش وا دەكا، بەلاٌم كه ئەگاتە سەر ئی خۆی ئەو وەختەیە كه دەچێتە سەر ئینسانییەتی كۆنەپەرستیو خۆشكەكەم ئەو وەختەیە كە بیری دەكا. ئەو شتە كە بەرخورد دەكەین بەرخوردەكە بەرخوردێكی عیلمییە.

ئێوه بۆ خۆتان دەزانن بە تایبەتی ئێستا كە نولاٌتەكەمان بوەتە جمهووریی ئیسلامیو ئەو مەسەلەیە حاكمو زیاتر بەرچاو دەكەویٚ كە دەیانەویٚ لە هەموو بارێكەوه یانیٚ ژن مەحدوودتریش بكەنەوه هەتا لە جاران، جارانیش ئازادی ژن زیاتر ئازادییەكی زاهیری بوو. ئازادی بۆ ئەوه بوو كە بچیٚ دانس بكا نەك بۆ ئەوەی كە لە ئیدارە كردنی ولاٌتەكەدا بەشدار بێت. بەلاٌم حەتتا ئەوەش ئێستا خەریكن مەحدوود دەكەنەوه بە شێوەیەك كە ژن ئیدی بە شێوەیەك كە نەتوانیٚ، ئەسڵەن یانیٚ، بێی لە قانوونی ئەساسیشدا هەیە لە ئەو شێعرەی كە فیردەوسی گوتوویەتی بە راستی یانیٚ فەرزەن كە باشە، دیارە ئەوه نیە چون لە قانوونی ئەساسی هاتوه كە ژن ئینتیزاری هەیەو ئیحتیرامی هەیە بەلاٌم هەر لە جێگای خۆیەتی.

# واقعییەتی گەلانی ئێران‌و ئەفسانەی م ـ ماکان*

لەم دواییی‌یانەدا نامیلکەیەك بە ناوی "ئەفسانەی گەلانی ئێران" لە لایەن بنکەی بلاّوکردنەوەی (مەزدەك) لە دەرەوە بلاّوکراوەتەوە. ئەو بنکەیە بە رواڵەت پێوەندیی بە جەبهەی میللی‌یەوە هەیەو نووسەری نامیلکەکە لە ژێر ناوی وەرگێراوی (م ـ ماکان)دا رای خۆی سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتی لە ئێراندا دەربڕیوە. وادیارە لە تێکۆشەرانی ناسراوی جەبهەی میللی‌یە. خۆ ئەگەر وا نەباو نووسەر سەر بە جەبهەی میللی نەبوایە، هیچ بە پێویستمان نەدەزانی وەلاّمی ئەو نامیلکەیە بدەینەوە. چونکە هەڵوێستی ئەسڵیی نووسەری نامیلکەکە سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتی، جیاوازی‌یەکی بەرچاوی لەگەڵ هەڵوێستی رێژیمی حەمە رەزاشا نیە. بەلاّم لە بەر ئەوەی ئێمە جەبهەی میللی بە هێزێکی نیشتمانی‌و دژی ئیمپریالیستی دەزانین‌و پێمان وایە لە داهاتووش‌دا دەتوانێ رۆڵێکی باش لە خەباتی هاوبەشی هەموو گەلان‌و هێزەکانی نیشتمانیی ئێراندا یاری بکا. بە پێویست دەزانین لە مەبەستەکانی ئەو نامیلکەیە بکۆڵینەوەو رای خۆمان بە روونی لە بارەی ئەودا دەربڕین. باسی ئەو شێوە کە ماکان لە هێنانە گۆڕی مەسەلەکاندا بە کاری هێناوە دوورو درێژە. ئێمە لە لێکۆڵینەوەی خۆماندا هێندێك لەو شێوە ناڕاست‌و نەزانانەی ئەو، دەستنیشان دەکەین. ماکان لە لاپەڕەی یەکەم‌دا دەنووسێ: "تەنیا حکوومەتێکی دێموکراتی لە سەر بناغەی سۆسیالیستی‌یە کە دەتوانێ بە پشتیوانی هێزی بەردەوامی گەل، ئێران لە مەترسی لەت لەت بوون بپارێزێ." لە پاشان ماکان بە دوای "بنچینەکانی تیئۆری لنینی" بوونی گەلانی جیاواز لە ئێراندا دەگەڕێ‌و

بەرهەمی ئەو گەڕانە پیاو ماندووکەرە، ئەوەیە: "فیکری گەلانی ئێران فیکرێکە بە هۆی نۆکەرانی ئیمپریالیزم لە دەرەوەڕا هاتوەو نیسبەتدانی بە لنین نە تەنیا لادانێکی گەورەیە، بەڵکوو بێحورمەتی بەو پیاوە مەزنەشە" (لاپەڕەی ٤٦). ئێستا بزانین ئەو ئاغای ماکانە کە مارکسیزم فێری مارکسیستەکان دەکا (بەلاّم لە هیچ شوێنێکدا نایدرکێنێ کە خۆی بە مارکسیست دەزانێ یا دژی مارکسیزمە) بیرو بڕوای سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتی تا چ رادەیەك لەگەڵ بیرو بڕوای رێژیمی حەمە رەزاشاو پانئێرانیستەکانی چڵکاوخۆری ئەو رێژیمە جیاوازیی هەیە. ئاغای ماکان دەنووسێ "ئێمە بێجگە لە نەتەوە (گەل)ی ئێران لە چوارچێوەی سنوورەکانی ئەو ولاّتەدا گەلێکی دیکە ناناسین." (لاپەڕەی ٤٣). رێژیمی حەمە رەزاشا کە بە کردەوە حاشا لە بوونی نەتەوەکانی تری ئێران وەك ئازەربایجانی، کوردو ... هتد دەکاو دان بە هیچ چەشنە مافێکی نەتەوایەتی بۆ ئەو نەتەوانە دانانێ، بیروڕای لەگەڵ بیروڕای ئاغای ماکان کە دەڵێ لە ئێراندا تەنیا نەتەوەیەك هەیەو ئەویش نەتەوەی ئێرانە، بە تەواوی یەکە. پانئێرانیستەکانی نۆکەری شا لە تاقمی پزیشکپووریش ئامانجیان هەر ئەوەیە کە هەموو گەلانی ئێران بە ناوی نەتەوەی ئێران بێتە ژێر ئالاّی پانئێرانیزم.

هەم لە سەردەمی رەزاشاو هەم لە سەردەمی ئێستادا رێژیمی کۆنەپەرستی پاشایەتی هەموو بزووتنەوەیەکی گەلانی زۆرلێکراوی ئێرانی بۆ دابینکردنی مافی نەتەوایەتی خۆیان بە جیاوازیخوازی تاوانبار کردوەو ئاغای ماکانیش هەروا دەکا. رێژیمی کۆنەپەرستی بنەماڵەی پەهلەوی، بزووتنەوە نەتەوایەتییەکان بە دەستکردی بێگانەکان دەزانێو بە توندی سەرکوتی کردوونو سەرکوتیان دەکا. ئاغای ماکانیش بۆ ئەو سیاسەتە دژی نیشتمانیو کۆنەپەرستییە تیئۆری دەتاشێو داوێنەکەی مۆر دەکا. لە تەواوی ئەو نامیلکە ٥٠ لاپەڕەییەدا، ماکان دەرفەتی چنگ ناکەوێ رەخنە لە سیاسەتی کۆنەپەرستیو دژی ئینسانی بنەماڵەی پەهلەوی سەبارەت بە نەتەوەکانی ئێران بگرێ، بەڵکوو وەك دەبینین چەند جار لە لاڕاو تەنانەت بە ئاشکراش پشتگیری لەو سیاسەتە دەکا.

جێی سەرسوورمانیش نیە چوونکە تیئۆریی ئاغای ماکان کە بوونی گەلانی ئێران بە ئەفسانە دەزانێ، بیهەوێو نەیهەوێ ئەوی کردۆتە دۆستو یەکگرتووی رێژیمی حەمە رەزاشا.

## "بەڵگە هێنانەوە لە لنین"

ماکان چەند لاپەڕەی نامیلکەکەی بۆ باسی بیروڕای لنین سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتی تەرخان کردوە. بەداخەوە ئاشکرایە کە بیروڕای لنینو لنینیزم بۆ ئاغای ماکان بە تەواوی بێگانەیەو تەنیاو تەنیا بۆ راکێشانی لاوانی شۆڕشگێر ئەو باسەی هێناوەتە گۆڕێو ئامانجی ئەوەیە بوونی چەند نەتەوەی جۆربەجۆر لە ئێراندا لەگەڵ تێزی لنینیی مافی چارەنووسی گەلان بخاتە ناتەبایییەوە. کەسێك شارەزایییەکی کەمیشی لە نووسراوەکانی لنین هەبێ، زوو تێدەگا کە ئەو خۆماندوو کردنەی ماکان بە فیڕۆ چووە. لنین بێ ئەملاو ئەولا لایەنگری مافی دانانی چارەنووسی گەلانو لایەنگری وەك یەکیی گەلانی بچووكو گەورەیەو بەڕاستی لەو بڕوایەدا بوو کە مافی گەلان، لە دانانی چارەنووسی خۆیاندا بێجگە لە مافی جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ هیچ مانای دیکە هەڵ ناگرێ. ئێستا با بزانین ئاغای ماکان لە چەسپاندنی مەبەستەکەیدا کە لە بنەڕەتڕا گۆڕینی بیروبڕوای لنینە، چۆن سەرکەوتوە.

یەکەم هەڵبەستنی ماکان ئەوەیە، کە بیرو باوەڕی لنین سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتی بە رووسیەو وەزعی رووسیە نیسبەت دەداو بە خەیاڵی خۆی زۆر بە زرینگی ئەو کارەی کردوە. بۆ نموونە لە لاپەڕەی ٥دا دەنووسێ: "سەبارەت بە بەرنامەی دیاری کراوی مارکسیستەکانی رووسیەی تزاری (دەست نیشانکردنی وشەکان هی ئێمەیە) لنین بڕوایەکی روونو تایبەتی هەبوو. ئەو پێی وابوو کە بۆ ئەوان مافی گەلان لەدانانی چارەنووسی خۆیاندا بێجگە لە جیابوونەوەی سیاسیی نەتەوەیەك کە لە ژێر زوڵمو زۆرداریی نەتەوەیەکی دیکەدایە ناتوانێ مانایەکی تری هەبێ." ماکان بە لێ زیادکردنی رستەی "سەبارەت بە بەرنامەی دیاریکراوی مارکسیستەکانی رووسیەی تزاری" ویستوویەتی وا نیشان بدا کە ئەو بڕوایە لە بارەی ولاّتانی دیکەدا وەك ئێران راست نایەتەوە. بەلاّم بزانین لنین بۆخۆی چ دەڵێ: ئەو لە باسی خۆیدا لەگەڵ لوکزامبورگ لە پاش هێنانەوەی نموونەی ئاسیاو باڵکان دەنووسێ:

"دانانی چارەنووسی نەتەوەکان لە بەرنامەی مارکسیستەکاندا لە روانگەی مێژوویی‌و ئابووری‌یەوە ناتوانێ بێجگە لە دانانی چارەنووسی سیاسی، سەربەخۆیی دەوڵەتی‌و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوایەتی هیچ مانایەکی دیکەی هەبێ." لێرەدا قسە هەر لە سەر رووسیە نیە. لنین لە وێکنەچوونی وەزعی رووسیەو ئۆتریش (نەمسا) ئەو نەتیجەی وەرنەگرت کە گەلەکانی دانیشتووی ئۆتریش مافی دانانی چارەنووسیان نیە. هەروەك مێژوو سەلماندی، ئیمپراتۆری ئۆتریش هەڵوەشاو لە ئۆتریشی ئێستادا بێجگە لەو ئۆتریشیانە کە بە زمانی ئاڵمانی دەدوێن نەتەویەکی بەرچاوی‌تر نەماوە. ماکان لە وێکنەچوونی وەزعی ئێران‌و رووسیە وا نەتیجە وەردەگرێ کە لە ئێراندا بێجگە لە نەتەوەی ئێران گەلێکی‌تر نیە. ئەوە کە لە توندوتیژیی زۆرداریی نەتەوایەتی لە نێوان رووسیەی تزاری (قەیسەری)و ئێرانی ئەمڕۆدا جیاوازی هەیە ناتوانێ ببێتە بەڵگەی نەبوونی ستەمی نەتەوایەتی لە ئێراندا.

کاتێك ماکان بیروڕای لنین کورت دەکاتەوە دەنووسێ "مارکسیستەکان لایەنگری حکوومەتی ناوەندیی غەیرە فیدراڵین‌و لە کاتی پێویستدا تەنیا بۆ قوناخی تێپەڕبوون لە حکوومەتی فیدراڵی کەڵك وەردەگرن". بەڵام ماکان لە بیر خۆی دەباتەوە کە ئەو قۆناخی تێپەڕبوونە لە بەرنامەی مارکسیستەکاندا قۆناخێکی دوورو درێژی مێژوویی‌یە کە لە رۆژگاری پێش سەرمایەداری‌و سەرمایەداری‌یەوە تا رێکخستنی کومۆنیزم درێژەی هەیە. مەگەر یەکیەتیی سۆوییێتی بۆخۆی چەشنە دەوڵەتێکی فیدراڵی نەبوو کە ساڵی ١٩٢٢ لە سەردەمی ژیانی لنیندا لە ١٥ کۆمار پێك هات؟ ئەوە راستە کە لنین دژی سەربەخۆیی فەرهەنگیی (ثقافی) بوو، بەڵام ماکان مەسەلەکە بە جۆرێك دێنێتە گۆڕێ کە خوێنەر دژبوونی لنین لەگەڵ ئەو درووشمە بە بەڵگەی دژبوونی بنەڕەتیی لنین لەگەڵ هەموو چەشنە مافێکی نەتەوایەتی تێ بگا. لەکاتێکدا کە لنین بۆیە سەربەخۆیی فەرهەنگی رەت دەکاتەوە کە لایەنگری سەربەخۆیی سیاسی‌یە، نەك لەبەر ئەوەی کە بە قسەی ماکان دژی لەت لەت بوونی وڵاتە. یانێ لنین پێی وایە سەربەخۆیی فەرهەنگی بۆ دابینکردنی مافەکانی نەتەوەیەك بەس نیە. لنین لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە دەیانگوت لە پێشدا دەبێ سەرکەوتنی سۆسیالیزم دابین بکرێ‌و لە دواییدا باسی مەسەلەی نەتەوایەتی بخرێتە گۆڕێ‌و رێگای چارەسەرکردنی بدۆزرێتەوە، نووسیویەتی: "گرانایی پەروەردەکردنی

ئەنترناسیۆنالیستی کرێکارانی ئەو وڵاتانەی کە زۆردارن هەر دەبێ لەوەدا بێ کە پڕوپاگەندە بۆ مافی جیابوونەوەی وڵاتە زۆرلێکراوەکان بکەنو دیفاعی لیٚ بکەن. . . ئەم داخوازە ئەمڵاو ئەولای نیە تەنانەت ئەگەر جیابوونەوە پێش سۆسیالیزم لە یەك حالٚ لە هەزار حالٚدا بگونجێو بێتە دی".

ماکان لە لاپەڕەی ٣٤دا جارێکیتر لنین بە شاهید دەگرێ کە گۆیا لە بڕیارنامەی ١٩١٢ی سۆسیال دێموکراتەکان لە بارەی ئێراندا کە لنین دایڕشتوە "گەلی ئێران" نووسراوەو هەر بۆیە لە ئێراندا گەلێکیتر نیە. بەڕاستی شێوەی بەڵگە هێنانەوەی ماکان بۆ پێکەنینو گاڵتە دەبێ. خۆ ئەگەر تەماشای ئەسڵە رووسیەکەی ئەو بڕیارنامەیە بکەین باشتریش روون دەبێتەوە کە ئەو بەڵگە هێنانەوە بۆ پێکەنین دەبێ. بە پێی رێوشوێنی ئەو سەردەمە لە دەرەوە، ئێرانیان بە پێرس (پارس) ناو دەبردو زاراوەی "گەلی فارس" لە زمانی رووسیدا بەکار هێنراوەو لە تەواوی بڕیارنامەکەدا کە بە بیروڕای ماکان لە هەموان باشترە وشەی "گەلی ئێران" نەهاتوە بەڵاٚم لە بەر ئەوەی لە وەرگێڕاوە فارسییەکەیدا زاراوە رووسییەکەی باسمان کرد بە "گەلی ئێران" وەرگێڕدراوە، ئیتر ماکان ئەوماندووبوونە تووش خۆی ناکا کە بچێتە بنجو بناوانی مەبەستەکەوە.

## "مەسەلەی زمان"

شیکردنەوی ئاغای ماکان بۆ زمانە ئێرانییەکان بەڕاستی لە نەوعی خۆیدا شتێکی تازەیە. بە بیروڕای ماکان زمانی دەری زمانی هەموو خەڵکی ئێرانە، چونکە ئەو زمانە بە ناوی زمانی دانیشتوانی ئێران لە پرۆسە(رەوت)ی مێژوویی‌دا پێك هاتوەو پەرەی ئەستاندوە.

ئەوەی بۆ ماکان گرینگە شتی واقیعیو بەرچاو نیە، بەڵکوو خەیاڵاٚتی خۆیو چەند کەسێکی دیکەیە کە قسەیان لێوە دەگێڕێتەوە.

ئەوە کە منداڵی ئازەربایجانی بۆ یەکەم جار لە قوتابخانەدا تووشی زمانی فارسی دەبێو تێدەگا کە بە "سوو" دەڵێن "آب"و بە "چۆرەك" دەڵێن "نان"، بۆ ئاغای ماکان گرینگ نیە. ئەو ناتوانێ تێ بگا کە زمانی فارسی بۆ منداڵاٚنی ئازەربایجانیو کورد زمانی زگماکی نیە. ماکان بە ئاشکرا دەری ناخاو وادیارە ئەو ئازایەتیو رووهەڵماڵاٚوییە لە خۆیدا شك نابا. بەڵاٚم بەرهەمی لێکدانەوەکەی ئەوەیە کە هەموو

گەلانی ئێران دەبێ زمانی فارسی بە زمانی خۆیان بزانن‌و چوونکە ئەوەش لە راستی دووره کە وابێ دەبێ مشوورێکی بۆ بوخرێ یانێ نەتەوەکانی غەیرە فارس لە ئێراندا بە زۆر بتوێندرێنەوە.

ئێستا لەوە گەڕێین کە ماکان لە رۆژهەلاّتناسەکانەوە دەگێڕێتەوە (ئەو رۆژهەلاّتناسانە کە لە جێگایەکی‌تردا بە "مووچە خۆری ئاشکراو نهێنیی دەزگای حکوومەتی ولاّتە ئیمپریالیستی‌یەکانیان ناو دەبا" (لاپەری ٣١). کە گۆیا ئەو زمانەی هاتۆتە فەلاتی ئێران بە زمانی ئێرانی ناو دەبەن.

راستیی ئەوەیە کە لە فەرهەنگی زمانناسی‌دا لە هیچ شوێنێك ئێمە تووشی زاراوەی زمانی ئێرانی نابین‌و هیچ رۆژهەلاّتناسێکی ناسراو ئەو زاراوەی بەکار نەهێناوە. بەپێچەوانە هەموو رۆژهەلاّتناسەکان زاراوەی زمانەکانی ئێرانی بەکار دێنن کە لکێکە لە زمانەکانی هیندو ئۆرووپایی. لاڕووس (قامووسی فەرانسەوی) لە لکی هیندو ئێرانی‌دا کە زمانەکانی هیندی‌و ئێرانی دەگرێتەوە. زمانەکانی تازەی هیندی سانسکریت، پارسی کۆن، زەتر، فارسی‌و کوردی ناو دەبا. (لاڕووسی بچووك ساڵی ١٩٦٤ لاپەڕەی ١٤٤٣).

زاراوەیەکی‌تر کە ماکان بە کاری دێنێ "نیوە زمان"ە. دیارە ئەوەش زاراوەیەکی تایبەتی خۆیەتی. لە زانستی زمانناسی‌دا زاراوایەکی وەها نیەو ناشزانین مەبەستی لە نیوە زمان چیە. وادیارە ئاغای ماکان ناچار بووە ئەو زاراوە داتاشێ. تا ئەگەر نەیتوانی زمانەکانی ئازەری‌و کوردی بکاتە بەشێك لە شێوەکانی زمانی فارسی، لانی کەم بتوانێ ناوی نیوە زمانیان بەسەردا ببڕێ.

ئاغای ماکان سەرنج دەداتە سێ زمان کە لە ئێراندا هەن. یەکێك لەوانە زمانی بەلووچە. لە لاپەڕەی ١٣دا ئەوەی پێوەندی بە زمانی بەلووچەوە هەیە لە دوو رستەدا "روونی دەکاتەوە"و لە زمان پیکۆلێن، ئێرانناسی سۆوییێتی‌یەوە دەگێڕێتەوە. بەداخەوە ماکان لێرەش‌دا راستی لە زانستدا لە بیر دەباتەوەو نووسراوەکەی پیکۆلێن دەگۆڕێ. بە قسەی ماکان پیکۆلێن بەم جۆرە دەنووسێ: "زمانی بەلووچ دوو شێوەی هەیە کە هەردووکیان ژمارەیەکی زۆریان لە وشەکانی گەلانی دراوسێی خۆیانەوە وەرگرتوە... شێوەی رۆژئاوا لە وشەکانی زمانی فارسی، بە چەشنییێك کە لە هێندێك

لە مەڵبەندەکانی بەلووچستانی ئێراندا جیاوازییەکی بەرچاوی لەگەڵ زمانی فارسی نیە."

بەڵاّم لەراستیدا پیکۆلێن بەم جۆرە دەنووسێ: "زۆربەی زۆری بەلووچەکان چ لە بەلووچستانی رۆژئاواو چ لە بەلووچستانی رۆژهەڵاتدا بە زمانی خۆیان یانێ زمانی بەلووچ قسە دەکەن کە یەکێکە لە زمانە ئێرانییەکان. زمانی بەلووچ دوو شێوەی هەیە کە هەردووکیان ژمارەیەکی زۆریان لە وشەکانی گەلانی دراوسێ وەرگرتوە. شێوەی رۆژهەڵاّت لە وشەکانی زمانەکانی هیندیو شێوەی رۆژئاوا لە وشەکانی زمانی فارسی." ئاغای ماکان لەم وتە گێڕانەوەدا رستەی یەکەمی لابردووە ناچار نەبێ دان بەوە دابنێ کە بەلووچەکان بە زمانی خۆیان یانی زمانی بەلووچ دەدوێن.

بەشی یەکەمی رستەی دووهەمیشی فڕێ داوە تا خوێنەر تێنەگا کە شێوەی رۆژهەڵاّتی زمانی بەلووچ ژمارەیەکی زۆری لە وشەکانی زمانی هیندی وەرگرتوە. پاشان رستەی "بە چەشنێك کە لە هێندێك لە مەڵبەندەکانی بەلووچستانی ئێراندا جیاوازییەکی بەرچاوی لەگەڵ زمانی فارسی نیە". لە مەتنی رووسیدا بەو تەرتیبە نیە. لە مەتنی رووسیدا لە پاش دوو رستە پیکۆلێن لە نووسەرێکی ترەوە دەگێڕێتەوە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەلووچەکانی هەرێمی سنوور بە زمانێك دەدوان کە لە زمانی فارسی نێزیکتر بوو تا زمانی بەلووچ. ئەمەیە شێوەی عیلمی ئاغای ماکان لە لێکۆڵینەوەی مەسائیلێکدا کە بۆ بزووتنەوەی دژی ئیمپریالیستیو دێموکراتی ئێران یەکجار زۆر گرینگن.

ماکان ئەو دەم دێتە سەر زمانی ئازەربایجانی. لێرەشدا سەرەڕای ئەوەی هەر ئەو شێوەی دژی زانستییەی پێشووی بەکار دێنێ ناوەرۆکی قسەکانی هەموو ئینسانێکی تێگەیشتوو دەخاتە سەرسووڕمانەوە. ئەگەر بمانەوێ هەموو بەڵگەهێنانەوەکانی ماکان وەڵاّم بدەینەوە قسە زۆر درێژ دەبێتەوە. بۆیە چەند نوختەی بنەڕەتی دەست نیشان دەکەین. ماکان دەنووسێ سەدان ساڵ لەمەوبەر خەڵکی ئازەربایجان بە "نیوە زمان"ی ئازەری قسەیان دەکرد کە لکێك بوو لە زمانی فارسی. ئەگەر بۆ تاوێکیش بێ وادادەنێین بیروڕای ماکان راستە. ئەوە بۆ ئێمە گرینگ نیە کە چەند سەدە لەمەو پێش خەڵکی ئازەربایجانی ئێستا بە چ زمانێك قسەیان کردوە. بەڵاّم ئەدی ئێستا بە

چ زمانێك قسە دەكەنو ئایا دەتوانین زمانی ئێستایان بە لكێـك لـە زمـانی فارسـی دابنێین؟

ئەوە كە زمانی ئازەری لێكدراوێكە لە زمانی توركیو ئـازەریو عـەرەبی نابێتـە بەڵگەی سەربەخۆنەبوونی زمانی ئازەری. كام زمان لـــە زمانـە پێشـكەوتووەكان لـە فەرانسە، ئینگلیزی، ئاڵمانییەوە بگرە تا زمانەكانی ئێسلاڤ لێكدراوێك لـە زمانـە جۆربەجۆرەكان نیە. راستییەك كە حاشای لیٚ ناكریٚ ئەوەیە كە چەند میلیۆن خەڵكی ئازەربایجان بە زمانێك قسە دەكەن كە فارسی نیە.

ئەوەندە بەسە كە ئاغای ماكان خۆی زەحمەت بداو بچێتە یـەكێك لـە دێیـەكانی ئازەربایجان ئەو دەم بە چاوی خـۆی دەبینـیٚ كـە زمـانی خـەڵكی ئازەربایجـان تـا چ رادەیەك لەگەڵ زمانی فارسی جیاوازی هەیە. ئاغای ماكان لەوە دڵگیرە كـە زمـانی توركی لە درێژایی مێژوودا بە سەر خـەڵكی ئازەربایجـاندا بـڕاوە كـەچی لـە نیـوەی دووهەمی چەرخی بیستەمدا بۆخۆی پێشنیار دەكا زمانێكیتر كە ئـەم جـارە زمـانی فارسییە بە سەر خەڵكی ئازەربایجاندا ببڕیٚ. ماكان پێی وایە كـاتێك دان بـە بوونـی گەلی جیاوازی ئازەربایجاندا بنیٚ دەست بەجیٚ بە ژێرزارەكی دانـی بـە جیابوونـەوەی ئازەربایجـان لـە ئـێراندا نـاوە، و چونكـە تـرس لـەو جیابوونـەوە وەك تارماییـیەك سەرانسەری نامیلكەكەی داگرتوە، بۆیە رێگای چارەسەركردنی مەسەلەی نەتەوایەتی لە ئێراندا بە حاشا كردن لە بوونی نەتەوە جیاوازەكان دەزانیٚ.

بەڵام ئایا بەو كارە شۆوینیستییە دەتوانیٚ واقعیەتێكی بـەرچاو بـەراوەژوو بكـاو چەند میلیۆن ئازەربایجانی لە ئێراندا لە مافە نەتەوایەتییەكانیان بیٚبەش بكا. وەیان بە زۆر زمانی فارسییان بە سـەردا بـبڕیٚ؟ مەگـەر رەزاشـاش هـەر ئـەم سیاسـەتەی نەگرتبۆ پێشو لە قوتابخانەو ئیدارەو تەنانەت كۆڵانو بازاڕیشدا قسە كردن بە زمانی ئازەربایجانی قەدەغە نەكردبوو. بەڵام بەرهەمی ئەم سیاسەتە چ بوو؟ رەزاشا رۆیشتو خەڵكی ئازەربایجانو زمانی ئازەربایجانی مانەوە.

بە بیروڕای ئێمە گەلی ئازەربایجان دەبیٚ هــەموو مافـە نەتەوایەتییـەكانی خـۆی وەدەست بێنیٚ. ئەركی سەرشانی هەموو شوڕشگێڕەكانو دێموكراتـەكانی ئێرانـە كـە لەو رێگایەدا خەبات بكەن. گــەلی ئازەربایجـان بـۆ خۆیـەتی كـە دەتوانـیٚ بەكـەڵك وەرگرتن لە مافی دانانی چارەنووس بڕیار بدا كە لە ناو ئێراندا بمێنێتەوە یان نا.

**مەسەلەی کورد لە روانگەی شۆوینیستێکی فارسەوە:**

ماکان دەیسەلمێنێ کە بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد رابردوویەکی کۆنتری هەیە. دیسانیش پێی وایە کە هەموو راپەڕینەکانی گەلی کوردو هەموو تێکۆشانێکی سیاسی کوردەکان لە راپەڕینەکانی چەکداری‌یەوە بگرە تا بلاْوکردنەوەی رۆژنامە بە هاندانی بێگانە بوە. ئەو بێگانەیە جارێك عوسمانی‌یەو جارێك ئینگلیز، جارێك ئەمریکایەو جارێك یەکیەتیی سۆوییێتی. ئاغای ماکان لە لایەك مارکسیزم فێری مارکسیستەکانی ئێران دەکاو لە لایەکی‌تر ئەو ئەسڵە سەرەتایی‌یەی مارکسیزم نازانێ کە بزووتنەوەیەکی دەیانو سەدان هەزار کەس هاوبەشی تێدا دەکەن ئەگەر زەمینەیەکی بەرچاوی (عینی) نەبێ هیچ بێگانەیەك ناتوانێ دروستی بکات. ئەویش بزووتنەوەیەك کە هەر بە قسەی ماکان خۆی لە رۆژگاری سەفەوی‌یەکانەوە تا ئێستا لە کوردستاندا درێژەی هەیە.

ئەوە شتێکی تازە نیە کە جاسووسو نۆکەرەکانی ولاْتە ئیمپریالیستی‌یەکان تێدەکۆشن دەست باوێژنە ناو بزووتنەوەکانی نەتەوایەتی‌و دێموکراتی‌و پێوەندیشی تەنیا بە بزووتنەوەی گەلی کوردەوە نیە.

بەلاْم ئایا تێکۆشانی ئیمپریالیستەکان بۆ ئەوەی دەست باوێژنە ناو بزووتنەوەیەك دەبێتە بەلْگەی داتاشراوی ئەو بزووتنەوەیە؟ ماکان ئەو دوو مەسەلە یانی تێکوشان بۆ دەست هاویشتنە ناو بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە لایەن هێزە ئیمپریالیستی‌یەکانەوەو هەلْگێرساندنی بزووتنەوە بە دەستی ئەو هێزانە بە ئەنقەست بە یەك شت دادەنێ. بۆیە پاش ئەوەی چەند جار هەولْو تەقەلای بێگانەکان لە ناو بزووتنەوەکانی نەتەوایەتی کورددا دەست نیشان دەکا. دەست بەجێ نەتیجە وەردەگرێ کە "بەم چەشنە روون دەبێتەوە کە راپەڕینەکانی کوردستان لە ئێراندا بناغەیەکی نەتەوایەتی‌و زانستی‌یان نەبووەو بەلْکوو بە هاندانی بێگانەو بۆ دابین کردنی مەبەستی ئیمپریالیستەکان هاتوونە دی". ئایا ماکان بەراستی هێندە ساویلکەیە وا بیر بکاتەوە کە ئەگەر هەستی نەتەوایەتی نەبوایە گەلی کورد بۆ دابینکردنی مەبەستی ئیمپریالیستەکان ئەو هەموو خوێنەی دەڕشت. ئایا سمایلی شەریف زادەو مەلائاوارەو سولەیمانی موعینی‌و دەیان شەهیدی‌تر بە هاندانی بێگانە دەستیان دایە چەك؟ ئایا زۆر بی‌ئینسافی نیە مۆری نۆکەرایەتی ئیمپریالیزم لە ناو

چاوانی ئەو شەهیدانە بدرێ کە رابەری راپەڕینە چەکدارانەکەی ئەم دواییی‌یانەیان کـرد لــە دژی رێژیمـی دژی نیشـتمانیو کۆنەپەرسـتی شاهەنشـایی، ئـەویش لــە لایـــەن کەسێکەوە کە خۆی بە ئازادیخوازو دژی ئیستیعمار دەزانێ؟ ماکان بۆ سەلماندنی ئـەو ئیدیعایە کە کوردەکان نەتەوە نین لە لاپەڕەی ٣٢دا دەنووسێ: "هەروەك لــە پێشــەوە دیتمان لنین یەکیەتیی ئابووری خەڵکێك بە شـــەرتی بنــەڕەتی پێکـهاتنی "نەتــەوە" دەزانێ". لنین هیچ کات نەی‌گوتوە کە شەرتی بنەڕەتی پێکهاتنی نەتەوە، یەکیــەتیی ئابووری خەڵکێکە. ئەگەر ئەو ئەسڵە راست بــێ خــەڵکی یووگوسـلاڤیو یەکیــەتیی سۆوییێتی کە بە زمانی جیاواز قســە دەکــەن یــەك نەتــەوەن، چونکــە لــەو ولاتانــەدا یەکیەتیی ئابووری هەیە.کاتێك یەکیەتیی کۆمارەکانی ســۆوییێتی سۆسیالیسـتی لــە ساڵی ١٩٢٢دا پێك‌هات زۆربەی کۆمارەکـانی ئاسـیای نـاوەندیو قـەفقاز لــە بـاری پێشکەوتنی ئابوورییەوە لە قۆناخێکی زۆر دواکەوتوودا بوون بەلاّم ئەوە هیچ نــەبووە کۆسپ لە رێگــای پێك‌هــاتنی کۆمارەکـانی نەتــەوەیی کازاخسـتان، تورکمەنسـتان، تاجیکستانو ئەرمەنستان دا. نەتەوە دەرکەوتێکە (پدیدە ـ ظاهرة) کە لــە ئــەنجامی رەوتێکی مێژوویی دوورو درێژدا پێك‌دێ. کۆمەڵێك ئینسان کە لە درێژایی مێـــژوودا لە ولاتێکی هاوبەش‌دا دەژین، زمانی هاوبەش‌و خوو خدەی هاوبەشـیان هەیــە، بــەرە بەرە لە ئەنجامی گەشەکردنی ئابووری‌دا دەبن بە خاوەنی ئابووری هاوبــەش. ئـابووری هاوبەش لە پێش سەرمایەداری‌دا کە پێویستی بە ئابووری هاوبەش هەیە ناتوانێ پێك بێ. یەکەم هۆی ئەوە کە کوردەکان ئابووری هاوبەشیان نیـــە دواکــەوتوویی کۆمــەڵی کوردەواری‌یە کە تازە خەریکە لە فئۆدالیزمەوە تێ‌دەپەڕێ بۆ کۆمـــەڵگاکانی دواتــر. دووهەم کاتێك سەرزەوی کوردســـتان لــە نێـوان چــەند ولاّت‌دا دابــەش کـراوە، چـۆن دەتوانی چاوەڕوان بی کە کوردەکــان ببنــە خـاوەنی یەکیــەتیی ئـابووری. یەکیــەتیی ئابووری تەواو بەر لە پێکهاتنی دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوایەتی پێك نایـــە. بــەڵکوو بوونی دەوڵەتی ســـەربەخۆی نەتەوایەتی‌یــە کــە دەتوانــێ لــە پێکـهێنانی یەکیــەتیی ئابووری خێرایی بکا. ماکان پێی وایە چونکە لە زمانی کوردی‌دا چەند شـــێوە هەیــە ناکرێ پێی بگوترێ زمان. لـــەپێش‌دا دەبــێ بڵێــین بوونــی چــەند شـێوەی جۆربــەجۆر تایبەتی زمــانی کـوردی نیــە. زمـانی ئاڵمـانی کـە یەکێکـە لــە زمانـە مودێـڕن‌و پێشکەوتووەکان، ئێستاش خاوەنی چەند شێوەی جۆربەجۆرە. ناتەواوی زمانی کوردی

لەوەدایە کە ئەلفو بیّیەکی نیە کـە بتوانـیّ ببیّتـە بناغـە بـۆ پیّکهیّنـانی زمـانی ستانداردی کوردی. ئیّستا لە قوتابخانەکانی کوردستانی عیّراقدا بـە زمـانی کـوردی دەخویّندریّ. رۆژنامەو گۆڤارو کتیّـب بـەو زمانـە بـلاّو دەکریّتـەوە. لـە یەکیـەتیی سۆوییّتیشدا هەر وەهـا. رۆژهەلاّتناسـەکان لـە رۆژهەلاّتـەوە تـا رۆژئـاوا هـەموو سەلماندوویانە کە زمانی کوردی زمانیّکی سەربەخۆیە. لیّك نیزیکی زمـانی کـوردیو فارسی نابیّتە بەلّگەی ئەوە کە زمانی فارسی شـیّوەیەکی زمـانی کوردییـە یـان بـە پیّچەوانە زمانی کوردی یەکیّکە لە شیّوەکانی زمانی فارسی. مەگەر زمانی رووسیو بیلورووسی یا زمانی رووسیو ئۆکراینی جیاوازییان لە نیّواندا پترە لە زمانی کوردیو فارسی؟ تەنانەت دوو نەتـەوەی جیـاوازیش دەگونجـیّ بـە زمـانیّك قسـە بکـەن وەك ئۆتریشییەکانو ئالّمانییـەکان فەرانسـەوییەکانو بلژیکییـەکان، ئینگلیزییـەکانو ئەمریکاییەکانو هتد.

ئەوە کە کوردەکان خاوەنی سەرزەوییەکی هاوبەشن جیّگای بـاس نیـە. تەنانـەت ماکانیش کە لە گۆڕینو حاشا کردنی شتی واقیعیدا زۆر دلیّرو پڕڕوویە لـەو بـارەوە بیّدەنگە. بەلاّم شتیّکی ئاغای ماکان سەرنجی نەداوەتیّ ئەوەیە کە ئەو خەلّکـەی لـە ولاّتیّکی هاوبەشدا دەژینو بە زمانیّکی هاوبەش دەدویّن، خۆیان بـە کـورد دەزانـن. خووو رەوشتی هاوبەشی کوردەکانو خەباتیّکی دوورودریّژ کە بە دریّژایی میّـژوو بـۆ پاراستنی بوونو مانـەوەی خۆیـان کردوویانـەو دەیکـەن، یەکیەتیـەکی نەتەوایـەتی ئەوتۆی لە نیّوان کوردەکاندا پیّکهیّناوە کە لـە نـاو گـەلانیتردا کـەمتر دەبینـدریّ. کوردەکان خۆیان بە کورد دەزانن‌و بۆ وەدەستهیّنانی مافـەکانی نەتەوایـەتی خۆیـان خەبات دەکەن. ئەوە راسـتییەکی حاشـا لیّنـەکراوەو بڕیـاردەرە. ئیّسـتا ماکـان وا دەزانیّ بە غەلّەتبازیو هەوانتەی چەند شۆوینیستیّك دەتوانیّ خەتی سـوور بـە سـەر بوونی نەتەوەیەکدا بکیّشیّ.

لە لیّکۆلّینـەوەی مەسـەلەی کوردیـشدا ماکـان هـەروا بـە رەوشـتەکەی خـۆی وەفادارەو پشت دەکاتە راستی لە زانستدا، لە لاپەڕەی **٣٣**دا بەم چەشنە ماکـان لـە کتیّبی "عبدالرحمان قاسملو" (کوردستانو کورد)ەوە دەگیّڕیّتـەوە: "هیّندیّکیتـر لـە لیّك نیزیك بوونی زمانی کوردیو فارسی بە پیّچەوانە کەلّك وەردەگرنو کوردەکانیش بە ئیّرانی دەزانن یانی فارسو دوایە لیّی زیاد دەکا کوردەکان ئیّرانی نین". لە تەواوی

کتێبی قاسملوودا ئەو رستە نیە کە "کوردەکان ئێرانی نین". ئەودەم بەم چەشنە رای خۆی دەردەبڕێ: "بەڵێ پانکوردیستەکان لە ئەفسانەی جاسووسانی ئیمپریالیزم لە بارەی "نەتەوە"ی کورددا بە چەشنێك تواونەوە کە گەیشتوونەتە رەگەزپەرەستی‌و (وەك پان ئێرانیستەکان) کوردەکان بە "رەگەزی خاوێن" دەژمێرن." سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە لە تەواوی کتێبی قاسملوودا مەسەلەی رەگەز نەهاتۆتە گۆڕێ‌و سەبارەت بە خاوێنی رەگەزی کوردەکان قسەیەك نەکراوە. بەڕاستی ئاغای ماکان لە گۆڕین‌و بوختان‌و درۆپێوە نووساندندا دەستی دەڕوا. ماکان جارێکی‌تر دەست بە تێکدان دەکاو دەنووسێ: "ئەگەر راپەڕینی سمایل ئاغای سمکۆ راپەڕینی جووتیاران بوو . . ." لێرەشدا ماکان شێوە ناسراوەکەی خۆی بەکار هێناوە. قاسملو نوسیویەتی کە هێزی بنەڕەتی راپەڕینەکەی سمکۆ لە جووتیاران پێك‌هاتبوو. نەك ئەوە کە راپەڕینی سمکۆ راپەڕینی جوتیاران بوو. جیاوازی نێوان ئەو دوو راپەڕینەش شتێکی ئاشکرایە. بە قسەی ماکان قاسملوو سەلماندوویەتی کە "راپەڕینەکانی کوردستان لە درێژایی سەدەی رابردوو و سەرەتای سەدەی ئێستادا بە هاندان‌و لە ژێر پارێزگاری ئیمپریالیستەکاندا پێك‌هاتوون". ئەو ئیدیعایە درۆیەکی رووتە، بە خۆڕایی نیە کە ماکان لەم هێنانەوەدا لاپەڕەی کتێبی قاسملوو دەستنیشان ناکا.

ماکان بزووتنەوەی مەهاباد بە دەستکردی بێگانە دەزانێ‌و قازی محەمەد بە کارگێڕی بەڕێوەبردنی سیاسەتی بیگانەکان لە کوردستاندا. ئەو ئیدیعا دەکا کە "ئەو کۆمارە هەر لە بەر ئەوەی پشتی بە کۆمەلانی خەڵك نەبەستوو، چونکە بزووتنەوەیەکی جیاوازی‌خوازانە بوو بە بێ بەگژیەکەدا هاتنێکی سەختی عەسکەری لەگەڵ ئەرتەشی پەهلەویدا لە بەرێك هەڵوەشا." دیارە ئاغای ماکان لە بارەی کۆماری مەهابادەوە زۆر کەم ئاگادارە. بە شاهیدی دۆست‌و دوژمن (ئەوەندە بەسە کە ماکان تەماشایەکی کتێبی "نجفقلی پسیان لە مەهابادی خوێناوی تا قەراخەکانی چۆمی ئاراز بکا"). قازی محەمەدو کۆماری مەهاباد بە چەشنێکی بێوێنە جێگای خۆیان لە ناو خەڵکی کوردستاندا کردبۆوە. ئێستاش کۆماری مەهاباد دیاردەی خەباتێکی دوورودرێژی مێژوویی‌یەو لانی چاکەو خەراپەی ئەو کۆمارە میراتێکی گەورەیە بۆ گەلی کورد. نە ئاغای ماکان‌و نە شۆوینیستەکانی‌تری فارس بە گشتیی‌و نەکۆنەپەرستی حەمەڕزاشا ناتوانن کاریگەریەتی مەعنەوی ئەو کۆمارە لە ناو بەرن.

سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە ئاغای ماکان (ل٤٠) لە حیزبی توودەی ئێران داوا دەکا کە لە دژی مافی دانانی چارەنووسی گەلانی ئێران خەبات بکا. ماکان دەڵێ لە نێوان دروشمی دیفاع لە تەواویەتی ئەرزی ئێرانو مافی دانانی چارەنووسی گەلانی ئێراندا کە هەر دووکیان لە بەرنامەی حیزبی توودەی ئێراندا هاتوون ناتەبایی هەیە.

بە رێکەوت ئەم قسەیەی ماکان راستە، بەڵام رەخنەیەك کە لە بەرنامەی ئەو حیزبە دەگیرێ ئەوە نیە کە بۆچی مافی دانانی چارەنووسی تێدا گونجاوە. بەڵکوو بە پێچەوانەی ماکان، رەخنە ئەوەیە کە بۆچی دیفاع لە تەواویەتی ئەرزی ئێران هاتۆتە ناو ئەو بەرنامەوە. ئەو دروشمە یانی دیفاع لە تەواویەتی ئەرزی وڵات ناتوانێ پێوەندی بە حیزبی چینی کرێکار، حیزبی مارکسیستەوە هەبێ. ئەو دروشمە، دروشمی حیزبی بورژوازی و وردە بورژوازیە. ئەو دروشمە پاشماوەی ئەو سەردەمەیە کە حیزبی توودە ناوی حیزبی کرێکاری لەخۆی نەنابوو.

## "چارەسەر کردنی مەسەلەی نەتەوایەتی لە چینو یووگوسلاڤیو بیروڕای ئاغای ماکان"

ماکان پاشان بۆ سەلماندنی ئیدیعاکانی خۆی هەڵدێ بۆ سەحرای کەربەلا، دەیەوێ لە هەستو خوێنگەرمی لاوە شۆڕشگێڕەکانی ئێران بە پێچەوانە کەڵك وەرگرێو بۆیە دەکەوێتە سەر لێکدانەوەی سیاسەتی نەتەوایەتی چینی کومۆنیستو ئیدیعا دەکا کە چین مەسەلەی نەتەوایەتی بە جۆرێك چارەسەر کراوە کە کۆتایی بە دروشمی مافی دانانی چارەنووسی گەلان هێنراوە. بەبیروڕای ئێمە ئەوە بوختانێکی نارەوایە سەبارەت بە سیاسەتی نەتەوایەتی کۆماری گەلی چین.

وڵاتێك کە لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیدا لایەنگری رزگاری هەموو گەلانی گەورەو بچووکەو لە خەباتی رزگاریخوازانەی ئەو گەلانە پشتیوانی دەکا، چۆن دەتوانێ لە ناوخۆدا ئەسڵی لنینی مافی دانانی چارەنووسی گەلان لە بن پێ بنێ. بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە سەرنجڕاکێشترە بەرەنگاربوونی رێکخراوی شۆڕشگێری حیزبی توودەی ئێران لە دەرەوەی وڵاتە لەگەڵ مەسەلەی نەتەوایەتی لە ئێراندا. هەموو کەس دەزانێ کە ئەو رێکخراوە لە هەڵوێستی حزبی کومۆنیستی چین لە مەسائلی ناونەتەوەییدا پشتیوانی دەکاتو تێدەکۆشێ لە تاقیکردنەوەکانی گەلی چین بۆ پێشکەوتنی شۆڕشی ئێران

کەڵك وەرگرێ. خۆ ئاشکرایە کە ئەو رێکخراوە لە ئاغای ماکان پتر لە بیروباوەڕی حیزبی کومۆنیستی چین لە مەسەلەی نەتەوایەتی‌دا شارەزاییی هەیە.

بلاوکراوەی "توودە" ئۆرگانی ئەو رێکخراوە لە ژمارەی ١٨ سالی ١٣٤٩ لە وتارێك‌دا کە سەبارت بە مەسەلەی نەتەوایەتی‌و مەسەلەی کورد نووسیویەتی نوختەنەزەری مارکسیست ـ لنینیستەکانی لێك‌داوەتەوە. کە بێ جێ نیە بۆ ئاگاداری ئاغای ماکان چەند رستەیەکی لێرەدا بێنینەوە: "ئێمە لە چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی وا تێناگەین کە بۆ وێنە خودموختاری (ئوتۆنۆمی) بدرێ بە نەتەوەیەك. بەڵکوو مەسەلەی بنەڕەتی ئەوەیە کە ئەو نەتەوە ئازاد ببێ، لە بارەی جیابوونەوەو پێکەوەبوون‌دا بڕیار بدا. "ل٣٣" . . . . مارکسیست ـ لنینیستەکانی ئێران بە گەلانی زۆر لێکراوی ئێران زۆر قەرزدارن‌و خەباتێکی سەخت‌و بەردەوام لە ماوەیەکی دوورو درێژدا پێویستە هەتا لە لایەك شۆوینیستەکانی فارس تێك‌بشکێنن‌و لە لایەکی ترەوە دۆستایەتی‌و دڵنیایی زەحمەتکێشانی نەتەوەکانی‌تری ئێران بۆ لای خۆیان رابکێشن."ل٣٦ " ئەوە کە ئیمپریالیزم ناهەقی لە تەواوی گەلەکانی ئێران دەکاو رێژیمێکی داتاشراوی بە زۆر بە سەر هەموو خەڵکی ئێران‌دا سەپاندووە. لایەکی مەسەلەی نەتەوایەتی لە ولاتی ئێمەدا پێك‌دێنێ. لایەکەی‌تری ئەو مەسەلە ئازادنەبوونی گەلەکانی کورد، ئازەربایجانی‌و گەلەکانی‌ترە لە دانانی چارەنووسی خۆیان‌دا. دیتنی لای یەکەم‌و نەدیتنی لای دووهەم، یان هێنانی لای یەکەم بۆ وەلانانی لای دووهەم، گرتنی هەلوێستێکی شۆوینیستانەیە. "ل٣٨" "ئەرکی مارکسیست ـ لنینیستەکان لە هەلومەرجی ئێستادا ئەوەیە کە دیفاعێکی تەواو شێلگیر لە مافی ئازادی جیابوونەوەی نەتەوەکان بکەن. لەم هەلومەرجەدا مەترسی شۆوینیستی نەتەوە بچووکەکان گرینگ نیە بەڵکوو مەترسی گرینگ شۆوینیستی نەتەوەی گەورەیەو دەبێ مارکسیستەکان لە دژی ئەو مەترسییە خەبات بکەن. "ل٣٩" بەرەنگار بوونی مارکسیست ـ لنینیستەکان لەگەڵ مەسەلەی نەتەوایەتی‌دا بەم جۆرەیەو ئەو بەرەنگاربوونە لەگەڵ نوختە نەزەری وردە بورژوازی ئاغای ماکان کە ئەویش لایەنگری پێکهێنانی حکوومەتێکی ناوەندی دێموکراتی‌یە بە سەرکردایەتیی حیزبی چینی کرێکاری ئێران جیاوازی‌یەکی زۆری هەیە. ماکان دیسان هەر بۆ خەڵك فریودان ئەم جار هێرش دەباتە سەر سیاسەتی نەتەوایەتی یووگوسلاڤی‌و دژی

فیدرالیزم رادەوەستێ. ناوبراو دەگاتە ئــەو ئەنجامــە کــە کۆمــەڵی کومۆنیســتەکانی یووگوسلاڤی "لایەنگری سەربەخۆیی نەتەوایەتیو فەرهەنگییە یانی لایــەنگری ئــەو سیاسەتەیە کە لنین لە دژی ئەو خەباتی دەکرد. . ." ئێمــە نیشــانمان دا کــە ئاغــای ماکان چۆن هەڵوێستی لنینی لە دژی دروشمــی ســەربەخۆیی فەرهــەنگی گۆڕیــوەو وا جارێکیتریش دەستی داوەتە تێکدان. لە سەرەتای قانوونی ئەساســی یووگوســلاڤیدا نووسراوە: "نەتەوەکانی یووگوسلاڤی لەگەڵ لە بەرچاو گرتنی مافی چارەنووسی هــەر نەتەوەیەك بە مافی جیابوونەوە لە کۆماری یەکگرتووی نەتــەوەکانی ئــازادو خــاوەن مافی وەك یــەكدا کۆبوونــەوەو کۆمــەڵی سۆسیالیســتی فیدراتیــوی زەحمەتکێشــانی کۆماری سۆسیالیستی فیدراتیوی یووگوسلاڤییان پێكهێناوە." لە بــەندی یەکــەمی قانوونی ئەساسیدا دەڵێ "کۆماری سۆسیالیستی فیدراتیوی یووگوســلاڤی دەوڵــەتی هاوبەشی گەلانی ماف وەك یەکە کە بە داخوازی خۆیان یەکیان گرتووە." ئەو هەمــوو تێکدانە ئاشکرایەو وەرگێڕانی راستییەکان لە لایەن ئاغای ماکانەوە بەڕاستی چــاوو رووی دەوێ.

## "نەتیجە وەرگرتن"

نەتیجــە وەرگرتنــەکانی خوێنــەر دەخاتــە سەرســوورمانو ناڕەحەتییــەوە. سەرسووڕمان لە بەر ئەوە کە نووسەر لە گیروگرفتەکانی ئێرانو بە تایبەتی مەسەلەی نەتەوایەتیدا خۆی بەشارەزا دەزانێو نارەحەتیش لەوەی کەسێکی خۆی بە ئــازادیخواز دەزانێ سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایــەتی ئــەو چەشــنە داوەرییــە ناڕاســتانە بکــا. ماکان بەو پەڕی بێئینسافییەوە ئیدیعا دەکا کە "ئێمە دیتمان کە چونکــە ئــابووری فەرهەنگو زمانی ئێران هەمووی هاوبەش بووە زوڵــمو زۆر لــە هیچکــەس نــەکراوە. "ل٤٣" تەنانەت هەڵسوڕێنەرانی رێژیمی حەمەڕەزا شاش لە روویان نایە بیروباوەڕێکی ئەوتۆ دەربڕن. هەر لەو لاپەڕەدا ماکان دەنووسێ: "لە بــەر چــاوکردنی ئــەو هــەموو شتە ئاشکرایانەیە کە ئێمە بێجگــە لــە نەتــەوە ـ گــەل ـ ی ئــێران لــە چوارچێــوەی سنوورەکانی ئەو ولاتەدا گەلێکیتر ناناسین." پاشان لە دوای تێك خســتنەوەی چــەند مەبەستی بێسەروبن دەگاتە ئەم ئەنجامە "ئێمە دەبێ بزانین کە بە پێچەوانەی ئــەوەی لە بارەی قرقیزەکانو رووسەکاندا راستە (یانێ ستەمی نەتەوایــەتی بــەکار هــاتووەو پێوەندی زانیاریو ئابوریش نەبووە). لە بارەی تەورێزییەکانو شیرازییەکاندا راســت

نیە ( یانیٚ ستەمی نەتەوایەتی بەکار نەهاتوەو پێوەندی زانیاریو ئـابووریش هـەموو کاتێك بووە) "ل٤٤".

خوێنـەر بـیٚ گۆمـان دەبینـیٚ کـە ئاغـای ماکـان زۆر بـە زرینگـی لـە جیـاتی ئازەربایجانی‌یەکانو فارسـەکان دەنووسـیٚ تەورێزی‌یـەکانو شـیرازی‌یەکان چونکـە بـۆ خوێنەری ئێرانی زۆر گرانە بسەلمێنیٚ کـە دانیشـتووانی شـیراز دانیشـتووانی تـەورێز دەخەنە ژێر زوڵمو زۆر لە حالێکدا سەدان کیلومیتر لێك دوورن.

ئەوە کە منداڵی تەورێزی بۆ خوێندەوار بوون ناچارە فێری زمانی فارسی ببیٚ کـە بۆ ئەو زمانی بێگانەیەو هەقی نیە بە زمانی زگماکی خۆی بخوێنیٚ بە بیروڕای ماکان هیچ پێوەندی بە ستەمی نەتەوایەتی‌یەوە نیە.

بەڕاستی جێی داخە کەسێك خۆی بە پێشکەوتوو و دژی ئیمپریالیستو ئازادیخواز دەزانیٚ لە بەرەنگاربوونی مەسەلەی نەتەوایەتی‌دا ئەوەندە کورتبینی (تنـگ نظـری) بەکار بێنیٚ. سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە ماکان راپەڕینی "یەعقووب لەیسـی سـەفار"، "مازیار"و "ئەبوومۆسلمی خوراسانی" کە چەند سەدە لەمەو پێـش دژی دەسـەڵاتی عەرەبەکان پێك هاتوونو بە راپەڕینی رزگاریخوازانی ناو دەبا، بەڵام ئەگـەر کوردێـك وێرای راپەڕینەکانی گەلی کورد لـە سـەدەی بیسـتەمدا بـە بزووتنـەوەی نەتەوایـەتی ناوبەریٚ کفری کردووە.

پێشـنیاری ئاغـای ماکـان بـۆ چـارکردنی مەسـەلەی نەتەوایـەتی لـە ئـێراندا ئەسالەتێکی تایبەتی هەیەو کورتەی قسە ئەوەیـە کـە هیـچ گـەلێك خـاوەنی هیـچ چەشنە مافێکی نەتەوایەتی نەبیٚو هەموو گەلانی ئێران بتوێنەوەو یەك گـەلو یـەك نەتەوە پێك بیٚ.

جێگای سەرسووڕمانە کە ماکان بەو بیرو باوەڕەوە هێرش دەباتە سەر نازی‌یەکانی نیشتمانی‌و بە خۆڕایی دۆستانو هاوبیرانی خـۆی دەڕەنجێنـیٚ. رێبـازی ماکـان یـانیٚ حاشاکردن لە بوونی گەلەکانی زۆرلێکراوی ئێرانو تێکۆشان بۆ تواندنـەوەی ئـەوان، رێبازێکی کۆنەپەرستانەو دژی ئینسانییە.

ئاشکرایە کە ئینسانە ئازادیخوازەکـانو پێشـڕەوانی خەباتکـەری ئـێران لـە هـەر نەتەوەیەك بن ناچنە ژێر باری سیاسەتێکی ئەوتۆو لێی بێزارن. ئێمە بە نۆرەی خۆمان بیروڕای ماکان رەت دەکەینەوەو بە هەموو هێزمانەوە لە دژی خەبات دەکەین.

گەلەکانی ئێران لە راستی‌دا هەن‌و بوونی ئەوان بە ئەفسانە لە قەڵـەم‌دان ناتوانێ ئەو راستی‌یە بگۆڕێ.

رێژیمی کۆنەپەرستی شاو دەسەلاّتی ئیمپریالیزم تەنیا بە خەباتی هاوبەشی هەموو گەلانی ئێران دەتوانێ سەرەونخوون بکرێ. خەباتی هاوبەش پێویستی بە دانپێدانانی بوون‌و وەك یەکی مافی هەموو گەلانی ئێران هەیە. خەباتکەرانی گەلی کورد لە ئێراندا بە پێچەوانەی ئیدیعا ماکان داوای جیابوونەوە لە ئێران ناکەن. ئەوان لە کردەوەداو لە ئەنجامی تاقی‌کردنەوەی مێژوویی‌دا چاك تێگەیشتوون کە رێگای رزگاری گەلی کورد لە یەکیەتی‌و برایەتی‌و خەباتی هاوبەش لەگەڵ گەلەکانی ئێران لە دژی رێژیمی زۆرداری‌و دەسەلاّتی ئیمپریالیزم‌دا شاراوەتەوە.

هەربۆیە ئەوان لە دژی ناسیۆنالیزمی کورت‌بینانە (تنـگ نظرانـە)ی کوردو ئەو هێزانە کە لە ناو بزووتنەوەی گەلی کورددا دەبنە هۆی پەرش‌و بلاّوی ریزەکان‌و پەیدابوونی دووبەرەکی لە نێوان گەلەکانی ئێراندا خەبات دەکەن.

لە بەر خاتری یەکخستنی خەباتی گەلەکانی ئێرانە کە ئێمە داوای ناسینی مافی دانانی چارەنووس لە ئێراندا دەکەین. ئەوە تەنیا رێگای راکێشانی دڵنیایی نەتەوەکانی زۆرلێکراوی ئێرانەو تەنیا هۆی پێکهێنانی یەکیەتیی داخوازانەو پێوەندی بەهێزی ئەوانە لە ئێرانێکی ئازادو دێموکراتیك‌دا.

**ژێدەر:**

* نامیلکەی رێکخراوی رووناکبیرانی کوردی ئێران، سپتامبری ١٩٧٠ ـ خەرمانانی ١٣٤٩

## باسێك سەبارەت بە مودیرییەت

لە حیزبی دێموکراتدا دوو بەڵگەنامە (سەنەد)ی ئەساسیمان هەیە، یەکیان بەرنامەیە کە ئامانجە ستراتیژیکەکانی حیزب دیاری دەکا، جیا لەوە لە بەرنامەدا ئامانجی دوارۆژی حیزبیش کە بریتیە لە سۆسیالیزمی دێموکراتیك دیاری کراوە.

بەڵگەنامەی دووهەم پەیڕەوی نێوخۆیە، پەیڕەو قاعیدەو قانوونی هەڵسووڕانی نێوخۆو پەیوەندیی ئۆرگانە جیاجیاکانی حیزب پێکەوە دیاری دەکا. لە راستیدا پەیڕەوی نێوخۆ قانوونی ئەساسیی حیزبەکەمانە.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکانەی کە لە بەرنامەی حیزبەکەماندا هاتوونو ئەرکی ستراتیژیکن، ماوەیەکی زۆر پێویستە. بەڵام ئێمە هەموو رۆژێ تێکۆشانمان هەیە. هەموو رۆژێ خەریکی فەعالییەتی رۆژانەین، کەوابوو دەبێ بۆ گەیشتن بە ئامانجە ستراتیژیکەکان بەرنامەڕێژی بکەین، ئەو بەرنامەڕێژییە یانێ گەلاڵە (تەرح) دانان، لەگەڵ بەرنامەی حیزبدا هاتوون دەبێ شەوو رۆژ تێکۆشانمان هەبێ. ئەو تێکۆشانە ماوەی دیاریکراوی نیە. بۆ ئەوەی ئەرکی رۆژانە جێبەجێ بکەین، دوو مەرجی بنەڕەتی هەیە:

**١ـ مەرجی سیاسی:**

مەرجی سیاسی بۆ کادرێکی حیزبی بوونی سیمای دێموکراتە. هەموو کادرەکانی حیزبی مەرجەکانی سیمای شەخسیەتێکی تەشکیلاتیی دێموکراتیان خوێندۆتەوە لەوێدا مەرجەکانی کادرێکی حیزبی دیاری کراون.

**٢ـ مەرجی دووهەم واتە مەرجی تایبەتی:**

کە بریتی‌یە لە هێندێك تایبەتمەندیی ئەخلاقی‌و حیزبی کە لە پێڕەوی نێوخۆدا هاتوە. بەلاَم چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەرکی رۆژانە نە لە بەرنامەدا هاتوە نە لە پێڕەوداو بەگشتی تا ئێستا لە حیزبدا کەمتر باس لە سەر ئەوە کراوە کە کاری رۆژانە بە چ شێوەیەك بەرینەپێش؟

وەلاَمی ئەم پرسیارە باسێك دێنێتە پێش کە پێی دەگوترێ مودیرییەت یان بە واتایەکی‌تر چۆنیەتی هەڵسووڕاندنی کاروباری حیزبی.

لە مودیرییەتدا سێ بەش هەیە. یەکەم ئەو بەشەی کە سیاسەتێکی گشتی دادەنێ، دووهەم ئەو بەشەی کە سیاسەتە گشتییەکان دەکا بە ئەرك یان بڵێین ئەرکەکان دیاری دەکا. سێهەم ئەو بەشەیە کە بریتی‌یە لە ئیجراکردن‌و جێبەجێ‌کردنی ئەرکەکان.

لە حیزبی ئێمەدا کۆنگرە سیاسەتە گشتی‌یەکان دیاری دەکا. کومیتەی ناوەندی ئەو سیاسەتە گشتییانە دەکا بە ئەرك‌و بۆ جێبەجێ‌کردن دەیدا بە ئۆرگانە حیزبی‌یەکانی وەك دەفتەری سیاسی، کومیسیۆنەکان، مەڵبەندەکان، کومیتە شارستانەکان‌و بە گشتی هەموو بەدەنەی حیزب. پێش ئەوەی بچینە سەر باسی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەرکەکان دەبێ ئیشارە بەو راستییە بکەین کە شێوەی مودیرییەت لە ئیدارەیەکی دەوڵەتی، ئەرتەشێکی کلاسیك‌و حیزبێکی شۆڕشگێڕ بەتایبەت حیزبی دێموکراتدا جیاوازی هەیە.

لە ئەرتەش‌دا (بێجگە لە هێندێك شێوەکار) بە گشتی مودیرییەت لە سەر دەستووردانە. بە خۆڕایی نیە کە دەڵێن لە ئەرتەش‌دا ئیتاعەت کوێرکوێرانەیە. هەرچەند لە ئەرتەشی ولاَتێکی دێموکراتدا رەنگە لە شێوەی دیکەش کەڵك وەربگیرێ. لەم شێوە مودیرییەتەدا لە سەرەوەڕا ئەمر دەکرێ‌و نەفەراتی خوارەوە دەبێ ئەمرەکە جێبەجێ بکەن. هێندێك جار لە کاری نیزامیی حیزبی خۆشماندا کاتێك بڕیار درا، بڕیاردان، دەستەجەمعی‌یە، ئیتر بڕیارەکە دەبێ بێ ئەملاو ئەولا جێبەجێ بکرێ. بڕیار دەدرێ جەولەیەکی سیاسی- نیزامی لە ناوچەیەکدا بکرێ، فەرماندەری هێز دەستوور دەداو ئەرکی نەفەرات دیاری دەکا، جا ئیدی لە جێبەجی کردنی ئەو ئەرکانەدا هیچ باس‌و کێشەیەك نیە.

شێوەی دووهەمی مودیرییەت کە ئێستا لە بەشێکی زۆری دنیادا باوە، شێوەکاری ئیدارییە. لەم شێوەیەدا کـار بـە نـاردنی پـەیامو بەخشـنامەو یـان بـە شـێوەیەکی پێشکەوتووتر بە ناردنی "تلگرام"و "کامپیوتێر" جێبەجێ دەبـێ. مودیـری ئیـدارە پەیام دەدا بە کارمەندەکانی خۆیو ئەوانیش جێبەجێی دەکەن. لە حـیزبی ئێمـەشدا جارجار هێندێك هاوڕێ لە هـەردووك ئـەم شـێوەکارانەی کـە باسمـان کـرد کـەڵکیان وەرگرتوە. پێیان وابوە بە بەخشنامەناردنو دەستووردان کار جێبەجێ دەبێ. دیارە لـە هێندێك رێکخراوەدا لەم شێوە مودیرییەتانە کەڵك وەردەگرن، بەڵام ئـەم رێکخراوانـە دێموکراتیك نین. لەم چەشنە رێکخراوانەدا سانترالیزم بەهێزە، بەڵام دێموکراسی نیە.

شێوەی مودیرییەت لە حیزبی ئێمەدا بەگشتی لە سەر بناغەی پێوەندیی زینـدوو، رێنوێنیو لە ئاکامدا ئیقناعە. بەرپرسی حیزبی دەبـێ رێنوێنیـیو بڕیارەکـان کـە لـە بەخشنامەدا دەدا، دەبێ پێوەندیی زیندووی لەگەڵ نەفەراتی خۆی هەبێو تەوزیح بداو ماندوو نەبێ تا ئەو کاتەی تەرەف قانیع دەکا.

ئەزمـوونی چەندین ساڵە دەری خستوە کە ئێمە ئۆرگانێك یان هاوڕێیەکمان قـانیع کردوە، ئەرکەکەی خۆی زۆر بە باشی بەڕێوەبردوە. بەڵام ئەگەر قـانیع نـەبووبێو بـە دەستوور کارەکەی کردبێ، ئاکامی چاوەڕوانکراوی نەبوە. ئەگەر ئێمە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکان لە نامەو پەیامو بەخشنامەش کەڵك وەردەگرین، پێویستە پێشتر ئوسـوولە گشتییەکانی ئەو نامەو بەخشنامانەمان روون کردبێتەوە.

بۆ بەڕێوەچوونی هەرچی باشتری مودیرییەتو کارەکـانی حـیزبی پێویسـتمان بـە چەند عامیلێکی گرینگ هەیە کە لێرەدا باسیان دەکەین:

١ـ تەرح (گەڵاڵە): بۆ جێبەجێکردنی کارێك لە کاتێکی دیاریکراودا دەبێ گەڵاڵە دابنێین، بۆ وێنە کاری نیزامی ئەوسـاڵمان لـە نێوخـۆی وڵاتدا دەبـێ چـۆن بـێو چ بکەینو ئەگەر بکرێ لە چ شوێنێك باشترە بیکـەینو بـۆ جێبـەجێکردنی ئـەو کـارە نیزامییانە چەندەمان وەخت هەیـە؟ وەڵامـی ئـەو پرسـیارانە یـانی دانـانی تـەرحی نیزامی. بە بێ ئەو تەرحە هەر کارێکی بیکەین دەبێـە گۆترەکـاریو بێبەرنامـەیی، دەبێتە شتێك کە ئاکامەکەی دیار نیە. کە واتە بۆ نزیك بوونەوە لە ئامانجەکان، هەر ئۆرگانێکی حیزبیو تەنانـەت هـەر فـەردێکی حـیزبییش بـۆ جێبـەجێکردنی کـارو ئەرکەکانی لە کاتێکی دیاریکراودا (تایمبەندی)، دەبێ تەرحی هەبێ.

لێرە ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە تەرح دەبێ بۆ هەلومەرجێکی دیاریکراوو کاتێکی دیاریکراوو بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو دوای هەڵسەنگاندنو لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنە دابڕێژرێو پاشان قابلییەتو تواناو ئیمکاناتی خۆمان بۆ جێبەجێکردنی ئەو تەرحەش دەبێ لە بەرچاو بگرین. بۆ نموونە ئەگەر فەرماندەری هێزێك دەیەوێ تەرحێکی نیزامی لە شارێکی کوردستاندا پیادە بکا، دەبێ بزانێ هێزەکانی دوژمن چین؟ تەرکیبەکەیان چیە؟ لە چ شوێنێك جێگیر بوون؟ نوقتە ستراتیژیکەکانی شار کامانەنو چەندەیان لە دەستی دوژمن دان؟ ئایا هێزەکانی دوژمن ئامادەباشن یان نا؟ ئەگەر بۆی دەرکەوت کە مەسەلەن دوژمن ئامادەباشە، دەبێ رابوەستێ لە وەختێکی دیکەدا تەرحەکەی پیادە بکا. جا ئەوە بۆ تەرحێکی زۆر وردیش و بۆ کارێکی بچووکیش هەروایە. وەك ئەوەی کە ئاگادارین کە سەری فلانە سەعاتی دیاریکراو ئەگەر دەوری فلانە پایەگا بدەین، دەگیرێ. چونکە نیگابانەکەی پێوەندی هەیەو قەولو قەراری لەگەڵ ئێمەدا هەیە. واتە دەبێ بزانین لە چ مەقتەعێکی زەمانیو لە چ حاڵەتێکی موشەخەسدا ئەو تەرحە جێبەجێ بکەین.

دووهەم عامیلی جێبەجێکردنی ئەرکەکان بریتییە لە بوونی ئەفرادی پێویست. چونکە ئەگەر تەرحی زۆر باشیشمان هەبێو دەقیقو تایمبەندییش کرابێ، بەڵام ئەگەر ئەفرادی پێویستو لێوەشاوەمان نەبێ بۆ جێبەجێکردنی ئەو تەرحە، تەرحەکە پیادە ناکرێ ـ جا ئەو تەرحە چ بۆ کاری سیاسی بێو چ بۆ کاری نیزامی ـ کە واتە عامیلی ئینسانی کە ئێمە پێی دەڵێین کادر، نەخشێکی گرنگو بەرچاوی هەیە. بەر لەوەی تەرحێك دابنێینو بمانەوێ جێبەجێی بکەین دەبێ بزانین ئایا بۆ جێبەجێکردنی ئەو تەرحە ئەفرادێکی وامان هەیە، واتە کادری وامان هەیە کە ئەو کارەی پێ بکرێو سیمای دێموکراتی هەبێو تایبەتمەندییەکانی کادری حیزبی تێدا بێ؟ واتە شارەزای سیاسەتی حیزبی بێو لەسەرەخۆ بێو زوو تێك نەچێو تووڕە نەبێو خۆی نەدۆڕێنێ لە کاتی تەنگانەداو هەست بە بەرپرسایەتی بکاو هەڵسووڕو چالاك بێو تەکڕەوی نەکا.

کەوابوو بۆ دابەزاندنی هەر تەرحێك، کادر و ئەفرادی پێویست نەخشی ئەساسیی هەیە. بەڵام بێجگە لە کادر، هێندێك ئامرازو کەرەسەشی پێویستە. مەسەلەن بۆ

پیادەکردنی تەرحێکی نیزامی، تەقەمەنی، کەرەسەی تەخریبو ئیمکاناتی ماڵیشی پێویستە.

مەرجێکی دیکەی سەرکەوتنی هەر تەرحێك ئەوەیە کە دەبێ جێگای دابەزاندنی تەرحەکە موناسب بێ. بۆ نموونە دەمانەوەێ لە ناوخۆی کوردستاندا جێگایەك بۆ دەفتەری سیاسی دیاری بکەین بۆ ئەوەی کاری خۆی بکاو بشتوانێ ڕێبەرایەتیی کاروباری مەڵبەندو کومیتەکان بکات لانیکەم بۆ ماوەی سێ مانگ. بۆ ئەو کارە کادری باشو ئیمکاناتی پێویستیش ئامادە بکەین ئەگەر شوێنەکە موناسب نەبێ ئەوە تەرحەکە سەرکەوتوو نابێ.

عامیلی سێهەم: ئەوەیە کە هەر ئەرکێکی دەمانەوێ جێبەجێی بکەین دەبێ روونو ئاشکرا بێ. بە هیچ شێوەیەك ئەرك نابێ ناموشەخەس بێ، یەکێك لە گیروگرفتەکانی حیزبی ئێمە ئەوەیە کە زۆرجار بە پەیام یان بە نووسراوە یان بە قسە کارێك دیاری دەکەین بۆ کەسێك یان بۆ ئۆرگانێك بەڵام ئەو کارە روون نیەو موشەخەس نیە. بۆیە زۆرجار بەو ئاکامە ناگەین کە دەمانەوێ، جا ئەو ئەرکە چ نیزامی بێ چ سیاسیو چ تەشکیلاتی بێ فەرق ناکات. گرنگ ئەوەیە دەبێ روونو بێ پێچو پەنا بێتو تەفسیری جۆراوجۆری لێ نەکرێ. زۆرجار بە نامە یان بە پەیام داوایەك لە ئۆرگانێك دەکرێ بە روونی وەڵام ناداتەوە یان وەڵامێك دەداتەوە کە وەڵامی پرسیارەکە نیە. هۆی ئەو کارەش ئەوەیە کە هاوڕێی بەرپرس دیققەت ناکات لە وەڵامدانەوەداو هێندێك جاریش دەیەوێ لە ژێر پرسیارەکە دەرچێ.

زۆرجاری وایە بە روونی پێکەوە قسە ناکەین، شتێك بە گۆترە دەگوترێ، بەڵام ئەرکەکە موشەخەس نابێ. ئەوە لە وردەکاریی ڕۆژانەشدا زۆر گرنگە. بۆیە ئەگەر شتێکمان دەوێ، دەمانهەوێ جێبەجێ ببێت، دەبێ بە روونی داوا بکەینو بە روونیش وەڵامەکەی وەرگرینەوە. کە واتە بۆمان دەردەکەوێ کە دیاریکردنی ئەرکی روون زۆر زۆر گرنگە، چ لە باری سیاسییەوەو چ لە باری نیزامییەوە. بەتایبەتی دەبێ لە بیرمان بێ کە ئێمە لە وڵاتێکی دواکەوتوودا دەژینو کار دەکەین کە زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئەرکەکان بەڕێوە دەبەن، خوێندەواریی باشیان نیەو تەجروبەی زۆر باشیان نیە. بۆیە دەبێ بە روونی ئەرکەکانیان بۆ دیاری بکەین.

عامیلی چوارەم: کە لە مودیرییەتدا زۆر گرنگە بریتی‌یە لە کۆنترۆڵ. کۆنترۆڵیش بریتی‌یە لەوەی کە بزانین ئایا ئەرکە دیاریکراوەکە جێبەجێ کراوە یان نا، بزانین ئایا جێبەجێ دەکرێ یان نا؟ تاقیکردنەوە نیشانی داوە کە ئەگەر ئەرکێك دیاری بکرێو بەلاّم لە جێبەجێکردنەکەیدا کۆنترۆڵ نەبێ زۆرجار بە ئاکام ناگات.

کۆنترۆڵ لە سەر شتێکی دیکەش زۆر پێویستە، ئەویش لە سەر ئەو راپۆرتانە کە دەگاتە دەستی بەرپرسانی حیزبی. بۆ نموونە راپۆرتێك بە فەرماندەری هێز دەگات کە دوژمن فلاّنە رۆژ بە هێزێکی کەمو نارێكوپێك بە فلاّنە جادەدا تێدەپەڕێ. ئەگەر فەرماندەری هێز تەنیا لە سەر ئەو راپۆرتە هێزی خۆی کۆ بکاتەوەو بچێتە سەر ئەو جادەیە بۆ کەمین دانانەوە، رەنگە تووشی گیروگرفت بێو لە لایەن دوژمنەوە بکەوێتە داو، بەلاّم ئەگەر ئەو خەبەرە کۆنترۆڵ بکاتو لە چەندین لاوە تەحقیقی لە سەر بکا، ئەودەم راستو درۆبوونی خەبەرەکەی بۆ دەردەکەوێ. یان کەسێك خەبەر دەدات کە فلاّنە ئەندامی حیزبی لەگەڵ دوژمن پێوەندی هەیە، یان پێوەندی لەگەڵ کەسانی گومانلێکراو هەیە، ئەگەر ئەو راپۆرتە کۆنترۆڵ نەکرێو راستو ناڕاستی‌یەکەی بە تەواوی مەعلوم نەبێ، زۆر جار تووشی زەرەری گەورەمان دەکات.

ئەو ئەسلاّنەی کە باسمان کردن لە کاری مودیرییەتدا زۆر گرینگنو هەموویان پێکەوە سەرکەوتنی کاری بەرپرسێکی مودیر لە حیزبی ئێمەدا دەستەبەر دەکەن. نەبوونی هەرکام لەو ئەسلاّنە شوێنی کاریگەری خۆی لە لاوازیی کاری مودیرییەتدا نیشان دەدات.

بێجگە لەو ئەسلاّنە کە باسمان کردن، هێندێك مەسایلی دیکەش لە سەر کاری مودیرییەتی حیزبی تەئسیر دادەنێن کە پێویستە لێرەدا ئیشارەیان پێ بکرێ:

**ئەلف ـ بەرپرسایەتی‌و سەلاحییەت:**

لە حیزبی ئێمەدا ئەگەر کەسێك بەرپرسایەتی درایە، سەلاحییەتیشی بەقەدەر خۆی دەدرێتێ. هەرکام لەو دوو بەشە بە بێ ئەوەی دیکە ناتەواوەو بە کردەوە گیروگرفتمان بۆ دەخولّقێنێ. بۆ نموونە مەسئوولییەتی فەرماندەری هێز بە کەسێك بسپێرین، بەلاّم سەلاحییەتی ئەوەی نەبێ کە لە چوارچێوەیەکدا کە بۆی دیاری کراوە بڕیار بداو لە نێو هێزەکەدا ئالّوگۆڕی پێویست پێك بێنێ، هاوکاری خۆی هەڵبژێرێ،

بێگومان فەرماندەرێکی ئەوتۆ بەرپرسایەتی‌یەکەی بـۆ هەڵناسـووڕێو کارەکـانی بـۆ جێبەجێ ناکرێنو بەرەوپێش ناچێ، بە پێچەوانەی ئەوەش هەر وایە.

کەسێك دیاری بکەین بە سەلاحییەتێکی زۆرەوە، وەك ئـــەوەی بـە مـــەیلی خـۆی ئەموالی حیزب خەرج بکات، بڕیار بدات، ئـــاڵوگۆڕ پێـك بێنـــێو بەرامبـــەر کــەسو حـیزبیش بـەرپرس نـــەبێ، ئـەوەش شــتێکی زۆر نادروستە. دیـارە ســـــەلاحییەتو مەسئوولییەتیش پێوەندی‌یەکی زیندوویان بەیەکەوە هەیە. بەو مانایە کـــە هەرچـــەند رادەی مەسئوولییەت زیاتر بێ بەو پێیەش رادەی سەلاحییەت دەچێتە سەر. هەر بـەو پێیەش کە رادەی سەلاحییەت دەچێتە ســەر، دەبـێ رادەی مەسـئوولییەتیش بچێتـە سەر.

**ب ـ پێکهێنانی هاوئاهەنگی لە نێو هاوکاراندا:**

یـەکێك لـە ئەرکـە گرنگـەکانی بەرپرسـێکی مودیـــری حـــیزبی، پێکـــهێنانی هاوئاهەنگی لە نێو ئەو هاوکارانەدایە کە کاری لەگەڵ دەکەن. ئـەو هاوکارانــەی کـە پێکەوەو لە ئۆرگانێکدا کار دەکەن لە زۆر لایەنەوە لەگەڵ یەك جیاوازییان هەیە. وەك جیاوازیی بۆچوون، رەوشتو شێوەی کار، رادەی خوێندەوارێو تاقیکردنەوەی حـیزبیو سیاسیو تەربیەتی بنەماڵەییو... کەوابوو جیاوازیی بۆچوونو نەزەر لـــە جـەمعێکی ئاوادا زۆر سروشتی‌یە، بەتایبەت لە حیزبێکی وەك ئێمەدا کە حـیزبێکی دێموکراتـەو جیاوازیی بۆچوونو نەزەر پێش بڕیاردان ئازادە.

بۆیە پێکـهێنانی هاوئاهـەنگی لـە نێـو جـەمعێکی ئـاوادا، ئـەرکێکی گرنگــی بەرپرسێکی مودیـــرە. پێکـهێنانی هاوئاهـەنگیش هونـەری تایبــەتی خـۆی هەیـەو خەلاقییەتو ئیبتکاری دەوێ بۆ نموونە لــە کۆبوونـەوەکاندا بـەرپرس دەبـێ لـە سـەر مەسەلە دیاریکراوەکان داوا لە هاوڕێیانی خۆی بکات کە نەزەری خۆیان بڵێن، پاشان کە ئەوان نەزەری خۆیان گوت جا ئەوجار بەرپرس نەزەری خۆی بــداتو جەمعبــەندیی نەزەرەکان بکاتو لێکیان بداتەوەو لە یەکتریان نزیك بکاتەوەو لــە ئاکـامدا بیانکاتـە یەك نەزەر بە چەشنێك کە ئەو نەزەرە بۆ هەموویان قبووڵ بێ. بەڵام هاوئاهەنگی بەو مانایە نیە کە بەرپرس شتێك بڵێو باقیی هاوکارەکانی بێ‌ئەوەی ئیجازەی دەربڕینـــی نەزەری خۆیان هــەبێ، قبووڵـی بکـەنو قسـە نەکـەن. ئـەوە شـێوە مودیرییـەتێکی دیکتاتۆرانەیە کە لەگەڵ رۆحی دێموکراســیدا ناتــەبایی هەیـەو لــە حـیزبی ئێمـەدا

جێگای نابێتەوە. دیارە بۆ پێکهێنانی ئەو هاوئاهەنگی‌یە دابەشکردنی کار بە شێوەیەکی دەقیق پێویستە، هەرچەند لە حیزبی ئێمەدا مەسئوولییەت هەم جەمعی‌یەو هەم فەردی‌یە. فەردی‌یە بۆ ئەوەی ئەگەر کارێك بەڕێوە نەچوو بەرپرسەکەی دیار بێ. چونکە ئەگەر وا نەبێ عامیلی هیچ کەم‌کاری‌و هەڵەیەك دیار نابێ. ئەگەر وای دانێین لە کۆمیتە شارستانێکدا ئەرکێك دیاری بکرێ، بەڵام ئەو کەسە دیاری نەکرێ کە ئەرکەکە بەڕێوە دەبا، حەتمەن کارەکە بەڕێوە ناچێ، چونکە کەس خۆی بە بەرپرسی بەڕێوەبردنی ئەرکەکە نازانێ. لە لایەکی دیکەشەوە بەرپرسایەتی جەمعی‌یە. چونکە لە حیزبی ئێمەدا هەر فەردێك لە نێو ئۆرگانێکدا کار دەکات، تاوانی ئۆرگانەکە دەبێتە ئەوە کە بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکە فەردێکی شایستەی هەڵنەبژاردوەو هەروەها بەڕێوەچوون‌و بەڕێوەبردنی ئەرکەکەشی کۆنترۆڵ نەکردوە. بۆیە دەبێ دابەشکردنی ئەرك بە وردی‌و بە روونی لە لایەن ئۆرگانەوە دیاری بکرێ‌و عادلانەش بێ. وا نەبێ کەسێك لە ئۆرگانێکدا بێکار بێ‌و ئەوی دیکەش لە رۆژدا چەندین سەعات کار بکا. هەردووك لای ئەو مەسەلەیە خراپە. ئەوەی زۆر کار دەکا فەرسوودە دەبێ، دیققەتی کەمتر دەبێ، کارەکان بە چاکی بەڕێوە نابا، ئەوەی دیکەش چونکە کار ناکا، هیچ فێر نابێ، تەمبەڵ بار دێ‌و بە نیسبەتی مەسایل بەرەبەرە بێ‌تەفاوەت دەبێ. بەداخەوە لە حیزبی ئێمەدا کەم‌کاری هەر ماوەو ئەوەش گیروگرفتێکی زۆری بۆ خولقاندوین. بۆیە ئەرکێکی گرنگی مودیری ئۆرگانەکان لابردنی کەم‌کاریە لە نێو ئۆرگانە حیزبی‌یەکاندا. ئەوەش بە هۆی تەقسیمی کاری عادلانەوە دەکرێ.

**ج: خەلاقییەت:**

راستە کە مودیر بۆ جێبەجێ‌کردنی کارەکانی خۆی دەبێ تەرح دابنێ‌و بە گوێرەی تەرحەکە ئیقدام بکات. بەڵام ئەوانەی تەرحەکە بەڕێوە دەبەن مۆرەی ماشێن نین کە هەموو شتێکیان بۆ دیاری بکرێ‌و وەك ماشێن کاربکەن. کادری ئێمە هەموو وردەکاری‌یەکانی تێکۆشانی رۆژانەی لە سەرەوەڕا بۆ دیاری ناکرێ، چونکە ئینسانێکی موستەقیلە، دەبێ فکر بکاتەوە، خەلاقییەت‌و لێوەشاوەیی خۆی وەگەڕ بخا. ئیبتکار بنوێنێ‌و کارەکانی لە چوارچێوەی بڕیارەکانی ئۆرگانی خۆی‌دا جێبەجێ بکات.

دیاریکردنی ئەرکێك بۆ هاوڕێیەك بە هەموو وردەکاریی‌یەکانی‌یەوە نە دەکریٚو نــە بەکەڵکە. چونکە حیزبی ئێمە وەك حیزبێکی شۆڕشگێڕ سەروکاری لەگەڵ سیاســەتو کۆمەڵو مرۆڤە. هەرکام لەوانەش سابیت نین‌و گۆڕانیان بەســەردا دیٚ. لێرەدایــە کــە دەبیٚ کادری حیزبی خەلاقییەت‌و ئیبتکاری هەبیٚو فێر ببیٚ. ئەگــەر وا نــەبیٚو هــەر چاوەڕوان بیٚ یەکێك پێی بڵیٚ وا بکەو وا مەکەو ئەو کارەی بەو شێوەیە بکە، ئــەودەم کادری حیزبی بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی زەحمەت ناکێشیٚ بۆ ئەوەی فیکر بکاتــەوە، لە ئاکامدا خەلاقییەتی نابیٚو پەروەردەش نابیٚ.

**د ـ کەڵك وەرگرتن لە ئەزموونی حیزب‌و ڕێکخراوەکانی دیکە:**

لە ڕاستی‌دا لەو بــارەوە لــە پاشــین‌و زۆرجــار نــەك هــەر لــە ئــەزموونی حــیزب‌و ڕێکخراوەکانی دیکە کەڵك وەرناگرین، بەڵکوو تاقیکردنەوەکانی خۆشمان بــە گرینــگ نازانین‌و دەیانخەینە پشت گویٚ. بەشێکی زۆری کارەکانمان لەوە دەســت پــیٚ دەکــەن، زۆر فەرماندەی نیزامیمان هەیە کە چەندین جار بەهۆی مەرەخەسی‌دان بە پێشــمەرگە لــە نێوخــۆی ولاٚتدا، پێشــمەرگەکەی لەدەســت داوە، بــەلاٚم دیســان هــەر دووپــاتی دەکاتەوە.

ئێمە دە ساڵە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی بەربەرەکانیٚ دەکەین‌و هەزاران کــەس لــە باشترین هاوڕێیانی خۆمان لەو بەربەرەکانیٚ‌یەدا لەدەست داوەو لە بەرامبەردا هەزاران ئەزموونی بەنرخمان وەدەست هێناوە کە دەبیٚ کەڵکیان لیٚ وەرگرین. بۆ ئەوەی باشــتر کەڵکیان لیٚ وەربگرین، پێویستە ئــەو ئەزموونانــە لــە جێگایــەك وەك کۆمیســیونی سیاسی- نیزامی کۆ بکرێنەوەو پاشان بکرێنە ڕێنوێنی‌و بدرێنەوە بە ئۆرگانــەکان بــۆ ئــەوەی زیــاتر فــێر بــن‌و مودیرییەتەکــەیان بــەهێزتر بکــەن. تەجروبەکردنــەوەی تەجروبەکراوەکان کارێکی غەڵەتە. ئێستا وەختی ئەوە هاتوە کە لە تاقیکردنەوەکانی رابردووی چل‌و سیٚ ساڵەی تێکۆشانی سیاسی‌و تەشکیلاتی‌و نیزامیی حیزبی خۆمــان بە باشترین شێوە کەڵك وەرگرین‌و هەمیشە ئەوە نــەبین کــە لــە ســفرەوە دەســت پــیٚ بکەین.

**وـ تێکەلاٚوکردنی ئەرکی گرینگ‌و ناگرینگ:**

یەکێکی دیکە لە خاڵە لاوازەکانی شێوەی مودیرییەتی هاوڕێیانی بەرپرس ئەوەیە کە جیاوازی لە نێوان ئەرکی گرینــگ‌و نــاگرینگ دانــانێن. تەنانــەت هێندێــك جــار

ئەوەندە لە وردەکاریو جوزئیاتدا نقوم دەبن کە ئەرکە گرنگەکانیان لەبیر دەچنەوە. ئیستلاحێك هەیە بۆ ئەو کەسانەی ئەو شێوە کارە دەکەن، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن: "دارێك بەرچاوی دەگرێ دارستانێك نابینێ." زۆر جار بینراوە کە بەرپرسێك لە نێوان ئەرکی گرنگو ئەرکی لاوەکیدا فەرق دانانێ. لە هەر رۆژێكو لە هەر شەرایتێکدا بۆ هەر ئۆرگانو بەرپرسێکی حیزبی ئەرکی گەورە هەیەو ئەرکی بچووکیش هەیە. ئەرکی گرنگ هەیەو ئەرکی گرنگتر هەیەو ئەرکی هەرە گرنگ هەیە. ئەسلْ ئەوەیە کە دەبێ هەمیشە ئەرکی هەرەگرنگ لە دەستووری کاری خۆماندا دابنێین بۆ جێبەجێ کردن. هەر کات ئەرکە لاوەکیو بچووکەکە بوو بە کۆسپ لە سەر رێگای جێبەجێ کردنی ئەرکە گرنگەکە دەبێ دەستبەجێ ئەرکە بچووکەکە وەلا بنێین. واتە دەبێ واز لە شتی بچووك بێنین بۆ شتی گەورە. دیارە ئەوە بەو مانایە نیە کە دەبێ شتی چووك وەلا نێین، چونکە شتی چووکیش گرنگو لە جێگای خۆیدا ئەهەمییەتی هەیە. گرینگ ئەوەیە کە ئەگەر لە نێوان ئەرکی بچووكو ئەرکی گەورەدا ناتەبایی دروست بوو، دەبێ شتە چووکەکە فیدای ئەرکە گەورەکە بکەین. زۆرجار دێتە پێش کە بەرپرسێکی حیزبی بۆ جێبەجێکردنی ئەرکێکی گرنگ زەحمەتێکی زۆری کێشاوە، بەلاّم لە ناکاورا کارێکی بچووك بەخۆیەوە مەشغوولّی دەکاتو ئەرکە گرنگەکەی لەبیر دەباتەوە. لە ئاکامدا هەموو زەحمەتەکەی بە فیرۆ داوەو زەرەرێکی زۆریش وەحیزب دەکەوێ. بەرپرسانی حیزبی لە حیزبی ئێمەدا ئەرکی گەورەیان لە سەر شانە، بۆیە نابێ کارە بچووکەکان ببنە هۆی ئەوەی ئەو هاورێیانە ئەرکە گرنگەکانیان لە بیر بچێتەوە.

هەروەك باس کرا مەبەست ئەوە نیە کە کاری بچووك بە هێند نەگرین. بەڵکوو مەبەست ئەوەیە ئەو چەشنە ئەرکانە بە کەسانی دیکە بسپێرین یان لانیکەم ئەرکی گرنگ بە قوربانی وردەکاری نەکەین. ئەو ئەسڵە دەبێ وەك ئەسڵێکی گرینگ لە کاری مودیرییەتدا بخرێتە بەرچاو.

**ع: ئامووزش:**

مەسەلەیەکی دیکە کە لە حیزبی ئێمەدا زۆر باسی لە سەر دەکرێ ئامووزشە. کە وەك ئەرکێکی گرینگ دەکەوێتە سەرشانی هەموو هاورێیانی حیزبی بەتایبەت بەرپرسەکان. زۆر کەس لە هاورێیانی حیزبی ئێمە ئامووزش لەوەدا دەبینن کە کلاسێك دابنرێو نەفەرێك دەرس بلێتەوەو باقی دیکە گوێی لێ بگرن ـ دیارە ئەوە

نەوعیٚ ئامووزشە ـ بەلاٚم ئەو چەشنە ئامووزشــە تـەنیا کـاتێك کـەڵکی دەبـیٚ کـە بەشدارانی کلاس هان بدات بۆ خوێندنەوەی زیاتر. ئـــەگینا تـەنیا بەشـدار بـوون لــە کلاسێكو دوو کلاس شوێنێکی ئەوتۆ لە سەر چوونەسەری رادەی زانیاریی هاوڕێیــانی حیزبی دانانیٚ. ئامووزش بۆ فەردی مەسئوولی حیزبی، خودئامووزیيـــە بـە شـێوەی فەردی. ئێمە هاوڕێی بەرپرسی وامان هەیە کە بیٚ بەشداربوون لە کلاسێكدا، بۆخـۆی هەم لە باری سیاسیو هەم لە باری ئیدارەکردنی ئۆرگانی خــۆی زۆر شـت فـێر بـوە. زۆربەی کادرەکانی ئێمە کە لە ئاستی سەرەوەی حیزبدا کار دەکەن هەر بەم شــێوەیە پیٚ گەیشتوون. خودئــامووزی فــەردی بریتیيـە لــە خوێندنــەوەی کتێـب، رۆژنامـە، گویٚگرتن لە رادیۆو... .

ئەگەر هاوڕێی ئێمە دەیەویٚ فێر بیٚ، دەبیٚ هەمیشەو بــەدایم خـۆی فـێر بکـات. ئاستی زانستی سیاسیو کۆمەلاٚیــەتیو فەرهــەنگیی خـۆی بەرێتــە ســەر، زەحمــەت بکێشیٚ بۆ ئەوەی زیاتر فێر بیٚ. بێگومـــان هــەر بــەو ئــەندازە کــە رادەی زانیــاریو فێربوونی هاوڕێی بەرپرس بچێتە ســەر، بــەو ئــەندازەش مودیرییــەتی ئــەو هاوڕێیــە بەهێزترو سەرکەوتووتر دەبیٚ. ئێستاش کەم نین ئەو بەرپرسانەی کە خوێندنەوەیان پیٚ گاڵتەیە. ئەوە لە کاتێك دایە کە بەشــێکی زۆری کــاتی خۆیــان بــە بێکــاری بەســەر دەبەن. ناخوێننەوەو گویٚ لە رادیۆ ناگرنو لە ئاکامدا رادەی زانیارییان ناچێتە ســـەرو مودیرییەتیان هەر لاواز دەبیٚ. هیواداریـــن هــەموو بەرپرســانی حـیزبی موتالەعــەو فێربوون وەك ئەرکێکی گرینگی حیزبی چاو لیٚ بکەن، رۆژبــەرۆژ لــەم بــوارەدا بچنــە پێش. ئەوەشمان دەبیٚ لەبیر بیٚ کە لە پێڕەوی نێوخۆی حیزبدا هــاتوە کــە یــەکیٚ لــە ئەرکە گرنگەکانی ئەندامی حیزب بریتیيە لە بردنەسەری رادەی زانیاریی خۆی.

**غ- هەڵبژاردنی هاوکار:**

کاتیٚ بەرپرسایەتی دەدریٚ بە هاوڕێیەك هەر چەند ئۆرگانی سەریٚ نەزەر لــە ســەر هاوکارەکانی ئەو بەرپرسە دەدات، بەلاٚم لە راستيدا رێگاش دەدات کە ئەو بەرپرســە بۆخۆی لە هەڵبژاردنی هاوکارەکانيدا نەزەر بدات. لە حیزبی ئێمەدا بــۆ هــەڵبژاردنی هاوکار، معیــاری حــیزبی هەیــە. کــە بریتیيـە لــەوەی کــە ئایــا کــادرێکی باشــە، بەتەجروبەیە، لەو کارەی خۆيدا شــارەزایی هەیــە، پسـپۆڕە، وەفـادارە بــە حــیزبو دڵسۆزە؟

ئایا تایبەتمەندی‌یەکانی کادرێکی باشی حیزبی تێدایە؟ ئەوانە معیاری حیزبین بۆ هەڵبژاردنی کادر نەك خزمبازی‌و ناوچەگەرایی‌و باندبازی‌و دەستەبازی‌و... دانانی فەرق‌و جیاوازی لە نێو هاوکاراندا، واتە بێبەڵگە زیز بوون لە هێندێکیان‌و لە هەمان کاتدا ئمتیازدان بە هێندێکیان. ئەوەش گیروگرفت لە کاری بەرپرسی ئۆرگانەکاندا دێنێتە پێش‌و درەنگیش چارەسەر دەکرێ.

**خ ـ شێوەی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئۆرگانەکانی سەرەوەترو ئۆرگان‌و ئەفرادی خوارەوە:**

ئەوەش ئەسڵێکی گرنگی دیکەی مودیرییەتە کە بەرپرسی حیزبی دەبێ بزانێ چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەفرادی سەرەوەو ئۆرگانی سەرەوە بکات‌و لە هەمان کاتدا بشزانێت کە چۆن بەرخورد لەگەڵ ئەفرادو ئۆرگانەکانی خوارەوە بکات. شێوەی ئوسووڵی ئەوەیە کە نابێ بە تەحەکوم‌و دەستووردان‌و توندوتیژی‌و کوێخایانە رەفتار لەگەڵ ئۆرگانەکانی خوارەوەدا بکەین‌و لەگەڵ ئۆرگانەکانی سەرەوەش نابێ رەفتارمان چاپلووسی‌و تەمەلوق‌و پێداهەڵگوتن بێ. رەفتاری ئێمە دەبێ رەفتارێکی ئوسووڵی‌و حیزبیانە بێ، لەگەڵ خوارەوەو بە نەرم‌و هێدی‌و ئوسووڵی رەفتار بکەین‌و لەگەڵ سەرەوەش بە رێزو ئیحترامەوەرەفتار بکەین، ئیحترام دەبێ هەبێ، بەلاّم ئیحترام چاپلووسی نیە. ئیحترام سەداقەتی تێدایە، رەخنەشی تێدایە.

جیا لەوانە کە باسمان کردن، زۆر شتی دیکەش لە کاری مودیرییەتدا گرنگە. ئەگەر لە ئۆرگانێکدا هەڵەیەك رووی داوەو بەرپرسی ئەو هەڵەیە مەعلووم نیە، بەرپرسی ئۆرگانەکە دەبێ مەسئوولییەتی ئەو هەڵەیە وەئەستۆی خۆی بگرێ‌و لە هەمان کاتدا ئەو کەسەی هەڵەکەی کردوە بیدۆزێتەوەو رێنوێنی بکا، یان لانیکەم بڵێ کە هەڵەکە ئێمە، واتە هەمووومان کردوومانەو ئەگەر ئۆرگانێك کارێکی باشی کردوە، بەرپرسەکە نابێ بڵێ من کردوومە، بەڵکوو دەبێ بڵێ ئێمە کردوومانە. ئەو شێوە رەفتارە لە لایەك دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەرپرسەکە حورمەت‌و رێزی هاوکارانی بۆ لای خۆی رابکێشێ. بەلاّم ئەگەر بە پێچەوانەوە هەموو کارە باشەکان بکاتە هی خۆی‌و هەڵەکان بکاتە هی هاوکارەکانی، ئەوە فاسیلەیەك لە بەینی خۆی‌و هاوکارەکانی‌دا پێك دێنێ.

**ف ـ رەخنە لەخۆ گرتن:**

هەروەها رەخنە لەخۆگرتنیش لە هەڵسووڕاندنی کاری حیزبیدا زۆر گرنگە. دیارە مەبەست لە رەخنەگرتن دەبێ چوونەپێشی کاری حیزبی بێو لە خزمەتی ئیسلاحی هاوڕێیانی حیزبیدا بێ، شێوەی رەخنەگرتنیش بۆخۆی گرنگە، رەخنە دەبێ بە شێوەیەکی زۆر نەرم بەڵام زۆر سەریحو بێ پێچو پەنا بگوترێ، دەنا تەرەف وەك جنێو وەری دەگرێو شوێنی باشیشی لە سەر دانانێ. باشتر ئەوەیە کە رەخنە بە شێوەی فەردی باس بکرێ. مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر هاوڕێیەك رەخنەیەکی لە سەرە لە پێشدا بە شێوەی خسووسی بانگی بکەینو پێی بڵێین ئەوە باشترە نەك لە نێو جەمعێكدا پێی بڵێین. دیارە ئەگەر ئەو هاوڕێیە دوای چەند جار رەخنەلێگرتن لە حاڵەتی خسووسیدا، وازی لە هەڵەکەی خۆی نەهێنا، ئەودەم لە کۆبوونەوەی حیزبیدا رەخنەی لێ بگیرێ، ئیشکالی نیە.

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بەرپرسێکی باشو مودیریش ئەوەیە کە ئەگەر هەڵەی هاوکارەکەی زۆر گەورە نیە، ئیدی پێویست ناکا لە هەموو جێگایەك هەڵەکەی باس بکات، بەڵکوو دەبێ رازدار بێ بۆ ئەوەی هاوکارەکانی ئیعتمادی پێ بکەنو دڵنیا بن کە رازدارەو ئەگەر قسەی دڵی خۆشیان لە لای ناوبراو باس بکەن بە نهێنی دەمێنێتەوە.

**ق ـ قاتعییەتو نەرمش:**

ئەو دوو تایبەتمەندییە بۆ فەردێکی مودیر پێویستن. زۆرجار وا دێتە بەرچاو کە قاتعییەت بە مانای توندوتیژیو تووڕەبوونەو نەرمش بەپێچەوانەی ئەوەیە. بەڵام مرۆڤ دەتوانێ هەر لەو حاڵەدا کە زۆر رووخۆشو لەسەرەخۆیە قاتعییەتی هەبێو هەروەها لەو حاڵەدا کە زۆر تووڕەیە سازشکاریش بێ.

کەوابوو قاتعییەتو تووڕەبوون یەك شت نین، قاتعییەت لە راستیدا بە مانای نەرمشو لەسەرەخۆییە، بەڵام بێ لادان لە ئوسووڵ. یان بە شێوەیەکیتر بڵێین ئەوپەڕی نەرمش، بێ لادان لە ئوسووڵ. کەوابوو فەردێکی مودیر ئەگەر قاتع بێ دەبێ نەرمشی هەبێ، بەڵام لە ئوسووڵ لانەدا، لە سیاسەتیشدا هەروایە. ئێمە دەکرێ لەگەڵ تەرەفی خۆمان بسازێین (سازش بکەین) بێ ئەوەی سازشکار بین.

ئەگەر بەرپرسی دوو کومیتەی شارستان کە لە سەر مەسەلەیەکی حیزبی ناکۆکییان لە نێواندایە، بەیەکەوە دابنیشن‌و ئەوەندە باس بکەن کە بە نەتیجەی هاوبەش بگەن، دەڵێین پێکەوە سازاون. کەوابوو سازش باشەو مەشرووعە. سازشکاری ئەوەیە کە هیچ ئوسووڵ‌و پرنسیپێك لە بەرچاو نەگرین‌و ئامانجێکی دیاریکراو تەعقیب نەکەین‌و بە حاڵەتێکی بێ‌تەفاوەتی‌یەوە لەگەڵ هەموو لایەك رێك بکەوین. ئەوە سازشکاری‌یەو زۆر خراپە. بۆیە ئەگەر حیزبی دێموکرات حیزبێکی سازشکار بێ بەو مانایەی کە گوتمان، ئەوە نە شۆڕشگێڕەو نە پێشکەوتوە. چونکە بەم چەشنە زۆر بە ئاسانی واز لە مافی گەل دێنێ‌و سازشکاری‌یەکەی بۆ دەبێتە هەدەف. بەلاّم لە لای ئێمە سازش وەسیلەیە بۆ گەیشتن بەو هەدەفانەی کە لە بەرنامەدا دیاری کراون.

کەسانی وا هەن کە ئوسووڵی حیزبی دەخەنە ژێر پێ. بە حاڵەتێکی بێ‌تەفاوەتیەوە دەڵێن (قەیدی ناکا) جا چیە چ دەبێ؟ بەم چەشنە تەوجیهە غەڵەتانە زەمینە ئامادە دەکرێ بۆ لە ژێرپێ‌نانی ئوسووڵی دیکە. بەم چەشنە وردە وردە بۆ ئەم کەسانە ئوسووڵێك نامێنێ کە بی‌پارێزن تا بێ‌ئوسووڵی جێگای ئوسووڵەکان دەگرێتەوە کە لە مودیرییەتی حیزبی‌دا ئەم چەشنە بیرکردنەوانە زۆر پڕمەترسین.

لەگەڵ باسی قاتعییەت‌و نەرمش، سەبرو حەوسەڵەش دێتەوە بیر، ئەوەی پێی دەڵێن (بردباری انقلابی). ئەم سەبرو حەوسەلەیە لە سیاسەت‌دا بریتی‌یە لە رۆیشتن تا ئاخرین خەت‌و لە کاری رۆژانەش‌دا ئەسڵێکی گرنگە. ئەگەر شۆڕشگێڕ بوردباریی ئینقلابیی نەبێ زوو ماندوو دەبێ‌و لە نیوەی رێگادا شۆڕش بەجێ دێڵێ. قسەیەکی جوان هەیە "شۆڕش لە نیوەی رێگادا ماوەتەوە، چونکە شۆڕشگێڕەکان حەوسەلەیان نەبوەو ماندوو بوون‌و بەجێیان هێشتوە". دیارە بەرپرسێکی مودیر دەبێ بۆ هەموو ئەو تایبەتمەندییانە لە پێش‌دا بۆخۆی نموونە بێ، دەنا قسەو رەخنەکانی لە سەر هاوکارانی هیچ شوێنێك دانانێ. ئەگەر بەرپرسێك بۆخۆی نموونەی نەزم نەبێ ناتوانێ لە هاوکارەکانی داوای نەزم بکا.

هەموو ئەو ئوسوولاّنە بۆ بەرپرسێکی مودیری حیزبی پێویستن‌و دەبێ رەعایەت بکرێن، چونکە لە حیزبی ئێمەدا ئازادیی دەربڕینی نەزەرو بیروباوەڕ هەیە. کە واتە دەبێ ئەو ئوسووڵە دێموکراتیکانەش بپارێزین. چونکە ئەگەر کەسێك لە حیزبی ئێمەدا هەست بە بەرپرسایەتی نەکات‌و لە بەرامبەر ویژدانی خۆی‌دا هەست بە

مەسئوولییەت نەکات، عامیلی فشاری ئەوتۆمان نیە کە ئەو کەسە وادار بکـات بـە پاراستنی ئوسووڵ.

دیارە ئەو ئەسڵانەی کە باسمان کردن خاریج لە مودیرییەتێکن کە لـە بنکەیـەکی ئابووری یان ئیدارەیەکی دەوڵەتی‌دا بەڕێوە دەچـن، زیـاتر پێوەندییـان بـە حـیزبێکی شۆڕشـگێڕو دێموکراتـەوە هەیـە. لـە هێندێـك وڵاتـی پێشـکەوتوودا هەسـتی بەرپرسایەتی‌کردنو کارکردنو ئینزیبات وەك حاڵەتێکی سروشتیی لی‌هاتوە. فەرد بـۆ خۆی بەرپرسی خۆیەتی‌و کاری خۆی دەکات‌و نـەزم‌و دیسـپلینێکی تـەواو دیـاریکراو رەعایەت دەکات. ئێمەش ئەگەر هەست بە بەرپرسـایەتی بکـەین‌و ویژدانـی خۆمـان هانمان بدات، راندومانی کارمان زۆر لەوە زیاتر دەبێ کە ئێستا هەمانە.

# باسێك سەبارەت بە دروشمی بنەڕەتیی حیزبەکەمان

## (دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان)*

هەر وەك دەزانن دروشمی هەرە ئەساسیی حیزبی ئێمە، "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان"ە. ئەو دروشمە بە هەڵکەوت یان بە تەسادوف هەڵنەبژێراوە. ئەو دروشمە پاش لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژ هەڵبژێراوە ئەمن لە سەر دێموکراسی نامەوی زۆر قسە بکەم. بەلاّم هەر ئەوەندە دەڵێم کە دێموکراسیمان لە پێشەوە داناوە هۆی ئەوەیە کە هەم پێوندی بە ئێرانەوە هەیە کە گشتی‌ترە، بەرینترە لە کوردستانو هەم هاتوینە سەر ئەو بڕوایە کە بە بێ دێموکراسیی راستەقینە، تەنانەت ئەگەر ئێمە خودموختاریشمان دەست کەوێ، ئەو خودموختارییە زامنێکی دیکەی نیە.

لە واقێعدا پاش وەرگرتنی خودموختاری، زامنی خودموختاریی ئێمە دوو عامیلە:

یەکێکیان پشتیوانیی خەڵکی کوردستانو چەکی پێشمەرگە، دووهەمیان ئەگەر رۆژێك قەرار بێ چەك دابنێین دەبێ ئەو دێموکراسییە زامن بێ کە لە ئێراندا جێگیر بووە. دێموکراسییەکی ئەوتۆ کە گەڕانەوەی دیکتاتوری تێدا نەبێ. دیارە ئەو وەختەش ئێمە چەك دادەنێین کە زانیمان دێموکراسی تەواو سەقامگیر بووە. بەلاّم تا ئەو وەختە ریگەیەکی دیکەمان نیە دەبێ چەکمان بەدەستەوە بێ. دێموکراسیمان بۆیە دەوێ، چونکە هەم خودموختارییەکەمان دەپارێزیو هەم خۆمان حیزبێکی

دێموکراتین‌و ئیمانێکی قووڵمان بە دێموکراسی هەیە. لایەنگری ئەوەین کە خەڵك بە تەواوی لە دێموکراسی‌دا بژین، هەموو ئازادییە دێموکراتییەکان لە ئێراندا دابین بکرێن‌و ڕێژیمێکی سیاسیی پلورالیستیی چەندحیزبی یان فرەحیزبی هەبێ.

ئێمە بەش بەحاڵی خۆمان موخالیفی هەموو شێوە دیکتاتورییەکین. کەوابوو دێموکراسی بۆ ئێمە وەك حیزبێکی دێموکرات هەدەفە. حیزبێکی دێموکراتین بۆ ئازادی یانێ بۆ ئازادیی هەموو گەلانی ئێران تێدەکۆشین‌و دەمانەوی ئەو ئازادییەش بپارێزین‌و تەنانەت پاش وەرگرتنی خودموختارییش ئەو دێموکراسییە لە بەشەکانی دیکەی ئێران زامنێکە بۆ خودموختاریی ئەو گەلانە. بۆ ئەوەی کە کەسێك پەیدا نەبێ دیکتاتوری دابمەزرێنێ. لە واقیعدا خودموختارییەکەمان لەبەین بەرێ، ئەوە بە کورتی لە سەر دێموکراسی.

بەڵام بەشی دووهەمی دروشمی ئێمە کە پێوەندی بە کوردستانی ئێرانەوە هەیە، "خودموختاری"یە. ئێوە دەزانن کە لە سەر دروشمی خودموختاری باس زۆر کراوە، زۆر هێز هەبووە کە پێشتر خودموختاری قبوولْ نەبووەو تەنانەت بە دروشمێکی بورژوازییان داناوە، بەڵام ئێستا قبووڵیانە.

ئێمە وەك خۆمان لە پێش‌دا با بزانین خودموختاری بە چی دەڵێن. هەر لە سەرەتای بەرنامەکەماندا هاتوە کە گەلی کورد لە کوردستانی ئێران مافی دانانی چارەنووسی خۆی هەیە. ئەوە بیروڕای ئێمەیەو ئەو حەقە حەقێکی بێ ئەملاو ئەولایە. لە سەرتای بەرنامەکەماندا ئەوە نووسراوە. مافی چارەنووس موحتەوا (نێوەڕۆك)ە، لە هەر پەدیدەیەك‌دا موحتەوا هەیەو شکڵی ئەو موحتەوایەش هەیە. بۆ نموونە لە بەرنامەو پێڕەوی حیزبەکەماندا: بەرنامە موحتەوای حیزبی ئێمە دیاری دەکاو پێڕەوی نێوخۆ شکڵی ئەو موحتەوایەیە. پێڕەو شێوەی بەڕێوەچوونی کاری نێو حیزب دیاری دەکا. لە مەسەلەی شوعارەکەماندا هەر ئەوەیە. مافی چارەنووس کە داوای دەکەین. موحتەوایە بەڵام ئەو مافی چارەنووسە دەکرێ بە چەند شێوە جێبەجێ بکرێ.

یەکەم شێوە کە لە هەمووان بەرچاوترەو زۆر کەس دەیزانێ‌و لە زۆر جێگاش‌دا جێبەجێ بووە، سەربەخۆیی‌یە. گەلێك مافی چارەنووسی خۆی داوا دەکا تا رادەی

جیابوونەوە پێکـهێنانی حکوومـەتێکی سـەربەخۆ ( مسـتقل). کـەوابوو (اسـتقلال) شێوەیەکە لە دانانی مافی چارەنووس.

شکڵی دووهەم؛ فێدراڵیزم یان فێدراتیوە، لە زۆر وڵاتاندا کە چەند میللییەتێن یان فرەگەلێنو چەند میللییەتیان تێدا هەیـە، دیـاریکردنی مـافی چـارەنووس لـەوێ بـە شێوەی فێدارالیزم چارەسـەر کـراوە. بـۆ نموونـە لـە یوگۆسـلاڤی خـودی یەکیـەتیی سۆڤییەتو تا رادەیەك هێندوستان، یان زۆر دەوڵـەتی دیکـەش دەتوانـین ناوبـەرین. مافی دانانی چارەنووس بەو شیوەیە دەبێ کە میللەتەکە جیا نابێتەوە لـە نێـو یـەك دەوڵەتدا لە یەك وڵاتدا دەمێنێتەوە. بەڵام جمهووریی خۆی هەیەو ئەو جمهوورییانە پێکەوە جمهوورییەکی فێدراتیو پێكدێنن. ئەوە شێوەی فێدراتیو یان فێدراڵییە، ئـەوە شکڵێکە لە جێبەجێ کردنی نێوەڕۆکی مافی دانانی چارەنووسدا.

شکڵی سێهەم؛ دیاریکردنی چارەنووس، بە شێوەی خودموختارییە. خودموختـاری وەختێك دێتە گۆڕێ کە بە گشتی ئەو گەلـە نەیهـەوێ جـودا بێتـەوە، یـانێ واز لـە سەربەخۆیی بێنێ. نەشیهەوێ یان بارودۆخی وڵات بۆ فێدراڵی لـەبار نـەبێ. زۆرجـار خودموختاری لەو وڵاتانەدا دێتە گۆڕێ کە یەك نەتەوەی زۆرلێکراویـان هەیـە، یـەك میللەتی زۆرلێکراویان هەیە، داوای خودموختاری دەکاو لە چوارچێوەی ئەو وڵاتـەدا دەمێنێتەوە. چونکە مەسایلی تایبـەتی میللیـی خـۆی هەیـە، داوای خودموختـاری دەکا. دەبینین بۆ وێنە لە هێندێـك لـە جمهوورییـەکانی یەکیـەتیی سـۆڤییەتیدا لـە نێوخۆی جمهوورییـەکانیدا، ناوچـەی خودموختـاریش هەیـە. دەتوانـین لـە وڵاتـانی دیکەشدا نموونە بێنینەوە، وەك ئیسپانیاو هێندوستان. ئێسـتا ئیـدی خودموختـاری مەسەلەیەك نیە کە تازە بێ، لە زۆر جێگا پیـادە کـراوە لـەو جیگایـەی کـە چـەند میللییەتی زۆرلێکراو هەبن، مەسەلەکە زیاتر بەرەو فێدراڵـیزم دەڕوا. چونکـە چـەند میللەتی زۆرلێکراوی هەن. تەنیا لەو جێگایەی کـە یـەك نەتـەوەی زۆرلێکـرا هـەبێ داوای خودموختاری لە گۆڕێ دایە. ئەگەر گەلێك نەیهەوی جودا بێتەوە یـان بۆخـۆی نەیهەوێ، جارێ ئیمکانی نەبێ داوای فێداراتیو بکا، ئەوە داوای خودموختاری دەکا.

لێرەدا دێینە سەر کوردستانی خۆمـان. کـەوابوو پێشـەکی ئـەوە دەڵێـین ئەگـەر خودموختارییەکی راستەقینەمان دەست کەوت بەو مانایەیە کـە مـافی چـارەنووس،

یان حەقی چارەنووسی جێبەجێ کراوە. مەسەلە ئەوە نیە کە ئێمە نوێنەرێکمان لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا هەبێ. ئالای تایبەتی خۆمان هەبێ. دراوی تایبەتی خۆمان هەبێ. ئێستا ئەوە زۆر میللەت هەیانە بە تایبەت لە ئافریقا کە پێشتر (مستعمرە) بوونو ئێستا ئازاد کراون. بەڵام هیچ هەست بەوە ناکەن مافی دانانی چارەنووسیان هەیە. مەبەستم ئەوەیە کە بوونی شکڵی ڕواڵەتیی سەربەخۆیی ( استقلال)، مانای ئەوە نیە میللەتەکە مافی دانانی چارەنووسی دەست کەوتبێ. عەکسی ئەوەش ڕاستە. ئەگەر [میللەت] خودموختارییەکی ڕاستەقینەی هەبێ، بەڕاستی مافی دانانی چارەنووسی خۆی بە دەستەوە بێ، هیچ پێویست بەوە ناکا کە نوێنەری تایبەتی خۆی هەبێ، یان دراوی تایبەتی خۆی هەبێ. گرنگ ئەوەیە کە خەڵك هەست بەوە بکا کە حاکمە بە سەر چارەنووسی خۆیدا. ئەوە شتێکە کە ئێمە بە زەحمەت توانیومانە تا ئێستا بە زۆر سازمانی پێشکەوتووشی حاڵی بکەین. چونکە زۆر جار ئەوان مەسەلەکە دێننە سەر ئەوە کە بۆ وێنە کوردستان با ئاوەدان بکەینەوە، با خەڵکی کوردستان وەزعیان باش بێ، مەدرەسەی هەبێ، فەرهەنگی هەبێ، ئابوورییەکەی بچێتە پێش، جا ئەوە چی لەوە زیاتری دەوێ؟ خەڵکی کوردستان ئەوەی ناوێ، خەڵکی کوردستان کە ئێستا ئامادەیەو شەش ساڵە شەڕ دەکا، تەنیا بۆ ئەوە نیە کە ڕیگای ئاسن بکێشرێ، کارخانەی هەبێ، ئەوەی دەوێ کە بۆخۆی هەست بەوە بکا کە لە وڵاتەکەیدا بێجگە لە خۆی هیچ کەسێکی دیکە بە سەریدا حاکم نیە. ئەو لە پێش هەموو شتێکدا ئەوەی دەوێو ئەوە ئەساسە.

ئەگەر ئەوەی دەست بکەوێ، ئەوانی دیکە، بۆخۆی بەرەبەرە جێبەجێ دەکا. بەڵام ئەگەر ئەوەی دەست نەکەوێ هەرچی لە باری ئابووریو فەرهەنگییەوە ئیعتباریشی بدرێتێ، هیچ نەتیجەیەکی ئەوتۆی نابێ. بە کردەوەش لە زۆر جێگا دیومانە ئێمە دەتوانین بۆخۆشمان نموونە بێن. دیارە حکوومەتی جمهووریی ئیسلامی لە ڕۆژی ئەوەڵەوە دەڵێ قانوونی ئەساسی قبوول بکەن. ئەو پارەی ئێمە بۆ چەك خەرجی دەکەین لە کوردستان خەرجی عومرانو ئاوەدانی دەکەین. بەڵام حاڵی نەبووە میللەتی ئێمە، میللەتێکی زۆرلێکراوە ئەو درەنگ حاڵی دەبێ ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێ ئەوەیە کە ئەو زۆرلێکراوییە، ئەو ستەمە میللییە لە پێش هەمووواندا

لەبەین بچێ. کەنگێ لەبەین دەچێ، ئەو وەختە کە خەڵکەکە خۆی هەست بەوە بکا کە خۆی حاکم بە سەر وڵاتەکەی خۆی دایە. نە ژاندارمەی لە سەرەوە نە پاسداری لە سەرە، نە هیچ کەسێکی دیکەی لە سەرە. ئەوە بە نەزەری من ئەساسە. باشە کەوابوو لە مەسەلەی خودموختاریدا ئەو مەسەلەیە ئەساسە.

ئێستا ئێمە وەك حیزبی دێموکرات بۆ هاتووین خودموختاریمان هەڵبژاردوە.

با لە پێشدا ئێمە لە سەربەخۆییەوە دەست پێ بکەین. بۆ سەربەخۆییمان هەڵنەبژاردوە؟ سەربەخۆیی ( استقلال) دیارە مانای جیابوونەوەیە. با لە پێشدا ئەوە بڵێین ئێمە وەك حیزبی دێموکرات حەقی سەربەخۆیی بۆ هەموو میللەتێکی زۆرلێکراو لەم دنیایەدا قائیلین یانی حەقی جیابوونەوە، کەوابوو دەبێ ئەو حەقە بۆ خۆشمان قائیل بین. ئەگەر جودا نابینەوەو داوای جودایی ناکەین، دەلیلمان بۆ ئەوە هەیە، دەبێ ئەو دەلیلە باس بکەین. حەقی جودابوونەوە لەگەڵ جودابوونەوە دوو شتی جیاوازن. بۆ نموونە لە زۆر وڵاتاندا ماوەیەکی زۆر خەبات کراوە بۆ ئەوەی کە ژن حەقی تەلاقی هەبێ. ئایا کاتێ ژن حەقی تەلاقی دەدرێتێ مانای ئەوەیە کە دەبێ تەلاق وەرگرێ؟ مانای ئەوە نیە، بەڵام ئەو حەقەی دەبێ هەبێ کە ئەگەر رۆژێك ویستی لەم حەقە کەڵك وەرگرێ. میللەتی زۆرلێکراویش ئەگەر ویستی جیابێتەوە دەبێ حەقی ئەوەی هەبێ. بەڵام بوونی ئەو حەقەو داواکردنی دوو شتی جیاوازن. کەوابوو ئێمە ئەو حەقە بۆخۆمان قائیلین. بەڵام داوای ناکەین، چونکە نامانەوێ. بۆ نامانەوێ؟ چونکە خودموختاریمان پێ باشترە. سەربەخویی مانای جودابوونەوەیە، جودابوونەوە لە کوردستانی ئێستادا چەند باری هەیە. لە چەند سەتحدا ئەو مەسەلەیە موتالا بکەین. یەکێکیان مەسەلەی نێوخۆی خودی کوردستانە. یەکێکیان مەسەلەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستە. ئەو جێگایەی کە ئێمەی تێدا هەین. یەکێکیان لە چوارچێوەی میللەتان یان نێونەتەوەیی دایە. لە سێ ئاستدا دەبێ موتالا بکەین.

ئاستی یەکەم نێوخۆی کوردستانە: لە پێشدا بزانین داوای چی دەکەین. ئایا ئێمە داوای جودابوونەوە بۆ کوردستانی ئێران بکەین؟ یان داوای کوردستانی گەورە بکەین؟

ئەوە بۆخۆی جارێ دوو مەسەلەیە. ئەوە دەبێ حەل بکەین لە بەینی خۆماندا، چونکە مافی دانانی چارەنووس بۆ نەتەوەی کورد، یانێ هەموو کوردستان نە لە یەك

جودابوونەوەیە بەڵکوو بەپێچەوانە یەکگرتنەوەیە. مافی دانانی چارەنووس ئەگەر بۆ هەموو پارچەکانی کوردستان ڕۆژێك جێبەجێ بێ ئەوە بە مانای ئەوەیە کە پێکەوە یەك دەگرنەوە.

پێکەوە یەکگرتن مافی جودابوونەوە نیە، مافی یەکگرتنەوەیە جودابوونەوە لە میللەتەکانی دیکەیە. بەلاّم لە واقیعدا حەقی یەکگرتنەوە، حەتتا لە حەقی جودابوونەوە زیاترە. کەوابوو ئەو حەقەمان هەیە چونکە دابەشبوونی کوردستان لە واقیعدا دابەشبوونێکی "دەسکرد"ە. ئێستا ئەو وەزعە نەماوە. بەلاّم جاران کە تازە دابەشکرابوو، ئێستاش هەر شوێنەواری ماوە، دەبینین برایەك کەوتۆتە کوردستانی تورکیە، برایەك لە کوردستانی عێراقە یان لە کوردستانی ئێرانەو دابەشکراون یانێ خانەوادەیەك دابەشکراوە. کەوابوو ئەو دابەشبوونە "دەسکرد"ە، "سروشتی" نیە. ئەگەر چاو لە مێژووی میللەتی کورد بکەین، لە واقیعدا دابەشبوون پاش شەڕی چاڵدران دەست پێدەکا. واتە ساڵی ١٥١٤ یانێ نزیکەی ٥٠٠ ساڵ لەمەوپێش. ئاخر دابەشبوونیشی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی دەست پێدەکا کە دابەشبوونی یەکجارەکییە. لەودا ئیمپراتووریی عوسمانی تێکچوو. لە یەکەم دابەشبوونیدا کوردستان کەوتە بەر ئێرانو دەوڵەتی عوسمانی. دەوڵەتی عوسمانی کە تێك دەچێ کوردستانی عوسمانی دەبێتە سێ بەش. بەشێکی دەبێتە کوردستانی تورکیە، بەشێکی کوردستانی عێراقو بەشێکی دەبێتە ناوچەی کوردستانی سووریە. بەشێکی دیکەش دەکەوێتە خاکی سۆڤیەت. لە واقیعدا کوردستان لێك بلاّو دەبێ. کەوابوو ئەو دابەشبوونە بێ ئەوەی کە لە میللەتی کورد بپرسن ئەنجام دراوە. کەس پرسی بە کورد نەکردوە، یانی ئیمکانی ئەوە نەبووە کە میللەتی کورد خۆی بتوانی حەقی خۆی وەربگرێ. وەختی خۆی ئەو ژیانەی کە ئێستا هەیەتی بە دڵخوازی خۆی هەڵینەبژاردوە. لە پێشدا نەسڵی پێشتر یان نەسڵەکانی پێشتر بۆیان داناوە کە لە دایك دەبێ ولاّتێکو جێگایەك دەبینی. نەسڵی ئێمەو میللەتی ئێمەش لە کوردستانی ئێراندا هاتوە حیزبی دێموکراتی دامەزراندوە، داوای حەقی خۆی دەکاو ئەو مەسەلەیەی لێك داوەتەوە.

لە پێشدا بزانین ئایا لە باری نێوخۆیی‌یەوە ئیمکـانی هەیـە؟ ئێمـە هـاتین داوای سـەربەخۆیی‌مان کـرد وەك وتمـان سـەربەخۆیی دوو بەشـی هەیـە. وای دابنـێین سەربەخۆیی‌مان بۆ کوردستانی ئێران دەوێ. داوا کردنی سەربەخۆیی بـۆ کوردسـتانی ئێران هەر نەبێ تێکدانی سنووری دەوڵەتێکـە وەك ئـێران. لـەو ناوچـە شـاخاوییەدا (کوردستانی ئێران)، حکوومەتیك دروست بکەی. ئەو وەختە کە حـیزبی دێموکـرات تازە دەستی پێ‌کردبوو تەواوی دانیشتووانی دەبوون بە دوو، سێ میلیۆن‌و ئێستا نزیك بە شەش، حەوت میلیۆنە. لەو ناوچە شاخاوییەدا کـە لـە بـاری سـامان (منـابع)ی ژێرزەمینییەوە جارێ نازانین چی تێدایە. جارێ هەتا ئێستا ئـەوەی تێـی‌دا هەیـە زۆر کەمەو لە باری ئابوورییەوە یەکجار زۆر فەقیرە، ناتوانێ لە باری ئابوورییەوە بۆخـۆی بژی. چونکە گوتمان هەر ئەوەمان ناوێ ناوێکمان ببێ ( استقلال)ێکمـان هـەبێ. ئـەو خودموختارییەی کە داوای دەکەین، دەبێ بەموحتەواش بێ کە شتیکیش بەو میللەتە بدا. بەتایبەتی کە زۆربەی خەڵکی کوردستان لە زەحمەتکێشـانن. یـەکێك لـە بـارە گرنگـەکانی سیاسـەتەکانی حـیزبی دێموکـرات ئـەوە بـووە کـە دۆسـتە کۆنـەکانمان (کۆمەلە) لێی حاڵی نەبوون. ئەورۆکە حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئـێران لـە دوو بەرەدا خەبات دەکا؛ هەم بۆ حەقی میللی‌و نەتەوەیی، هەم بـۆ حـەقی کۆمەڵایـەتی‌و ئابووریی زەحمەتکێشان. هەر لەبەر ئەوەشە ئەو نفووزە گەورەیەی پـەیدا کـردوە. لـە تەجرەبەی کوردسـتانی عـێراق کـەڵکی وەرگرتـوە. لـە کوردسـتانی عـێراق حـیزبی شیوعیی عێراق هەیە، پارتی دێموکراتی کوردستانی عێراق هەیە. پارتی دێموکراتـی کوردستانی عێراق کاری بە داخوازە کۆمەڵایەتییەکان نەبووە. حیزبی شـیوعی کـاری زۆر کەم بە داخوازە نەتەوەیی‌یەکان هەبووە. لە نتیجەدا هیـچ کامـەیان نـەیانتوانی هەموو مەسایلی میللیی میللەتی کورد بێننە گۆڕێ، بتوانن میللەتی کـورد بـۆ لای خۆیان رابکێشن. یەك بوو بە حیزبێکی ناسیۆنالیست، ئەوەی دیکـە هـەر مەسـەلەی چینایەتی هێنایە گۆڕێ، گرنگییەکی ئەوتۆی بە مەسەلەی میللی نـەداو لـە ئاکـامدا بوو بە حیزبێکی چکۆڵەو نفووزی خۆی لە دەست دا.

پێمان وا نەبێ ئەگەر خودموختاریمان وەرگرت، تەواوی ئەو شتانەی کە لـە دڵمـان دایە هەمووی جێبەجێ دەبێ. خودموختاری بۆ خەڵکی سادە بۆتە دروشمێك کە پێـی

وایە هەرچی ئارەزوویان هەیە کە خودموختاریمان وەرگرت چ ئارەزووی فەردی بـێ، چ کۆمەڵایەتی بێ ، بۆی جێبەجێ دەبێ. دیارە خودموختاری ئەوە نیە. بەڵام لە عەینی کـاتیش‌دا خودموختـاری ئەوەیـە کـە خـەڵك (چـاوەڕوانی)یـان هەیـە کـە ئـەتۆ خودموختاریت وەرگرت زۆر شتیان بـۆ جێبـەجێ بکـەی یـان زۆرتـر لـەوە ئەگـەر ( استقلال)ە کەمان وەرگرت، دەبێ زۆر شتی بۆ جێبەجێ بکەین. بە نەزەری ئێمەو بـە نەزەری حیزبی دێموکرات، ئێمە لە شەرایتی ئێسـتادا، نـاتوانین تەنانـەت لـە بـاری سیاسی‌یەوە خۆمان بپارێزین. ئەگەر ئەوەش بتوانین لە باری ئابورییەوە نـاتوانین ئـەو شتانە کە میللەت (چاوەڕوانیەتی) بەدی بێنین. یان بێجگە لەوە بۆ پاراستنی خۆمـان چ دەکەین؟ ئیمە دەکەوینە کوێ، ئێمە دەکەوینە بەینی تورکیەو ئێران. دیارە ئەگـەر داوای (استقلال) هەر بۆ کوردستانی ئێران بکرێ دەکەوینە نێو ئـەو چـەند دەوڵەتـە. باشە ئەوانە دۆستی کورد نین، دۆستی دەوڵەتێکی (سەربەخۆ)ی کورد نابن. بە شەش، حەوت میلیۆن کەسەوە ئێمە ئیمکاناتی دەوڵـەتی ئیسـرائیلمان نیـە. نـە لـە بـاری یارمەتیی دەرەوە نە لە باری زەمینەی پێکهاتنیەوە. چونکە ئیسرائیل کـە پێك‌هـات باشترین دانیشتوانی‌و باشترین ئەفراد لە هەموو دنیاوە کە جوولەکەکان بوون چوون بۆ ئیسرائیل. ئێمە ئـەو ئیمکاناتـەشمان نیـە کـەوابوو ئێمـە لـەو شـاخ‌و داخـە دەبـێ ئیمکاناتێکی زۆرمان هەبێ‌و پارەیەکی زۆر خەرج بکەین، بۆ ئەوەی ئەرتەشێکی زۆر قەوی پێك بێنین هەتا بتوانین دیفاع لـە خۆمـان بکـەین تـا یـەکێك لـەو دەوڵەتانـە نەمانخۆن. ئەگەر واقێعبینانە بـیر بکەینـەوە وەزعـی خراپـی ئـابووریی کوردسـتان، پێشکەوتنی وەزعی ئابووری و سەنعەتیی کوردستان‌و هەلومەرجی دەوروبەرمان یانی وەزعی "استراتژیکی"و "ژئوپلوتیکی" ئەوە کـە پێـی دەڵێـن جوغرافیـای سیاسـی هیچیان ڕێگا نادەن کە ئێمە بتوانین سەربەخۆیی کوردستانی ئێران بپارێزین. کەوابوو بە کردەوە ئەوە دەبێ لەولا دابنێین، چونکە دەبێ شەڕ بکەین. ئـەو هـەموو شـەهیدە بدەین شتێك پێك‌بێنین کە نەتوانین بیپارێزین، زۆر جاریش کـراوە، بـەڵام شۆڕەشـەکە نەپارێزراوە. ئیمکانی هەیە ئێمەش بتوانین ئەوەی کە دەمانەوی بە ناوی "استقلال"و سەربەخۆیی وەدەستی بێنین، بەڵام ناتوانین بیپارێزین.

ئێستا بێینە سەر بەشی دووهەم: بڵێین باشە ئێمە سەربەخۆیی (استقلال)ی کوردستانی ئێرانمان ناوێ. ئەگەر داوای "استقلال" بکەین "استقلال"ی هەموو کوردستانمان دەوێ. جا ئەگەر ئەوەمان گوت دیارە لە چوارچێوەی ئێران دەچێتە دەرێ. دەچێتە ئاستێکی دیکە. دەچێتە ئاستی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست. داوای "استقلال"ی کوردستان کردن یانی تێکدانی سنووری چوار دەوڵەتان. دەوڵەتانی عەرەبی وەك عێراق‌و سووریە، کەوابوو داوای سەربەخۆکردنی کوردستان بە مانای رووبەڕوو بوونەوەیە نەك هەر لەگەڵ دوو دەوڵەتی عەرەبی بەڵکوو لەگەڵ زۆر دەوڵەتی عەرەبی دیکەش. با نەڵێین هەموویان بەڵام زۆری دیکە هەن کە پشتی ئەو دەوڵەتە عەرەبییانەە دەگرن‌و موخالیفەت دەکەن کە کورد پارچەیەك لە خاکی ئەو ولاتانەی کە بۆخۆیان پێی دەڵێن ولاتی عەرەبی جودا بکاتەوە. تەنانەت زۆرکەس لەو کاربەدەستانە کە ئێستا لە سووریەو عێراقدا لە سەر کارن، قسەیان ئەوەیە کە کورد ئەو خاکەی کە ئێستا تێیدا دانیشتووە لەو دوو ولاتە عەرەبییە هی خۆی نیە. میوانی ولاتانی عەرەبییە، خاکەکە هی ئەوانە. لە سووریە بەتایبەتی زۆر نموونە هەیە. بۆ نموونە جێگایەك ناوی "کانیی کوردان" بوو، دیارە بە عەرەبی دەبێتە "عین الاکراد"و لە پێشدا هاتون ئەکرادەکەیان گۆڕیوەو کردویانەتە عەرەب‌و لە پاشان ناوە کوردییەکەیان لابردوەو کردویانە بە "عین العرب". زۆر جێگای وا هەیە ناوەکەیان بەم شێوەیە گۆڕیوە. مەبەست ئەوەیە تەرەف دەبین لەگەڵ چەند دەوڵەتی عەرەبی. لە راستیدا ولاتانی عەرەبی لە دنیادا رۆژبەرۆژ نفووزیان دەچێتە سەرێ، بۆچی؟ چونکە ئیمکاناتی ئابوورییان زۆرە، نەوتیان هەیە، دەوڵەتان پێیان خۆشە لەگەڵ ولاتانی عەرەبی پێوەندیی ئابوورییان هەبێ. پێوەندیی بازرگانییان هەبێ، قازانجیان هەیە. لە نتیجەدا ولاتانی عەرەبی پێکەوە ئەگەر هەمووشیان نەیکەن زۆریان لە پشتی ئەو دوو دەوڵەتە رادەوەستن.

دوو دەوڵەتەکەی دیکە یەکێکیان ئێرانەو ئەوی دیکەیان تورکیەیە. تورکیە بەشێکە لە سازمانی ئاتلانتیکی شیمالی (ناتۆ). جوداکردنەوەی بەشێك لە خاکی یەکێك لە ئەندامانی ناتۆ هەروا ئاسان نیە. چونکە تورکیە لەگەڵ ولاتانی ئۆرووپای رۆژئاواو ئەمریکا لە پەیمانێکی نیزامی دایە، پشتی بەقەوەتە. ئەوەش نیە کە بێن‌و

مەوافیقەت بکەن‌و بڵێن فەرموون خاکی تورکیە بەرن. چونکە کوردستانی تورکیە، بەشێکە لە خاکی یەکێك لە ئەندامانی هەرە گرنگی پەیمانی ئاتلانتیکی شیمالی لە باری ستراتژیکەوە.

ئێرانیش دیارە بۆخۆی وڵاتێکی چەندین میلیۆنییە. ئەویش بۆخۆتان دەبینن ئێستاش پاش تێکچونی ڕێژێمی پاشایەتی، قودرەتی هەیەو پشتی جەبهەی هەیە. جودا بوونەوە یان جوداکردنەوەی کوردستانی ئێرانیش ئاسان نیە. لە وڵاتانی ئافریقایی کە پێشتر "مستعمرە" بوون‌و ئێستا سەربەخۆیی‌یان وەرگرتوە، دیارە لەوێش "استعمار" زۆر زیرەکانە سنووری داناوە کە دەبینین بۆ وێنە میللەتێك دابەش کراوە بەشێکی وەبەر وڵاتێکی دیکە کەوتوە. لە نەتیجەدا ئەو وڵاتانە دەیانەوێ بەشێك لە سنوورەکانی خۆیان بگۆڕن. ئەو شەڕە کە ئێستا لە زۆر وڵاتی ئافریقایی‌دا هەیە لە سەر ئەوەیە. بەڵام تەنانەت لەوێش ئیمکانی گۆڕینی سنوور زۆر زەحمەت بووە، چ بگا بە گۆڕینی سنوورێکی وەك کوردستان کە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی دانراوە، ئەویش لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا کە ناوەندی هەرە گرنگی ئیستراتژیی ئابوورییە لە جیهاندا.

دیارە لە باری نێونەتەوەیی‌شەوە هەر وایە. ئەگەر ئێمە بمانەوێ سەربەخۆیی کوردستان وەربگرین، دەبێ لە بەرامبەر دوو دەوڵەتی عەرەبی‌دا کە عەرەبەکانی دیکەش پشتیوانییان لێ‌دەکەن‌و تورکیەو ئێرانیش‌و لە سەر یەك لە بەرامبەر هەموویاندا ڕابوەستین. با بزانین جارێ ئەو هێزەمان هەیە، بۆخۆتان دەزانن کە ئێستا کوردستانی ئێمە نیسبەت بە کوردستانەکانی دیکە، وەزعی باشترە. لە باری جووڵانەوە لە پێشترین. بەڵام لەگەڵ ئەوە جارێ ئەو هێزەمان نەبووە کە بتوانین خوموختاری بە سەر ڕێژیمی جمهووریی ئیسلامی‌دا بسەپێنین. ئەو برادەرانە کە هێندێکیان دەڵێن ئێمە ئەو هەموو زەحمەتە دەکێشین، ئەو هەموو شەهیدە دەدەین، بۆچی بۆ سەربەخۆیی نەبێ؟ من لە بەرامبەریاندا دەڵێم ئێمە ناتوانین خودموختاری وەربگرین چ بگەین بەوە کە سەربەخۆیی وەربگرین. ئێمە ئەگەر بمانهەوێ سەربەخۆیی وەربگرین، دەبێ جووڵانەوەیەکی نێونەتەوەیی یەکجار بەهێزمان هەبێ، لە سێ وڵاتی ئێران، عێراق‌و تورکیە. تورکیە زۆر گرنگە. تورکیە نیوەی دانیشتووانی هەموو

کوردستانی تێدایە. ئەگەر کورد ٢٠ میلیۆن بێ، ١٢میلیۆن کەسی لە تورکیەیە. باشە ئایا بۆ وێنە جوولاًنەوەیەکی ئاوا هەیە؟ جوولاًنەوە لە کوردستانی تورکیە پەراکەندەیە، وەزعێکی شپرزەی هەیە، هەر ناکرێ پێی بڵێین جوولاًنەوە، لە کوردستانی عێراق بۆخۆتان دەبینن کە هەیە بەلاًم دیسانەکە لەو وەزعەدا نیە کە کوردی عێراق بتوانێ داخوازەکانی خۆی وەدی بێنێ. لە ئێرانیش بۆخۆتان دەزانن وەزعمان چۆنە. باسی سووریە ناکەم چونکە لەوێدا هیچ جوولاًنەوەیەکی ئەوتۆ لەگۆڕێدا نیە. کەوابوو ئێمە بە چ هێزێك دەتوانین سنووری چوار دەوڵەتان بشکێنین‌و کوردستانی گەورە ساز بکەین. ئەو هێزەمان نیە لە باری نێوخۆیی‌یەوە. هەروەها لە باری رۆژهەلاًتی نێوەڕاستیش‌دا، کەس نیە پشتیوانیمان لێبکا لە بەرامبەر ئەو هەموو دوژمنە کە هەمانە. چونکە ئەگەر ئێمە داوای سەربەخۆیی‌مان کرد، دیارە ئەو وەختە وەك ئەمڕۆ نابێ. ئێستا ئێمە لە سنووری خاکی کوردستانی عێراق دانیشتووین، سبەینێش لێرە ناتوانین دانیشین، چونکە عیراق موخالیف دەبێ، ئێرانیش موخالیف دەبێ، تورکیەش موخالیف دەبێ. ئیدی ئەتۆ رێگاو دەرەتانت لە باری جوغرافیایی‌یەوە بۆ دەرەوە نیە.

لە رۆژهەلاًتی نێوەڕاستەوە بچینە سەتحی جیهانی، بزانین لە دەوڵەتە گەورەکان یان لە دەوڵەتە نێونجییەکان کێ ئامادەیە پشتیوانی لە "سەربەخۆیی"ی کوردستان بکا. با ئەوە لە نەزەردا بگرین کە ئەمریکا بێت‌و دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ تورکیە تێك بدا کە ئەندامی ناتۆیەو بە یارمەتیی ئەمریکا دەژی. بۆچی بۆ ئەوە کە میللەتی کورد هەیە. سەربەخۆیی بداتێ. دەبێ ئەوەندە ئینساندۆست‌و بەشەردۆست بێ؟ کەوابوو ولاًتە غەربییەکان بە گشتی پێیان خۆش نیە لە رۆژهەلاًتی نێوەڕاستدا کە بۆیان "حساس"ە، قازانجی ئابووریان هەیە، نەوت دەبەن‌و سیلاحیان پێدەفرشن، قازانجێکی زۆری بازرگانییان هەیە، بێن‌و پشتیوانی لە شتێك یان پەدیدەیەك بکەن کە سنووری چوار دەوڵەتان تێك دەدا. بۆ بیکەن؟ شتێك کە مەعلوومە عاقیبەتەکەی دەبێتە چی؟ دەوڵەتان پێش هەموو شتێك قازانجی خۆیان لەبەرچاو دەگرن‌و مەسڵەحەتی خۆیان دەپارێزن.

بەشـــی دووهـــەمی دەگەڕێتـــەوە ســـەر یەکیـــەتیی ســـــۆڤیەتی‌و دەوڵەتـــە سوسیالیستییەکان. ئەو ولاّتانەش دیارە لەگـەڵ ئـەوەی ولاّتـانی سوسیالیسـتین‌و لـە ئەسڵدا لایەنگری مافی دانانی چارەنووسی میللەتانن. بەلاّم ئەوانیش لـە شـەرایەتی ئێستادا کە ئێمە باسی دەکەین نایەن لە هیچ‌و خۆڕایی خۆیـان تووشـی مەسـەلەیەك بکەن کە دوژمنایەتیی تورکیەو عـێراق‌و ئـێران‌و بـە تایبـەتی عـەرەبی تـێدا بـێ. وەختێك پێش لە سـاڵی ١٩٥٦ یەکیـەتیی سـۆڤیەتی، دامـەزراندنی کوردسـتانێکی سەربەخۆی لە رۆژهەلاّتی نێوەڕاستدا سەلماند. بەلاّم پاش ســاڵی ٥٦ کـە پێوەندیـی لەگەڵ ولاّتانی عەرەبی بەهێزتر بـوو لـە پێـش‌دا لەگـەڵ ئـێران‌و دوایـەش سـووریەو ولاّتانی دیکە. دیارە بەرەبەرە لەو ستراتیژییەی پێشووی پاشەکشەی کـرد‌و ئێسـتاش لە ستراتیژیی یەکیەتیی سۆڤیەتی‌دا شتێکی ئاوا نابینین. نموونەش ئەوەیە کە ٦ ساڵە شەڕ دەکەین بۆ خودموختاری نەماندیوە کە یەکیەتیی سۆڤیەتی خۆی زۆر بە ئێمەوە ماندوو بکا. دیارە وەختێك کە حیزبی توودە جنێوی پێ‌دەداین، ئەو جنێوی نـەدەدا‌و وەدوای سیاسەتی حیزبی توودە نەدەکەوت، ئەوانەش واقعییەتێکە. بەلاّم ئەو جـۆرەی بە کردەوە یارمەتی مەلا مستەفای بارزانی دەکرد بە هیچ جۆرێك بە یەك لە دەی ئەو گرینگییەی نەدەدا بە وەزعی کوردستانی ئێران. لە حاڵێك‌دا کوردستانی عێراق جیران نەبوو. ئێمە جیران‌و دراوسێی یەکیەتیی سۆڤیەتین لـە شـەرایەتی ئێسـتادا. کـەوابوو ئەوەش لە بەرنامەی ستراتیژیی ئەودا نیەو "سەربەخۆیی"ی کوردستان ئیمکانی نیە. بەلاّم شەرایەتی تورکیە لەگەڵ هەڵوێستی یەکیەتیی سۆڤیەت کەمێك جیاوازی هەیە. تورکیە ئەندامی ناتۆیـە. ئـەوەندە کـە ئـەمریکا پێـی ناخۆشـە ئـەوەندە یەکیـەتیی سۆڤیەتی پێی خۆشە، ئەگـەر کـوردی تورکیـە بجووڵێتـەوە. دیـارە پێـی خۆشـە تـا خودموختـاری یـان تـا سـەربەخۆیی، ئـەوەندە پاشـان بەسـتراوەتەوە بـە جـۆری حەرەکەتەکەی.

کەوابوو ئێمە با کورتی کەینەوە لە باری نێوخۆیی‌یەوە ئـەو هێزەمـان نیـە داوای سەربەخۆیی بکەین. لە باری رۆژهەلاّتی نێوەڕاستەوە کۆسپ هێندە زۆرن کە وەزعەکە بە ئێمە ئیجازە نادا. لە باری نێونەتەوەیی‌یەوە هیچ پشتیوانی‌یەکی ئـەوتۆمان نیـە. دەوڵەتێك پەیدا بێ بۆ نموونە وەك فەرانسە یان یەکێکی دیکە دوو بوورسمان بداتێ یان

دوو ویزامان بداتێ یان بریندارێکمان لیٚوەرگرێ. ئەوە نابێتە سەربەخۆیی. چونکە داواکردنی سەربەخۆیی شەڕێکی دوورو درێژو پشتی جەبهەی دەوێ. ئێستا ئێمە ئەگەر جەبهەمان هەبا، دەمانتوانی خۆمان رابگرین، بەلاٚم نەماندەتوانی بەو شێوەیەی کە ئێستا هەمانە وابایین، بۆ وێنە بریندارێکمان هەیە دەینێرین بۆ نەخۆشخانە هاتوچۆمان هەیەو لەو بارەوە گیروگرفتمان نیە، بەلاٚم ئەو وەختە بەتایبەتی ئەوەمان لە بیر نەچێ ژئۆپۆلیتیك کە دەڵێم باسی جوغرافیای سیاسی دەکەم، ئەوەیە کە ئێمە رێگاشمان بۆ دەریا نیە. بۆ وێنە وەك بەنگلادیش ئەگەر رێگامان بۆ دەریا هەبا "سەربەخۆیی"ی خۆمان وەردەگرت. چونکە ئێمە لە ئابلۆقەی ئەو چەند دەوڵەتە داین.

کەوابوو بە کردەوە داوا کردنی سەربەخۆیی بۆ ئێمە بێجگە لەوە کە عەمەلی نیە، زەرەریشی هەیە. زەرەرەکەی لە چی دایە؟ زەرەرەکەی ئەوەیە هەرکە ئێمە داوای سەربەخۆیی‌مان کرد بۆ وێنە لە کوردستانی ئێران، ناخۆشی لەگەڵ دەوڵەتەکانی دیکە دەست پێدەکا. یانی لەگەڵ تورکیەو عێراقو ئەوجار ئیدی بە عەمەلیو ئاشکرا شەڕمان لەگەڵ دەکەن. ئەو هێزەمان نیە هیچ، ئەو هێزە ئێرانی‌یانە، ئەو هێزە تورکانەو ئەو هێزە عێراقییانەش کە دێموکراتنو هاوکاریان لەگەڵ دەکەن ـ ئەوانیش تازە بە زەحمەت هاوکاریان لەگەڵ دەکەن ـ لە دوارۆژدا ئیمکانی هەیە هاوکاریمان لەگەڵ نەکەن. دیارە بۆخۆتان بۆ نموونە هێزێکی وەك موجاهیدین دەناسن کە حەقی خودموختاری پێ هەزم ناکرێ، چ بگا بەوە کە ئێمە داوای جیابوونەوە بکەین. لەو بارەشەوە بە تاقی تەنیا دەمێنینەوە یانی کورد بە تاقی تەنیا دەمێنێتەوە لە نێوان ئەو چەند دەوڵەتەدا. ئەوە ئیمکانی نیە کە بتوانین دروشمی سەربەخۆیی بسەپێنین بە سەر ئەو دەوڵەتانەدا. ئەوە لێکدانەوەی ئێمە بوو. کەوابوو دروشمی ئەساسیمان هەر (دێموکراسی بۆ ئێران، خودموختاری بۆ کوردستان)ە.

ئەگەر سەربەخۆیی‌مان لەولا دانا، فێدرالیزم دەمێنێتەوە. باشە بە پێی ئەو ئیستدلالانە کە کردمان دەبێ زیاتر داوای فێدرالیزم بکەین چونکە چەند میللییەتی زۆرلێکراو لە ئێراندا هەن، ئێمە بە تەنیا نین. بەلووچستان هەیە، تورکمەنستان هەیە، ئازەربایجانیش هەیەو عەرەبیش هەیە. ئەوە بۆ داوای خودموختاری دەکەین؟

دیسان دەگەڕێینەوە سەر ئەوە کە ئێمە لە حاڵەتێکی کەمێك دوولایەنـەدا قـەرارمان گرتوە. ئەگەر بێنین داوای فێدراڵیزم بکەین، هـەموو پێمـان دەڵێـن، ئـەوە بـۆ داوای فێدراڵیزم دەکەن خۆ ئێوە نوێنەری هــەموو گـەلانی ئـێران نـین؟ هـەرچی بـێ ئێمـە حیزبێکی ناوچەیین، حیزبی سەرانسەری ئێران نین. پێمان دەڵێن حیزبی ناوچـەیی، تـۆ دەتوانی هەر داوای خودموختاری بکەی. جاری واش هەیە خەڵکی دیکە پێمان دەڵێن ئـەوە بـۆ داوای خودموختـاری بـۆ خـەڵکی دیکـە ناکـەن؟ دیـارە ئێمـە لایـەنگری خودموختاری بۆ هەموو گەلانی ئێرانین. زیاتر لەوە پێمان وایە شـێوەی عەمــەلی بـۆ حەلکردنی مەسەلەی میللی لە ئێراندا شێوەی فێدراڵیزمە، چونکـە چـەند میللـەتی دیکەش هەن.

کە باسی (تضمین) دێموکراسیمان کرد بۆ خودموختــاری (تضمـین)ێکـی دیکـەش هەیە، ئەگەر دێموکراسی بە تــەواوی لـە ئـێراندا جێگـیر بـێ. مانـای ئەوەیـە کـە خەڵکەکانی دیکەش خودموختاریی خۆیان وەرگرتــوەو ئەگـەر ئـەوان حـەقی خۆیـان وەربگرن. ئەویش بۆخۆی (تضمین)ێکە بۆ حەقی ئێمە. تازە دەوڵەتی مەرکەزیی ئێران بە ئاسانی ناتوانـێ تورکەمــەن، بـەلووچ، عــەرەبو ئازەربایجـانی کـۆ بکاتــەوەو لـە کوردستاندا شەڕمان لەگەڵ بکا. ئەگەر دێموکراسی هەبێو ئـەوانیش حـەقی خۆیـان وەرگرتبێ، ئیدی ئەوە زۆر زەحمەتتر دەبێ لە جاران. کەوابوو ئێمە لایــەنگری گـەلانی زۆرلێکراوی ئێرانین. بەڵام ئێمە وەکیلیـــان نـین. ئێمــە نـاتوانین خودموختارییـان بـۆ وەربگرین. ئازەربایجانی دەبێ بۆخۆی بجووڵێتەوە، عەرەب دەبــێ بۆخـۆی بجووڵێتــەوەو تورکەمەن هەروا. جاران لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە واقیعدا ئازەربایجان بوو کـە پێشڕەوی جووڵانەوە بوو لە ئێراندا، بەڵام ئێستا کوردستانە.

دیارە بۆخۆمان دەزانین بە پێی وەزعی تاریخی بوونی حیزبی دێموکـــراتو وریـایی خەڵكو وشیاریی سەتحی نێونەتەوەیی، هەموو بوونە هۆی ئەوە کە کوردســتان ئێســتا بە ئاگاهی زیاترەوە پێشڕەوی خەبات بێ لە ئـێراندا. بـەڵام باشـە نـاتوانین ببـین بـە وەکیلی خەڵکی دیکە پێیـــان بڵێـین ئێـوە داوای خودموختــاری بکــەن. بــەڵام ئێمــە موافیقی فێدراڵیزمین، هەموو وەختێك موافقین. جارێك کە کۆنفرانسی گەلانی ئــێران پێکهات دوو سێ مانگ پاش شۆڕش لە سەرەتای بەهاری ١٣٥٨ بوو لە تاران ئێمــە

لەوێ فیدرالیزممان پێشنیار کردو موافیقی بووین. قەرار بوو کۆنگرەیەك پێك بێ لە رۆژی ٣ی خەرمانان لە مەهاباد، کۆنگرەی هەموو گەلانی ئێران کە بۆخۆتان دەزانن رۆژی ٢٨ی گەلاوێژ شەڕەکە ساز بوو، ئیدی عەمەلەن کۆنگرەش پێك نەهات. دەنا هەر ئەو وەختەش نەزەرمان ئەوە بوو کە فیدرالیزم لە ئێراندا دەبێ هەبێ. یانی ئێران دەبێتە جمهووری‌یەکی فیدرالی. یەك جمهووریی مەرکەزیو لە پاشان جمهووریی ئازەربایجان هەیە. کە ئەوانە وەکو جمهوورییەکانی شوورەوی بۆخۆیان جمهوورییان هەیەو حەقی دانانی چارەنووسی خۆیان بە شێوەی فیدرالی هەیە. کەوابوو ئێمە لایەنگری فیدرالیزمین.

ئێمە حیزبێکی ناوچەیین ناتوانین ببین بە وەکیلی گەلانی دیکەی ئێران. بەلام وەك ئێرانییەك حەقی خۆمانە نەزەر بدەین. چونکە ئێمە ئێرانیینو ئێرانییش حەقی دەربڕینی نەزەری هەیە. هەر بۆیە هەر وەختێك نوێنەرانی ئەو گەلە زۆرلێکراوانە داوای یارمەتییان لە ئێمە کردبێ، دریغیمان نەکردوە. ئێمە هەموو وەختێك ئامادەیی خۆمان نیشان داوە. ئەوەندەی ئیمکاناتمان هەبووە یارمەتییان ویستوە، یارمەتیمان داون، چ سیاسی بێ، چ یارمەتیی دیکە بێو لە ئەسڵی مەسەلەکەش دیفاعمان کردوە. کارمان بەوە نیە کە مەسەلەن فیرقەی دێموکرات هاتبێ لە ئازەربایجان باش بێ یان خراپ بێ، ئێمەش دیفاع لە فیرقەی دێموکرات کە نازانین چیە، ناکەین. بەلام ئێمە دیفاع لە حەقی خودموختاریی خەڵکی بەلووچستانو هتد دەکەین. ئەو حەقە بە هی هەمووان دەزانین. هەموو وەختێك ئێمە زاراوەی گەلانی ئێران بە کار دێنین. میللەتی ئێران لە فارسییشدا بە کار ناهێنین. ئێمە میللەتی ئێران بە زاراوەیەکی دروست نازانین. چونکە ئێران لە یەك میللییەت پێك نەهاتوەو لە چەند میللییەت پێکهاتوە. کەوابوو فیدرالیزمیشمان قبووڵە. بەلام چونکە کەسێکی دیکە نیە جاڕێ لە مەیداندا، هەر ئێمە بە تاقی تەنیا هەینو داوای حەقی خۆمان دەکەین. داوای خودموختاری دەکەین. کەوابوو گەڕاینەوە سەر خودموختاری.

ئێستا با بزانین خودموختاری چیەو چۆن دەتوانین جێبەجێی بکەین. باسی کێشەکانی فیدرالیزممان کرد، ئیشکالەکە لە بەر ئەوەیە کە نەتەوە زۆرلێکراوەکانی دیکە لە مەیداندا نین.

دەمێنێتەوە خودموختاری. شێوەی مافی چارەنووسی ئێمە خودموختارییـــە. بـەم شێوەیە خەڵکی ئێمە دەتوانن خودموختاری دابمەزرێنن یان پیادەی بکەن. باشــە ئـەو حەقەمان هەیە کە دانانی مافی چارەنووسی خۆمان بە شێوەی خودموختــاری دیـاری بکەین‌و دای‌بمەزرێنین. داواکردنی خودموختاری دیارە مانای ئەوەیە کە ئێمــە لەگـەڵ دەوڵەتی ئێراندا تەرەفین. ئێمە لەگەڵ دەوڵــەتی ئـێران شــەڕ دەکــەین. لەگــەڵ هیــچ دەوڵەتێکی دیکە شەڕ ناکەین. نە لەگەڵ تورکیە شەڕ دەکەین نە لەگەڵ عــێراق شــەڕ دەکەین. ئەگەر ئەوان شەڕمان لەگەڵ بکەن مەجبوور بین شتێکی دیکەیە. بەلاّم ئێمە پێشمان ناکرێ‌و پێشمان خۆش نیە. چونکە ئێمــە ئــێرانین‌و دەمانهــەوێ لــە ئــێراندا خودموختاری وەربگرین. کە گوتمان خودموختاری مانای ئەوەیە کــە لــە چوارچێــوەی ئێراندا داواکانمان جێبەجێ دەکەین. داوای جیابوونەوە ناکەین، هیچ داوایەکمان نیــە کە لە دەرەوەی چوارچێوەی ئــێران بــێ. لــە چوارچێــوەی سـنووری ئــێرانیش‌دا هیــچ داوایەکی وا نابێ بێتە گۆڕێ کە بۆنی ئەوەی لێ‌بــێ کــە ئێمــە دەمانــەوێ لــە ئــێران جیابینەوە. کە خودموختاریمان داوا کرد، ئیدی داوای خودموختــاری بکــەین‌و شــتی دیکە داوا نەکەین.

چونکە لەو وتووێژانەدا کە لەگەڵ ڕێژیمان هەبووە بە داخــەوە تەجرەبــەی خراپمــان هەیە. ئێمە وەکو حیزبی دێموکرات هەرچەند تەجرەبەمان لە زۆر حیزبی دیکە زیـــاتر بوو، بەلاّم دیسانەوە دوو خەتەر هەبوو بۆ ئێمە؛ یەکەم: هێندێــك لــە بــرادەران داوای وایان دەکردو بە تایبەتی ئەو وەختە کە لە وەفدی نوێنەرایەتیی گەلی کورددا بووین‌و کۆمەڵەو فیدایی شتی وایان دەهێنایە گۆڕێ کــە بەڕاســتی لــە هیــچ حکوومــەتێکی خودموختاردا نیە. لە بەرامبەر ئەوەش‌دا هێندێك شتی دیکە هەبوو کە هێندێ کەس کە بە گرووهی حەوت کەسی مەشهوور بوون، ڕۆیشتن‌و حیزبەکــەیان بــەجێ هێشــت، ئەوانیش مەسەلەکەیان وا لێ‌کرد کە لە واقیعدا لە خودموختــاری شــتێك نــەدەماوە. ئەوەی کە هێنابوویان بە نێوی خودگەردانی‌و دەیانهەویست ئێمە قبووڵی بکەین. ئەوە هیچ شتێکی لە خودموختاری نەدەهێشتەوەو ئەساسی خودموختاری لەبەین دەچــوو. کەوابوو هەم دەبێ خودموختاریمان هەبێ‌و هەم دەبێ تــەنیا خودموختاریمــان بــوێ نــە زیاتر. بۆیە ئێمە ئەو شەش مانگە کە وتووێژمان هــــەبوو لەگــەڵ ڕێژیمــی جمــهووریی

ئیسلامی‌دا شتێکمان داوا نەدەکرد کە بزانین پێمان دەڵێـن کـە ئـەوە لـە چواچێـوەی ئێران بەدەرە. شتی ئاواشمان داوا نەدەکرد کە میللەتی کورد کە ئەو هەموو خەباتـەی کردوە پێمان بڵێ ئەوە هیچ نیە. دیارە ئەمن ناچمە سەر ئەوە کە بە زاراوەی سیاسـی پێی دەڵێن موزایدەیە. ئەو موزایدەیە، کە کۆمەڵـەو رێکخـراوی دیکـە دەیکـا یـانی غەیری مەسئوولانە دەجووڵێتەوە. ئێستا مەسەلەن بەرنامـەی خودموختـاریی ئێمـە هەیەو کۆمەڵە هاتوە ئەو بەرنامەیەی لەواقێعدا کۆپیە کردوە، نوسخەی لێ‌هەڵگرتوە بۆ وێنە وشەی "انقلابی" لە پشتەوە داناوە. خودموختاریی ئینقلابی‌یان دەوێ یان بۆ وێنە فلان شتی ئینقلابی، دوو سێ شتی لێ زیاد کردوە، تەنیا بۆ ئـەوە کـە چونکـە خۆی بە "اصطلاح" بە پێشرەو دەزانێ. بۆ ئـەوەی بسـەلمێنێ کـە بـەڵێ لـە حـیزبی دێموکرات پێشرەوترە، شتی غەیرە واقعیی داوا دەکا یا قەوڵی شتی غـەیرە واقێعـی بە خەڵکی دەدا. دەیانگوت زەمانی مەشرووتە هێندێك کـەس تـەبلیغاتیان دەکـرد، دەیانگوت ئەگەر مەشرووتەمان وەرگرت کەبابی ئەوەندە درێژە، یەك میتر دەبـێ بـۆ ئەوەی خەڵك پێیان خۆش بێ‌و بۆ مەشرووتە شەڕ بکەن. ئێسـتاش کۆمەڵـە وادەکـا. بەڵام ئێمە واقێع‌بینین‌و ئەوەی کە دەیڵێین وەك حیزبێکی سیاسی، ئـەوەش جێبـەجێ دەکەین. هەر ئەوە نیە کە ئێمە ئێسـتا بڵێـین کـە سـبەینێ هـات‌و خودموختاریمـان وەرگرت، ئیدی ئەوە جوابی خەڵك نەدەینەوە یان قەولی وامان بـە خـەڵك دابـێ ئـەو وەختە بۆمان جێبەجێ نەکرێ، حیزبی مەسئوول‌و سیاسـی کـاری وا ناکـا. کـەوابوو خودموختاری بۆ ئێمە چەند ئەسڵی گرینگی تێدایە.

زۆر جار گوتوومانە بەڵام خراپ نیـە دووپـاتی بکەینـەوە لـە پێـش هـەمووانـدا شتێکمان دەوێ ئێمە وەری بگرین کە خەڵکی کوردستان هەست بەوە بکا کە بۆ خۆی حاکمی چارەنووسی خۆیەتی. ئەوە لە هەموو شتێك گرینگترە. جا ئەوە بە چەند شـت جێبەجێ دەبـێ: یـەکێکیان ئەوەیـە کـە ئێمـە سـەڵاحییەتی دەوڵـەتی مەرکـەزی‌و سـەڵاحییەتی ئورگانـەکانی خودموختـار جـودا بکەینـەوە. چـی لـە سـەڵاحییەتی ئورگانەکانی خودموختاردا هەیە؟ چی لە سەلاحییەتی دەوڵەتی مەرکـەزی‌دا هەیـە؟ ئێمـە دەڵێـین بێجگـە لـە مەسـەلەی ئەرتـەش، مەسـەلەی پێوەندییـەکانی دەرەوە، مەسەلەی دانانی پرۆژە یان بەرنامەی درێژخایەنی ئابووری کە مەعموولەن خەرجێکی

زۆری دەوێو هەروەها سیستمی بانکیو پووڵی بێجگە لەوە نەزەرمان ئەوەیە کە ئەوی دیکە واتە هەموو سەلاحییەتەکەی دیکە بدرێ بە ئۆرگانەکانی خودموختار.

بەتایبەتی لە مەسەلەی سەلاحییەتدا، دوو شت زۆر گرینگن: یەکەم بریتییە لە راگرتنی ئەمنییەتی نێوخۆی کوردستان. مێژووی کوردەواری وای لە کورد کردوە کە ئێستا رقی لە ژاندارمەیە، رقی لە پاسدارە. دەیهەوێ بۆخۆی ئەو هەستە دەسەڵاتدارەتییەی کە لە وجوودیدا هەیە لەودا پێك بێو بۆخۆی ببێ بە پۆلیسی خۆیو ژاندارمی خۆیو کەسی دیکە ئیدی لە جێگای دیکە نەیە ببێتە ژاندارمی ئەوو زوڵمی لیَبکا، کەوابوو ئەمنییەتی نێوخۆیی کە ئێمە پێی لە سەر دادەگرین، دەبێ بەدەست ئۆرگانەکانی خودموختارەوە بێ.

دووهەم: بەرچاوترین عامیلی مەوجوودییەتی نەتەوەی کورد، وەك هەر نەتەوەیەکی دیکە زمانە. دەمانهەوێ زمانی کوردییش وەك زمانی رەسمی لە کوردستاندا بناسرێ. دیارە دەڵێین زمانی فارسییش لەگەڵ زمانی کوردیدا هەبێو لە مەدرەسەکاندا هەبێ، چونکە لە ئێراندا دەمانهەوێ لەگەڵ خەڵکی دیکەدا بین، منداڵەکانمان ئێستا دەچنە مەدرەسە بە زمانی کوردی دەخوێنین، سبەینێ بتوانن لەگەڵ میللەتەکانی دیکەشدا قسە بکەن. جا ئەگەر فارسی نەزانن ناتوانن لەگەڵ تورکێك قسە بکەن یان لەگەڵ عەرەبێك یان لەگەڵ فارسێکدا قسە بکەن. کەوابوو ئەویش پێویستە، بۆیە زمانمان پێ گرینگە. چونکە گوتم لە واقیعدا زمان بەرزترین عامیلی فەرهەنگی نەتەوەییمانە.

پاش زمانەکە دیارە مەسەلە ئەوەیە کە ئەو خودموختارییەی باسی دەکەین لە کوێ دەبێ جێبەجێ بکرێ؟ خۆ دەبێ جێگایەکی دیاری بکەین یانی خاکی کوردستانیش دیاری بکەین. ناکرێ خودموختاری هەبێ نەزانین لە کوێ "تطبیق" دەبێ. هێندێك کەس دەڵێن ئێوە دەتانەوێ سنوور بکێشن. نەخێر سنوور ناکێشین، ئوستانەکانی ئێرانیش خۆ سنووریان هەیە. بۆ خوێندنیش ئەگەر دەمانهەوێ دەرسی کوردی لە فلان جێگا بڵێین دەبێ بزانین هەتا کوێ دەرسی کوردی هەتا چ مەنتیقەیەك چ ناوچەیەکی کوردستان دەرسی کوردی دەڵێینو لە کوێ نایڵێین؟ کەوابوو دەبێ چوارچێوەی جوغرافیایی ناوچەی کوردستانیش دیاری بکرێو ئەویش بۆ ئێمە شتێکی

ئەساسیو گرینگە. ئێمە بە نەزەری خۆمان هەم لە باری مێژوویی‌یەوەو هەم لە باری عەمەلییەوە ئیمکانی هەیە بەشێك کەم یان زیاد، چوار ئوستانی ئێران بە کوردستان دەزانین: ئازەربایجانی غەربی، کوردستان، کرماشانو ئیلام. دەمانهەوێ ئەو چوار ئوستانە ببنە یەك ناوچە ناوچەی خودموختاری کوردستانو لەوێدا ئەو داخوازانەی کە هەمانە پیادە بکرێن. ئەوە چوار ئەسڵی بنەڕەتی بوون کە بۆ ئێمە لە هەموو شتێك گرینگترن.

بەلاّم لێرەدا با بگەڕێینەوە سەر چوار ئەسڵەکە یانی مەسەلەی سەلاّحییەتو دیاریکردنی سەلاّحییەتەکان، مەسەلەی ئەمنییەتی نێوخۆیی، مەسەلەی زمانو مەسەلەی جوغرافیایی. ئەگەر ئەوانەمان حەل کرد، مەسائیلی دیکە ئاسانتر حەل دەبێ. بەلاّم با بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی ئەرتەش چونکە لێرەدا مەسەلەیەکی "حساس"ە. هێندێك کەس دەڵێن باشە ئەگەر ئەرتەش لە کوردستاندا بوو هەر وەختێك کە پێی خۆش بێ دەتوانێ خودموختاریمان لێبستێنێتەوە. ئەوە واقعییەتێکە کە ئێمە بۆ پاراستنی خودموختاری دوو زامنمان هەیە. هەتا ئەو کاتە کە دێموکراسی‌یەکی ساقامگیر لە کوردستانو لە ئێراندا پێك نەهاتوە، ئەوە کە باسمان کرد ناچارین چەك هەڵبگرین، بەلاّم ئایا ئێمە کە خودموختاریمان دەوێ دەتوانین بڵێین کوردستان ئەرتەشی تێدا نەبێ. ئەگەر ئەو داوایەمان کردو ئەرتەشمان وەدەرنا مانای ئەوەیە ئیدی ئەو وەختەی خودموختاری نیە. لە خودموختاریدا لە هیچ جێگای دنیادا شتی وا نیە کە دەوڵەتی مەرکەزی ئەرتەشی نەبێ بۆ دیفاع لە سنوور. بەلاّم ئەگەر وەزیفەی ئەرتەشمان لە رێژیمێکی دێموکراتیکدا دیاری کرد، هەروەها کە هاتوە ئەرتەش حەقی دەخالەتی لە کاروباری کوردستاندا نیەو ئەرتەش نەبوو بە عامیلی سەرکوت، ئەو وەختە بوونی ئەرتەش هیچ ئیشکالی نیە. هەر وەختێك لە دەرەوە خەتەرێك پەیدا بوو بۆ "استقلال"ی ئێرانو تەواوییەتی ئەرزیی ئێران، با ئەرتەش بچێ دیفاعی لێبکا. بەلاّم ئەرتەش نابێ ببێ بە عامیلی سەرکوت لە کوردستاندا، یانی ئەوە ئەو خەتەرەی هەیە کە ببێ، بەلاّم ناشتوانین بڵێین با نەبێ. بۆ لابردنی ئەو خەتەرە ئێمە دەبێ بۆخۆمان لە فیکری خۆماندا بین کە لە حاڵەتێکی زەروورێدا بتوانین دیفاع لە خودموختاری خۆمان بکەین ئەوەش ئەوەیە کە ئێمە باسی ئەوە

دەکەین کە هێزی پێشمەرگە هەر لـە جێگـای خۆیـەتیو وەزیفەیـەکی دەبـێ، ئـەوە جێکای باسـە. ئێمـە نـەزەرمان ئـەوە بـوو وەزیفـەی هـێزی پێشـمەرگەو وەزیفـەی ژاندارمریو پۆلیس نەبێ بە یەك. ئەوە با ئۆرگانەکانی دیکـە ئـەو کـارە بکـەنو لـە خودی کوردستاندا هەڵبژێردرێن. بەلاّم هێزی پێشـمەرگە وەك هـێزێکی "ذەخـیرە"و زیاتر "داوطلب"، هەموو وەختێك ئامادە بێ کە ئەگەر خەتەرێك بوو دەسـت بداتـە چەك. هەروەها لە زۆر جێگا میلیشیایان داناوەو لە حاڵـەتی تایبـەتیدا کـەڵکی لێ وەردەگرن.

بەلاّم ئایا ئەو خودموختارییە کە باسمان کرد سەربەخۆیی ئـێران یـان تەواوییـەتی ئەرزیی ئێران لە خەتەر دەخا؟ بە نەزەری ئێمە نەك هەر لە خەتەری ناخا، بەڵکوو بـە پێچەوانەوە ئەوە زۆر بەهێزی دەکا. جا بۆیە کـە باسـی تەواوییـەتی ئـەرزیی ئـێران دەکەین باکمان نیە، چونکـە پـاش ئـەوەی کـە ئێمـە خودموختاریمـان وەرگـرت لـە تەواوییەتی ئەرزیی ئێران دیفاع دەکەین. ئەگەر لە بیرتان بێ وەختێك شـەڕی ئـێرانو عێراق دەستی پـێکرد. وەك هەمیشـە ئـەو رێکخراوانـە زۆربـەیان تووشـی لافـاوی ناسیۆناڵیستی ئێران بـوون یـان ئـەوەی پێیـان دەگـوت دژی ئیمپریالیسـتی. چـوون شەڕیشیان کرد لەگەڵ عێراقدا. حیزبی ئێمە تەنیا حیزبێك بوو کە رایگـەیاند ئێمـە حازرین شەڕ بکەینو دیفاعیش بکەین لـە مـەرزی ئـێران، لـە تەواوییـەتی ئـەرزیی ئێران، بە شەرتێك حەقی ئێمە بدرێ. حەقی خودموختاری بدرێ، ئەو وەختە میللەتی کوردیش هەست بەوە دەکا کە لە چی دیفاع دەکا، ئەگەر ئەوە نەبێ ئێمـە نایکـەین، نەشمانکردو ئێستا هەموویان پەشیماننو پەشیمان بوونەتـەوە. ئێمـە پەشـیمان نـین، چەنکە نەمانکردوە ئەگەر لە بیرتان بێ بەیاننامـەیان دەرکـرد کـە شـەهیدیان داوە، ئیفتیخاری زۆریان بەوە دەکرد. ئەوانە موجاهیدین، چریکی فیدایـیو حـیزبی تـوودە بوون. ئێمە گوتمان حازرین لە ئێرانێك دیفاع بکەین کە حەقی میللەتی کـوردی تێـدا دابین بووبێ، بەلاّم حازر نین لە حاکمییـەتی ئاخوندەکـان دیفـاع بکـەین، دیفاعمـان نەکرد. باشە مەسەلە ئەوەیە کە ئێمە لە تەواوییەتی ئـەرزیی ئـێران دیفـاع بکـەین، بەڵێ زۆر باشیش دیفاعی لێدەکەین لەو سـەربەخۆیییە واقعییـەی ئـێران، حـازرین

دیفاع بکەین. ئەو سەربەخۆیی‌یە کە خودموختاریشی تیّدا سەقامگیر بـووە، حـەقی ئیّمەی تیّدا دابین کراوە. ئەو وەختە دەیکەین‌و بە هەموو دڵەوە دەیکەین.

کەوابوو ئیّمە ئەگەر لەگەڵ ئەوانــە کـە شووینیســتن‌و موخـالیفی خودموختـارین قسەمان ئەوەیە کە ئەگەر ئیّوە حەقی ئەو میللەتانەو حەقی میللەتی زۆرلیّکراو بدەن لە واقیّعدا رایان دەکیّشن بەرەو مەرکەز، بەرەو ئەوە کە لە ئیّراندا بمیّننــەوە چونکـە یەك شتی تایبەتیش لە نیّو گەلانی ئیّراندا هەیە. ئەوەمان لە بیر نەچیّ هەموویان تا رادەیەك وەك کورد وان. یانی چی؟ یانی کورد تــەنیا لــە ئـیّراندا نیــە لــە تورکیــەو عیّراقیش‌دا هەیە. بەلووچ تەنیا لە ئیّران نیە لە پاکستانیش هەیەو لە ئەفغانستانیش هەیە. ئازەربایجانییش تــەنیا لــە ئـیّراندا نیــە، لــە یەکیــەتیی شــوورەوییش هەیــە. تورکەمەن تەنیا لە ئیّراندا نیە، لە شوورەوییش هەیە. عەرەب تەنیا لە ئیّران نیە، لە عیّراقیش هەیە. یانی مەبەستم ئەوەیە کە ئەو قووەتی راکیّشانە (جاذبە)یە لە تــاران پیّك نەیە ئیّستا کە نەتەوە زۆرلیّکراوەکان وریا بوونەوە، نەتیجــەی ئــەوە دەبــیّ کــە عەکسی دەرچوون لە مەرکەز زیاتر دەبیّ، ئەتۆ حەقەکەی نەدەیــەی. هــەر داوا بکــا. هەر شەڕ بکاو داوای خودموختاری بکا لە چوارچیّوەی ئیّراندا رۆژیّك ئــەویش دەڵــیّ هەر خودموختاریشم ناویّ (اصلا") جودا دەبمەوە، خوداحافیز. یانی هەرچی شــەڕەکە دریّژتر بیّ‌و داوای خودموختاری کەمتر قبووڵ بکریّ، نەتیجەکەی ئەوە دەبــیّ ئەگــەر رۆژیّك قودرەتیان هەبیّ جیا دەبنەوە. کوردیش بۆ ویّنە ئەوەی نــەکا بــەلووچ ئــەوەی دەکا. فەرز کەین من ئیشکالاتی خۆمانم بــاس کــردو ئیمکــانی هەیــە بــەلووچ ئــەو ئیشکالاتەی نەبیّ بە ئەندازەی ئیّمە، ئەو یەك دوو حوسنی هەیە نیسبەت بــە ئیّمــە، بۆ ویّنە دەریای هەیە ئەوە یەکجار زۆر موهیمە. بەلاّم کارم بەوە نیە مەبەستم ئەوەیە کە ئەو کەسانە کە بە جیددی‌و بەڕاستی لایەنگری "ســـەربەخۆیی"ی ئـیّرانن، دەبــیّ لایەنگری خودموختاری بن. ئەگەر بەڕاستی دەیانهەویّ ئەو ســەربەخۆیی‌یە بپــاریّزن. چونکە ئیّستا ئیدی وەزع وەك جاران نەماوەو مەسەلەی میللی لــە دنیــای ئــەمڕۆدا لــەواقیّعدا گرنگــترین مەســەلەیە، ئــاڵۆزترین مەســەلەیە لەگــەڵ ئــەوە لــە ولاّتــانی سوسیالیستی نیسبەت بە ولاّتانی سەرمایەداری حەل بووە، لەویّش هــەر شــویّنەواری ماوە لە ولاّتانی سەرمایەداری کە هەتا ئیّستا باش نەبووە.

لە وڵاتێکی وەك بلژیكدا من كە سەفەرم كرد بۆ بلژیك بە تەواوی بــۆم دەركـەوت كە ئەو ئیختلافی میللیـیە رۆژبەرۆژ لەویَ زیاتر دەبیَ. ئەوانەی بە زمــانی هولـەندی قسە دەكەنو ئەوانەی كە بە زمانی فەرانسەیی قسە دەكــەن، ئیختلافیـان رۆژبــەرۆژ زیاتر دەبیَو بە هەموو شتێك بە نووسینو بە رێپێــوان، بــە هــەڵبژاردن، بــە گۆڕینــی قانوونی ئەساسیو زۆر شتی دیكەش، خەباتی بۆ دەكریَ. مەبەستم ئەوەیە كە ئێســتا وەزعـەكە بەرەو ئەوە دەڕوا. لە ئــێرانی دوارِۆژدا پــاش رووخــانی رێژیمــی خومــەینی، هێزەكان دیارە زیاتر ئازاد دەبنو ئەوەی ئێمە لە كوردستاندا پــاش رووخــانی رێژیمــی پاشایەتی هەمانبوو، "تقریبا" وەزعێكی ئاوا ئیمكانی هەیە پاش رووخــانی رێژیمــی خومەینی لە بەلووچستان پێك بیَ، چونكە لەویَ ئاگاهی بەرەبــەرە دەچێتــە ســەریَ، رێكخراوی واشیان بەرەبەرە بۆ پــەیدا بــووە، لــە نەتیجــەدا ئازەربایجـانیش ئیمكـانی هەیە، عەرەبستانیش هەروا دەبیَ.

نەتیجە ئەوە دەبیَ ئەگەر حەقی میللەتان نەدریَ، ئــەو وەختــە دیــارە مەســەلەی (گریز از مركز) دێتە پێش. یانی ئەگەر دەتهەویَ "ســەربەخۆیی"ی ئــێران بپــارێزی، دەبیَ حەقیان بدەیتیَ. ئەگەر بەڕاســتی حــەقیان نەدەیــەی، "ســەربەخۆیی"ی ئــێران وەخەتەر دەكەویَ. تەواوییەتی ئەرزیی ئێران ئەو وەختە وەخەتەر دەكەویَ. ئەو وەختە ئەگەر خودموختاری بــە كــورد بــدریَ ئــەوە شــێوە بۆچوونــی ئێمەیــەو بۆچوونێكــی دروســتە، بەتایبــەتی بــۆ دوارِۆژ. كــەوابوو ئێمــە كــە لــە چوارچێــوەی ئــێراندا خودموختاریمان دەویَ، ئەوە راست موخالیفی جیابوونەوەیــە، لــە پاشــان ئێمــە رۆژی ئەوەڵ گوتمان، ئێمە ئەوەمان تەنانەت لە شووراداو لە جێگای دیكــەدا راگــەیاند كــە كورد مافی جیابوونەوەی هەیە، ئەوەش مافی خۆیەتی. بەڵام ئێمــە نامانهــەویَ لــەو مافە كەڵك وەربگرین، تاوان نیە ئێمە بڵێین ئەو مافــەمان هەیــە، بــەڵام كــە نــاڵێین مانای ئەوە نیە كە دەترسێین، نە مانای ئەوەیە كە بەو بۆچوونانە كــە پێشــتر باســمان كردن گەیشتووینەتە ئەو نەتیجەیە كە لە ئێراندا بمێنینەوە.

مانەوە لە ئێراندا چ قازانجێكی دیكەی هەیــە؟ قــازانجی دیكەشــی دیــارە هەیــە. ئەوەڵەن با ئەوە بڵێین ئێمە كوردی ئێران ماوەیەكە لەگەڵ كــوردی عــێراق مەســەلەن هاتووچۆمان هەیە، بەرخوردمان بووە، ئێمە لەمێژە بــەو راســتییە گەیشــتووین كــە

لەگەڵ ئەوەی ئەوان کوردنو ئێمەش کوردین، بەلاّم هێندێکیش فەرقمان هەیەو ئەوەش شتێکی زۆر سروشتییە، ئێمە ساڵەهای ساڵە لە ئێراندا دەژین فەرهەنگی ئێرانی شوێنی لە سەرمان داناوەو لە چوارچێوەی ئێراندا دەژین. ئەوان ساڵەهای ساڵە کوردستانی عێراقدا دەژینو فەرهەنگی عەرەبی شوێنەواری لە سەر داناون. ئەوە شتێکی سروشتییەو ئەو جیاوازییەش بەرچاوە.

ئێمە شت دەنووسین لە کوردستانی عێراق دەیخوێنینەوە. لە کوردستانی عێراق شت دەنووسن لە ئێران دەکەوێتە دەستمان. شتی ئەوان دەخوێنینەوە، ئەوەش هەیە. بەلاّم یەك واقعییەت هەیە کە ئەگەر گوتمان زمان هۆیەکی ئەساسییە ئەوە شتێکە کە نابێ لە نەزەری نەگرین. بێجگە لەوە کە دوو لەهجەمان هەیە، دوو لەهجەکە ئەوە نەڵێین لێك حاڵی نابین. ئیمکانی هەیە پاش مانگێك دوو مانگ بەرەبەرە لێك حاڵی ببین. لەهجەی شیمالیو لەهجەی جنووبی. بێجگە لەوە ئێمە لە واقیعدا بە چوار ئەلفو بێی زمانی کوردی دەنووسین، ئەلفو بێیەکی عەرەبی هەیە ئێمەو کوردی عێراق پێی دەنووسین، ئەویش هەرکەس رێنووسێکی بۆخۆی داناوە چونکە ئاکادمیمان نیە کە دایبنێ. یەك دەبینی (نوو) بە دوو واو دەنووسێ، یەك شتی لە سەر دادەنێو زۆر شتی دیکە. بۆخۆتان دەزانن لە پاشان لە تورکیە بە لاتین دەنووسن. بەلاّم هی تورکیە لەگەڵ لاتینێکی دیکە کە لە بەیروتو ئەوانەی "جەلادەت بەدرخان" دایانناوە جیاوازی هەیە، ئەویش لە جێگای دیکە پێی دەنووسن. بێجگە لەوە لە شوورەوی بە شتێکی تێکەلاّو لە سیریل یانی خەتی رووسیو لاتینی پێکەوە دەنووسن، چوار ئەلفو بێی هەیە.

لە واقیعدا بێجگە لە مەسەلەی فەرهەنگی مەسەلەی ئابوورییش هەیە. ئێستا ئێران بەرەبەرە بووە بە وڵاتێکی سەرمایەداری. ئابووریی کوردستانی ئیچران بۆتە بەشێك لە ئابووریی ئێران. ئابووریی کوردستانی عێراق لەگەڵ هەموو ئەو قاچاخچییەی کە هەیە ئێستا زیاتریش بووە بەشێکە لە ئابووریی عێراق. خۆ مەسەلەکە بەو ئاسانییە نیە. نموونەتان بۆ بێنمەوە، لەهستان چەندین دەساڵە بووەتە وڵاتێکی یەکپارچەو یەکگرتوو. بەلاّم لەهستان وەزعی ئێمەی هەبووە. لەهستان بەشێك بوو لە ئۆتریش. بەشێکی لە ئاڵمانو بەشێکی لە رووسیە ئێستا کە لەهستان

پاش ئەوەی کە چل ساڵە سوسیالیزم لەوێ دامەزراوە، بەشـی ئاڵمـانی بەشـی هـەرە پێشکەوتووی ئابووریو فەرهەنگیی لەهستانە. بەشی رووسیە چونکە ئەو وەختـە زۆر پاشکەوتوو بووە، بەشی هەرە پاشکەوتووی لەهستانە. بەشی ئۆتریش لـە نێوەڕاسـت دایەو ئەمن یەك ساڵ لە لەهستان بوومو بەشەکانیم دیوە. پرۆفیسورێکی لەهسـتانی دەیگوت: ئێمە یەك لەهستانمان نیـە، چـوار لەهسـتانمان هەیـە. بۆخـۆی دەیگـوت. مەبەستم ئەوەیە کە مەسەلەکە وا ئاسان نیـە کوردسـتانی ئـێرانو تورکیـەو عـێراق پێکەوە ئاوا دابنێین پینەی بکەینو بڵێین بوو بە کوردستانو بە ئابوورییـەکی واحیـد. ئەو مەسەلەیە بەو ئاسانییەش نیە. لـە حـاڵێکدا ئەگـەر لـە ئـێران بمێنینـەوە بـەو داهاتەی کە ئێران هەیەتیو بەو ئیمکاناتە ئێمە دەتوانین ئیستفادە بکـەین بـۆ ئـەوە بەرەبەرە وەزعی کوردستانی خودموختار باشتر بکەین. داوا بکـەین کـە کوردسـتانی خودموختار زیاتریش بە نیسبەتی جێگای دیکە داهاتی بدرێتـێ، چونکـە لـە بـاری ئابوورییـەوە پاشـکەوتووترینە. دیسـان ئێمـە وەك ئینسـانێکی واقیعبـین بـۆ بەلووچستانیش ئـەوە داوا دەکـەین. وای دابنێـین خودموختـاری وەرگـیراوە. ئەگـەر بوودجە بۆ هەموو بەشەکانی ئێران دیاری بکرێ، مەسەلەن ئەگەر بۆ هەر نەفەرێك لە ئێران ٥٥٠ دۆلار دابنێینو بۆ بەلووچستان ٦٠٠ دۆلار دابنێـینو بـۆ کوردسـتان ٥٠٠ دۆلار دابنێین. با ٥٥٠ دابنێین، بۆ بڕێك زیاتر لە حەدی نێوەنجی، بۆ ئەوەی کە هەموو بەشەکانی ئێران بەرەبەرە لە یەك ئاستدا بچنـە پێـش. بـۆ شـیمال مەسـەلەن ٤٥٠ دابنێین کە وەزعی باشترەو بۆ ئەوەی کە لە باری ئابوورییەوە وەزعەکە بەرەبـەرە وای لێ بکەین کە هەموو بەشەکانی ئێران لە یەك سەتحدا بـن. چونکـە ئەگـەر وا نـەبێ دیارە کوردستان رۆژبەرۆژ پاشکەوتووتر دەبێو تارانو شیمالی ئێرانو جێگـای دیکـە رۆژبەرۆژ زیاتر پێش دەکەون.

یەکێك لە داخوازەکانمـان لـە مەسـەلەی خودموختـاریدا مەسـەلەی ئابوورییـە. کەوابوو ئێمە لە باری ئابووریشەوە ئەگەر لە داخیلی ئێراندا بمێنینـەوە پێمـان وایـە قازانج دەکەین. قازانج دەکەین چونکە لە وڵاتیکی چەندین میلیۆن کەسیدا ئـابووری زۆر باشتر دەتوانێ بچێتە پێش. کەوابوو لە ئێرانێکی چل میلیۆن کەسیدا زۆر باشـتر دەتوانین لە باری ئابوورییەوە خۆمان پێش بخەین هەتا لە کوردستانێکی شەش حەوت

میلیۆنیدا. ئەوانە هەموو هۆی ئەوەن کە ئێمە خودموختاری بە شوعاری ئەساسیی خۆمان دەزانینو تەنانەت دەڵێین دروشمی ئیستراتیژیکەو ئێمە ناڵێین کە شوعاری ئێستامانە. مەسەلەن جارجار لە زمانی هێندێ بەرپرسی حیزبییەوە دەردەچێ کە لەگەڵ ئێرانییەکان تووشی کێشەمان دەکاو دەڵێ جارێ خودموختاریمان دەوێ! جارێ نیەو، خودموختاریمان دەوێ.

بەڵام باشترە بزانین تەکلیفی ئێمە لەگەڵ کوردەکانی عێراقو تورکیە چی لێدێ؟ باشە ئەوان کورد نین؟ ئێمە کورد نین؟ یەك مەسەلە کە پێوەندی بە خەباتەکەمانەوە هەیە ئەوەیە کە ئێمە لایەنگری خەباتی رزگاریخوازانەی هەموو گەلانی زۆرلێکراوین. دیارە حەقی موسەلەمیشە نەك لە جووڵانەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد لە عێراقو تورکیەو سووریە، بەڵکوو لە هەموو جووڵانەوەیەکی رزگاریخوازانە پشتیوانی بکەینو دەشیکەین. ئەوە یەکێك لەو شتانەیە کە "تقریبا" دوو ساڵ پێش، بوو بە مەسەلەیەك لە بەینی ئێمەو سازمانی موجاهیدینی خەڵکدا. ئەو وەختە کە یەکیەتیی نیشتمانی هات بۆ یارمەتیمان لە ناوچەی سەردەشت کە مەسەلەی رێگای پیرانشار ـ سەردەشت لە گۆڕێدا بوو، دوژمن هێرشی هێنابوو ئەو وەختە ئێمە دەمانـنووسی هێزی پشتیوان، موجاهیدین دەیاننووسی ئێستا ئێوە پێیان دەڵێن هێزی پشتیوان، سبەینێ ئەو هێزە پشتیوانە دەبێتە چی؟ ئەوە "تجزیه طلبی"یە. ئێمە زۆر سادە جوابمان دانەوە کە چۆن ئێوە بە خۆتان ئیجازە دەدەن لە جووڵانەوەکان لە نیکاراگوئەو لە ئیلسالوادورو نامیبیاو لە هەر جێگایەکی دیکە پشتیوانی بکەن. ئێمەش دەیکەین، دەبێ بۆ ئێمە حەقمان نەبێ لە کوردەکانی عێراق پشتیوانی بکەینو ئەوان حەقیان نەبێ لە ئێمە پشتیوانی بکەن. دیارە بەرەبەرە وا دیار بوو حاڵی بوون کە داخوازەکەیان بێجێیەو وازیان لێهێنا. هەر ئەوان بۆخۆیان عەکسی ئەوەیان داوا کرد کە ئێمە ببین بە نێوبژیوان، لەگەڵ خودی ئەو هێزە پشتیوانە پێوەندی بەرقەرار بکەن.

مەبەستم ئەوەیە کە ئەوە ئەرکمانە ئەوە هیچ مانای جیاوازیخوازی نیە. ئەگەر ئێمە پشتیوانی لە کوردی تورکیە بکەین. ئەمن پشتیوانی لە ئیلسالوادور دەکەم کە هەزاران کیلومیتر لە من دوورترە. بۆ ناتوانم، بۆ حەقم نیە پشتیوانی لە کوردی

تورکیە بکەم یان ئەو پشتیوانی لە من بکا؟ ئەوە بە نەزەری من شتێکی زۆر ئاساییە. ئەگەر توانیمان خودموختارییەکی باش وەرگرین، بێگومان ئەوە دەبێتە نموونەیەك بۆ کوردستانی عێراقو بۆ کوردستانی تورکیەش، ئەوە شاراوە نیە خۆ لە کوردستانی عێراق دەوڵەتی تورکیە راستەوخۆ دەخاڵەتی کرد. بەلاّم ئێمە پێمان وایە ئەگەر سبەینێ رژێمی خومەینی رووخاو خودموختاریمان وەرگرت دەوڵەتی تورکیە ناتوانێ هیچ بکا. تورکیە ناتوانێ دەوڵەتی ئێران وادار بکاو بیخاتە ژێر فشار کە خودموختاری رەت بکاتەوە. تازە رژێمی خومەینی رووخا خۆ ئێمە راناوەستین داوای خودموختاری بکەین، خودموختارییەکە سەقامگیر دەکەین. ئیعلانی دەکەین ناچین نامەی سەرئاواڵە بنووسین وەك ئەو وەختەی بۆ خومەینیمان نووسی ئەو جار بۆ یەکێکی دیکە بنووسین، تازە بۆ کەس نامە نانووسین.

کەوابوو ئێمە لە ئێراندا ئەگەر خودموختاریمان وەرگرت، دەبێتە نموونەیەك بۆ عێراق. مەسەلەن ئێمە پێمان خۆش بوو کە لە عێراقدا ئێستا برادەرانی یەکیەتیی نیشتمانی رێككەوتبان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق. ئەگەر رێككەوتبان ئەوەی کە ئەوان دەستیان دەکەوت لە ئێستای ئێمە زیاتر بوو. ئێمە هیچمان دەست نەکەوتوە. بۆخۆمان هەین دەنا حکوومەت موافیقەتی بۆ هیچ شتێك نەکردوە، دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی هەر هیچ قبووڵ ناکا. خودموختاری هەر لە بناغەوە قبووڵ ناکا. باشە ئەوان دەهاتنە ئێرە یانی هێندێك وەسەر دەکەوتن، ئەگەر کورد حەقەکەی وەرگرتبایە ئێمە پشتی جەبهەیەکی باشمان هەبوو. زۆر باشتر دەبووین بە پشتیوانیی ئەوان ئێمە دەمانتوانی زووتر رژێمی خومەینی برووخێنین. کە رژێمی خومەینیمان رووخاندبا، ئێمە لێرە ئەو خودموختارییەی وەرمان دەگرت زۆر زیاتر دەبوو لەوەی کە ئێستا ئەوان وەریان گرتوە، بەلاّم ئەوانیش دەبوا بەرەبەرە زیاتریان بدەنێ.

تەنانەت ئەو تەرحەی کە "شورای ملی مقاومت" پەسندی کردوە، ئەوە بەرنامەی ئێمە نیە دەنگمان پێ نەداوە پاش کێشەیەکی زۆر بە پەسندیان گەیاندوە، بەرنامەی ئێمە زیاتر لەوەیە. بەلاّم برادەرانی یەکیەتیی نیشتمانی زۆر بەوە قانیع بوون کە حکوومەتی عێراق تەرحێکی ئاوا پەسند بکا. هەر پێشنیاریشیان ئەوە بوو کە ئێرانەکەیان بە عێراق بگۆڕنەوەو تەواو "توافق" بکەن. کەوابوو ئەو تەرحە دیارە هی

حکوومەت نیە. "شورای ملی مقاومت" لە سەر کار نیە. سبەینێ لە سەر کار بێ مومکینە ئەوە قبوولْ نەکا. بەلاّم ئەو تەرحە زیاتر بوو لەوەی کە ئەوان ئێستا پاش چەندین سالْ خەبات دەستیان کەوت. ئەگەر ئێمە بتوانین شتی خۆمان، هۆویەتی میللی خۆمان لە ئێران، لە عێراقو لە تورکیە، بسەلمێنین ئەو وەختە دەتوانین دیارە رابیتەشمان پێکەوە دەبێ.

ئیدی نەسلْی داهاتوو بۆخۆی بڕیار دەدا ئایا وەك ئێمە خودموختاری دەوێ یان نا؟ ئەسلْەن مومکینە لە نەسلْی داهاتوودا رۆژهەلاّتی نێوەڕاست بۆخۆی ببێتە حکوومەتێکی فێدرالْ. کوردیش بۆخۆی ببێتە حکوومەتێکی فێدرالْ لە بەینی دەولْەتاندا. ئەوە روون نیە چی لێدێ. بەلاّم ئەو وەختە پاش پەسندی هۆویەتی میللیمان، ئەوە ئەگەر کورد بیهەوێ یەك بگرێتەوە بۆی زۆر ئاسانتر دەبێ. با ئەوەش بلْێم چونکە هەر ولاّتێك شەرایەتی ئابووری، سیاسیو کۆمەلاّیەتیی تایبەت بە خۆی هەیە. ئیران لەگەلْ عێراق، عێراق لەگەلْ تورکیە، ئێران لەگەلْ تورکیەو سووریە. هەر بۆیە شێوەی جۆراوجۆری خەباتیش هەیە.

بۆ وێنە ئێمە لەگەلْ برایانی کوردی تورکیە قسەمان کرد، پێیان گوتین لەو جەریانەشدا چوار جار قسەم لەگەلْ کردن پێمگوتن زۆر وریا بن خۆتان تووشی شەڕی چەکدارانە مەکەن. چونکە حکوومەتی تورکیە خودا خودایەتی. چونکە ئەوەلْەن جوولاّنەوەکە زۆر زەعیفە لە هەر جێگایەك هەرچی بکا هەر تێکدەشکێ. حکوومەتی تورکیەش ئەوە دەکا بە بیانوو (مستمسك)، بۆ ئەوەی ئاخرین شوێنەواری دێموکراسی لەبەین بەرێ. چونکە تورکیە فەرقی هەیە لەو بارەوە لەگەلْ ئێران. چونکە تورکیە ئەندامی ناتۆیە، پارلمانی ئۆرووپا فشاری بۆ دێنێ کە هەر نەبێ لانیکەمی دێموکراسی رەعایەت بکا. تورکیە کوردی تێدا هەیە، بەلاّم هەر "اعتراف" ناکا هەر دەلْێ کورد نیە. ئەوە لە فەرهەنگی عیلمیی تورکیەدا نووسراوە. لە پاشان نووسیویەتی ئەو تورکانە کە لە سەرشاخی دەژینو زمانی زگماکی تورکییان لە بیر چۆتەوە. یانی کوردی تورکیە ئاوان. چونکە چوونە شاخیو زمانی تورکییان لە بیر چۆتەوەو ئێستا بوون بە کوردو زمانێك کە کەس لێیان حالْی نابێ. مەبەستم ئەوەیە کە شێوەی خەباتیش فەرق دەکا. وانیە چونکە لە ئێرانو عێراق خەباتی چەکدارانە

هەیە بڵێین لە تورکیەو سووریەش هەر ئەو شێوە خەباتە بکرێ. لە پاشان لە سووریە شتێکی دیکەش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو بەشەی لە کوردستان لە راستیدا شاخی یەکجار زۆر کەمن، هەمووی دەشتە. بۆخۆتان دەزانن دەشتایی ئیمکانی بەرگری کردنو مەقاومەتی نیە. ئەوەیە کە ئێمە لەو شاخو داخە داین یانی ئەگەر هەموو دەشت بایە ئێمەش نەماندەتوانی خۆمان رابگرین، کەوابوو هەلومەرج لە هەریەك لەو ولاتانەدا فەرق دەکا، وەك یەك نیە لە هەموو بارێکەوە لە بەر ئەوەیە کە شێوەی مومکینی خەباتەکەش جیاوازیی هەیە. مەسەلەن لە تورکیە شێوەی خەباتی پارلمانی بێ باشترە. یانی ئەگەر کورد بتوانێ حیزبێکی باش بۆخۆی دابنێو لە هەڵبژاردنێك کە تا رادەیەك ئازادە بەشداری بکاو نوێنەری خۆی هەبێ کە جاران مەترەحیان دەکرد لە پارلماندا باس بکاو مەسەلەکە مەترەح بکاو خەڵك پشتیوانی لێبکا باشترە. چونکە ولاتێکی ئۆرووپایییەو بەشێکە لە پارلمانی ئۆرووپا. هەتا ئێستا چەندین بەرنامە لە سەر کورد لە پارلمانی ئۆرووپا پەسند کراوە. بەلام ئیدی جۆری خەباتەکە بەستراوەتەوە بەوە کە خودی کوردی تورکیە تا چ رادەیەك دەتوانن یەك بگرن، جوولانەوەیەکی بەهێز پێك بێنن. ئێمە ئەگەر یەك کۆمەڵەمان هەیە، بەداخەوە ئەوان ١٥ ـ ١٠ یەکیان هەیە. یانی ئەوەی کە من دیومە هەتا ئێستاش شتی چکۆڵە چکۆڵە هەن لەوێ، هەمووشیان توندو تیژن. لە"**P.K.K**"وە بگرە هەتا ئالای رزگاری، هیچیان واقیعبینانە مەسەلەکە مەترەح ناکەن. هەروا بۆخۆتان دەزانن بەو هەمووە کە دیوتانە غەیرە واقیعبینانە مەترەحی دەکەن کە دیارە ئەوە بۆخۆی ئیشکالێك پێكدێنێ. یەکێك لە کۆسپەکانی هەرە گەورە خودی تورکیەیە. دیارە کۆسپیشە بۆ هەموو میللەتی کورد.

لە بارێکی دیکەشەوە کە ئاخرین شتە پێتان دەڵێم، ئەوەیە کە ئەگەر رۆژێك قەرار بێ مەسەلەن شوعاری سەربەخۆییمان هەبێ یەکێك لە شتەکان ئەوەیە کە لە باری نێونەتەوەییشەوە دەبێ وەزعەکە ئامادە بکرێ. ئێمە لەو بارەوە زۆر لە پاشین. زۆریش پێشترین لە چەند ساڵ لەمەوبەر. یانی چەند ساڵ مەسەلەن ٢٥ـ٢٠ ساڵ لەوە پێش ئەتۆ لە هەر جێگایەك باسی کوردت بکردایە دەبوو نەخشەیەکیش دەربێنیو بۆیان بکێشییەوەو بڵێی ئەوە ئێرانەو ئەوە تورکیەیەو ئەوە عێراقەو ئەوە ئێمەش

لێرەین. ئێستا ئەوە نیە کە لە هێندێ وڵاتدا بە تایبەتی لە ئۆرووپادا زۆر کەس دەزانن کورد چیەو چی دەوێ. بەڵام ئەوە جارێ بە تەواوی ئەو جۆرە کە دەڵێن ئەنتێرناسیۆناڵیزە نەبووە. یانی نەبۆتە مەسەلەیەکی نێونەتەوەیی. هێندێک حکوومەت لە مەسەلەکە شتێك دەزانن. هێندێك رۆژنامەنیگار نووسیویانەو تەلەفزیۆنەکان هێندێك شت نیشان دەدەن. بەڵام ئەوە زۆر کەمە، دەبێ زیاتر بچێتە نێو خەڵك بە تایبەتی بیرورای گشتی لە وڵاتەکانی رۆژئاوا لە ئۆرووپای رۆژئاواو لە ئەمریکای شیمالی زۆر گرینگە.

ئەگەر لە بیرتان بێ لە مەسەلەی "ویتنام"دا، بیرورای گشتیی ئەمریکا نەخشێکی یەکجار گەورەی هەبوو، هی ئۆرووپای رۆژئاواش هەروا. بەڵام هی ئێمە جارێ وای لێنەهاتوە، خەباتێکی برێك درێژتری دەوێ، دەبێ ئەو خەباتە لە ژوورەوە هەیە لە دەرەوە "منعکس" بکرێتەوە. بۆ ئەوەی زەمینە لەو بارەشەوە ئامادە بکرێ، هەتا بۆ مەسەلەی خودموختارییش کە ئێمە دەڵێین خودموختاریمان دەوێ، دەبینین کە رەنگدانەوەی نیە. نموونەتان بۆ بێنمەوە: رۆژ نیە دەنگی ئەمریکا باسی ئەفغانستان نەکا کە چ دەکەنو موجاهیدین چیان کردوەو فلانو... ئەوانە چونکە خەباتەکەیان دژی شوورەوییە. بەڵام باسی ئێمە ناکا لە حاڵێکدا ئەو شەڕە ئێمە دەیکەین قابیلی موقایسە نیە لەگەڵ شەڕێك کە موجاهیدینی ئەفغانستان دەیکەن.

ئێمە فیلمێکمان هێنابوو نیشانمان دا کە وەزعیان چۆنە لە هەرە باشترین ئەفغانییەکان مەسعوودی فەرماندەیە، فیلمی ئەومان هێناوە کە فەرانسەییەکان هەڵیانگرتوە، نیشانمان داوە کە وەزعیان چۆنە. ئێمە مەبەستمان لەو فیلمە ئەوەیە کە شێوەی خەباتەکەمان موقایسە بکەین بزانین کە ئەوان ئەو هەموو یارمەتییەشیان دەدرێ، بە میلیۆن دۆلار بۆیان دەچێ، پاکستانیان هەیە، ئێرانیان هەیەو ئەمریکایان هەیەو بیرورای گشتیی لە وڵاتانی رۆژئاوا بە قازانجی وان تەحریك بووە. بزانن وەزعمان چیە؟ موقایسەی بکەن لەگەڵ وەزعی خۆتان بزانن ئێمە وەزعمان چیەو ئەوان وەزعیان چۆنە؟ ئێمە چەند رێكو پێكو تەیارین بە نیسبەت ئەوان. دیارە بۆخۆمان نارازین، بەڵام نیسبەت بەوان چۆنین، ئەو فیلمە هی بەشێکە کە لە هەمووان تەیارترە. لە هەمووان تەیارتر مەسعوودە. لە هەمووان مەشهوورترە، لە هەمووان بە

"اصطلاح" لە پێشترە. موقایسەی بکەن. بەڵام هەموو رۆژێ ئەفغانی وای کرد، فلان وای کرد، ئێمە شتێکی زۆر گەورە نەبێ باسیشمان ناکەن.

چونکە مەسڵەحەت وا دەخوازێ. ئەوەی کە عەرزم کردن لێرەدا مەسڵەحەت وا دەخوازێ کە باسی بکا. هی ئێمە مەسلەحەت "ایجاب" ناکا، بەڵام ئەگەر بتوانین بیروڕای گشتی حاڵی بکەین لە ئەمریکا لە وڵاتانی رۆژئاوایی لە ئۆرووپای رۆژئاوا، ئەوە تەنانەت شوێن لە سەر وڵاتانی سوسیالیستی دادەنێ. بیروڕای گشتی دەبێ مەسەلەی کورد بناسێ. ئەوەش هەم بە درێژەپێدانی خەباتەکەمان دەبێ‌و هەم بە "منعکس" کردنی ئەو خەباتە بە شێوەیەکی دروست‌و ئوسووڵی لە دەرەوە. ئەو وەختە دیارە نەتیجەی باشتر دەبێ. یانی ئەگەر رۆژێک مەسەلەکە هاتە مەیدان کەسێك هەیە بزانێ، بابە کوردیش بۆ خۆی میللەتێکە حەقی هەیە‌و زۆری لێکراوە. ئەوە جارێ بە تەواوی لە دەرەوە نەناسراوە‌و بە تەواوی نەچۆتە نێو بیروڕای گشتیی جیهانییەوە بە شێوەیەکی پان‌و بەرین‌و بەو شێوەیە کە پێویستە نەناسراوین.

## ژێدەر:

* ئەم بەشە مەتنی باسێك بوو کە رێبەری شەهید دوکتور قاسملوو، لە ساڵی ١٣٦٤ لە سەر مەسەلەی مافی دیاریکردنی چارەنووس لە شێوەی خودموختاری‌دا پێشکەشی کردوە.

# ڕەوتی ئاشتیو دێموكراتیزاسیۆن

لە ڕاپۆرتی كومیتەی ناوەندی بۆ كۆنگرەی هەشتەم باسی ٢ پرۆسەی جیهانی كراوە: یەكەمیان پرۆسەی ئاشتی یا ڕەوتی ئاشتی‌یە. دووهەمیان پرۆسەی دێموكراتیزاسیون یا دێموكراتیزەكردنە. ئەم یەك ساڵو چەند مانگە نیشانی دا كە ئەو لێكدانەوەیەی ئێمە ڕاستو دروست بووە. بناغەی ئەم پرۆسەیە بە ناوی پرۆسەی ئاشتی، ئەو ئاڵوگۆڕەیە كە لە ڕێبەرایەتیی حیزبی كومۆنیستی سۆڤیەتی‌دا هاتۆتە پێش. لە واقیعدا لە چوار ساڵ لەوە پێشەوە كە میخائیل گۆرباچۆف بوو بە سكرتێری حیزبی كومۆنیستی یەكیەتیی سۆڤیەتی، ئەو پرۆسەیە دەستی پێ‌كردووەو ڕۆژ بە ڕۆژیش خێراتر دەچێتە پێش. بزانین تەئسیری پرۆسەی ئاشتی لە دنیادا چ بووە؟ یەكەم تەئسیری ئەوە بووە كە ئەو شتەی جاران پێیان دەگوت ركەبەری لە بەینی دوو دەوڵەتی گەورەی جیهان وەك ئەمریكاو یەكیەتیی سۆڤیەتی گۆڕاوە. لە رابردوودا لە هەموو ناوچەكانی دنیادا لە هەموو گیروگرفتە سیاسی‌یەكانی جیهاندا هەركەس لەگەڵ یەكیەتیی سۆڤیەتی با، دژی ئەمریكا دەبوو، هەركەس لەگەڵ ئەمریكا با، دژی یەكیەتیی سۆڤیەتی بوو. ئەو دوو دەوڵەتە سیاسەتی خۆیان لە سەر ئەوە دادەنا كە كێ دەگەڵ كێ‌یە؟ ئەگەر یەكێك لەگەڵ ئەمریكا با، ئەمریكا پشتیوانی لێ دەكرد، ئەگەر دژی ئەمریكا با، یەكیەتیی سۆڤیەت پشتیوانی لێ دەكرد.

لە ڕاستی‌دا لە هەموو بارێكەوە دنیا بوو بە دوو بەش، نەك لەبەر ئەوە ولاّتانی سۆسیالیستی بەشێك بوون، ولاّتانی سەرمایەداری گەورەو ئێمپریالیستییش بەشێكی دیكە، بەڵكوو ئەوەی لە نێوەڕاستیشدا بوو دەبوایە تەكلیفی خۆی روون بكاتەوە.

هێندێ ولاّت ناوی ڕەسمیشیان هەر ئەوە بوو، ولاّتانی جیهانی سێهەم یا ولاّتی بێلایەن، ئەو ولاّتانەش بەکردەوە لە ڕووی ناچاری لە سیاسەتدا پشتیوانییان لە یەکێك لەو دوو دەوڵەتە دەکرد. بۆ نموونە پاکستان یەکێك لە ولاّتانی بێلایەن بوو، لە هەموو کۆنفرانسەکانی ولاّتانی بێلایەندا بەشداری دەکرد، بەلاّم بە کردەوە ولاّتێك بوو کە سیاسەتی ئەمریکای بەڕێوە دەبرد. کووبا بە ڕەسمی جزووی ولاّتەکانی بێلایەن بوو و لایەنگریی لە یەکیەتیی سۆڤیەت دەکرد. هێندێ ولاّتیش وەك هیندوستان کە دەیانتوانی تا رادەیەك نەزەری خۆیان بلّێن، بەلاّم دیسانەکە لە ژێر تەئسیری یەکێك لەو ولاّتانەدا بوون، بەتایبەتی ئابووریەکەشیان سەر بە یەکێك لەو ولاّتانە بوو. شەڕی سارد لە کۆنەوە دەستی پێ کردبوو و دیسان هەر بەردەوام بوو. نموونەی ئەو شەڕە ئەوە بوو کە ئەو دوو دەوڵەتە گەورەیەش لە هەموو فرسەتێك کەڵکیان وەردەگرت بۆ ئەوەی نفووزی خۆیان لە دنیادا بەرنە پێش. ئەمریکا دەچوو زۆر بە ئاسانی گرانادای دەگرت، چوونکە حکوومەتێك پێکهاتبوو بە دڵی نەبوو. هەروەها خۆی ئامادە کردبوو (نیکاراگوا)ش داگیر بکاو ئەگەر پێی بکرێ کووباش کە لە ئەمریکای لاتیندا هەڵکەوتوە، لەبەین بەرێ.

سۆڤیەتیش لەو لاوە ئەفغانستانی داگیر کردبوو، بێجگە لە ولاّتەکانی سۆسیالیستی کە لە واقیعدا هەموویان ئەرتەشی سۆڤیەتییان تێدا بوو، چێکۆسلۆواکی لە ساڵی ٦٨ لەم وەزعەدا بوو کە میخائیل گۆرباچۆف هاتە سەر کار. ئێستا ئەو شێوە بەربەرەکانێو ڕووبەڕووبوونە "رو در رو" بەرەبەرە لە ئەسەر سیاسەتی واقیعبینانەو بەڕاستی ئاشتیخوازانەی (نەك هەر بە قسە، بەڵکوو بە کردەوە)ی گۆرباچۆف لەو حاڵەتەدا دەرچووەو بەرەبەرە دەبێتە هاوکاری کردن.

جاران ئەو دوو دەوڵەتە پێکەوە هاوکارییان نەدەکرد، مەگەر لە دابەشکردنی مەنتەقەی نفووزدا، هاوکاری ئەو وەختە بۆ ئەوە بوو کە مەسەلەن لە فلاّن شوێنڕا تا فلاّن جێ ئی منەو تۆ دەستی تێوەر مەدەو فلاّن شوێن بۆ تۆ من کارم پێی نیە.

وەختێك ئەرتەشی سۆڤیەت چێکۆسلۆواکی داگیر کرد، بۆ ئەوە داگیری کرد کە ئەو وەختە پرۆسەیەك لە چێکۆسلۆواکیدا دەستی پێ کردبوو کە ئێستا میخائیل گۆرباچۆف لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا دەستی پێ کردوە، تەنیا دەوڵەتی غەیرە سۆسیالیستی کە لەو هێرشە پێشتر ئاگادار کرا، ئەمریکا بوو. شەوێك پێش ئەو

هێرشە سەفیری سۆڤیەتی لە واشینگتۆن خەبەری بە ئەمریکا دا کە ئەوان سبەینێ چێکۆسلۆواکی داگیر دەکەن، ئەوانیش گوتیان مەنتەقەی خۆتانە، کەیفی خۆتانە. مەبەست ئەوەیە کە ئەو هاوکاریيە بەو شێوەیە بوو. ئێستا زۆر نموونەی وا دێتە بەرچاو کە مەسەلەن ئەگەر ئەمریکا لە جێگایەك تووشی تەنگانە بوو، یەکیەتیی سۆڤیەت نایهەوێ دژی ئەمریکا لەو تەنگانەیە کەڵك وەربگرێ. یەکێك لەوانە ئێرانی خۆمان. راستە "شواردنادزە" راست لەو وەختەدا کە وڵاتەکانی رۆژئاوا سەفیری خۆیان لە تاران بانگ کردبۆوە چووە تاران (لەکاتی ژیانی خومەینیدا)، بەڵام بێگومان ئەگەر گرۆمیکۆ با لە وەختی خۆیدا، بە تەواوی وەزعەکەی دەگۆڕی. کەڵکێکی زۆر خراپی لەوە وەردەگرت بۆ ئەوە خۆی لە ئێران نزیك بکاتەوە، بۆ ئەوە ئێران بە ئیستلاح بکا بە وڵاتێکی دژی ئێمپریالیستی.

بۆ خۆیان دەزانن ئەو وەختە کە لە هەموو وڵات خەڵك سەرکوت دەکرا (لە زەمانی شا) یەکیەتیی سۆڤیەت لە زەمانی برژنێفدا بە ئێرانی دەگوت دژی ئێمپریالیستی، بەڵام شواردنادزە ئەوەی نەکرد. نەك هەر ئەوەی نەکرد، بەڵکوو حازر بوو ببێ بە پەیامبەری پەیامی ئینگلستان بۆ خومەینی بۆ ئەوەی ئەو لە سەر مەسەلەی "سەلمان رشدی" وا بە توندی نەڕوا. لەو قسانەدا کە لەوێ بە ئاشکراش کران (ئاشکرا گوتن بۆ خۆی یەکێك لە تایبەتمەندیيەکانی گلاسنۆست)ە، گوتی ئێوە شۆڕشی خۆتان کردوەو لە واقێعدا پێی راگەیاند کە حەقی دەخاڵەتی لە کاروباری ئێمەدا نیە. ئێمەش نامانهەوێ دەخاڵەت لە کاروباری ئێوەدا بکەین. جاران ئەو سیاسەتە لە پشتی دەرگای داخراودا دەکراو بە هیچ کەسیش ئاشکرا نەدەبوو. دیارە ئەوە دەنگدانەوەی وەزعی نێوخۆی یەکیەتیی سۆڤیەتیيە کە هەموو شتێك ئاشکرایەو، ئەگەر لە رۆژئاوادا بێنە سەر ئەو باوەڕەی کە بەڕاستی گۆڕانێکی شۆڕشگێرانە بە سەر سیاسەتی یەکیەتیی سۆڤیەتدا هاتۆتە پێشێو ئەو هاوکاریيە بۆ ئاشتیی جیهانی لە بەینی ئەو دوو دەوڵەتە زیاتریش دەبێ بەو جیاوازیيەوە کە هاوکاریی جاران بە زیانی میللەتان لە پشتی دەرگای داخراودا پێك دەهات. ئێستا لەبەر چاوی میللەتانو بە قازانجی ئەوان پێك دێ.

ئەو سیاسەتە یەکەم ئاکامی ئەوە بوو کە شەڕی سارد تەواو بوو، ئەو توندو تیژیو ئەو تەبلیغاتە دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکا نەماوە، جاران ئەگەر لە یەکیەتیی

سۆڤیەتیدا شەکر دەست نەدەکەوت خەتای ئیمپریالیزمی ئەمریکا بوو، بەرنامەیەك جێبەجێ نەبا دەیانگوت ئەوە ئیمپریالیزم نایەڵێ، لەو لاشەوە ئەگەر لە ئەمریکای لاتین، لە ئاسیا یان لە هەر جێگایەك جوولانەوەیەك پێكهاتبا، دەیانگوت دەستی کومۆنیزمی نێودەوڵەتیو دەستی یەکیەتیی سۆڤیەتی تێدایە. ئێستا ئەگەر دیققەت بکەین لە تەبلیغاتی هیچ لایەكدا ئەوە بەرچاو ناکەوێ. سیاسەتی سۆڤیەت لەم بارەوە روونترە، بەلام ئەمریکا جارێ هەر نیگەرانە. ئەویش هۆیەکەی ئەوەیە کە ئێمە لە گلاسنۆستدا نووسیومانە کە هێندێ لە سیاسەتمەدارانو رۆژنامەنووسانی رۆژئاوایی تێناگەن چ گۆڕانێك لە یەکیەتیی سۆڤیەتیدا پێك هاتووەو تا رادەیەکیش حەق ئەوەیە کە تێ نەگەن. چونکە لە یەکیەتیی سۆڤیەتیشدا نەیاندەزانی لە ئەمریکا چ باسە. ئێستا زۆربەی زۆریان تێگەیشتوون، چونکە دەبینن ئەو شتانەی لە یەکیەتیی سۆڤیەتیدا گوتراوە، یەك لە دوای یەك جێبەجێ دەبن. بۆیە دەڵێن شەڕی سارد تەواو بووە، ئەوە سەرکەوتنێکی گەورەیە نەك هەر ئەو شەڕە تەواو بووە، بەڵکوو بەکردەوە هێندێ شت کراوە کە مەترسیی شەڕی ئەتۆمیی رۆژ بە رۆژ کەمتر دەبێ. ئەوەی کە موافقەتیان کردوە مووشەکەکانی نێوەنجی لەنێو بەرن، ئەوانی (دوربرد) کەم بکەنەوە، هەتا ئێستا هاتوونەتە سەر ئەو بڕوایە کە چەکی سوننەتی لە ئۆرووپا کەم کەنەوە، چونکە ئۆرووپا جێگایەکە کە لەوێدا دوو جەبهەی بەرامبەر بە یەکتر راوەستاون. یانێ لە لایەکەوە سۆڤیەت لە هەموو ولاتەکانی سۆسیالیستیدا ئەرتەشی هەیەو ئامریکاش لە لایەکەوە ئەرتەشی هەیە لە ولاتەکانی رۆژئاوادا. هەردوولا بۆمبی ئەتۆمییان داناوە، بۆیە خەتەری شەڕ لە ئۆرووپا لە هەموو جێگایەك زیاترە، زۆریش لێك نزیکن بۆیە ئەگەر لەوێ مەسەلەی ئاشتی چارەسەر بکرێ، رەنگە مەترسیی شەڕی ئەتۆمی بە یەکجاری لە ناو بچێ، مەترسیی شەڕی ئەتۆمی لە زەمانی برژنێفدا تا رادەیەکی زۆر نەمابوو، هۆیەکەشی بوونی خودی ئەتۆمەکە بوو، یانی لە واقیعدا چەکێك پێك هاتبوو کە هیچ تەرەفێك لە بەر ئەو چەکە نەیدەوێرا شەڕەکە ساز بکا. چونکە دەیزانی بۆ خۆشی زەرەر دەکا.

کەوابوو ئەگەر ئەو دەوڵەتانە هاتنە سەر ئەوە کە پێکەوە هاوکاری بکەن، دەست لە کاروباری نێوخۆیی یەکتر وەرنەدەنو تەحریك نەکەن، (رودررو) نەبن، نەتیجەکەی دەبێتە ئەوەی کە سادیرکردنی شۆڕشی سۆسیالیستی (بە وتەی سۆڤیەتەکان)

موونتەفی بووە. ئەوەی کە ئێستا میخائیل گۆرباچۆف دەڵێ، ئێمە لایەنگری شۆڕشی سۆسیالیستی نین، شتێکی تازە نیەو لنینیش گوتوویەتی. تەنیا لە زەمانی ئیستالیندا بووە کە ئەوەیان تا رادەیەك گۆڕی، ترۆتسکی باسی ئەوەی دەکرد کە دەبێ شۆڕش پەیتا پەیتا هەبێ تا ئەو وەختە دنیا بە تەواوی ئازاد دەبێو شۆڕشی سۆسیالیستی سەردەکەوێ. ئەو دەیگوت ئێمە نابێ تەنیا لە یەکیەتیی سۆڤیەتیدا شۆڕش بکەینو دەست لە سەر دەست دابنێین، بەڵکوو دەبێ دەست بکەین بە دروستکردنی سۆسیالیزم، لە وڵاتەکانی سەرمایەدارییشدا دەبێ شۆڕشەکە بە زۆریش بێ بەرینە پێشو شۆڕشێکی جیهانی بەرپا بکەین، شۆڕشی سۆسیالیستی نابێ رابوەستێ. لنین هەر ئەو وەختە موخالیفەتی لەگەڵ ئەو بۆچوونە کردو نەزەری ئەوە بوو کە ئێستا ئێمە رێگامان ئەوەیە کە ئەو وڵاتە سۆسیالیستیيە بپارێزین کە بریتیيە لە یەکیەتیی سۆڤیەتیو لە پاشان میللەتەکانی وڵاتانی دیکە دەبێ بۆ خۆیان شۆڕشەکە بکەن، نەك ئێمە لە دەرەوەڕا شۆڕشیان بۆ سادر بکەین. ئەوەش بڵێین سادیرکردنی شۆڕشی سۆسیالیستی لە دەرەوەڕا نەتیجەی زۆر خراپی هەیە. نموونەی هەرە باشمان لە بەرچاوە، ئەویش ئەفغانستانە. ئێستا یەکیەتیی سۆڤیەت کە ئەو هەموو پارەی سەرف کردو ئەو هەموو سەربازانەی لە ئەفغانستان کوژران، ئەفغانستانی بەجێ هێشت. ئەوە کارێکی یەکجار زۆر ئازایانەو شوجاعانە بوو کە گۆرباچۆف کردی. وەختێك لە باکوو شۆڕش سەرکەوت، شۆڕشگێڕەکان ئەو تەوەهۆمەیان بۆ پێكهات کە بە بێ لەبەرچاو گرتنی هەلومەرجی وڵاتەکانی دیکەی ئەمریکای لاتین، دەتوانن لە هەموو وڵاتێکی ئەم بەشە لە جیهاندا سەرکەوتوو بن. ئەوە بوو کە چەگوارا دەستی پێ کرد کە لە بۆلیڤی شۆڕشی سۆسیالیستی ساز بکا، نەتیجەکەی دەزانینو یادداشتەکانی، هاوڕێیان خوێندویانەتەوە، لەوێ کەس پشتیوانیی لێ نەکردن، ژمارەیەکی پارتیزان دەگەڵ مانەوە، ئاخرەکەشی بۆ خۆی کەوتە دەست پۆلیسی بۆلیڤیو کوژرا. کەوابوو ئەگەر ئەو هەلومەرجە ئامادە نەبێ لە وڵاتێكدا، سۆسیالیزمیش پیادە ناکرێ. بۆیە گوتمان ئەگەر گۆرباچۆف ئەوەی دەڵێ، شتێکی تازەی نەگوتوە. چارەسەرکردن یان ئامادەکردنی هەلومەرج بۆ چارەسەرکردنی کێشەی مەحەللی لە ئەفغانستانەوە بگرە تا دەگاتە نیکاراگوا، کامبوج، ئانگۆلا، شەڕی ئێرانو عێراق، مەسەلەی فەلەستینو بە گشتی هەمووی

ئاكامی پرۆسەی ئاشتی لە جیهان دایە كە بۆ نموونەو بە كورتی ئیشارە بە هێندێك لەو ناكۆكییانەو ئاكامەكانیان دەكەین:

**ئانگۆلا:**

ئەفریقای جنووبی كە دەوڵەتێكی نەژادپەرەستو كۆنەپەرستە، بە پشتیوانیی ئەمریكا پشتیوانییان لەو ڕێكخراوە كرد كە بە نێوی "یۆنیتا" (یەكیەتی)یە. یۆنیتا ئەو ڕێكخراوە بوو كە كاتێك بەرەی ڕزگاریخوازی ئانگۆلاسەركەوتو لە ئانگۆلا حكوومەتی دەستەچەپی دامەزراند، جیا بۆوەو كێشەكە ئەوەندە گەورە بۆوە كە كووبا دەخاڵەتی ڕاستەوخۆی كرد، لەشكری خۆی نارد بۆ دیفاع لە ئانگۆلا، بۆیە ئەو حەقەی بە خۆی دەدا چونكە لە تاریخدا وا هاتووە كە كووبایییەكان ئەوانەی ڕۆیشتوونو موهاجێرەتیان كردوە، بەتایبەتی ئەوانەی لە كووبا دان هەم نەژادی سپییان تێدایەو هەم نەژادی ڕەش، ڕۆیشتوون بۆ ئانگۆلاو لە مەنتیقەی ئانگۆلاو ئانووئی دامەزراون. بەم چەشنە كووبا كە خۆی بە نزیك لەوان دەزانی، لەشكری خۆی نارد بۆ دیفاع لە ئانگۆلا لە موقابیل یۆنیتادا. ئەمریكاو ئەفریقای جنووبییش پشتیوانییان لە "ساویم بی" كرد كە سەرۆكی یۆنیتا بوو، ماوەیەك پارەیان دەدایە، چەكیان دەدایەو بە كورتی هەموو چەشنە یارمەتییەكیان پێ دەكرد. بەڵام ئێستا ئەوە بەرەبەرە مەسەلەی ئانگۆلا چارەسەر كراوە، هەرچەند ساویم بی چەندین جار چووە لای ڕەیگان، ڕەیگان وەریگرتو پێشوازی لێكرد، بەڵام ئێستا یارمەتیی ناكەن. لەو لاشەوە لەشكری كووبا لە ئانگۆلا خەریكە دەچێتە دەرێ.

**كامبۆج:**

پاش ئەوەی كە پۆلپۆتییەكان لە كامبۆج ئەو كارەساتەیان پێك هێناو چەندین میلیۆن كەسیان كوشت، كامبۆجیان كرد بە وێرانەیەكو لەشكری وێتنام چوو كامبۆجی داگیر كرد، پۆلپۆتییەكان هەر ماون، بەڵام ئەوەندە بەهێز نین. لەو ئاڵوگۆڕە كە لە سیاسەتی جیهانیدا پێك هاتووە، وێتنام خەریكە لەشكری خۆی لە كامبۆج دێنێتە دەرێو دەگەڵ "سیانۆك" كە وەختی خۆی سەرۆك كۆماری كامبۆج بوو، تەنانەت دەگەڵ بەشێك لە پۆلپۆتییەكان دەیانهەوێ بە شێوەیەك ڕێك كەونو لە كامبۆج حكوومەتێكی سەربەخۆ بێننە سەر كار. لە جێگاكانی دیكەش كێشەی مەحەللی خەریكە بەرەبەرە حەل دەبن، چونكە سۆڤیەت پشتی ئەو كەسانە ناگرێ كە

دژی ئەمریکا شەڕ دەکەن. گۆرباچۆف کاتێك لە کووبا دەڵێ ئێمە نامانهەوێ شۆڕش سادیر بکەین، مانای ئەوەیە کە نامانهەوێ لە نیکاراگوا پشتیوانی بکەین بۆ ئەوەی شۆڕش سادیر بکەین. لە بەرامبەردا هەر خودی سەنای ئەمریکا سەرۆك کۆمار ناچار دەکا یارمەتی بە کۆنتراوپانی دژی شۆڕشەکانی نیکاراگوا نەکا کە دژی دەوڵەتی نیکاراگوا شەڕ دەکەن. کەوابوو لەوێش خەریکە رێککەوتنێك پێك دێ.

یەکێك لە مەبەستەکانی گۆرباچۆف لە سەفەر بۆ کووبا لە واقیێعدا بۆ قانعکردنی کاسترۆ بوو لە زۆر بارەوە. فیدل کاسترۆ تەنیا کەسێك بوو کە لە بەینی ولاٚتەکانی سۆسیالیستیدا بە ئاشکرا گلاسنۆستو پرۆستۆریکای رەد کردەوە. دووهەمیش کاسترۆ هەر لەو باوەڕەدا بوو کە چەگوارا دەیگوت. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە چەندین ولاٚتی دیکەی ئەمریکای لاتین بکەن بە کووبا. لەوێ شەڕی پارتیزانی پێك بێو شۆڕش سادیر بکرێ. دیارە لە واقیێعدا بەکردەوە ئەو سیاسەتە وەلانرا، چونکە کووبا لە باری ئابووریشەوە بەبێ یارمەتیی یەکیەتیی سۆڤیەت نەیدەتوانی ئەم کارانە بکا. کووبا جەزیرەیەکی زۆر مەرغووبە بۆ توووریستەکانی ئەمریکایی، بەلاٚم پاش شۆڕش ئەوە سێ ساڵە هیچ ئاسەوارێك لەو توووریستانە نەماوە. بەلاٚم ئێستا سێ چوار مانگە دەرگای خۆی کردۆتەوەو هەرچی توووریستی ئەمریکایە هاتووچۆی کووبا دەکا، چونکە پێویستیی بە دولار هەیە. بێجگە لەوە ئەو سیاسەتەی یەکیەتیی سۆڤیەت دەبێتە هۆی باشتربوونی پێوەندیی یەکیەتیی سۆڤیەتی دەگەڵ زۆر ولاٚتی گرنگی دیکەو لە پێش هەمووانیدا چین. هەموو دەزانن لە زەمانی برژنێفدا نێوانی چینو سۆڤیەت ئەوەندە تێك چوو بوو کە خەتەری شەڕیان بۆ پێك هاتبوو. بەلاٚم ئێستا ئەم حەساسیەتە گۆڕاوە، گۆرباچۆف سەفەری چینی کردو ئەوە بۆ خۆی هەنگاوێکی گەورە بوو بەرەو ئاشتی لە نێوان ئەم دوو ولاٚتە گەورەی سۆسیالیستیداو بەم چەشنە دەبینین رەوتی ئاشتی لە جیهاندا بەردەوام بەرەوپێش دەچێ. دیارە ئەگەر رەوتی ئاشتی سەرکەوێ، ئاکامەکەی دەبێتە ئەوە کە سۆڤیەت دەتوانێ بەشێکی زۆر لە بوودجەی شەڕ لە بەشی ئابووری، کۆمەلاٚیەتی، فەرهەنگیو بێهداشتیدا سەرمایەگوزاری بکا، کە ئەوەش گۆڕانێکی جیددی دەبێ لە وەزعی نێوخۆی یەکیەتیی سۆڤیەتدا.

**پرۆسەی دووهەم:**

پرۆسەی دووهەم کە باسمان کرد، پرۆسەی دێموکراتیزاسیۆنە. لە واقیێدا پرۆسەی یەکەم باسی پرۆسەی ئاشتی بوو، تا رادەیەکی زۆر نەتیجەی ئەو پرۆسەیە کە بە گلاسنۆست ناسراوەو لەگەڵ پرۆستۆریکا لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا دەستی پێ کردوە. هەروەها کە لەو نامیلکەیەشدا کە لە لایەن حیزبەوە نووسراوە لە راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی هەشتەمیشدا هاتووە، بناغەی ئەم مەسەلەیە لە واقیێدا دێموکراتیزاسیۆنە. ئەویش ئەوەیە کە ڕێگا بدرێ خەڵك بەکردەوە لە بەڕێوەبردنی کاروباری ولاتەکەیاندا بەشدار بن. لە سەرەتادا زۆر کەس هەبوون لە دەرەوە یا لە بەینی خۆماندا وایان بیر دەکردەوە کە گۆرباچۆفیش وەك خرۆشچۆف هاتووە دوو قسە دەکاو پاشان وەدەری دەنێنو دەڕواو گلاسنۆستو دێموکراسیو ئەو باسانەش تەواو دەبن. بەلاّم ئێستا کەم کەس ماوە کە باوەڕ نەکا بەرنامەو قسەکانی ئەمجارەی سۆڤیەت وەك جارانی رابردوو نین. ئەو جارە ئەوە خەریکە بەڕاستی دێموکراسی لە یەکیەتیی سۆڤیەتیدا پیادە دەبێو سەردەکەوێ، بەبێ ئەوەی مەترسییەکی بۆ سۆسیالیزم پێك هێنابێ. بە پێچەوانەی ئەوە کە هێندێك کەس ئیددیعایان دەکرد کە لە دێموکراسیدا سۆسیالیزم وەخەتەر دەکەوێ، حیزبی ئێمە یەکەم حیزبە کە لە رۆژهەلاّتی نێوەڕاستدا یان رەنگە لە جیهانیشدا لەو حیزبە هەرە کەمانە بێ کە پێشتر مەسەلەکەمان حەل کردوە. بۆیە باسی زۆر لە سەر ناکەین.

ئێمە بە هێنانی "کورتەباس" لە کۆنگرەی شەشەمدا ئەو مەسەلەیەمان هەر لەو وەختەوە چارەسەر کردوە کە بۆ ئێمە سۆسیالیزم بێ دێموکراسی تەنیا کاریکاتۆرێکە لە سۆسیالیزمو سۆسیالیزمی واقعی نیە. هەروەها گوتوومانە لە هەر ولاتێکدا کە هەلومەرجی سۆسیالیزم ئامادە نەبێ، ناتوانێ سۆسیالیزم دامەزرێنی، ئەگەر دێموکراسیش نەبێو خەڵك بەشداری نەکا لە دروستکردنی سۆسیالیزمدا، سۆسیالیزم پێك نایە.

لە کۆنگرەکانی پێش کۆنگرەی بیستەمو پاش کۆنگرەی بیستەمیشدا هەتا لە زەمانی خرۆشچۆفدا پێشبینی دەکرا لە ساڵی ١٩٨٥ یەکیەتیی سۆڤیەتیش لە هەموو بارێکەوە لە ئەمریکا وەپێشتر کەوێ. ئەو نووسراوە راپۆرتی رەسمیی کۆنگرەیە کە خرۆشچۆف وەك بڕیاری کۆنگرەی بیستەم کە لە ساڵی ١٩٥٦ پێك

هاتووە یانی لە واقیعدا ٢٣ ساڵ لەوە پێش داویەتی، بەڵام ئێستا کە ئینسان گوێی لە قسەکانی میخائیل گۆرباچۆف دەبێ، تێ دەگا کە بە پێچەوانەی ئەو بڕیارە، سۆڤیەت لەو ماوەدا نەك هەر پێشتر نەکەوتوە، بەڵکوو زۆر پاشتر کەوتوە، لە زۆر بەشدا هەر نەچۆتە پێش. مەسەلەن یەکیەتیی سۆڤیەت لە زەمانی رووسیەی تەزاریدا عەمباری گەنم بوو، ئێستا ئەگەر ئەمریکا گەنمی پێ نەفرۆشێ خەڵکەکە نانی نیە بیخوا. لە حاڵێکدا خاکی یەکیەتیی سۆڤیەت یەك شەشەمی خاکی جیهانەو چەندین بەرامبەری خاکی ئەمریکایە. هۆی ئەو وەزعە بێگومان نەبوونی دێموکراسی بووە، بەڵام ئێستا کە دێموکراتیزاسیۆن لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا دەستی پێ کردوە، لە هونەردا، لە فەرهەنگدا، لە فیلم دروستکردندا، لە تیئاتردا، لە ئەدەبیاتو. . . لە هەموان گرنگتر شوێن دادەنێتە سەر ئابووریو سیاسەتی سۆڤیەت، ئێستا خەڵك قسەی خۆیان دەکەن. خەڵك نوێنەری خۆیان هەڵدەبژێرن‌و. . . دیارە لە رۆژئاوادا پێیان وایە دێموکراسی هەر ئەوەیە کە ئەوان هەیانە. ئەگەر دێموکراسیی ولاتانی دیکە راست ئولگووی ئەو دێموکراسی‌یە نەبێ، دێموکراسی نیە. بەڵام راستی‌یەکەی ئەوەیە کە هەر ولاتێك هەلومەرجی تایبەتی‌و پرۆسەی تاریخیی خۆی هەیە. یەکیەتیی سۆڤیەتی لە تاریخی خۆیدا تەنیا چەند مانگێك سوننەتی دێموکراسی بووە، چەند مانگێك پێش شۆڕشی ئوکتۆبرو یەك دوو مانگیش پاش شۆڕشی ئوکتۆبر بوو، دەنا یان دیکتاتۆریی تەزاری بووە یا دیکتاتۆریی پرۆلێتاریا کە لە پاشان بۆتە دیکتاتۆریی ستالین. ولاتێکی ئەوتۆ ئەگەر دێموکراسی دابمەزرێنێ، ئاسان نیە. ئێمەش بۆ خۆمان ئەزموونی ئەو شێوە دێموکراسی‌یەمان هەیە، لە سەرەتادا پێشمەرگە پێی وابوو دێموکراسی ئەوەیە بە قسەی فەرماندەری هێز نەکا، بۆیە تەمرینی دێموکراسی یان بلێین خۆ ئامادەکردن بۆ دێموکراسی پێویستە، لە بەر ئەوە ئەگەر لە دیکتاتۆری‌یەوە چووی بۆ دێموکراسی، هەموو وەختێك ئیفراتو تەفریتی تێدایە. ئی وا هەیە وا بیر دەکاتەوە دێموکراسی یانی بەکەیفی خۆت لێی بخوری، خراپ حاڵی دەبن. ئی واش هەیە لە موقابیلدا لە دێموکراسی دەترسا، چونکە نەی‌دیبوو. لە یەکیەتیی سۆڤیەتیشدا تا ئێستا کەس نەی‌گوتوە مەسەلەن حیزبی کومۆنیست هەڵەی کردوە، ئەگەر گوتبێتی لانیکەم لە سیبری سەری وەدەرناوە. ئێستا کە ئەو قسانەو لەویش توندتر دەکرێ، ئەوانەی فێری دێموکراسی

نەبوون دەترسێن، پێیان وایە بە گوتنـی ئـەو قسـانە ڕەنگـە ڕێژیمەکـە بڕووخـێ، لـە حالێکدا ئەوە چەند ساڵە ئەو قسانە دەکەن، ڕێژیمەکـەش نـەڕووخاوە، بـە پێچەوانـە ئێستا خەڵك زیاتر پشتیوانی لە ڕێژیمەکە دەکا. بـەڵام ئێسـتا دوو کۆسـپ لـە سـەر ڕێگای پرۆسەی دێموکراتیزاسـیون لـە سـۆڤیەتدا هـەن، کۆسـپی نێوخـۆو کۆسـپی دەرەوە. پێشوو قەت لە نێوخۆدا باسی خراپیی ئەو وەزعە نەدەکرا، بەڵام ئێستا ئـەو باسە بە ئاشکرا دەکرێ، تەنانەت یەکێك لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بە وردی لە سـەر ئـەم کەموکوورییانـە دەدوێو دەڵـێ: "دیـارە گلاسنۆسـتو پرۆسـتۆریکاو دێموکراسیش بۆ ماوەیەك خەڵك ڕازی دەکا، بەڵام بۆ هەمیشـە زگیـان تـێر ناکـا". ئەندامێکی دیکەی حیزبی کومۆنیستی سۆڤیەت دەڵێ: "ئێمـە سـێ سـاڵ وەختمـان هەیەو گرنگترین مەترسی بۆ ئێمە ئەوەیە کە وەختمان زۆر کەمە، ئەگەر لەو دوو سێ ساڵەدا بتوانین وەزعی ئابووری‌یەکەمان باشتر بکەینو لـەو تـەنگو چەڵەمەیـە دەری هێنین کە چەندین دە سـاڵە تێـی کـەوتووە، ئـەوە باشـە، ئەگـەر نـەتوانین، تووشـی گێروگرفتی زۆر گەورە دەبین". ئێمەش هەر لە سەرەتای گلاسنۆستدا باسمـان کـردوە کە گەورەترین سەرکەوتنی ئەو دێموکراتیزاسیۆنە لە یەکیەتیی سـۆڤیەتدا ئـابووریی وڵاتەکەیە، دیارە ئەو شتانە کە لە زەمانی برێژنێفدا دەکران، ڕیفۆرمێـك بـوون کـە لەسەرەوەڕا دەکران. گۆرباچۆف دەزانێ کە ئەم کەموکوورییانە بەم شـێوەیە چارەسـەر ناکرێن، دەبێ لە بناغەوە زۆر شت بگۆرێ کە ئێمە دەچینە سەری:

لە باری پسپۆڕیی ئەفراد، سـەرچاوە ژێرزەوی‌یـەکانو. . . سـۆڤیەت یـەکێك لـە دەوڵەمەندترین وڵاتانی دنیایە. لە باری پسپۆڕیی ئەفرادەوە بە دەیان هەزارو سـەدان هەزار موهەندیس، دوکتورو پسپۆڕی هەموو بەشێکی هەیە، دیارە ئەوە شتێکی زۆر گرنگە بۆ وڵاتێك کە دەیهەوێ پێش کەوێ. لە باری نەوتو خەڵووزی بەرد، ئەڵماسو زێڕو هەرچی بتهەوێ لە یەکیەتیی سۆڤیەتی‌دا بە فراوانی هەیە، بـەڵام ئیشـکاڵ لـە شێوەی بەڕێوەبردنی ئابووری دایە کە ئەوە خەریکن دەی‌گۆڕن.

کۆسپی دەرەوە ئەگەر سەرنجتان دابێ، لە زەمانی برێژنێف یـان سـتالیندا کـە لـە یەکیەتیی سۆڤیەت گۆڕانێك پێك دەهات، دەستبەجێ هەموو وڵاتانی سۆسیالیسـتی عەینی ئەوەیان دەکرد بە ئولگوو و پیادەیان دەکرد، ئیدی بۆ هەلومەرجی ئەو وڵاتـە دەبوو یا نەدەبوو گوێیان نەدەدایە. بۆ نموونە وڵاتی سـۆڤیەتی کـە دەسـتی کـرد بـە

دروستکردنی سۆسیالیزم، ولاتێك بوو تەقریبەن ١٧٠ میلیۆن دانیشتووی هەبوو، ولاتی هەرە گەورەی سۆسیالیستیی جیهانە. ولاتێکی ئەوتۆ پێویستە هەموو بەشەکانی سەنعەتی قورس پێك بێنێ. لە زەمانی ستالیندا کە ئەو کارە لە سۆڤیەت دەستی پێ کرد، مەجارستانیش عەینی ئەو کارەی کرد، ئەم ولاتە لە سەرەتای دەست پێکردنی سۆسیالیزمدا ٩ میلیۆن دانیشتووی هەبوو و لە باری ئیمکاناتی ماددیو مەعنەوی‌یەوە یەکجار زۆر لە سۆڤیەت فەقیرتر بوو، بەلاّم بە چاولێکردن لە سۆڤیەت گۆڕانیان تێدا کرد کە لە پاشان بۆیان دەرکەوت کە ئەو پرۆژانە نە پێویست بوونو نە سەرکەوتوو. بەلاّم چونکە سۆڤیەت ئەوەی کرد، ئەوانیش ئەوەیان کرد. لە زەمانی برێژنێفیشدا هەر وا بوو، بەلاّم ئێستا ئەگەر گۆرباچۆفیش بە ولاتێکی سۆسیالیستی بلّێ ئەمن ئەوەی ئێستا دەیکەم ئەتۆ بیکە، هەرچەند شتەکە باشیشە ئیدی لەگەلّ برێژنێف فەرقی نابێ. بەڕێوەبەرانی ولاتە سۆسیالیستی‌یەکان لە زەمانی ئیستالیندا نەیاندەگوت ولاتی ئێمە هەلومەرجی تایبەتی خۆی هەیە، ئێستا چونکە نایانهەوێ دێموکراسی لە ولاتەکەیاندا پیادە بێ، دەلّێن هەلومەرجی خۆمان بۆ خۆمان دەزانین.

لە چیکسلواکی‌دا (سالّی ٦٨) کەسانێك هاتوونەتە سەرکار لە واقیّعدا دژی سیاسەتی دێموکراتیزاسیۆن بوون. ئەوانە زیاتر هەولّ دەدەن بۆ ئەوەی ئەو دێموکراتیزاسیۆنە لە یەکیەتیی سۆڤیەتی‌دا سەرنەکەوێ، لە رابردوودا لە چێکۆسلّوواکی‌دا دروشمێکیان هەبوو کە لە بەر دەرکی هەموو دانیشگا، کارخانەو . . نووسرابوو. سالّەهای سالّ ئەو دروشمانە لە جێی خۆی‌دا مابوونەوە، هەرچەند زۆر کەسیش نەی‌دەخوێندنەوە. شیعارەکەیان ئەوە بوو، یەکیەتیی سۆڤیەت بۆ ئێمە نموونەیە. ئێستا بەڕێوەبەریی چێکۆسلّوواکی دەلّێ، نەخێر هەر ولاتێك هەلومەرجی تایبەتی خۆی هەیە. لە حالّێکدا دەیان سالّە ئەو دروشمەیان بەڕێوە بردوە کە باسمان کرد. دیارە لە چێکۆسلّوواکی‌دا سوننەتی دێموکراتیك بە پێچەوانەی سۆڤیەت یەکجار زۆر بووە. چێکۆسلّوواکی لە هەلّبژاردنێکی تەواو ئازاددا حیزبی کومۆنیست زۆربەی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، تەنیا ولاتێکە لە دنیادا بە ئازادیی تەواو حیزبی کومۆنیست حکوومەتی بە دەستەوە گرتوە. لە زەمانی پێش شەڕیشدا تەنیا ولاتێك بووە کە حیزبی کومۆنیست نفووزێکی یەکجار زۆری هەبووەو ولاتێکی دێموکراتیك بووە، بەلاّم ئێستا لەوێدا خەلّکەکە زۆربەیان دژی ئەو رێبەرایەتی‌یەن. بۆیە ئەو

ڕێبەرایەتی‌یە ناتوانێ زۆر خۆی ڕابگرێ. ئێستا هەر بەرەبەرە پاشەکشە دەکا، بەلاّم موقاوەمەتیش دەکا، پاشەکشەکەی ئەوەیە کە موساك کە سەرکۆمارو سکرتێری گشتیی حیزب بوو لە سکرتێری هاتە خوارێ، یەکێکیان کردۆتە سکرتێری گشتی کە ئینسانێکی بێکارەیەو هەموو کەس دەزانێ کە بۆ ماوەیەکی درێژ ناتوانێ درێژە بە کار بداو سۆڤیەتیش ئەوەندەی بۆی بکرێ فشار دێنێ، چونکە ئێستا پێوەندیی فەرهەنگییان هەیە، هاتووچۆیان هەیە، بەتایبەتی گرنگتر لەوانەش ئەوەیە لە هەموو حالّەتێکدا خەلّکەکە دەتوانن تەلەویزیونی سۆڤیەتی چاو لێ بکەن، چونکە زمانەکەشیان نزیکەو هەرکەس چێکی بزانێ، رووسی تێ دەگاو خەلّکێکی زۆر لەو ولاّتە چاو لە تەلەویزیۆنی سۆڤیەت دەکەن کە ئێستا رۆژ تا ئێوارێ باس لە دێموکراتیزاسیۆن، گلاسنۆستو پرۆستۆریکا دەکا، لە ئاکامدا وای لێ دێ ئەو بەڕێوەبەرایەتی‌یە ئیزولە دەبێو هیچ ڕێگایەکی نامێنێ، بێجگە لەوەی بڕواو بەم چەشنە ئەم ولاّتە رەنگە یەکەمین ولاّتی سۆسیالیستی بێ کە ئالّوگۆڕی تێدا پێك بێ.

بە پێچەوانە ئالّمانی شەرقی رەنگە بتوانێ زیاتر خۆی ڕابگرێ، بەلاّم لە هەموان خراپتر وەزعی رۆمانی‌یە. ئەم ولاّتە لە شێوەکاری سۆسیالیستی بە تەواوی دەرچووە، چاوشیسکۆ ژنی خۆی کردوە بە ئەندامی دەفتەری سیاسیو خزمەکانی کردوە بە هەمەکارە. یانێ ئێستا بنەمالّەی چاوشیسکۆ هەموو شتێکیان بەدەستەوەیە. چووکترین ڕێگاش بە دێموکراسیو گلاسنۆست نادەن، لە باری ئابووریشەوە وەزعێکی وا خراپی هەیە کە لەگەلّ سۆڤیەتیشدا موقایسە ناکرێ، دانیشتوانی ئەم ولاّتە لە زستاندا مافی ئەوەیان نیە کە لە رۆژدا لە گەرمای زیاتر لە ١٤ دەرەجە کەلّك وەرگرن، چونکە سووختیان نیە. لە ٢٤ سەعاتدا نابێ لە زیاتر لە ٦ سەعات لە بەرق کەلّك وەربگرن، تەنانەت لە زستانیشدا ولاّتەکانی ئۆرووپای رۆژئاواش خەریکن بەرەبەرە پێوەندیی خۆیان لەگەلّ رۆمانی قەتع دەکەن. میتران دەعوەت کرابوو بۆ ئەو ولاّتە، بەلاّم نەچوو. رۆژ بە رۆژ وەزعەکە لە رۆمانی خراپتر دەبێ، بەلاّم ئۆپۆزیسیۆن لە رۆمانی‌دا بە قەت چێکۆسلۆواکی بەهێز نیە، هەر بۆیە رەنگە گۆڕانەکە لەو ولاّتە درەنگتر بێ. ئالّمانیش کە حیسابی جیاوازی خۆی هەیەو هەر قسە کۆنەکانی خۆی دەلّێتەوەو جنێو بە هەموان دەدا. دیارە لە هەمان کاتدا لەوێش ئالّوگۆڕ هەیە. بولغارستان دوو جانبە بازی دەکا، بە رەسمی هەموو شتێکی وەك یەکیەتیی

سۆڤیەتی‌یە، تەنانەت بەناوبانەگە دەڵێن ئەگەر لە مسکۆ باران بباریَ، خەڵك لە سۆفیا چەتر هەڵ دەدەن، یانی ئەوەندە تابعی مسکۆن. بەلاّم لەوێش‌دا ئیشکالەکەیان ئەوەیە، ژێکۆف نزیك بە ٣٠ ساڵە لە سەر کارە، هەرچی کاری خراپ لە زەمانی بریژنێف لە یەکیەتیی سۆڤیەتی‌دا کرابیَ، لە بولغارستانیش‌دا کراوە. تەمەنیشی نزیك بە ٧٥ ساڵە رێگا نادا جاریَ هیچ گۆڕانێك پێك بیَ، بەلاّم ئەوە بۆ سۆڤیەت موشکیلە نیە، چونکە وا ویَ دەچیَ کە زۆرکەس خۆیان ئامادە کردبیَ دەستبەجیَ، پاش ژێکۆف بەو خەتە برۆن کە گۆرباچۆف تەبلیغی بۆ دەکا. بەلاّم دوو ولاّت بە تەواوی وەزعیان گۆڕیوەو دەتوانین بڵێین لە یەکیەتیی سۆڤیەتیش پێشتر کەوتوون، ئەوانیش مەجارستان‌و لەهستانن. لە مەجارستان‌دا ئێستا حیزبی کومۆنیست بڕیاری پلوورالیزمی داوەو بەڕەسمییش رایگەیاندوە کە حیزب‌و رێکخراوی دیکەش دەتوانن تێکۆشانیان هەبیَ. مەجارستان فەرقێکی یەکجار زۆری کردوە، لە هەموو بارێکەوە خەڵك هەست بە ئازادی دەکا، لە خیابانی هەرە گرنگی "بوودایپێست"دا ئەوانەی لە ئۆپۆزیسیۆن دان بە ئازادی رۆژنامەکانی خۆیان دەفرۆشن. حیزبی کومۆنیست قەبووڵی کردوە کە دەکریَ حیزبی دیکەش هەبن‌و دەتوانن پێکەوە بە ئازادی بژین. تەنانەت پرسیاریان لیَ کردون. مەترسیی ئەوە نیە خەڵك لە هەڵبژاردن‌دا دەنگ بدا بە لایەنەکانی دیکە، ئەوانەی لە سەر کارن، وەلاّمیان داوەتەوە ئەگەر زۆربە دەنگ بە ئێمە نەدا، مانای ئەوەیە کە زۆربەی ئێمەی ناویَ، دەبا ئەوانی دیکە دەسەلاّت بە دەستەوە بگرن. حەق ئەوەیە خەڵك هەر بڕیارێکی دا، ئێمە تەبەعیەتی لیَ بکەین.

لە لەهستانیش پاش گێرەو کێشەیەکی زۆر ئاخرەکەی بە تەوافۆق گەیشتن کە (همبستگی)ش لە دەسەلاّت‌دا بەشدار بیَ‌و ئەوە کارێکی زۆر باش بوو. دیارە لەهستان وەزعێکی زۆر پیچیدەی هەیە. چونکە یەکێك لە عاملە هەرە گرنگەکان کە لەویَ‌دا تەئسیری هەیە، کلیسایە. لە حالێك‌دا لە ولاّتەکانی دیکە، مەسەلەن لە چێکۆسلۆواکی‌دا کلیسا نەخشێکی ئەوتۆی نیە. بۆیەش رێژیمی لەهستان مەجبوورە حیسابێکی تایبەتی لە سەر کلیسا بکا، چونکە کلیسا لەویَ بێجگە لە نەخشی مەزهەبی، نەخشی سیاسیشی هەیە. بەلاّم هەر لەو ولاّتەدا دێموکراتیزاسیۆن زۆر چۆتە پێش، قەبووڵیان کردوە کە پلۆرالیزم (چەند حیزبی) هەبیَ، (همبستگی)ش تێکۆشانی ئازادی هەیە.

لە ئاسیادا تەنیا وڵاتێك کە لەو بارەوە نەچۆتە پێشو ڕەنگە جارێ هەروا بمێنێتەوە، کورەی شیمالییە. مەسەلەیەکی کە لەم پێوەندییەدا زۆر گرنگەو ئێستا بۆتە جێگای پرسیار ئەوەیە کە دێموکراتیزاسیۆن پرۆستۆریکای لەگەڵە، پرۆستۆریکا یانێ لە واقیعدا "بازسازی". ئەو بازسازییە دەبێ لە ئابووریو سیاسەتیشدا پێك بێ، ئایا ئەو بازسازییە سۆسیالیزم ناخاتە مەترسییەوەو نابێتە سەرمایەداری؟ ئەو بازسازییە تا کوێ دەچێتە پێش؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لە "شیکردنەوەی کورتەباس"دا دراوەتەوەو لێرەدا زۆر بەکورتی ئیشارەیان پێ دەکەینەوە: لە باری ئابوورییەوە لە وڵاتێکی سۆسیالیستیش بازاڕ هەیە، چونکە پووڵ هەیە. وەك وڵاتانی دیکە خەڵك حقووق وەردەگرنو دەچنە بازاڕ، بە پێی ئەو پووڵەیان شت دەکڕن. دیارە لەم وڵاتانەدا هێندێك شتیش حکوومەت بە خۆڕایی یان بە قیمەتێکی زۆر هەرزان دەیدا. کتێب، تیئاتر، سینەماو خانوو و بەرقو ئاو زۆر هەرزاننو هێندێك شتی وەك مەدرەسە بە خۆڕاییە. بەڵام بەهەرحاڵ مەسەلەی (عرضە و تقاضا) لە وڵاتانی سۆسیالیستیشدا هەیە. ئەو مەسەلە کە قانوونی ئابوورییەو مارکس کەشفی کردوە، ئەوەیە کە ئەگەر لە بازاڕدا شت زۆر بوو، قیمەت دێتە خوارو ئەگەر شت کەم بوو، قیمەت دەچێتە سەر. لە وڵاتانی سۆسیالیستیدا عەوامیلی زۆر پەیدا دەبن کە دەخالەت لەو قانوونەدا دەکەن. نەك هەر دەخالەت دەکەن، بەڵکوو نایەڵن بازاڕەکە بە کەیفی خۆی ئیستیفادە بگەیەنێ. گرنگترینی ئەو عەوامیلانە پلان یان نەخشەیە. لە سەرەوەدا دادەنیشن نەخشە دەکێشن دەڵێن کە ئێمە دەبێ لەو ماوەدا ئەوەندە شت دروست بکەین، ئەوەندە ئوتۆمبیل دروست بکەین، ئەوەندە خانوو دروست بکەین، ئەوەندە بەرهەمی گەنممان هەبێو. . . . دیارە دەبێ وا دیاری بکرێ کە هەموو ئەوانە پێکەوە بخوێنێتەوە، ئەوە کارێکی یەکجار زەحمەتە لە مسکۆڕا بڕیار بدەی کە مەسەلەن لە "ولادی وستۆك" فلاَن کارخانە دەبێ چ بەرهەم بێنێ، ـ بەینی مسکۆ تا ولادی وستۆك لە فاسیلەی بەینی مسکۆ نیۆیۆرك زیاترە ـ جا لەو فاسیلەیەدا بڕیار بدەی کە لە فلاَن کارخانەی ولادی وستۆکدا دەبێ چی تەولید بێ. ئەگەر ئەو تەولیدە وا دابنێین کەوش بێ، کەوش چەرمی دەوێ، چەرم ئەوەندە دروست بکەی کە لازمە، بۆ ئەو کەوشە بزماری دەوێ ئەوەندە دروست بکەی کە لازمە. دیارە کەوش شتێکی

زۆر سادەیە، ئەگەر شتەکە بوو بە ئوتۆمبیل ئیدی ئەوە دەبێ بە دەیان کارخانە کار بکەن بۆ ئەو کارخانەی ئوتۆمبیل سازییە.

لە وڵاتی سەرمایەداریدا، سەرمایەدار لە هەر جێگایەك ئاگادار بوو شتێك پێویستە قیمەتێکی داناوە، لە هەر جێگایەك شتێك کەم بوو، کابرای سەرمایەدار تێگەیشت کەمتر لە بازاڕ دەست دەکەوێ‌و باش دەفرۆشرێ، دەستبەجێ سەرمایەگوزاری دەکاو دەست دەکا بە تەولیدی ئەو شتەو قازانجێکی زۆری دەست دەکەوێ. مەسەلەن لە فلاَن کارخانەدا شت کەمتر تەولید دەبێ، دەستبەجێ دوای سەرمایەگوزاری دەست دەکا بە تەولید، بەرەبەرە ئەو شتە کە لە بازاڕ زۆر بووو ئیدی تەولیدەکەی ئەو قازانجەی نەما، شتێکی دیکە بەرهەم دێنێ‌و قیمەتێکی دیکەی بۆ دیاری دەکاو هەر بەم چەشنە درێژە دەدا. بەلاَم لە سیستمی سۆسیالیستیدا سەرمایەدار ناتوانێ ئەو کارە بکا، لەوێدا نرخی شتومەك دەوڵەت دیاری دەکا، مەسەلەن دەڵێ دەبێ هێلکەیەك بفرۆشرێ بە تمەنێك، نابێ زیاتر لە تمەنێك بفرۆشرێ. لە مسکۆ قیمەتەکەیان داناوە، لە فلاَن جێگای ئۆکراین‌و سیبیریش هێلکەکەی دەبێ وا بەرهەم بێنێ کە بە تمەنێکی بفرۆشێ، کەڵخۆزەکە هەرچی دەکا دەبینێ ئەگەر هێلکەیەك بە تمەنێك بفرۆشێ زەحمەتەکەی دەرناهێنێ، بە ناچار مریشك راناگرێ، ئەگەر مریشکی رانەگرت هێلکە نیە، دەوڵەتیش ئیزن نادا قیمەتەکە بچێتە سەرێ، چونکە ئەگەر هێلکەی کرد بە دوو تمەن زەحمەتکێشانی شار حوقووقیان ئەوەندە نیە هێلکە بە دوو تمەن بکڕن‌و بۆ شتی دیکەش هەر بەم چەشنەیە. لە زەمانی برێژنێفدا بازاڕێکیان ساز کردبوو، پێیان دەگوت بازاڕی کەڵخۆزی، ئەو بێجگە لەو بازاڕە دەوڵەتی‌یە بوو، کەڵخۆزەکان حەقیان هەبوو بەرهەمە زیادی‌یەکەیان لەوێڕا بێننە ئەو بازارەو بیفرۆشن‌و قیمەتەکەشی بە دەستی خۆیان بوو. فەرقی ئەو دو بازاڕەش لەوەدا بوو کە بازاڕی دەوڵەتی میوەی رزیو، گۆشتی خراپ، هێلکە هەر نەبوو، پەنیری خراپ بە قیمەتی هەرزان، بەلاَم لە بازاڕی کەڵخۆزەکان باشترین میوەو گۆشت‌و هێلکە هەبوو، بەلاَم بە قیمەتێکی زۆر گرانتر دەیانفرۆشت‌و زووش تەواو دەبوو.

بە کورتی شێوەی بەڕێوەبەری ئابووری‌و بە تایبەتی ئەو کەسەی کە بەرهەم دێنێ، دەی‌هەوێ بزانێ تا چ رادەیەك بەرهەمهێنان بە قازانجە؟ نرخەکەی کێ دیاری دەکا؟ ئەوە ئەساسی مەسەلەکەیە، یانی ئەگەر یەکیەتیی سۆڤیەت دەی‌هەوێ هێلکە

لە بازاڕ هەبێ ئەوەڵەن ئەو کەسانە کە بەرهەمی هێلکەیان هەیە، ڕێگایان بدا ئــەوان قازانجێکی ئەوتۆیان دەست کەوێ کە بە دڵەوە کارەکە بکەن. لە لایەکی دیکەشەوە بۆ ئەوە دەبێ ڕێگا بدەن نرخەکەشی نرخێکی وابێ کە ئەوان قازانج بکەن بۆ ئەوە، دەبێ نرخو پلان هەردووکیان بگۆڕدرێن. مەسەلەن لەوێ ڕێگایان داوە تەقریبەن زۆر کــەمتر لە یەك چوارەمی هێکتاریش عەرز هی خودی کەڵخۆزەکەیە. ئــەم هۆیانــەن کــە لــە یەکیەتیی سۆڤیەت شت زۆر کەم دەست دەکــەوێ، لــە حــاڵێکدا عەرزەکــەی هەیــە، تراکتۆرەکەی هەیە، موهەندیسەکەی هەیە، کوودی هەیە، بەڵام عەلاقە بە کارەکە لە جووتیارەکەدا نیە.

لــە وڵاتــانی ســەرمایەدارییشدا نەخشــە هەیــە، تــەرحو بەرنامــە هەیــە، بــەڵام جیاوازیەکە لەوەدایە کە لە وڵاتانی سەرمایەداری بەرنامەو نەخشە تــابعی بــازاڕن. لە وڵاتی سۆسیالیستی بازاڕ تابعی بەرنامەو نەخشــەیە. بــۆ ئــەوەی وەزعەکــە لــەو وڵاتانەدا باشتر بێت لانیکەم لە وڵاتــی سۆسیالیســتی دەبــێ ئــەو دوانــە "هەمتــراز" بکرێن، بە بێ نەخشە ئانارشیسمی سەرمایەداری زیندوو دەبێتەوە. بەڵام وا بکەن کە بازاڕ نەخشێکی ئەوتۆی هەبێ کە بتوانێ ئەو تەنزیمە پێك بێنێو خــەڵك کــەمبوودی پێداویســتیەیە هــەرە ئەساســیەکانی نــەمێنێ. پێشــتر لــە وڵاتــانی ســەرمایەداری تیئۆریەك هەبوو کە زۆر جار باسی دەکرا، ئێستا کەمێك زیاتر زیندوو بۆتەوە، ئــەو تیئۆریە بە لاتینی پێی دەڵێن "کومپرژانس". کومپرژانس یانی لێك نزیك بوونەوە. مەبەســت لــەو تیئۆریــە ئــەوە بــوو کــە هێندێــك کــەس لــــەو بڕوایـــەدا بـــوون، بەرەوپێشچوونی تێکنیك بەتایبەتی لە ڕۆژگاری ئێستای ئێمـــەدا خــەڵك لێــك نزیــك دەکاتەوە، هەموو شتێك خەریکە ئوتۆمـــاتیزە دەبــێ، هــەموو شــتێك خەریکــە بــە کامپیوتێر جێبەجێ دەبێ، هێندێك کارخانە هەن لە ئەمریکاو تەنانەت لە وڵاتاکانی دیکەشدا ئوتۆماتیزە بوون، جاران ٥٠٠ کرێکــار کاریــان تــێدا دەکــردن، ئێســتا ٥ موهەندیس ئیدارەیان دەکەن. هەر کرێکاری نەماوە، موهەندیسە لە ســـەر ســەفحەی کامپیوتێر، لەوێڕا کارخانەکە ئیدارە دەکا. جاران ئەو کرێکارە کە ئارەقەی دەڕشت، ئیستسمار دەبوو، بۆیە مەسەلەن مانی دەگرت یان شۆڕشی چەکدارانــەی دەســت پــێ دەکرد، ئەوە ئیدی تەقریبەن لە زۆر جێگا بێجگە لەوە کە ئوتۆماتیزە بووە، نەماوە.

پێوەندی لە نێو وڵاتەکانی دنیادا بەشێکی بە شێوەیەکی توند دەچێتە پێش‌و وەك جاران نەماوە، رادیۆ هەیە کە هیچ، تەلەویزیۆن هەیە، ئێستا تەلەویزیۆن بە ماهوارە تەسویر نیشان دەداو بە تەلەویزیۆنێك دەکرێ بەشێکی زۆری بەرنامەکانی دنیا چاو لێ بکەی. بۆیە شێوەی فکرکردنەوەو بۆچوون نزیك دەبێتەوە، جا ئایا لەو نزیکبوونەوە چی دەر دێ؟ دەبێتە بۆچوونی سەرمایەداری یا سۆسیالیستی؟ بازاڕیش یەکێك لەو شتانەیە کە بازاڕی وڵاتەکان لێك نزیك دەکاتەوە. بێجگە لە ستالین کە ئەو شتانەی هێناوە، دەڵێ نابێ بازاڕ هەبێ، لە نووسراوەکانی لنین دەیان جار باسی بازاڕی سۆسیالیستی کراوە، مارکس‌و لنین کە پێش‌بینییان کردوە بازاڕ نەمێنێ، بۆ ئەو کاتەیە کە سۆسیالیزم یا کومۆنیزم لە بەشی زۆری دنیادا سەرکەوتووە. شتێکی وا جارێ رووی نەداوە، کەوابوو بازاڕ دەتوانێ نەخشی زۆر ئەساسیی هەبێ‌و رێگای دیکەش نیە بێجگە لەوە تا ئەو وەختە کە ئەوەندە فراوان بێ، ئەوەندە شت زۆر بێ کە ئێحتیاج نەمێنێ، ئەگەر لیباسمان لازم بوو بچین لیباسەکە هەڵگرین، ئەگەر هەر شتێکمان لازم بوو بچین بە جنس وەری بگرین‌و برسیمان بوو خۆراك بخۆین، جا ئەو وەختە پووڵ نامێنێ. بەڵام ئێستا هەرکەس دەتوانێ ئەوەندە بکڕێ کە پووڵی هەیە، زیاتر ناتوانێ، ئەگەر شتومەك ئەوەندە زۆر بوو لە حەد زیاترە، ئیدی ئەودەم پووڵ بۆ چیە؟ پووڵ بەکار نایە، هەرکەس دەتوانێ بە کەیفی خۆی پێویستی‌یەکانی خۆی هەڵبگرێ. بەڵام نەگەیشتوینە ئەو جێگایە. هێندێك لە وڵاتانی سۆسیالیستی ویستویانە هێندێك شتی ئاوا تەتبیق بدەن کە چونکە زودڕەس بووەو وەختی نەهاتوەو عەمەلەنیش نەتیجەکەی عەکسی بووە، کەوابوو مەسەلەی تیئۆری لێك نزیکبوونەوە لە باری تیکنۆلۆژی‌یەوە، لە باری ئەوەی کە پێوەندی‌یەکانی هەمەلایەنە لێك نزیك دەبێتەوە، شتێکی زۆر سروشتی‌یەو رۆژ بە رۆژیش دنیا لەو بارەوە دەبێتە یەك.

بەڵام ئەگەر وڵاتەکانی سۆسیالیستی بەرەو ئەوە دەڕۆن کە هێندێك نەخش بدەن بە بازاڕ، لە عەینی وەختیش‌دا لە وڵاتەکانی سەرمایەدارییش‌دا رۆژ بە رۆژ هێندێك کەس دەیانهەوێ نەخشی سەرمایەدار مەحدوود بکەنەوە، ئەویش بۆ خۆی پرۆسەی لێك نزیکبوونەوەیە. مەسەلەن ئەو وەختەی سۆسیالیستەکان لە فەرانسە هاتنە سەرکار، لە ساڵی ١٩٨١ بەشێکی زۆری کارخانەی هەرە گەورەو بەشێکی زۆری بانکەکانیان میللی کرد، یان مەسەلەن ئێستا لە سوئید کە بەشی هەرە گەورەو

بەشێکی بانەکان میللین، بەشی هەرە زۆری کارخانەکان میللین، یانیٚ وەزعێکی ماڵیاتی وایان پێك هێناوە کە ئەگەر کەسێك داهاتی گەیشتە رادەیەك کە لە حەد تێپەڕ بوو، زیاتر لە سەدی سەد ماڵیاتی لێ وەردەگرن. یانی لە ئەسڵەکەش بڕێکی لێ دەستێننەوە، بۆ ئەوە وایان لێ کردوە کە فەرقی حوقووقەکان زۆر نەبێ. لە ولاٚتی سۆسیالیستی حوقووق یەك بە دەیە. کەسی وا هەیە ٥٠٠ تمەن وەردەگرێ، ئی واش هەیە ٥٠٠٠ وەردەگرێ، هی واش هەن لە دە هەزاری زیاتر وەردەگرن، بەلاٚم ئەوانە کەمن. رەنگە هێندێك کەسیشیان هەبێ لە ٥٠٠ تمەن کەمتر وەربگرن، ئەوانیش کەمن یانیٚ لە سەدی نەوەد، نەوەدو پێنجی خەڵکەکە لە بەینی یەكو دەیە. تەقریبەن لە سوئیدیش وای لێ هاتووە، ئێستا لە سوئیدیش هەر یەكو دەیە. لە واقێعدا زۆر کەم کەس هەیە کە مەسەلەن لە ٢٠ هەزار کرۆن لە سوئید مانگانە زیاتر وەرگرێ. چونکە ئەگەر فڕوفێلو دزی نەکاو ماڵیاتەکەی بدا دێتە خوارێ دەبێتە دە هەزار، لە واقێعدا بە شێوەیەکی دیکە حوقووقەکانیان لێك نزیك کردۆتەوە. بەلاٚم دنیاش بەرەو ئەوە دەڕوا کە سەرمایەداری گەورەش دەمێنێتەوە، یانیٚ فەقیر هەیە، هی واش هەیە ٢ ملیۆن فرانکی پێ پووڵ نیە، ئی واش هەیە ٢٠ ملیۆن فرانکی هەیە، زۆریشن نە یەكو دوو، یانیٚ فەرقی تەبەقاتی لەوێ یەکجار زۆرە، وەك سوئید نیە، لە ئەمریکا فەرقی تەبەقاتی یەکجار زۆرە. باسی ولاٚتەکانی وەکوو مێکزیكو ئێرانی خۆمانو نازانم ئەو ولاٚتەکانی نەوتیو خەلیجو ئەوانە ناکەین، چونکە دیارە وەزعەکە لەوێ ئەسڵەن بە تەواوی فەرقی هەیە.

لە واقێعدا بە بێ ئەوەی ئەتۆ واز لە سۆسیالیزم بێنی، دەتوانی بەرەو ئەو وەزعە بڕۆی، چونکە سۆسیالیزم هەدەفی لە پێش هەمواندا ئینسانە. دەیەوێ کۆمەڵێکی وا پێك بێنێ کە ئینسان هەم لە باری ماددیەوەو هەم لە باری رۆحیو مەعنەویەوە ئاسوودە بێو تەواوی ئەوانەش کە سۆسیالیزمی خەیاڵیشیان پێك دەهێناو ئەوانەی پێش سۆسیالیزمیش حەولیان دابوو بۆ ئەوەی کە ئینسان بتوانێ تەواوی ئیستعدادی خۆی بە کار بێنێو لە باری ماددیو مەعنەویەوە ئاسوودە بێ، لە باری ماددیەوە ژیانی باشی هەبێ، هەم ئازادیی هەبێ. لە ولاٚتەکانی سۆسیالیستی لە باری ماددیەوە نەیانتوانیبوو ئەوەی کە پێویستە بیدەن بە هاوولاٚتیەکانیانو ئازادیەکەشیان لەبەین بردبوو. ئێستا ئەوەی کە تازە دەستی پێ کردوە، خەریکە

هەردووکی پێکەوە جێبەجێ دەبێ. ئەو وەزعە بۆتە هۆی ئەوە کە بوحرانێکی یەکجار زۆر قوولٚ لەو رێکخراوانە کە خۆیان بە چەپ دەزانـــن پێـك بـێ. لـەو چـوار سـالّەی رابردوودا رۆژنامەی "مردم" کە جاران ئەگەر مەســەلەن سـوڤیەت فەزانـەوەردێکیان ناردبا، چوار وتاریان لە سەر دەنووســی، ئێســتا ئـەو شـتە گەورەیـە لـە یەکیـەتیی سۆڤیەتی‌دا رووی داوە کە زۆر کەس بە شۆڕشی تازەی دادەنێ (ئێمـەش لـە راپۆرتـی خۆماندا بە شۆڕشمان داناوە) تەنیا سێ چوار مەقالەی بێ ناوەڕۆك‌و سـادە نـەبێ کـە ئەویش شتی رەسمیی سۆڤیەتی‌یە، هیچیان نەنووسیوە. هۆی ئـەم چەشـنە هەلّوێسـتە ئەوەیە کە بەڕێوەبەرانی حیزبی تـوودە موخـالیفی ئـەوەن کـە ئـەو وەزعـە کـە لـە یەکیەتیی سۆڤیەتی‌دا پێك هاتووە، ئەگەر لە نێو حیزبی توودە تەتبیق بکرێ، دەبـێ ئەوانەی کە ئێستا بەڕێوەبەری حیزبی توودەن، لە پێش هەموان دەربکرێن.

**کۆمەلّە:**

کۆمەلّە دیارە لەگەلٚ یەکیەتیی سۆڤیەت‌دا نەك هەر دۆستایەتیی نەبووە، بـەلّکوو دوژمنی بووە، بەلاّم سەیر ئەوەیە کە کۆمەلّە لە سەر گلاسنۆست‌و پرۆستۆریکا شـت نانووسێ، وا دیارە ئەوانیش لە سەر ئەو مەسەلەیە ناکۆکییان لە بەین دایـە، چونکـە ئەگەر یەکگرتوو بان شتێکیان دەنووسی. لە رابردوودا کۆمەلّە هەزاران جار یەکیەتیی سۆڤیەتی بە سوسیال ئیمپریالیزم ناو بردووەو هەزاران رەخنەیان لـێ گرتـــووە، بـەلاّم ئێستا ئەو شتانە نالّێن، مانای ئەوەیە هێندێك تێی‌دا ماونەتەوە بۆیە نانووسن.

**"راەکارگر":**

تەکلیفی خۆی روون کردۆتـەوەو بـە تـەواوی دژە، هـەزاران قسـەی بـە گۆرباچۆف‌و دێموکراتیزاسیۆن‌و ئەوانـــە گوتـوە. ئێسـتاش هـەر لـە حـالّو هـەوای دیکتـاتۆریی پرۆلیتاریا دایە.

**چریکی "اقلیت":**

هەموو بەشەکانی ئەقەلیەت سەرگەردانن، نازانن بلّێن چـی. جـاری وایـە شـتێك دەنووسن کە نیشانەی ئەوەیە کە موافیقی ئەو رەوتـەن، جـاری وایـە عەکسـی ئـەوە دەنووسن. ئەوە نیشانەی سەرگەردانیی فکری‌و تئیۆریکی تەواوە.

**"اکثریت":**

بەشی کێشتگەری‌یەکان لە ئەکسەریەت‌دا بە تەواوی ئەو خەتەیان قبوولٚ کردوە.

**"حیزبی دێموکراتیکی مردم ایران":**

بە تەواوی ئەو خەتەیان قبووڵ کردوە.

**ئازادی کار:**

موخالیفە، بەلاّم ناشوێرێ موخالیفەتەکەی دەربڕێ، بێجگە لەوانە "اکثریت"ی فەڕۆخ نگەهدار زۆر زیاتر لە حیزبی توودە ئەو شتانەی کە لە سەر گلاسنۆست‌و پرۆسۆریکا لە یەکیەتیی سۆڤیەتی‌دا هەیە مونعەکیسی دەکەن‌و ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە زۆربەیان موافیقن، بەلاّم موخالیفیشیان تیّدا هەیە.

ئەوە وەزعی ئەو ڕێکخراوانەیە لە سەر گلاسنۆست‌و پرۆستۆریکا. وا وێ دەچێ ئەو ڕەوتە ئەو ڕێکخراوانە تووشی ئینشعاب بکا. راهی کارگەر تووش بووە، بەشێکی زۆر لەو ڕێکخراوە جیا بوونەتەوەو رۆیشتوون، دەبێ چاوەڕوانی ئەو جیابوونەوانە لەوانی دیکەش بین. ئەوانی دیکەش چونکە دەبێ خەتی خۆیان دیاری بکەن، مەرزبەندی‌یەکە ئیدی مەرزبەندیی تەشکیلاتی نیە، مەرزبەندیی ئەوەیە کە کێ لەگەڵ ئەو خەتەیە کە لە یەکیەتیی سۆڤیەتی‌دا دەستی پێ کردوە، موخالیفە یان موافیق؟ ئەو مەرزبەندی‌یە شوێن دادەنێتە سەر چەپ لە ئێراندا. دوو ڕێگاش لە پێشە، یان ئەوەیە کە ئەوانەی واقیّع‌بینن، دەبێ بێن تەجدید نەزەر لە هەمووی ئەو رابردووە بکەنەوەو تەنانەت لە بۆچوونیان نیسبەت بە چینی کرێکاردا، واقیّعیەتەکان بخەنە بەرچاوو لە تەحلیلی ئاخردا بگەنە نەتیجە. بۆ ئەوە دەبێ تەجدید نەزەرێکی گشتی لە رابردووی خۆیان بکەن. ئەوانەی ئەو خەتە تازەیان قبووڵە، بەشێکیشیان هەروەکوو ڕێکخراوی پێشوو دەمێننەوە، بەلاّم لە لایەکی دیکەشەوە ئیمکانی ئەوە پێك دێ کە ئەوانەی جودا بوونەتەوەو ئەوانەی ئەو خەتەیان گرتۆتە پێش، پێی دەڵێن خەتی یەکیەتیی سۆڤیەت، ئەوانە لێك نزیك دەبنەوە، یانی ئەو جودا بوونەوەی ئەوجارە ڕەنگە سەرچاوەی یەکگرتنەوەی ئەو ڕێکخراوانە بێ کە بەرەبەرە عەینی ئەو خەتە دەڕۆن. لە واقیّعدا چەپێکی دێموکراتی، خەللاق، چەپێکی مارکسیستی دێموکراتی لە ئێراندا پێك بێ، بەلاّم بێگومان جارێ ئەو ڕێکخراوانە لە پرۆسەی جیابوونەوە دان، یەکگرتنەوە ماوەیەکی زۆری پێ دەوێ‌و لە رادەی جیهانییش‌دا وەك پێشتر ئیشارەمان پێ کرد، وەزعەکە لەباری مەرزبەندی بۆ وڵاتانی سۆسیالیستی هەر بەم چەشنەیە.

## فەسڵی حەوتەم:

# هەلومەرجی ناوچە پاش کۆتاییهاتنی شەڕی ئێـــــران ـ عێـــــــراق

# هەلومەرجی ناوچە پاش کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران ـ عێراق*

هاوڕێیان! ئەوساڵ ئێمە لە هەلومەرجێکی زۆر ناسك داین. کە دەڵێم "ناسك" مەبەستم ئەوە نیە کە هەلومەرجەکە بۆمان خراپە. مەبەست ئەوەش نیە کە هەلومەرجەکە بۆ ئێمە باشە. ئەوە دەگەڕێتەوە سەر کاری خۆمان، ئەگەر بتوانین لەو شەرایەتە، لەو هەلومەرجە کەڵك وەربگرین، ئیستفادە بکەین ئەوە هەلومەرجێکی زۆر باش بۆمان هەڵکەوتووە. ئەگەر نەتوانین لەو هەلومەرجە کەڵك وەربگرین، وەختەکە بە خۆڕایی بچێ، ئەو وەختە هەلومەرجێکی ناسك بۆ ئێمە پێك دێ.

ئێوە دەزانن نزیك بە هەشت مانگ لەوەی پێش لە سەر فشاری داخڵی، لەسەر ناڕەزایەتیی خەڵك‌و لە سەر فشاری نێونەتەوەیی، کۆماری ئیسلامی ناچار بوو بڕیارنامەی ٥٩٨ی شوورای ئەمنییەت قبووڵ کات. پێم‌وایە لەوەی باشتر ناگوترێ کە خودی خومەینی گوتی، لە واقیعدا ئەو بڕیارنامەیە بۆ خومەینی وەك ژەهر وابوو کە خواردیەوە. ( هەرچەند زۆر لە هاوڕێیان دەپرسن ئەو هەموو ژەهرەی خواردەوە بۆ هیچی بە سەر نایە؟) ئەو وەختەی کە ئەو بڕیارنامەیە پێك‌هات، زۆرکەس رەنگە ئێوەش شاهید بن لە هەر دوو کوردستان، بە تایبەت لە کوردستانی عێراق، ترسی ئەوەیان هەبوو کە ئەوە دیسان ساڵی ١٩٧٥ تیکرار دەکاتەوە، دیسان دەبێتە ئاشبەتاڵ، دیسان جووڵانەوەی کورد تێك‌دەشکێ. بەڵام ئێمە، رێبەرایەتیی حیزبی ئێمە، هەر لە سەرەتاوە زۆر بە سەراحەت رایگەیاند کە لە مێژووی حیزبی ئێمەدا ئاشبەتاڵ جێگای نیەو نابێ تیکرار بکرێ‌و هەروەها لێکدانەوەی حیزبی ئێمە نیشانی دا کە دەگەڵ ئەوە کە بڕیارنامەکە قبووڵ کراوە، ئەوە نابێتە هۆی ئەوە کە ئەو دوو

دەوڵەتە بە تەواوی ڕێككەونو ئاشتییەکی بەردەوام، سولْحێکی دایمی لە بەینیاندا پێك بیّو ئەو وەختە جوولاْنەوەی کورد بکەوێتە وەزعێکی سەخت. ئێمە وەکوو حیزبی دێموکرات، وەکوو حیزبێکی مەسئوول دەبیّ فکری ڕۆژی هەرەسەختیش بکەین. کە دەڵێین ئاشبەتالْ نابیّ، حەتتا ئەگەر ئەو دەوڵەتانە ڕێككەوتن، ئێمە دەبیّ خەباتی خۆمان درێژە پیّبدەین. ڕێبەرایەتیی حیزبی ئێمە فیکری ئەو وەختەی کردۆتەوە. باشترە ئینسان لە سیاسەتدا فکری حاڵەتی هەرەسەخت بکاتەوە چونکە ئەوانی دیکە ئاسان دەبن، ئەگەر لە فکری حاڵەتی ئاساندا بیّ، ئەو وەختە سەختەکەی بۆ تەحەمول ناکریّ. بۆیە حیزبی ئێمە ڕێگای ئەوەی کە لە حاڵەتێكدا کە بەتەواوی ئاشتییەکی بەردەوام لەبەینی ئەو دوو دەوڵەتەدا پێكبیّ، ڕێگای دیوەتەوە بۆ ئەوە کە ئێمە لەو حاڵەتەدا چ دەکەین. دەمێنێتەوە ئەوە ئایا ئەو دوو دەوڵەتە دەتوانن ڕێككەون؟ پێمانوایە نا. ئێمە دەبیّ خۆمان بۆ حاڵەتی ڕێککەوتن ئامادە بکەین، بەلاْم پێمانوایە زەحمەتە. چونکە دیارە جەوهەرو ماهییەتی ئەو دوو دەوڵەتە یەك ناگرنەوە.

دەوڵەتی ئێران کۆمارێکی بەناو ئیسلامی، ئەسناعەشەری، ویلایەتی فەقیهییە کە دەیهەویّ بە زۆر شۆڕشی ئیسلامیی خۆی سادر بکاو عێراق حکوومەتێکی لائیك، غەیری مەزهەبی کە دەیهەویّ بەو بەرنامەی خۆی دایناوە سۆسیالیزم! دروست بکا. کەواتە ئەو دوو دەوڵەتە بە هیچ شێوەیەك جەوهەریان یەك نیە. مەسەلەی دووهەم ئەوەیە کە هەشت سالْ شەڕ بووە لە بەینیان، دوژمنایەتی عەرەبو فارس شتێکی تازە نیە. لە تاریخدا دەیان جار شەڕیان کردووە. پاش هەشت سالْ شەڕ وا ئاسان نیە ئاکامی ئەو دوژمنایەتییە لەبەین بچیّ. لە نەتیجەدا، ئێمە پێمان وایە کە ئەو دوژمنایەتییە هەر دەبیّ ماوەیەك بەردەوام بیّ. جگە لەوە هێندێك شت هەیە کە لەبەینی ئەواندا چارەسەر نابیّ. من دەمهەویّ تەنیا دووشتتان بۆ باس بکەم: یەکیان ئەوەیە ئەگەر دیققەتتان کردبیّ ڕۆژ هەتا ئێواریّ، ڕادیۆو ڕۆژنامەکانی ئێرانو قسەکەرانی کۆماری ئیسلامی هاوار دەکەن دەڵێن؛ عێراق جاریّ خاکی ئێمەی داگیر کردووەو ناچێتە دەریّ. عێراقیش جوابی ئەوەیە کە خاکی ئێمە داگیر دەکەن. باشە کێهەیان ڕاست دەکەن؟! عێراق ڕاست دەکا یان ئێران؟ ئەگەر دیققەت بکەین پێموایە هەردووکیان ڕاست دەکەن. بۆ هەردووکیان ڕاست دەکەن؟ چونکە عێراق دەڵیّ ئەو

سنوورەی کە هەیە ئی پاش ساڵی ١٩٧٥ە. عێراق دەڵێ ئەمن ئەو سنوورەم قبوول نیە. سنووری پێش ساڵی ٧٥م قبووڵە. ئەگەر سنووری پێش ساڵی ٧٥ بێ، ئەوە عێراق هیچ خاکێکی داگیر نەکردوە. ئەگەر پاش ساڵی ٧٥ بێ دیارە داگیری کردوە. عێراق دەڵێ پەیماننامەی ١٩٧٥ لەغو کەنەوە. ئێران دەڵێ لە جێگای خۆیەتی. دووهەم مەسەلە کە هەر لەو بابەتەوە دێتە مەیدانێ، مەسەلەی "شط العرب"ە. ئێران بە پێی پەیماننامەی ١٩٧٥ حەقی نیوەی شەتولعەرەبی هەیە. عێراق دەڵێ ئەو پەیماننامەیە نەماوە، شەتولعەرەب ئی خۆیەتی. ئەوە مەسەلەیەکە عێراق رایگەیاندووە بە هیچ شێوەیەك نایهەوێ پاشەکشەی لێبکا. ئێرانیش ناتوانێ قبووڵی بکا. چونکو ئەگەر ئەوەی قبوول بکا بە مانای ئەوەیە لە شەڕدا شکستی خواردووە. مەسەلەی دووهەم ئەوەیە باشە کێ شەڕەکەی دەست پێکرد؟ ئێران شەڕەکەی دەست پێکرد یان عێراق؟ دیارە هەموو ئێران تەبلیغاتەکەی لە سەر ئەوە داناوە کە عێراق شەڕەکەی دەست پێکردووە. عێراقیش دەڵێ ئێران ئەوەندە تەحریکی کرد تا نەتیجەکەی بوو بە شەڕ. بە کورتی ئەو دوو مەسەلەیە رێگا نادا ئەو دوو حکوومەتە پێکەوە رێككەون. بێجگە لەو دوژمنایەتیە کۆنە کە لە بەینیاندا هەیە، مەسەلەیەکی دیکەش هەیە کە ئەوە بۆ ئێمە {لە هەمووان گرنگترە} ئەویش ئەوەیە ئەگەر پەیماننامەی ١٩٧٥ بەسترا بۆ بەسترا؟ بۆ ئەوە کە عێراق حازر بوو نیوەی شەتولعەرەب بدا بە ئێران، بۆ ئەوە ئێران پشتیوانی لە جوولانەوەی کوردیی مەلا مستەفا بارزانی نەکا. لە واقیعدا جوولانەوەی کورد بوو بە هۆی ئەوە کە قەراردادی ١٩٧٥ پێك بێ. بەلام خۆ جوولانەوەی کورد ئەگەر ئەو وەختە کە تەنیا لە کوردستانی عێراق هەبوو، ئێستا هەم لە کوردستانی ئێران هەیەو هەم لە کوردستانی عێراق. کەوابوو جوولانەوەکەش پانوبەرینە، سیاسیترە لە جاران، عەشیرەتی نیە. لە بەر ئەوە هەرکەس بیهەوێ تەنانەت مەسایلی دیکەش حەل بکا، ئاشتییەکی بەردەوام پێكبێنێ ـ لەبەینی ئێرانو عێراقدا ـ دەبێ چارەسەرێکی بۆ مەسەلەی کورد بکا. بێ چارەسەری ئەو مەسەلەیە هیچ ئاشتییەکی بەردەوام لە بەینی ئێرانو عێراقدا نابێ. هەموو وەختێ ئەو شاخو داخە بۆ ئەوە دەبێ کە کورد بتوانێ ئەو ئاشتییە تێك بدا. تێکی دەدا ئەگەر حەقی خۆی وەرنەگرێ. هەر بۆیە لێرە دانیشتووە کە تێکی بدا، حەقی خۆیەتی. کەوابوو نەتیجە دەگرین؛ نەتیجەکە ئەوەیە کە

دادەنیشن پێکــەوە قســە دەکــەن ـ فشاریشــیان زۆر لەســەرە لــە دەرەوەڕا ئــەو دوو دەوڵەتە ـ بەڵام ئاشتیی بــەردەوام لەبــەینی ئەوانــەدا بــە زەحمــەت پێــك دێ. ئێمــە وەختێك کە بڕیارنامەکە قبوول کرابوو باسمان کرد کە ڕەنگــە شــەش مــانگ تــا دوو ساڵی بــوێ هــەتا بەتــەواوی ڕێــك دەکــەون. ئێســتا ٨ مــانگ رابــردووە نــەك هــەر ڕێكنەکەوتوون بەڵکوو نێوانیان برێکیش ناخۆشتر بووە تا هەشت مانگ لەوەی پێش. ئێستا لەو بڕوایەداین کە مەسەلە، مەسەلەی پانمیلییە. ڕەنگــە زۆری بکێشــێ کــە ئەو دووانە بتوانن پێکەوە ڕێك بکەون.

لە پاشان کەمێکیش لە سیاسەت ئەگەر ورد بینەوە، هێندێ شتی دیکــەشمان بــۆ دەردەکــەوێ. هــەتا ئێســتا ئێمــە وەکــوو حــیزبی دێموکراتــی کوردســتانی ئــێران، پێمانخۆش نیە زۆر هێزی خۆمان بەکار بێنین، پێمانخۆش نیــە زۆر شــەهید بدەیــن. پێمانخۆشە وەزعی خۆمان بەباشی رابگرین. بۆچی؟ ئەوەمان داناوە کە ئیمامەکەمان بەو زووانە تەشریفی دەڕوا. ئیمام! کە ڕۆیی ئەو وەختە وەزعی وڵات تا رادەیەکی زۆر دەگۆڕێ. ئێمە لەوانە نین کە بڵێین ئەوڕۆ خومەینی بمرێ سبەینێ لــە ئــێراندا شــۆڕش دەکەین. بەڵام پێمانوایە کە ئەو ڕێژیمە گۆڕانی بە سەردا دێو ڕێگا خۆش دەکرێ.

ئەوە ئەو هەلومەرجە ناسکەیە. وەختێك پێكهاتووە بــۆ ئێمــە کــە شــەڕ بــەینی ئێرانو عێراق نەمێنێ، بەڵام پێکەوەش بە تەواوی ڕێك نەکەوتوون. ئەوە فاســڵەیەکی زۆرزۆر بەجێیە. ڕەنگە چەند مانگی دیکە بێ، ڕەنگە چەند ساڵی دیکــە بــێ. ئێمــە دەبێ لەو فاسڵەیە، لەو ماوە زەمانییە کەڵك وەرگرین، ئیستفادە بکەین. ئەوە ئەرکی سەرشانی مەیە. باشە چ بکەین؟ چ ئەرکێکمان هەیە کە دەبێ بە جێــی بێنــین؟ مــن پێموایە کە ئێمە سێ ئەرکی گەورەمان کەوتۆتە سەرشان. بە تایبەتی لــەو ماوەیــەدا دەبێ تێبکۆشین جێبەجێیان بکەین. یەکەم لە هــەموان موهیمــتر ئەوەیــە کــە لــە مەیدانی خەبات لە نێوخۆی ئێراندا هەر دەنگمان هەبێ، هەر تەقەمان هەبێ. دیــارە بە شێوەیەکی ڕێکوپێکترو بە شێوەیەکی باشتر. هەر لەو کاتەدا کە خۆمان دەپارێزین لەوە کە بەخۆڕایی شەهید نەدەین، لەو کاتەدا دەبێ زەربە لە دوژمــن بدەیــن. دەبــێ زەربە لە ڕێژیمێك بدەین کە ڕۆژبەڕۆژ کزتر دەبێ. ئەوەڵەن ئێمــە لــەو بڕوایــەداین کــە ڕێژیمی ئێران بە پێچەوانەی ئەوە کە پار دەیهەویســت پیشــانی بــدا، ئەمســاڵیش زۆر کزترە لە جاران، زۆر کەس وا فکر دەکاتەوە ـ کەمێك غەیر سیاســیانە ـ کــە ئــێران

ئێستا دەگەڵ عێراق شەڕی نەماوەو هەرچی هێزی هەیە کۆی دەکاتەوەو لە کوردستان خۆی بەهێز دەکا. باشە ئەگەر ئێمە شەڕی جبهەیی لەگەڵ ئێران بکەین ئەو قسەیە راستە، بەلاّم ئێمە شەڕی جبهەیی‌مان نەکردووە. پێشمەرگە بوو بە پارتیزان لە هەموو جێگایەکی هەبوو و لە هیچ جێگایەکی نەبوو. ئەو وەختە ئێران چ دەتوانێ بکا با ١٠٠٠٠٠ نەبێ ٥٠٠٠٠٠ بێ. ئەو وەختە تەئسیری هەیە کە ئێمە شەڕی جبهەیی بکەین کە نایکەین، لە پاشانیش ئێران ئێستا دوو کۆسپیشی لەپێشە بۆ شەڕکردن دەگەڵ پێشمەرگە.

یەکیان نیزامییە، نیزامییەکەی ئەوەیە ئەوانەی کە پێشمەرگەن بەتایبەتی ئەوانەی کە تەجروبەیان لەو چەند ساڵەیدا زیاترە لەگەڵ رێژیمی ئێرانی، زۆر باش دەزانن کە نوقتەی هەرەبەهێزی ئەو رێژیمە نە ئەوە بووە کە ئەوەی لە شتی نیزامی‌دا دەڵێن "لۆژستیکی" باشتر بووە، نە سازماندەهی باشتر بووە، نە سەربازو پاسدارو بەسیجی‌یەکەی پوختتر لە پێشمەرگەی ئێمە بوون. هیچی لەمانە نەبووە. هێزی دەچی‌دا بووە؟ لە سەرەتادا هێزی لەوەدا بووە کە ئەو جەوانانەی کە دەهاتن بۆ شەڕ، پێیان دەگوترا کە ئەگەر ئێوە بکووژن ئەوە خزمەتی ئیسلامتان کردووە!. ئەگەر بکووژرێن دەچنە بەهەشتێ!. یەعنی رووحییەیان باش بووە، ورەیان لەسەرێ بووە. ئەوە نوقتە قووەتی رێژیمی ئێران بووە. هەر ئەو وەختە کە ئەو نوقتە قووەتە نەما ... پار ئەو وەختانە ئەگەر لە بیرتان مابێ پاش فاو، ئیدی شکست لەدوای شکست بە سەر ئێرانێ هات. بۆ؟ چونکە رووحیەکە نەمابوو. ئێستاش هەروایە، ئەو جەوانانە کە دەساڵ لەوەی پێش دەهاتن لە کوردستان یا لە دژی عێراق ٨ساڵ لەوەی پێش شەڕیان دەکرد، ئەوان بە بیروباوەڕ بوون، بە ئیمانەوە هاتبوون شەڕ بکەن. ئێستا ئەو بیروباوەڕە، ئەو ئیمانە نەماوەو ئەوە نوقتە زەعفی هەرەگەورەی ئەو رێژیمەیە. کەوابوو لە باری نیزامییەوە لە مەیدانی شەڕدا ئێوە تەرەف نین دەگەڵ کەسانێك کە هەتا ئاخر فیشەك شەڕتان دەگەڵ بکەن.

دووهەم: کۆسپێکی سیاسیشی لەپێشە ئەویش ئەوەیە چەندین ساڵە هەر لەو وەختەوە شەڕی ئێرانو عێراق دەستی پێ‌کردووە رێژیمی ئێران تەبلیغات دەکا کە ئەوانەی کە لە کوردستان شەڕ دەکەن ئەوانە بەعسین، پیاوی عێراقن. باشە خۆ ئێستا عێراق شەڕ ناکا. ئەگەر ئێستا شەڕ بکرێ لە کوردستان ـ کە پار مەسەلەن هێزی

شیمال زەربـــەی تونـدی وەشـاند لـە دەوروبـەری ورمـێو زۆر کەسیان لـە کـوژراوو بریندارەکانیان بردە شاری ورمێ ـ خەڵکەکە پرسیاریان دەکرد باشـە ئەوانـە لـەکوێ کوژراون؟ ناڵێن شەڕی ئێرانو عێراق نەماوە؟ ئەو سەرپۆشەشە کە چەند ساڵ ڕێژیم لە سەر شەڕی کوردستان دابینابوو، ئێستا مەجبوورە لابچێ. مەجبورە ئیعتیراف بکا کە ئەوەڵەن، شەڕێکی دیکە هەیە لـە ئـێران ئـەویش لـە کوردسـتانە. دووهـەم، دەبـێ ئیعتیراف بکا بەوە کە لەواقیعدا نەیتوانیوە لە کوردستاندا زاڵ بـێ. نـەیتوانیوە بـەو شێوەیە کە ئیددیعای دەکرد شەڕەکە خەلاس بکاو لە هەمووان گرینگـتر ئەوەیـە کـە دەبێ ئیعتیراف بکا کە حیزبی دێموکراتو پێشمەرگەکانی کە شەڕ دەکـەن، بەعسـی نین چونکو بەعس شەڕ ناکا. بەعس دەگـەڵ ئـێران ڕێککـەوتووە. بـەعس دەیهـەوێ پەیماننامە ئیمزا بکا، بەڵام ئێمە نامانهەوێ. لە ڕۆژی ئەوەڵەوەش گوتوومانـە ئێمـە شەڕ بۆ شتێك دەکەین. ئەو شـەڕە بـە سـەر ئێمـەدا تـەحمیل بـووە، بـۆ شـتێك بـۆ دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان. کەوابوو هەتا ئەو وەختـە نەگـەین بە هەدەفی خۆمانو ئامانجی خۆمان، شەڕی ئێمـە هـەر بەردەوامـە. ئەگـەر ئەوانـە هەموو بخەینە بەرچاو، نەتیجە دەتوانین وەربگریــن کـە ئـەرکی یەکـەمان زۆر باشـتر دەتوانین جێبەجێ بکەینو نیشان بدەین ئێمە هـێزێکی سـەربەخۆین، سـەر بـە هیـچ جێگایەك نین، سەر بە میللەتی کوردو حیزبی دێموکراتینو ئاواتی خۆمان ئەوەیە کـە دێموکراسیو خودموختاری وەدەست بێنینو دەتوانین دوای تـەواو بوونـی شـەڕیش لـە داخڵی کوردستانی ئـێراندا، هـێزی خۆمـان نیشـان بدەیـن. ئـەوە پێموایـە ئـەرکی هەرەگرنگی ئێمەیە کە دەبێ ئەوساڵ بەتایبەتی کە ساڵێکی ناسکە زۆر باشتر نیشانی بدەین. ئەو نیشاندانە، دیارە مانای ئەوە نیە کە بۆتان باس کراوەو باسـیش دەکـەین کە ئێمە هەروا خۆمان بە سەر پایگادا بدەین، یا خۆمان بە خۆڕایی بەکوشت بدەیـن، نا بە پێچەوانەوە، دەبێ زۆر وردو زۆر نەقشەی دەقیقمان هـەبێ. وابکـەین کـە هیـچ شەهیدمان نەبێ یا ئەگەر شەهیدمان هەبوو، زۆر کەم بێ. دەبێ ئاوا بچینـە پێشـێ، بەڵام لە جێگای خۆشی زەربەی باشی لێدەدەین. ئەوە نەبێ کە ئێمە لە ماوەی چـەند مانگان بڵێین ٥٠ عەمەلیاتمان کردووە، نا لـە مـاوەی چـەند مـانگدا دەبـێ چـەند عەمەلیاتی باش بکەین کە دەنگ بداتەوە. بە تایبەتی ئەوە ئێوە هـێزی شـیمال لـە هەموو جێگایەك زیاتر دەگرێتەوە. هۆیەکەیشی روونـە، چونکـو ئێـوە لـە سـنووری

تورکیەدان ـ ئەگەر برێك دوورتر بڕۆن دەگەنە سنووری سۆڤییەتیش کە نـاڕۆن! نـازانم بۆ ناڕۆن؟ ـ ئێوە هەر ئەوەندە ڕەنگە تەقەش نەکەن، بەلاّم بڕوام پیّ بکەن کە مەسەلەن لە ماوەی حەفتەیـەکدا سـیّ چـوار جـار پـەلێکی پێشـمەرگە بچێتـە سـەر ڕێگـای "بازەرگان" یا ئێستا مەسەلەن ڕێگای "سێرۆ"ش بۆتە ڕێگایـەکی ئەسـڵی، بچێتـە سەر ڕێگای سێرۆ. هەر ئەوەندە، چونکو ئەوانەی کە لە دەرەوەڕا دێن، زۆریان خارجین حەتتا شۆفێرەکانی ئەو ترۆمبێلانە خارجین. دەنگ دەداتەوە لە هەموو ئورووپا کە ڕیّ گیراوە، هەرچەند مومکینە تەقەش نەکەنو ئەوە تەئسیری زۆر لەوە زیاترە لەوەی کـە ئێمە مەسەلەن لە ناوەندی کوردستان پایگایـەکی ١٥٠ کەسـیش بگریـن کـە ڕێژیـم سەرپۆشی لە سەر دانیّو باسی نەکات.

ئێوە بتانهەویّو نەتانهەویّ، مادام شیمالین ئەرکی سەرشانی ئێـوە هـەر ئەوسـاڵە زۆر قورسە لە هەموو ئەوانی دیکە. دەبیّ چالاکترو فەعالتر بن. ئەوە شتێکە نابیّ لە بیرتان بچیّ، بۆچی؟ بۆ ئەوە کە ئەو ئەرکە گرینگە کە باسم کرد، نیشـان بدەیـن کـە ئێمە حیزبێکی سەربەخۆین، هێزێکی سەربەخۆین، داوای دێموکراسیو خودموختـاری دەکەینو دەمانهەویّ ئەو دێموکراسیو خودموختارییە وەربگرین، شەڕی ئێرانو عێراق هەبیّو نەبیّ ئەوە ڕەبتی بە ئێمە نیەو بۆ ئامانجـەکانی خۆمـان هـەر شـەڕی خۆمـان بەڕێوە دەبەین.

ئەرکی دووهەممان؛ ئەوەیە کە ئێمە بەداخـەوە هـەتا ئێسـتا لـە نـاوخۆی ئـێراندا بەتەنیاین. ڕاستە لەو ئاخرانەدا هێندێك تەقە کراوە لە بەلووچستان هێندێك جموجـۆڵ هەیە مەسەلەن بڵێین تورکەمەنسەحرا، بەلاّم واقعییەتەکەی ئەوەیە کە بەو شـێوەیەی کە ئێمە هەین، لە داخڵی ئێراندا هیچ کەسی دیکەی لیّ نیـە. بۆیـە ئێمـە ناچـارین ئەگەر واقیعبین بین، ئێمە بە تاقی تەنیا ناتوانین ببین بە ئالترناتیڤ، یەعنی نـاتوانین ببین بە جێنشینی ڕژیمی خومەینی چونکو کوردستانی ئێران سەدی ٧ی خاکی ئێرانە. گەلی کوردیش لـە کوردسـتانی ئـێران سـەدی ١٧ی دانیشـتوانی ئێرانـە. ئێمـە لـە ئەقەلییەت داین کەوابوو، دەبیّ هاوپەیمانمان هـەبیّ لـە بەشـەکانی دیکـەی ئـێرانداو دۆستمان هەبیّ. ئەوەیە کە حیزبی ئێمە هەر لە سەرەتاوە هەموو وەختێك مەشغووڵی ئەوە بووە. یەکەم دەگەڵ گەلانی زۆرلێکـراوی ئـێران ـ کـە بەداخـەوە ڕێکخراوێکـی بەهێزیان نیە جـاریّ ـ وەکـوو تورکمـەن، وەکـوو بـەلووچ، وەکـوو عـەرەب، وەکـوو

ئازەربایجانی، دۆستایەتی بکا. دووهەم، دەگەڵ هەموو ئەو هێزانــە کـە ئیمانیــان بــە دێموکراسیو خودموختاری هەیە کە زۆربەی هەرەزۆری هێزەکان دەگرێتـــەوە، دەگـەڵ ئەوانیش هاوکاری بکا. ئێمە تەنیا یەك هێز وەدەر دەنێـین، ئـەویش شاپەرسـتەکانە. چونکە تەجروبەمان دەگەڵ شاپەرستەکان هەیە. لەمێژە تەجروبەمان هەیــە، ئەوەڵـەن لەو بڕوایەداین کە شۆڕشی ئـــێران سـەڵتەنەتی ناشـتووە، دەفنــی کـردووە. ٦٠٠٠٠ شەهیدی داوە بۆ ئەوە کە سەڵتەنەت لە مێژووی ئـــێراندا شـوێنەواری نـەمێنێ. لـە پاشان ئێمە لەو بڕوایەداین کە سەڵتەنەت لە ئێراندا وەك سەڵتەنەت لە ئێنگلســـتانو سوئێد نیە. ئەگـــەر پادشـا بێتــە سـەرکار دەپێـشدا دەڵـێ دێموکـراتم، بـە محەمـەد رەزاشاشیان وەختی خۆی کە تازە هاتبووە سەرکار دەیانگوت: "شاهنشاه جوان بخــت دمکرات"، دیتمان چیکرد. دێ لە پێشدا دەڵێ دێموکراتم، بەڵام لــە پاشــان دەبێتــە دیکتاتۆرێك کە ئەو سەری دیار نیە. کەوابوو شاهەنشاهی بۆ ئێمە یانێ دیکتاتۆری. لە پاشان دەبێتە دیکتاتۆر چونکو لە نێوخۆی وڵاتدا هیچ پایگـــاهێکی ئیجتیمـاعی نیە، هیچ بنکەیەکی کۆمەڵایەتی نیەو مەجبوورە خۆی ببەستێتەوە بە دەرەوە. جاران شایەکانی ئێران خۆیان، خۆیـــان بەســتبۆوە بــە رووســیەی تـزاری لــە پاشــان خۆیــان بەستبۆوە بە ئێنگلستانێ، ئێستاش خۆیـــان دەبەســتنەوە بــە ئـەمریکا. ناچـارە بــە دیکتاتۆری حوکم دەکاو میللەت پشتیوانی نیەو دەبێ یەکێکی بێگانە پشتیوانی بێ. بۆیە دەبێتە دیکتاتۆر، دەبێتە نۆکەری بێگانەو دیتمان هەر وابوو.

بەڵام ئێمە وەکوو کورد هۆیەکی دیکەشمان هەیە بۆ ئەوەی دژی شاهەنشاهی بــین. رێژیمی شاهەنشــاهی، رێژیمــی شاپەرســتی، ســەڵتەنەت، یــانێ کۆکردنــەوەی هــەموو دەسەڵات لە تاران. ئێمەش کە خودموختاریـــان دەوێ، دەمانــەوێ دەســەڵاتەکە کــەم کەینەوە لە تاران. دەمانەوێ بەشێك لــە دەســەڵاتەکە بێنینــە کوردســتان، بەدەســت خۆمانەوە بێ، خودموختاری یـــانێ ئـەوە. ئـەو دەیــەوێ "تمرکـز" پێكبێنــێ، ئێمــە دەمانەوێ "عدم تمرکز" پێكبێنین، ئێمە دەمانەوێ دەسەڵاتەکە لە تاران کەمکەینەوە. کــەوابوو ئێمــە وەك کــورد، وەك خودموختــاریخواز، هــەر دەبــێ دژی ســەڵتەنەتو شاهەنشاهی بین، هەر لە بناغەوە دژیانین. بێجگە لەوانە، دیارە ئەوانی دیکە، ئێمـــە ئامادەینو زۆریش تێکۆشاوین. دەتوانم بڵێم کە ئێستا وەزعەکە بەرەبەرە باشتر دەبێ. هەندێ لە رێکخراوەکان عاقڵتر دەبن، باشــتر تێدەگــەن کــە دەبــێ هاوکــاری بکــەن

پێکەوەو ئێمە بەرەو ئەوە دەڕۆیـن کـە بەڵکـە بتوانـین ڕۆژێـك پێکـەوە، جەبهەیـەك پێكبێنین. ئەوەش ئەرکێکە لە سەر شانمان بۆ ئــەوەی کـە ئەگـەر ڕێژێمـی خومـەینی رووخا بتوانین ڕێژیمێکی دێموکراتیك لەجێگای دابنێین، کە ئێمەشی تێدا بین، خـەڵکی دیکەشی تێدا بێ.

ئێمە دەبێ لە دەرەوەی کوردستان، بەتایبەتی لــە ئورووپـاو ئامریکـا، ئـەفکاری عموومیو بیروڕای گشتیی جیهانی رابکێشین بۆ لای مافی کورد. هەراوهووریایــەکی زۆر ساز بکەین، ئەو دەوڵەتانە کە کوردی تێدان، ئەو دەوڵەتانە بترسێنین، هەموویان، بەتایبەتی دەوڵەتی تورکیە، دەوڵـەتی ئـێرانو دەوڵـەتی عـێراق. مەسـەلەکە گـەورە بکەینەوە لە دەرەوە. ئـەوە کـە دەڵێـین مەسـەلەی کـورد بکـەین بـە مەسـەلەیەکی نێونەتەوەیی. کۆنفرانس سـاز بکـەین، کۆنفرانسـی مـەتبووعاتی سـاز بکـەین، لـە ڕۆژنامەکاندا بنووسین، لە رادیۆو تەلەفزیۆن قسە بکەین، لەگەڵ شەخسییەتەکان قسە بکەین، ڕێکخراوەکانی دێموکراتی هان بدەین، پارلمانەکان هان بدەیـن کـە دیفاعمـان لێبکەن. ئەوەی لەدەستمان بێ دەبێ بیکەین. ئەو ئاژاوەیەی لە کوردستان دەســتمان پێکردوە، لە ئورووپاشی بکەین. دیارە مەبەستم ئەوە نیە کوشتنو بڕینو ئەوانە، ئەوە لەوێ نابێ، ئەوە کاری "P.K.K"یە، ئەوە کاری مە نیە، ئێمە شتی وا ناکەین. بەڵام هەراوهووریایەکی وا ساز بکەین کە زۆر گەورە بێ. کە زۆر گەورە بوو ئەو دەوڵەتانــە ترسیان بۆ پەیدا دەبێ. کە ترسیان بۆ پەیدا بوو، ئەو وەختە بە داخوازی کەمی ئێمــە زوو رازی دەبن. وا گەورەی بکەینــەوە کـە پێیـانوابێ ئـەوە کوردسـتان وا خەریکـە هەمووی لە دەستیان دەردەچێ، ڕەنگە هەموو ببێتەوە یەك، ئــەو وەختـە مـەجبوور دەبێ بە خودموختارییەکە زوو رازی بێ. ئەوەش سیاسەتێکە کە ئێمە هەمانە.

لە ساڵی رابردوودا ڕەنگە خۆشتان ئاگاتان لێبێ، لەو بارەوە کەمێك سەرکەوتووتر بووین لە ساڵەکانی پێشــترو ئــەمن پێموایـە ئـەو سـاڵە کـە وا لـە پێشـمانە زیـاتر سەرکەوتوویی دەبیندرێ. بەڵام دەمهەوێ لێرە شتێك بڵێم، سەرکەوتنی ئەو ئەرکــەی ئێمە بەوە بەســتراوەتەوە کـە لـە داخـڵدا چـۆن بـین. ئەگـەر پێشـمەرگە لـە داخـڵ عەمـەلییاتی هـەبێ، فەعالییـەتی هـەبێ، تەشـکیلاتی حیزبمـان بەتایبـەتی لــە شارەکانیش لەمەودوا فەعالییەتی زیاتر بێ، ئەگەر بچمە دەرێ زمانم ئــەوەندە درێـژ دەکەم، دەتوانم قسە بکەمو زۆر شت بڵێم. بەڵام ئەگەر نـەبوو، ناچـارم کـولی بکـەم.

ئەوە بەستراوەتەوە بە ئێوەوەو ئەگەر دەتانهەوێ لـە دەرەوە باشـتر کارەکانمـان بچێتـە پێش لە ژوورەوە دەبێ فەعالییەتی باشتر بکەن. ئەمن پێم وایـە دەتـوانم ئـەوەندەتان پێبڵێم کە لەو یەك دوو سەفەرەی لەساڵی رابردوودا کردم قەت نەبووە کـە وەك ئـەو سـێ چـوار مانگـە نـەك هـەر بـیرورای گشـتیو رۆژنامـەکان حـەتتا هێنـدێ لـــە دەوڵەتەکانیش ئاوا ئێمە وەربگرن. هێندێك لــە دەوڵــەتان کـە جـاران حـازر نـەبوون قسەشمان دەگەڵ بکەن، ئێستا حازرن قسە بکەن، بــە رەسمـی وەرمـانگرن، گـوێ لـە قسەکانی ئێمە بگرن، هێندێك شتیشمان بۆ بکەن. دیارە ئێمە خۆشبەختیمان ئەوەیـە کە شەڕی پارتیزانی دەکەین. شەڕی پارتیزانییش نیازی بە دووشت هەیە. دەڵێن باشە چەکتان دەوێ یان پارەتان دەوێ؟ ئێمەش دەڵێین نە چەکمان دەوێ نە پارەمـــان دەوێ، پشتیوانیی سیاسیمان دەوێ. کورد بەداخەوە لــە کوردسـتانی عـێراق دەچوونـە هـەر جێگایەك داوای ئـــەو دوو شـتەیان دەکـرد. بـەڵام ئێمـە داوای پشـتیوانیی سیاسـی دەکەین. ئەمن کە دەگەڵ یەکێك لە سیاسەتمەدارانی هەرە پایەبەرزی فەرانسە قســـەم دەکرد، پێمگوت ئێمە هیچمان نـاوێ لەوانـە. گوتـی ئـەوە دیـارە ئێـوەی کـورد زۆر زیرەکن. گوتم بۆچی؟ گوتی باشە! ئەگەر یەکێك پشتیوانیی سیاســیو مەعنـەوی لـە ئێوە بکا هەموو شتێکیشتان دەداتێ. جا گوتم مەبەستی مەش هەر ئەوەیە، چونکــو بۆ ئێمە موهیم سیاسییەکەیە. بارە سیاسییەکەی هەبێ، ئەوی دیکەی دەبێ. شوکور ئێستا تەماشا دەکەم پێشمەرگەی باشو پوختو هەموو ماشــەڵڵا دیـارە نـانی بـاش دەخـۆنو چـەكو ئەوانـەش باشـە. هەمانـە، بێحەدیشـمان هەیـە. جـا پشـــتیوانیی سیاسیمان لەوان دەوێو ئەمن پێموایە ئەو پشتیوانییە سیاسییە رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێ، ئیستیفادەی دەبێ لێبکەین. دیسان ئەو فاسڵە زەمانییە بۆ ئێمــە موهیممـە. دەبـێ لەو فاسڵە زەمانییەدا مەســەلەی کـورد زۆرزۆر گـەورەتر بـێ. دەبـێ وابکـەین ئـەو دەوڵەتانە دە بەینیاندا بەرەبەرە موسابقە پێكبێ. ئێستا فـــەرز بکـەن ئێمـە دەگـەڵ نوێنەری عێراق دادەنیشینو دەڵێین تۆ حەقی کورد نەدەی ئەوە ئێران خەریکــە دەیدا، لە تورکیاش کە دانیشتین دەڵێین ئەگەر تۆ حەقی کورد نەدەی ئـەوە عـێراق خەریکـە دەیدا، لە ئێرانیش دەڵێین ئەگەر تۆ حەقی کورد نەدەی ئەوە تورکیە دەیهەوێ بیـــداو دەبێتە دێموکراسیو لە پاشان نیشتمانێکی هەیە غەیرەمەزهەبییە، لائیکــە. جـاران ئەو دەوڵەتانە کوردیان دەکرد بە ئالەتی دەست بۆ ئەوەی دژی یــەکتری بەشـەڕ بێـن،

دەبا جارێکیش کورد موسابقەیەك پێكبێنێ لە بەینی ئەو دەوڵەتانە. ئێمە پێمان وایە وەزعی نێونەتەوەیی دەرەوە بۆ ئەوە موساعیدە، بەلاّم بەستراوەتەوە بەوە کە هەم ئەرکی داخڵیی خۆمان چۆن جێبەجێ بکەینو هەم بە زانینو تێگەیشتنەوە ئەو مەسائیلەی بەرینە پێش. چونکو هەر بە گۆترەش ئەو کارە جێبەجێ نابێ. دەبێ زمانێکی وامان هەبێ، پەیامێکی وامان هەبێ کە ئەو دەوڵەتانە، ئەو سیاسەتمەدارانە، ئەو رۆژنامەنووسانە لێمان وەرگرن. چونکو جاری وا هەیە برادەری کوردمان هەیە دیارە ئی ئێمە نیە (حیزبی دێموکرات) ئی تورکیەو ئی عێراق، دەڵێ بەڵێ، ئێمە دەمانهەوێ کوردستانی سەربەخۆ دروست بکەین سنووری چوار دەوڵەتان تێكدەین. عێراق، تورکیە، سووریەو ئێرانو حەتتا هی سۆڤییەتیش جارجار. باشە هەر جارێ زیاتر ئەوەی گوێ لێبێ، دەترسێ. دەڵێ ئەوە ئاژاوەیەکی گەورە ساز دەبێو دەبێتە شەڕێکی بەینەلمللەلی. زۆر رێگایەکی ئیشتیباهە. لە پاشان شتێکی غەیرەواقعییە. کەس ناتوانێ سنووری چوار وڵاتان لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا وەلابەرێ، لە پاشان ئەو هێزەمان نیە. باشە کەوابوو دەبێ بچی بڵێی خودموختاریمان دەوێ لە چوارچێوەی ئێراندا. هیچ شتێکم ناوێ لە دەرەوەی ئێران. بەلاّم دەمهەوێ زمانی خۆم هەبێ، لە بەشی کوردستاندا کاروباری کوردستان، خۆم ئیدارەی بکەم، ئەمنییەتی داخڵیی کوردستان دەبێ بەدەستی خۆمەوە بێ. لە پاشان دەڵێم ئەوەی کە من دەمهەوێ بەشێکە لە هەموو بەشەکان. ئەگەر ئەو شێوە قسەیەمان هەبێ، راستە کە هەردووکی بۆ یەك رێبازە، بەلاّم فەرقیان هەیەو ئەوە باشتر وەردەگیرێ. ئەو پادشاهە کە لە خەونی خۆیدا دیبووی هەموو ددانەکانی کەوتوون یەك ددانی ماوە، بەیانی دوو مونەجمی هەبوو بانگی کردن بە یەکێکیانی گوت: باشە! تەفسیری چیە؟ ئەو وەختە گوتی؛ وەلاّ تەفسیری ئەوەیە کە هەرچی کەسو کارت هەیە هەموویان دەمرنو تۆ بە تاقی تەنیا دەمێنیەوە، گوتی بیبەن بیکوژن، پاش ئەوەی هەموو کەسوکاری من بمرن، من بە تاقی تەنیا چ بکەم؟ ئەوەی دیکەی بانگ کرد گوتی تۆ دەڵێی چی؟ گوتی مانای ئەو خەونە ئەوەیە عومری پادشا لە هەموو کەس زیاترو درێژتر دەبێ. جا ئەوە باشە، قسەکانیش هەر یەك بوون، شێوەی گوتنەکە جیاواز بوو.

ئەوە ئەو سێ ئەرکە کە باسم کرد. هەموومان دەبێ وەك حیزبی دێموکرات لە پێشمەرگەیەکی سادەوە بگرە هەتا سکرتێری ئەو حیزبە، حەول بدەین بۆ ئەوەی ئەو سێ ئەرکە باشتر بچێتە پێش. یەکەم، لە داخڵدا نیشان بدەین هێزێکی سەربەخۆین. دووهەم، دەگەڵ ڕێکخراوەکانی ئێران کە ئێستا زۆرتر دەبن، بەرەبەرە تێگەیشتووتر دەبن، واقێعبینتر دەبن، دەگەڵ ڕێکخراوی میللەتە زۆرلێکراوەکانی ئێران، تورکمەنو عەرەبو ئازەری، دەگەڵ ئەوانە دۆستایەتی ساز بکەین. بۆ دوارۆژ بۆ ڕووخاندنی ڕێژیمی خومەینی. بۆ دوارۆژی ئەو ڕێژیمە، دەبێ ئەو کارە بکەین. سێهەمیش کە لە دەرەوە مەسەلەی کورد گەورە ببێ، ببێ بە مەسەلەیەکی نێونەتەوەییو هەموو ڕۆژێ باس بکرێ جا لەوە کەڵك وەربگرین بۆ ئەوەی بە مافی خۆمان بگەین.

ئێمە وەکو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ڕۆژی ئەوەڵەوە ڕامانگەیاندووە کە شەڕخواز نین، ئێمە شەڕ بۆ شەڕ ناکەین. ئێمە شەڕ بۆ شتێکی دیکە دەکەین. شەڕەکەش ئێمە دەستمان پێنەکردووە. ئەو شەڕە بەسەر ئێمەدا تەحمیل بووە. شەڕی ئێمە بۆ دێموکراسیو خودموختارییە. هەر وەختێکی بە دێموکراسیو خودموختاری گەیشتین، دەست لە شەڕەکە هەڵدەگرین. پاشان لە سیاسەتدا ئەوە ڕەشو سپی نیە، هەموو شتێكو هیچ شتێك. هەرکەس ئاوا سیاسەت بکا سەرناکەوێ. با ئیعتیراف بکەین کە لە تاریخی میللەتەکەماندا، "کورد" سیاسەتەکەی ئەوە بووە یا هەموو شتێك یا هیچ شتێك. نەتیجەکەی بۆتە چی؟ هیچ. لە سیاسەتدا زۆرجاری وا هەیە دوو هەنگاو دەچییە پێش، دوو قەدەم دەچییە پێش، شتێك وەردەگری لە پاشان دیسان خەبات دەکەی بۆ شتێکی دی، دیسان دەچییە پێش. ئەو سیاسەتە ناویان ناوە هونەری مومکین، سیاسەت هونەری مومکینە، نە خەیاڵی. لە خەیاڵی خۆت شتێك دابنێیو داوای بکەی! ئەوەی کە واقێعییەتە جێبەجێ دەبێ، ئەوە سیاسەتە، ئەوەی دیکە شێعرو خەیاڵاتە. قەدەغە نیە شێعرو خەیاڵات. ئێمە بە شێعرو خەیاڵات کاری سیاسی ناکەین.

دەڵێن حیزبی دێموکرات، موزاکرەجو بووە ، ئاشتیخواز بووە، ئەوەش وەکو جنێو دادەنێن، هەروا بزانە شتێکی زۆر خراپە! نەخێر! شتێکی زۆر باشە. ئێمە ئاشتیخوازینو موزاکرەش دەکەین. ئێستا کە باسم کرد، ئێمە بە تاقی تەنیا لە ئێراندا شەڕ دەکەین. لە شیمالەوە نەقیزەیەکی لێدەدەینو هەڵدێین لە جنووبەوە

زەربەیەکی لیّدەدەینو لەولاوە دیسان ئەزییەتی دەکەین. بـۆ وا دەکـەین؟ خـۆ ئێمـە دەزانین بەوە ئەو رێژیمە نـاڕووخیّ. ئـەی بـۆ وا دەکـەین؟ شـتەکە روونـە. ئـەوەندەی لیّدەدەم هەتا هەراسانی دەکەم کە بڵیّ باشـە بـۆ وا دەکـەی؟ کـە هـات بڵـیّ بـۆ وا دەکەی، ئەو وەختە پێی دەڵێم بۆ وا دەکەم. ئەو وەختە دەبێتە چی؟ دەبێتە موزاکرە. لە واقیێدا ئەمن شەڕ دەکەم بۆ موزاکرە. ئێمە دەڵێین کـە مەسـەلەی کـورد حـەللی نیزامیی نیە. مەبەستمان ئەوەیە ئەوانەی کە دانیشتوون لە ئەمریکاو لە ئورووپاو لە بەغداو نازانم لە کویّ، دەڵێن بۆ شەڕ ناکەنو بۆ خۆ هەڵ ناکەن؟ وەلاّمەکەی هاسـانە. ئەگەر پیاوی وەرە بۆخۆت شەڕ بکە. بەلاّم ئێمەین ئێستا شەڕەکە دەکـەین. دەبزانـە چەندە ئەوانە بیّشەرمو دوو روون کە بە حیزبی دێموکـرات دەڵێـن شـەڕ بکـە. هـەتا پارەکە دیسـان کۆمەڵـە هـەبوو، ئێسـتاش کۆمەڵـە هـەموو ئـەندامانی خـۆی کـۆ کردۆتەوەو ئەوی ماویەتی سی چل کەسی لیّ دەرهێناوە وەك کۆماندۆو ئەوی دیکەش بە سەفەر دەڕۆن بۆ دەرەوەو لـە سـوئێدو ئێنگلسـتانو فەرانسـەو ئاڵمـان شۆڕشـەکە ئیدامە دەدەن!!! کەوابوو ئێمە دەڵێین موزاکـرە دەکـەین، بـەلاّم موزاکـرە بـۆ چـی؟ موزاکرە بۆ دێموکراسیو خودموختاری. ئەگەر رێژیمی خومەینی رۆژێك هـات گوتـی من حازرم خودموختاری بدەم بە شێوەیەك کە حیزبی دێموکرات مەوافیقـەتی دەگـەڵ بکا. ئەو وەختە ئێمـە بـە میللـەتی کـورد بڵێـن چـی؟ چـەك! ئـەو وەختـە بۆمـان دەردەکەویّ کە ئێمە شەڕەکە دەکەین هەر بۆ شەڕ. مەنزوورم ئەوە نیە کە خومـەینی شتی وا دەڵیّ، پێموابیّ تا خومەینی مابیّ شتی وا ناڵیّ.

ئێمە لە عەینی وەختدا کە ئێستا شۆڕشگێڕترینو شەڕکەرترین هـێزی ئـێرانیین، دە عەینی وەختدا مەسئوولترین حـیزبی ئێرانیشـین. هـەر بۆیـەش میللـەتی کـورد دەزانیّ کە ئێمە مەسئوولانە دەجووڵێینەوە. میللەتی کورد دەزانـیّ کـە لـە زەمـانی ئاشتیدا شەڕ بکەینو لە زەمانی شەڕدا بڵێین دادەنیشـین. دە زەمـانی شـەڕدا، شـەڕ دەکەینو ئەگەر ئاشتی بوو ئەوە ئاشتی دەکـەین. کـەوابوو ئێمـە هیـچ ناشـارینەوە، ئەگەر رۆژێك هەر رێژیمێك لە تاراندا بێتە سەرکار لە سەر دێموکراسیو خودموختاری دەگەڵ ئێمە وتوویژ بکا، هیچ باکمان نیەو بە ئاشکرا دەڵێـینو دەنووسـینو لـە رادیـۆ بلاّوی دەکەینەوە، کەسێکیش کە پێمان دەڵیّ موزاکرەجو ئـەوەی بـە جنێـو نـازانین، پێمانوایە حەقی خۆیەتی. گوتم ئێمە مەبەستمان هەر ئەوەیە ئەو رێژیمە ناچار بکەین.

یا ئەوەندە درێژ دەبێ شەڕی مە تا ڕێژیمەکە دەڕووخێ یا ئەوەندە کە ناچاری دەکـەین کە بێتە سەر مێزی موزاکرە. لە هەموو دنیاش ئێوە تماشا بکەن لە ئانگولا موزاکـرە دەکەن، لە سریلانکا موزاکرە دەکەن، لە فەلەستین دەگەڵ ئیسرائیل موزاکرە دەکـەن. باشە بۆ هەموو خەڵکی دنیا ڕەوایە، بۆ کوردی بەدبەخت قەدەغەیە. ئـەوان بۆخۆیـان هیچیان لەئێراندا پێ‌ناکرێ، موجاهدینو ئەوانی دیکە هیچیان پێ‌نـاکرێ، لەمـەودوا بەغداش زۆر گەرمە، گەرما تینیان بـۆ دێنـێ، ناشـتوانێ بچێتـەوە ئـێرانێ. باشـە فکرەکە ئەوەیە کە ئەمن هیچم پێ ناکرێ بەڵام ئەتۆ هەر شەڕ بکـە. باشـە شـەڕەکە دەکەم، بەڵام بۆ تۆی ناکەم، ئەمن شەڕەکە بۆ خۆم دەکەمو ئەگەر ڕۆژێك یەکێکی ئاوا پەیدا بوو لە تاران هات گوتی: با شەڕ نەکەین، ئەوەی تۆ دەتهەوێ جێبەجێی دەکەم، خۆ من ئەو وەختە شێت نەبووم شەڕەکە بکەم. لە بەر خاتری چی شەڕ دەکەم؟! ئێمـە لە سیاسەتدا ئەو بڕوایەمان نیە یا دەبێ "خومەینی" بێ یا دەبێ "ڕەجـەوی" بـێ. ئەمە ئەو شتەمان نەگوتووە. ئێمە دەڵێین ئەو ڕێژیمە ڕەنگـە ماوەیـەکی دیکـەش لـە سەرکار بێ ڕەنگە پاش "خومەینی"ش "ڕەجەوی" نەیەتە سـەر کـار ـ هـەر نایەتـە سەر کاریش ـ باشە کەوابوو ئێمە دەگەڵ ڕێژیمێك تەرەفین لـەوێ دانیشـتووە. ئەگـەر ڕێژیمەکە ئەتۆ دەتوانی بیڕووخێنی کە ئیددیعات زۆرە، فەرموو خۆ کـەس پێشـی پـێ نەگرتووی، بیڕووخێنە، ئێمەش پێمانخۆشە بڕووخێ. ئێمە پێمـان خۆشـە، کـێ پێـی ناخۆشە؟ ئەمە ئەوشۆ بە ئیستراحەت بنووینو بـەیانی هەسـتین بزانـین "خومـەینی" رووخاوە. بەڵام خەونو خەیاڵات شتێکی دیکەیەو واقعییـەت شـتێکی دیکەیـە. کـە ناتوانی ڕێژیمەکە بڕووخێنی هیچت لە دەست نایە، شەڕیشت پێ‌ناکرێ، دووکەسیشـت لە هیچ شارێکی ئێران نەماوە کە شتێکت بـۆ بکـا، تـۆ داوا دەکـەی شـەڕەکە مـن هەڵیهایسێنم. پێت وایە کورد، کوردی جارانە. لە بۆیە ئەگــەر هـاتو ئـەو ڕێژیمـە، جارێ ڕێژیمێکی کۆنەپەرستی سەدەکانی نێوەڕاستییــە کـە شـتێکی لێ دەرنایـە، بـەڵام ئەگەر سبەینێ وەزعی ڕێژیمەکە گۆڕاو تەغیراتێك پێكهاتو یەکێکی وا پــەیدا بـوو، گوتی: بەڵێ من حازرم خودموختاری بدەم، دەی‌کەین. ئێمــە حـیزبێکی مەسـئوولین. خوێنی یەك پێشمەرگەمان بە دنیایەکی نادەین، پێمخـۆش نیـە یـەك پێشـمەرگەمان شەهید بێ، شـەڕ بـۆ شـەڕ ناکـەین. ئێمـە شـەڕ بـۆ هـەدەفێك دەکـەین. شـەڕمان پێ‌ناخۆشە، ئەگەر لە ڕێگای ئاشتی لە ڕێگای وتووێژەوە حەقی خۆمان وەربگرین بۆ

شەڕ دەکەین. ئێمە عاشقی شەڕ نین. ئێمە عاشــقی ئاشــتیو ئــازادیو دێموکراســیو خودموختارین.

جا من ئارەزووم ئەوەیە ئەوەی کە باسمان کرد لێرە، پێکەوە هەرکەس لە جێگــای خۆی، ئەرکی خۆی بە چاکی بەجێبگەینێ. ئەمن دڵنیام کە ئەوساڵ، هەم ئێـــوە وەك پێشمەرگەو بە تایبەت وەك هــێزی مەڵبــەندی شــیماڵو ئێمــە وەك بەڕێوەبــەری ئــەو حیزبەو هەموو هێزەکانی دیکەمان لە ناوەندی کوردستانو لـــە جنووبــی کوردســتان، ئەوساڵ دەبێ ئەرکی خۆمان باشتر لە پارو ساڵانی دیکە بەجێ بگەیەنینو دڵنیــام کــە چــەند هــەنگاو لــە ئامانجــەکانی خۆمــان کــە دێموکراســیو خودموختارییــە نزیــك دەبینەوە.

## ژێدەر:

* ئەم نووسراوەیە لە گوتارێکی دوکتور قاسملوو لە نێو پێشمەرگەکانی مەڵبەندی شیماڵ، چەند مانگ دوای کۆتایی هــاتنی شــەڕی عێراق ـ ئێران، لە رووی نەواری کاسێت پیادە کراوە.

# وتاری مێژوویی کاك دوکتور قاسملوو سەبارەت بە لادانی تاقمی حەوت کەسی لە ڕێبازی حیزبو گەل*

خۆشكو برایانی خۆشەویست! سلاوێکی گەرمتان لێدەکەمو خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم کە جارێکی دیکە لەگەڵ خەڵکی قارەمانی مەهاباد دەدوێم.

ولاتەکەمان هەروەك چەند مانگ لەوەی پێش، لە وەزعێکی سیاسی، لە شەرایتێکی سیاسی زۆر ناسك دایە، ئەوی ئێمە هەتا ئێستا لە میللەتی خۆمان دیوە ئەوەیە کە، میللەتی کورد یەکپارچە، "متحد" هەستاوەو داوای حەقی خۆی دەکا. ئێمە لە لایەن حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە شانازی بە میللەتی خۆمان دەکەین، شانازی بەوە دەکەین کە سەراسەری کوردستان یەکپارچە هەستاوە دژی کۆنەپەرستیو بۆ دێموکراسی لە ئێرانداو بۆ خودموختاری لە کوردستاندا خەبات دەکا.

ئێمە زۆرجار هەر لەو مەیدانەدا رامانگەیاندوە کە لایەنگری ڕێگای ئاشتیخوازانەی چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردین. زۆرجار گوتوومانە کە میللەتی کورد شەڕخواز نیە، میللەتی کورد شەڕی ناوێ، بەلام میللەتی کورد داوای حەقی مەشرووعی خۆی دەکا. زۆرجار لەو مەیدانەدا رامانگەیاندوە کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، هەموو وەختێك ئامادە بووەو ئامادەیە بۆ ئەوە کە لە ڕێگای ئاشتییەوە میللەتی کورد بە ئاواتی خۆی بگەیەنێو وەزعێکی وا پێکبێ کە میللەتەکەمان پاش وەرگرتنی حەقی خودموختاریی خۆی بتوانێ ژیانێکی بەختیار

بۆخۆی درووست بکا. ئەوە ئێمە نەبووین، پێشمەرگەکانی قارەمانی کوردستان نەبوون کە ئەو شەڕەیان دەست پێ‌کرد، شەڕ لە لایەن ئەو کەسانەوە دەست پێکرا کە دەیانەوێ بە زۆر، بە زۆری فانتۆم‌و هێلی‌کۆپتێرو تۆپ‌و تانك میللەتەکەمان چەك بکەن، لێرە لەو مەیدانەدا گوتمان چەك‌کردنی میللەتی کورد ئاسان نیە. میللەتی کورد بێ‌ئەوەی داخوازەکانی بێتە دی چەك ناکرێ. ئێستا نێزیکی چەند مانگە شەڕێك بە سەر ئێمەدا تەحمیل بووە، ئێمە پێمان خۆشە کە ئەو شەڕە هەرچی زووتر دوایی بێ. ئێمە پێمان‌خۆشە کە ئێران کە پاش شۆڕشێکی گەورە بە سەر ئێمپریالیزم‌دا سەرکەوتووە، پاش شۆڕشێکی گەورە ڕێژیمی مەنفووری شاهەنشاهیی لەبەین بردوە، ئەو میللەتە (میللەتی کورد) وەك هەموو گەلانی ئێران، پێمان‌خۆشە بە ئاواتی خۆی بگا، لە سولح‌و سەفا، لە ئاشتی‌دا هەموو ئاواتەکانی خۆی بەجێ بگەیەنێ. بەلاّم بەداخەوە لە نێو قودرەتی حاکم‌دا، لە نێو دەسەلاّتی حاکم‌دا هێزی وا هەیە کە تەنیاو تەنیا مەبەستی ئەوەیە کە بەزۆر، بە زۆری چەك مەجبوورمان بکا چۆك دابدەین‌و تەسلیممان بکا. هەتا گەیشتۆتە ئەو جێگایە کە هێندێك لەوانە دەڵێن کە ئێمە تەنانەت حازر نین وتووێژیش بکەین لەگەڵ میللەتی کورد. باشە نایانەوێ وتووێژمان لەگەڵ بکەن، نایانەوێ حەقمان بدەن، بارەها گوتوویانە کە ئێمە ئامادەین ٦ ئەسڵی پیشنهادیی حیزبی دێموکراتی کوردستان ئێعلام بکەین، هەتا ئێستاش کە ئێستایە میللەتەکەمان چاوەڕوانە، هەتا ئێستاش هیچیان ئیعلام نەکردووە، کەوابوو ئەوە کە شەڕە، ئەوە کە ئێمە شەهید دەدەین، ئەوە کە پێشمەرگە قارەمانەکانمان خۆیان فیدای میللەت‌و نیشتیمان‌و شەرافەتی گەلی کورد ئەکەن، ئەوە خەتای ئەو کەسانەیە کە دەستوور بە ئەرتەش‌و پاسدار دەدەن کە میللەتەکەمان لەبەین بەرن. ئێمە حەملەمان نەکردووە، ئێمە پەلامارمان نەبردووە، ئەوان هاتوون، ئەوان پەلاماریان هێناوە. زۆرجار ئیعلاممان کردبوو و ئێستاش رادەگەیەنین هەتا ئەوەندە بتوانین، هەتا ئاخر قەترەی خوێنی خۆمان دیفاع لە شەرافەت‌و ناموس‌و ئازادیی میللەتەکەمان دەکەین. ئەگەر هەتا ئێستا لە تاران، لە جێگای دیکە، زۆرکەس هەن ئەوەی حاڵی نەبوون، دەبێ ئێستا حاڵی بن، میللەتی کورد بەزۆر تەسلیم نابێ، بە وتووێژ ، بە وەرگرتنی حەقی خۆی شتێکی دیکەیە. ئامادەین ئێستاش ئامادەین، بەتایبەت کە ئێستا دەبینین لە داخیلی هەیئەتی حاکم‌دا، ئیختیلافێکی زۆر توند

پێكهاتووە. لە سەر بەڕێوەبردنی رادیــۆو تەلــەڤزیۆن ئیختیلافیــان هەیــە، لــە ســەر داخستنو دانەخستنی دانشگاكان ئیختیلافیان هەیە، لە سەر دانــانی "نخست وزیــر" ئیختیلافیان هەیە، لە سەر مەسەلەی كوردستان ئیختیلافیــان هەیــە، ئێمــە لەگــەڵ ئەوەی هەتا ئێستا قسەی خۆمان لە هیچ لایەكەوە نەبیستووە، بەڵام بە لێكدانــەوەی خۆمان، بە لێكدانەوەی حیزبەكەمان هاتوینە سەر ئەو باوەڕە كە لەو ئیختیلافەدا كە بەینی رەئیس جمــهوور "بنی‌صــدر"و هێنــدێ لەوانــەی كــە "متعصــب"و دوژمنــنو دەیانەوێ بە هەموو هێزەوە سیاسەتی وڵاتەكە بكەن بە ئینحیساری خۆیــانو هــەموو دەسەڵاتی وڵاتەكە بەدەستەوە بگرنو وڵاتەكەمان بەرەو دیكتاتۆری بەرن. لــە بــەینی ئەو دوانەدا ئێمە ئامادەین ئەگەر داخوازەكانی میللەتی كورد بێتەدی، ئەگەر بەڵێنی بدرێ كە لە ئێراندا دێموكراسی دەبێ لــە تــەرەف رەئیــس جمــهوور "بنی‌صــدر"ەوە، ئامادەین لە بەنی‌سەدر لە موقابیل مورتەجێعەكاندا پشتیوانی بكەین.

ئەمن پێمخۆشە لە لایەن هەموو گەلی كــوردەوە، لــە لایــەن خــەڵكی قارەمــانی مەهابادەوە، لێرەدا را بگەیەنم كە ئێمە بۆ دیفاع لە ئازادی لە ئێرانداو بۆ وەرگرتنــی هەقی میللەتەكانی زۆرلێكراوی ئــێران،و بــۆ دابینكردنــی هــەقی زەحمەتكێشــان لــە سەرانسەری ئێرانداو هەروەها بۆ ئەوەی بە تــەواوی ریشــەی ئێمپریــالیزم لــە وڵاتــی خۆماندا دەرهێنین، ئامادەین بۆ ئەوە پشتیوانی لە سیاسەتێك بكەین كە هیوادارین رەئیس جمهوور بەنی‌سەدر بیگرێتە پێش. هەروەها ئیجازەم بدەن لێرەدا را بگەیەنم كە پێرێ، دوو رۆژ لــەوەی پێــش لــە تــەرەف "علامــە نــوری"یــەوە ـ كــە لــە تــەرەف بەنی‌سەدرەوە كراوە بە نمایەندەی "تام‌الاختیــار" بــۆ وتوویــژ لــە كوردســتاندا ـ، لــە تەرەف جەنابی عەلامە نووریەوە، پەیامێك ناردراوە بۆ ئێمە، لەو پەیامــەدا دەڵێــن: ئایا ئەگەر ئێمە لەگەڵ كەلیمەی خودموختاری كە لە لایــەن میللــەتی كــوردەوە زۆر خۆشەویستە، كەلیمەی ئیسلامیشی لەگەڵ دابنێین ئێوە نــەزەرتان چیــە؟ ئێمــە لــێرە ئیعلانی دەكەین كە میللەتی كورد زۆربەی زۆری موسوڵمانەو ئەگــەر خودموختــاریی ئیسلامی بدرێ بە میللەتی كورد، قەبووڵی دەكاو پێشی خۆشە.

خۆشكو برایانی خۆشەویست!

لە شەرایتێكی ناسكی ئەوتۆدا، نۆكەرانی ئیمپێریالیزم ئەوانەی كە ساڵەهای ساڵ خزمەتی رێژیمی مەنفووری شاهەنشاهیان دەكرد وەك "پالیزبان"، وەك "ئووەیســی"،

وەك سەدانی دیکە خەریکن لە موبارزەی ئەسیلی میللەتەکەمان ئیستیفادەی خـراپ بکەن، خەریکن نێوی خەباتی ئەسیلو قووڵــی میللەتەکـەمان بـەدناو بکـەن. ئێمـە لێرەدا رادەگەیەنین کە میللەتی کـورد ئـەو نۆکەرانـە بـاش دەناسـێ، نـە پالیزبـانی قەبووڵە، نە "ئووەیسی" قەبووڵە، نە "بەختیار"ی قەبووڵە نە عەلیی قازی قەبووڵە، هەموویان مەحکووم دەکا. ئێمە رادەگەیەنین کــە هێنـدێ گرووهـەکی دیکـەش وەك "حامێدبەگ"، "سەرداری جاف"، "سوپای رزگاری"و هەموو ئەوانەی دیکە هیچیان ناتوانن‌و حەقی ئەوەیان نیە بە نێوی میللەتەکەمان قسە بکەن. ئەوانە بـــەکرێگیراون‌و میللەتی ئێمە قــەت حـازر نیــە بچێتــە ژێـر بـاری هیـچ دەسـتەیەکی بـەکرێگیراو. ئیمپریالیزم لە رێگای دەرباری شاهەنشاهی‌یەوە، لە رێگای ئووەیسی‌و بەختیارەوە، لە رێگای عەلی قازی (کوڕی رەش)ەوە، لــە رێگـای زۆر کەسـی دیکـەوە، لــە عــێراق‌و تورکیەوە خەریکە عەوامیل بنێرێ‌و میللەتی ئێمە بە فریو بەرێ. میللەتی کورد لـــە کوردستانی ئێران، تەجروبەی سیاسیی زۆرە، زۆر باش حاڵی بووە کە کێ دۆسـتیەتی، کێ دوژمنیەتی. لە بەر ئەوە ئێمـــە لـێرە ئێعـلام دەکـەین کـە میللـەتی کـورد لــە کوردستانی ئێران بە رەهبەریی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێگای ئەسـیلی خۆی دیوەتەوە. ئەو رێگایە زۆر روونە، خەبات بۆ دێموکراسی لە ئـێران، خـەبات بـۆ خودموختاری لە کوردستان، خەبات بۆ دیفــاع لــە حقووقــی زەحمەتکێشــان، ئەوەیــە رێگای ئێمە. حیزبی ئێمە ئەو رێگا راستەو ئەو رێبازە "صحیح"ە قەد بەر ناداو هیچ هێزێك نە لە داخیلی کوردستان‌و نە لە خاریجی کوردستان، ئیمکانی ئـەوەی نیــە کـە بتوانێ ببێتە هۆی ئەوە کە حیزبی ئێمە ئەو رێبازە "صحیح"ە لە دەست بدا.

خۆشك‌و برایانی خۆشەویست! ٣٥ ساڵە حــیزبی دێموکراتــی کوردسـتانی ئـێران، رێگای ئەسیلی خۆی درێژە پێ‌دەدا. ئێمە لەو رێگایەدا زۆر تووشی تــەنگ‌و چەڵەمــە بووین، زۆر فیداکاریمان کردووە، زۆر کەس لە رۆڵە نەبەزەکانی ئەو میللەتە لە رێگای وەرگرتنی حەقی خۆیاندا شەهید کراون، بە ســەدان پێشــمەرگەمان هــەر لــەو چــەند مانگەدا ژیانی خۆیان لە رێگای ئازادیی میللەتی کــورددا بــەخت کـردووە، تــەواوی تــاریخی میللەتەکــەمان‌و حیزبەکــەمان خوێناوی‌یــە، "ئێمــە رۆڵــەی رەنگــی سـوورو شۆڕشین، سەیری کە خوێناوی‌یە رابردوومان". ئێستا لەو رێگایەدا، زۆرجــار تــەنگ‌و چەڵەمە هاتۆتە پێش، زۆرجار تووشی شکسـت بوویــن، زۆر جـاریش سـەرکەوتووین،

بەلاّم رێگای "صحیح"و ئامانجەکانی باشی خۆمانو میللەتەکەمان بەر نەداوە. ئێمە لە موقابیلی هەموو ئەو تاوانو "اتهام"ە کە لە لایەن ئەو کەسانە کە ئێمە بە کۆنەپەرستیان دادەنێن لە ئێراندا، دژی حیزبەکەمانو میللەتەکەمان دەگوترێ، دەڵێین: میللەتی کوردو هەروەها حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ئێمە لە پێش هەمووان‌دا خۆمان بە ئێرانی دەزانینو بۆ ئازادیو سەرکەوتنی ئێران، بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕشی ئێران خەبات دەکەین، ئێمە پێمانخۆشە لەگەلٚ هەموو هێزەکانی دێموکراتی ئێرانی، لەگەلٚ هەموو ئەوانە کە بەڕاستی دەیانەوێ خزمەت بە شۆڕشی ئێران، بە گەلانی ئێران، بە زەحمەتکێشانی ئێران بکەن، لەگەلٚ هەموویان پێمانخۆشە هاوکاریمان هەبێو ئێمە لەو بارەوە لە تەرەف حیزبی دێموکراتەوە، هیچ درێغیمان نەکردووەو چوکترین کۆسپێکیش لە رێگای ئێمەدا بۆ ئەو هاوکاریە نیە. ئێمە پێمان وایە کە ئەگەر وەزعی ولاّتەکەمان شپرزەیە، کە ئەگەر وەزعی ئیقتیسادی ولاّتەکەمان رۆژبەرۆژ خراپتر دەبێ، ئەگەر لە "محاصره"ی ئیقتیسادی داین، ئەگەر رۆژبەرۆژ گرانتر دەبێ هەموو شتێك کە زەحمەتکێشان ناتوانن بەڕاستی ئەو شتومەکەی کە پێویستە بکرِنو ئەگەر وەزعی سیاسی ولاّتەکە تێكچووە، لە سەرانسەری ئێراندا هەزارو یەك کێشە ساز بووە، ئەگەر وەزعی "اجتماعی"ی زەحمەتکێشان خراپە، ئەگەر هەموو ئەوانە راستنو ئەگەر دەمانەوێ هەموو ئەو مەسائیلە حەل بکەینو هەروەها ئەگەر دەمانەوێ بە جیددی لە موبارزەماندا دژی هەموو دوژمنانی دەرەوە سەرکەوین، یەك رێگا هەیە ئەویش یەکگرتنی هەموو هێزەکانی دێموکراتی ئەسیل، هەموو هێزەکانی شۆڕشگێڕی ئێرانە. ئەمن بە ناوی هەمووتان، بە ناوی هەموو گەلی کوردەوە، لێرەوە بە هەموو سازمانەکانی ئێرانی کە بەڕاستی دیفاع دەکەن لە حەقی میللەتە زۆرلێکراوەکان، دیفاع دەکەن لە دێموکراسی، خەبات دەکەن دژی ئیمپریالیزم، دیفاع دەکەن لە حەقی زەحمەتکێشان، بە هەموویان رادەگەیەنین کە حیزبی دێموکراتی کوردستان ئامادەیە بۆ هاوکاری.

خۆشكو برایانی خۆشەویست!

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، حیزبی خۆشەویستی میللەتی کوردە. دیارە ئەو حیزبە خۆشەویستە، ئەگەر تووشی ئیشتیبا بێ، ئەگەر تووشی تەنگوچەڵەمە بێ یا ئەگەر ناکۆکیی تێدا پەیدا بێ، میللەت پێی ناخۆشە. ئێستا ماوەیەکە چەند

کەسێك لە ئەندامانی کۆنی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، پەیامێکیان دەرکردووەو رێگای خۆیان لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران جودا کردۆتەوە. دیارە ئەو پشتیوانیە بەرینە کە ئێستا ئێوە، لێرە لەو مەیدانەدا لە حیزبی دێموکرات دەکەن، باشترین جوابە بە ئەو کەسانەو رادەگەینێ کە ئێوە رێگای راستی حیزبی دێموکرات تەئید دەکەن. لە خەڵکی قارەمانی مەهاباد، لە خەڵکی تێگەیشتووی مەهاباد، ئێمە هەر "انتظار"مان ئەوە بووە کە هەموو وەختێك کە وەك جاران پشتیوانی حیزبی خۆشەویستی خۆیان، حیزبی دێموکراتی کوردستان بن. ئەمن بە ناوی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە، زۆر زۆر سوپاستان لێدەکەم.

خۆشكو برایانی خۆشەویست!

زۆر لە جەوانان، لە سەر ئەو مەسەلەیە باس دەکەن، بۆچی وای لێهات؟ بەداخەوە دەبێ بڵێین کە ئەو چەند کەسە بە کەیفی خۆیان ئەو کارەیان نەکرد. بەداخەوە دەستێك لە دەرەوەڕا هانی دان، دەستێك کە دەفتەری سیاسیی ئێمە دیاریی کردووە. ئەوانە بۆ داپۆشینی ئەو کارە نالەبارەی کە کردوویانە، هەزار "اتهام" بە حیزبی ئێمە وارید دەکەن، ئەو "اتهام"انەی کە "خلخالی" پێمان وارید دەکا، "چمران"و "ظاهرنژاد" پێمان وارید دەکەن. حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران پێش هەموو شتێك، ئیستیقلالی حیزبیی خۆی خۆشدەوێ، پێش هەموو شتێك بێزارە لە "وابستگی" بە هەر جێگایەكو بە هەر کەسێکەوە بێ. پارەکەش پێیان گوتین ئەوانە بەعسین، ئەوانە سەهیۆنیستن، ئەوانە کومۆنیستن، ئەوانە "تجزیە طلب"ن، جا ئایا ئێستا عەیب نیە لە مەهاباد یەکێك هەستێو پەیدا بێو ئەو "اتهام"انە لە بارەی ئێمەدا تیکرار بکاتەوە.

خۆشكو برایانی خۆشەویست!

حیزبی دێموکرات حیزبێکی سیاسی‌یە، ئێمە کە لە تەرەف دەفتەری سیاسیەوە بەیاننامەمان دەرکردووە، بۆ ئەوە بووە رێگای راست بە خەڵك نیشان بدەین، مەسەلەکە زۆر روونە فەلسەفەی ناوێ، هەر ئینسانێکی سادە ئەوەی تێدەگا، یان لە سەنگەری میللەتدای یان سەنگەری میللەتت بەجێ هێشتووەو لە سەنگەرێکی دیکەدای، تەکلیفی خۆت روون بکەوە، لەو دووانە یەکێك. رێگای سێهەم لێرە نیە.

لە بەینی حەقو باتڵدا، لە بەینی میللەتو دوژمنانی میللەتدا دەبێ ڕێگای خۆت ڕوون بکەیەوە. یان لەگەڵ میللەتی یان لەگەڵ دوژمنانی میللەت.

خۆشكو برایانی خۆشەویست!

ئێمە وەك حیزبی دێموكراتو وەك كومیتەی ناوەندیو دەفتەری سیاسی، ئەو سێ ڕێگایە لە پێش ئەو چەند كەسە دادەنێین، ئیختیار بە خۆیانە، ئەوەڵەن، حیزبی دێموكرات وەك باب وایە بە قەوڵی كوردیی خۆمان "نەچوە بچێ"، ئەگەر لە كردەوەی خۆیان پەشیمانن، ئەگەر دەیانهەوێ بگەڕێنەوە باوەشی میللەتو حیزبو ئەو میللەتە كە ئێستا بە هەزاران كەس كۆ بوونەتەوە، بگەڕێنەوە ڕێگا ئاوەڵایە ئێمەش قبووڵیان دەكەین. ڕێگای دووهەم: باشە، نەزەریان ئەوەیە كە لەگەڵ ئێمە ڕێك ناكەون ئەو وەختە دەچن حیزبێكی دیكە تەشكیل دەدەن كەیفی خۆیانە، دەچنەوە ئەو حیزبەی كە هەر لە پێشداش هاوكاریان لەگەڵ دەكرد، لە واقێعدا ئەكسەریان ئەندامی ئەو حیزبە بوون (حیزبی توودە)، با بچنەوە، بۆ ئێمە هیچ ئیشكاڵی نیە.

**[لە لایەن خەڵكەوە دروشمی "مرگ بر تودە" بەرز دەبێتەوە]**

خۆشكو برایانی خۆشەویست!

"مرگ بر تودە" شوعاری حیزبی دێموكراتی كوردستان نیە، ئەگەر ئەوانە بچنەوە لە حیزبی توودەی ئێراندا فەعالییەت بكەن، هیچ ئیشكاڵێكی بۆ ئێمە نیە، ئێمە دێموكراتین، ئیمانمان بە دێموكراسی هەیەو هەموو حیزبێكیش حەقی فەعالییەتی هەیە.

ڕێگای سێهەم؛ ئەوەیە كە ئێستا ئەوان گرتوویانەتە پێش، دەڵێن ئێمە حیزبی دێموكراتین. جا كەنگێ ٧كەس حیزبی دێموكرات بووە؟ دەڵێن ئێمە بە ناوی كونگرەی چوارەمەوە قسە دەكەین. ئێمە، كومیتەی ناوەندیی ئێمە، نەزەری خۆی لە سەر ئەو نامیلكەیە كە نووسیویانە بڵاو كردۆتەوە، ئەوڕۆ دەگاتە دەستانو لەوێ بۆتان دەردەكەوێ كە ئەوانە بە تەواوی لە ڕێبازی كۆنگرەی چوارەم لایان داوە، "منحرف" بوون لە ڕێگای حیزبی دێموكراتی كوردستان. لە بەر ئەوە خۆشكو برایانی خۆشەویست، ئێمە لێرە ڕادەگەیەنین حیزبی دێموكرات یەكە، تاقە حیزبی دێموكرات

هەیە لە کوردستانی ئێراندا، هیچکەسێکی دیکەش حەقی نیە بە ناوی حیزبی دێموکراتی کوردستان فەعالییەت بکا.

لە بەر ئەوە، ئەوانە ئەگەر ئەو دوو ڕێگایەی پێشتریان هەڵنەبژارد، دەبێ‌و زۆر شتێکی مەشرووعە، هەرچی ئەموالی حیزبی دێموکراتیان لە لایە، دەبێ تەسلیمی حیزبی دێموکرات بکەنەوە. چونکە حیزبی دێموکرات ئەو حیزبە نیە، لەو کوردستانەدا یەکێك بتوانێ کەڵەگایی لێ‌بکا. حیزبی دێموکرات ئەوەی قبووڵ ناکا.

خۆشك‌و برایانی خۆشەویست!

کێ ڕۆیشتوەو کێ ماوە؟ چەند کەس ڕۆیشتوون حیزبی دێموکرات هەر لە جێگای خۆیەتی. ئەوانەی ڕۆیشتوون ئەو سیاسەتەی پێشنیار دەکەن سیاسەتێکی دەستی ڕاستی، کۆنەپەرستانە، سازشکارانەیە، ئەوەی حیزبی دێموکرات بەڕێوەی دەبا، سیاسەتێکی ئینقلابی، دەستی چەپی‌و "مترقی"یە. ئەوەیە فەرقەکەمان. سیاسەتی، ئێمە شەڕخواز نین، بەڵام تەسلیم‌تەڵبیش نین، تەسلیم نابین. ئەو کەسانەی کە ڕۆیشتوون دەبێ بۆ میللەتی کورد، ڕوون بکەنەوە کە ئایا ئێمە چەکی خۆمان دابنێین یان دانەنێین؟ با نەزەری خۆیان بە سەراحەت بڵێن. ئێمە دەڵێین، گوتوومانەو تیکراریشی دەکەینەوە، بەڵێ چەکی خۆمان دادەنێین ئەو وەختە کە دێموکراسی لە ئێراندا "تأمین"بێ، خودموختاری لە کوردستان وەرگیرابێ‌و پێشمەرگە قارەمانەکانمان ئینتیزاماتی کوردستانی بە دەستەوە بگرن. ئەوانە دەیانهەوێ پێشمەرگەکانی ئێمە کە بە سەدان شەهیدیان داوە چەك بکەن، نە، پێشمەرگەی ئێمە حازر نیە چەك بکرێ، ئەوە هەموو کەس دەبێ بزانێ.

**[دروشمی "بژی هێزی پێشمەرگە ـ دوژمن نەسیبی مەرگە" دەگوترێتەوە}**

ئەوەی کە لێرە عەرزم کردن، بۆ ئەوەیە کە تەکلیفی خۆمان لەگەڵ هەر کەسێك کە لەو حیزبەدا لە ڕێگای "صحیح" لادەدا ڕوون بکەینەوە، حیزبی دێموکراتی کوردستان، حیزبێکی عەزیمە، حیزبێکی سەرکەوتووە، حیزبی خۆشەویستی هەموو میللەتەکەمانە، هەرکەس، هەرچی لە ڕابردووی ئەو حیزبە لابدا، میللەت مەحکوومی دەکا، جا ئەو کەسە چ عەبدولڕەحمانی قاسملوو بێ، چ هەرکەسێکی دیکە بێ.

**[دروشمی "سەلام بەر دێموکرات ـ درووود بەر قاسملوو" دەگوترێتەوە]**

خۆشكو برایانی خۆشەویست!

لەبیرتان نەچێ، دیارە ئەوە مانگێكە چاومان بە یەكتر نەكەوتووە، بازە شتێكتان لەبیر چووە، یەكێك لەوانە ئەوەیە ئەوەیە شوعاری ئێمە هەر "درووود بەر دێموكرات"ە، فەردپەرستی لە حیزبی دێموكراتدا نابێ ببێ. فەردپەرستی بە زەرەرمان تەواو دەبێ.

زۆر قسەی دیكەش هەیە كە پێمخۆش بوو بیانكەم، بەلاّم وەخت تەنگە، ناشمەوێ لەوە زیاتر ماندووتان بكەم. فەقەت پێمخۆشە یەك قسە حەل بكەین، ئەویش ئەوەیە حیزبی دێموكراتی كوردستانی ئێران، رێگای ناونەتەوایەتیی خۆی روون كردووەتەوە. لە سەتحی "بین‌المللی"دا دۆستو دوژمنی ئێمە دیارە. ئێمە لەوەتی حیزبەكەمان هەیە، بە هەموو هێزمانەوە دژی كۆنەپەرستی موبارزە دەكەین، ئێمە لەوەتی حیزبەكەمان هەیە، لەو رۆژەوە كە پێكهاتووە، هەموو هێزەكانی "مترقی" دونیا بە دۆستی خۆی دەزانێ. ئەمن دەمەوێ لێرەوە بە ناوی حیزبی دێموكراتی كوردستانەوە بە ناوی هەمووتانەوە رابگەیەنم، كە سیاسەتی "صحیح"ی ئێمە لە سەتحی "بین‌المللی"دا هەر درێژەی هەیەو بوختانو تاوانی چەند كەسێك ناتوانێ ببێتە هۆی ئەوە كە دۆستو دوژمنی خۆمان لە سەتحی "بین‌المللی"دا نەناسین. ئەوەتان لەبیر نەچێ كە هێندێكەس كە خۆیان بە "مترقی" دادەنێنو لە واقیعدا كۆنەپەرستن، دەیانەوێ بە ئێمە تاوانی كۆنەپەرستی بدەن، زیددی سۆسیالیستی بدەن. نەخێر ئێمە لایەنگری سۆسیالیزمین، لە بەرنامەی حیزبەكەماندا هاتووە لایەنگری هەموو هێزەكانی "مترقی" دونیاینو دۆستی ولاّتانی سۆسیالیستیین، با ئەوە هەموو كەس بزانێ.

هەروەها ئیجازەم بدەن خۆشكو برایان خۆشەویست، عەرزتان بكەم كە هەتا ئێستا میللەتی كوردو بەتایبەت خەڵكی قارەمانی مەهاباد بە شەمی سیاسیی بەرزی خۆیان، بە تیگەیشتنی خۆیان، بە تەجروبەی سیاسیو موبارزەی خۆیان، بە هەموو هێزیانەوە پشتیوانیان لە حیزبی دێموكراتی كوردستان كردوە. ئەو شوورو "هیجان"ەو ئەو پشتیوانیە كە من ئێستا لە ئێوەی دەبینم، ئیجازە بدەن لە تەرەف كومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموكراتەوە پێتان رابگەیەنم كە ئێمە تەردیدمان نیە، شكمان نیە، گومانمان نیە كە لە دوارۆژیشدا خەڵكی قارەمانی مەهاباد، بە هەموو هێزەوە پشتیوانی لە حیزبی دێموكرات، لە هەموو شەرایەتێكدا دەكا.

ئیجازە بدەن، جارێکی دیکە لەو پشتیوانیە سوپاس بکەم، داوای سەرکەوتنتان بۆ بکەم کە میللەتەکەمان لە خەباتی توندی خۆی بۆ دابینکردنی دێموکراسی لە ئێرانداو بۆ وەرگرتنی خودموختاری لە کوردستاندا بە پشتیوانی ئێوەو بە رەهبەری حیزبی دێموکراتی کوردستان سەرکەویّ

ـ سلاّو لە پێشمەرگەکانی قارەمانی کوردستان کە ئالاّی ئازادیی کوردستانیان بەرز راگرتووە!

ـ سلاّو لە رەوانی پاکی هەمووو شەهیدانی کوردستان!

ـ سلاّو لە هەموو هێزەکانی دێموکراتی ئێران کە بە دلّەوە بە دەسکەوتەکانی شۆڕشی ئێرانو دژی ئێمپریالیزم بۆ دێموکراسیو بۆ وەرگرتنی حەقی میللەتەکانی زۆرلێکراو خەبات دەکەنو موبارزە دەکەن.

ـ سلاّو لە خەلّکی قارەمانی مەهاباد!

ـ سلاّو لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران!

ـ سلاّو لە کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە هیچ گومانی تێدا نیە لەو "تصقیە"یە ساغو سالمو بەهێزترو موبارزتر دێتە دەر.

جارێکی دیکە سوپاستان دەکەم، هاونیشتیمانانی خۆشەویست، خەلّکی قارەمانی مەهاباد، خودا حافیز، هەتا جارێکی دیکە لێرە یەکتر ببینینەوە.

## ژێدەر:

* ئەم نووسراوەیە لە وتاری دوکتور قاسملوو لە سەر لادانی تاقمی حەوت کەسی لە رێبازی دێموکرات، دوای کۆنگرەی چوارەمی حیزب لە سالّی ١٣٥٨ لە شاری مەهاباد وەرگیراوەو لە رووی نەواری کاسێت پیادە کراوە.

# بۆ یادی گۆران*

دە ساڵ لەمەوبەر (١٨ی مانگی نوامبری ١٩٦٢) عەبدوڵڵا گۆران، گەورەترین شاعێری کورد لە چەرخی بیستەمدا کۆچی دوایی کرد. گۆران چوار ساڵ پێش مردنی پاش شۆڕشی چواردەی ژووئیە لە بەندیخانە ئازاد بوو خەریك بوو و سەرلەنوێ هونەری پایەبەرزی خۆی لە هەلومەرجێکی باشتردا بۆ نەتەوە زۆرلێکراوەکەی تەرخان بکا کە نەخۆشی ئەمانی نەداو بەم جۆرە شاعێرێکی بلیمەت، ئینسانێکی نموونە، نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزو خەباتکەرێکی کۆڵنەدەر لە کیس چوو. نەتەوەی کورد بەدرێژایی مێژووی چەند هەزار ساڵەی خۆی دەیانو تەنانەت سەدان شاعێری هونەرمەندی پەروەردە کردوە. زمانی کوردی هەرگیز لە شێعردا نەداریو هەژاری بەخۆیەوە نەدیوە. هەر چەرخێکی مێژوومان چەند گەورە شاعێرو چەند گەورە زانای کوردی تێدا هەڵکەوتوە. شاعێری چەرخی بیستەمان گۆرانە. گۆران لەو بلیمەتانەیە کە لە مێژووی هەموو نەتەوەیەكدا بە دەیان ساڵ جارێك پەیدا دەبنو نەتەوەو مێژوو شانازییان پێوە دەکا. گۆران خاوەنی هونەرێکی بێهاوتای شێعر بوو، گۆران گەلو وڵاتی خۆی باش دەناسی، لەگەڵیان ژیابوو و لە ژیانو خەباتی گەل ئیلهامی وەردەگرت. پلەی خوێندەواری بەرز بوو، لە ئەدەبی بێگانە شارەزا بوو، هەموو کاتێك خەریك بوو شتێکی تازە فێر بێ تا لە کاروانی ئەدەبی جیهانی وەدوا نەکەوێ. ئەمانە هەموو لە خەیاڵی جوانو دڵڕاکێشی هونەری لە تاسەو ئارەزووی شاعێرانەیو لە ناوەرۆکی روونی مانای شێعرەکانیدا بەتەواوی دیار بوو. زمانی شێعریی گۆران زمانێکی پەتیو پاكو بێگەردە. خوێنەری کورد بە هەموو گیانو دڵیەوە هەستی پێ دەکا کە زمانی خۆیەتیو لێی تێدەگاو خەیاڵی شێعری شاعێر رایدەکێشێتە جیهانێکیتر. دەرگای

بەهەشتی بێپایانی هونەری لێ دەکاتەوە. زمانی گۆران پەتیو پاکە بەڵام دروستکراو نیــە. وەك ئاوی سەرچاوە روونو رەوانە. چونکە گۆران زمـــانی گــەلی خــۆی بــاش دەزانــێ. ئــەو زمانەی کە کوردی جوتیار، کوردی کرێکــار، شــوانو ســەپان پێــی دەدوێــن بــەو زمانــەش شێعریان بۆ دەڵێ، بەڵام دەیخاتە ناو قالبی زمانی ئەدەبییەوەو ناو چوارچێوەی هەڵبەســتێك رێزمانی کوردی لەبیر نەکردۆتەوە. گۆران یەکێکە لەوانەی لە شــێعری کــوردیدا شۆڕشــیان بەرپا کرد. وازی لە عەرووز هێنا کە لەگەڵ شێوەی زمانەکەمان باش رێك نەدەکەوت. بــەم جۆرە گۆران شێعری کوردی لە بەندیخانەی عەرووزو قافیە رزگار کردو لــەو کــارەدا هونــەرو وەستایی خۆی بەجوانی نیشان دا. بەڵام گۆران بۆ وەزنی شێعری تازەی کوردی دوور نەڕۆی، خۆی دەڵــێ: "شــێعرە تازەکــان بــە وەزنــی پەنجــە (هیجــا) هــەڵ بەســتراون کــە هەرچــەند شێعردۆستەکانی کۆن بە خوێندنەوەی رانەهاتوون. بــەڵام لــە بــەر ئــەوەی وەزنــی تایبــەتی نەتەوەییمانەو لەگەڵ خەسایسی زمانەکەمان چاکتر رێك دەکــەوێ بــە پێویســتم زانــی لــە ماوەی تەقەلای ئەدەبیی خۆمدا رۆژبەڕۆژ بەرەو لایەنی بەکارهێنانی ئەم وەزنانە بچم تا لــەم چەند ساڵەی دواییدا وەزنی عەرووزم بە تەواویو لام وایە بەیەکجاری بەرەلا کرد."

کەوابوو گۆران گەڕایەوە سەر وەزنی تایبەتی نەتەوەییمان. چونکە دەگەڵ سروشــتەکانی زمانەکەمان چاکتر رێك دەکەوێ. لە هونەری گۆراندا یەکیەتیی شــێوەو نــاوەڕۆك بــەجوانی خۆی دەنوێنێ. بیری نوێ پێویستی بــە شــێوەیەکی نــوێ هــەبوو کــە خــۆی تێــدا بنوێنــێ. ناوەڕۆکی نوێ بەرەبەرە چوارچێوەی کۆنی شێعری تێكشکاند، شێعر ئازاد بوو، شێعر رزگار بوو، بۆ ئەوەی بتوانێ لە چوارچێوەیەکی تازەدا بیری نوێ دارێژێ، بــۆ ئــەوەی لێکدانــەوەی دەروونی لە قســەی زمــانی دوور نــەبێو ئــەو خەیاڵــەی پێــی مەســتە بــۆی بخرێتــە نــاوی چوارچێوەی هەڵبەستی. هۆی پایەبەرزیی هونەریی گۆران هــۆی ســەرکەوتنی بێوێنــەی لــە شێعری کوردیدا، بەکورتی ئەمانەن: گــۆران ئینســانێکی هەڵکــەوتوو بــوو، بــیرو بــاوەڕی پێشــکەوتووانە، کــردەوەی جــوان، جووڵانــەوەی پیاوانــەو شــێوەی ژیــانی ســادەو بێڕیــا، ئینسانێکی نموونەیی لە گۆران پێك هێنا بــوو. گــۆران ئینســانێکی نموونــە بــوو بــەڵام لــە ئاسمانەوە نەهاتبوو ـ پەری نــەبوو ـ ئــادەمیزاد بــوو. وەك هــەموو ئــادەمیزادێك خەوشــی هەبوو، نەشی دەشاردەوە. لە راستیدا ئادەمیزادی خۆش دەویستو هیچ شتێکی ئینســانی بۆی بێگانە نەبوو. لە شێعرەکانیشیدا ئەم فەلسەفەیە بەجوانی دیارە. دڵی ناسكو نــەرمی گۆرانی شاعێرو بۆچوونی ئینسانیی ئەو لە دیتنی هێزی دیاردەی نیشتمان وەکــوڵ دەهــات،

خۆی پێ رانەدەگیراو لێکدانەوەی دەروونی دەخستە سەر کاغەزو زۆر جار شیعری کوردی دەگەیاندە بەرزترین پلەی خۆی. لە بەردەنووسێکدا لە زمانی کچێکەوە کە بە دەستی بابی بە تاوانی ناپاکی کوژراوە دەڵێ/ لاوێکی نامەردم تووش هات لە رێما/ بە سوێن‌و پەیمان/ وەك رەشمار پەپکەی خوارد نووست لە ناو جێما/ ئابڕوومی تکان/ منی کچ مامزی بەندیخانەی ژین/ سزای تاوانم بە دەستی باوکی خۆم چووم بۆ سەربڕین/ پرچی پەخشانم/ تلا لە خوێنەوە کەوتە سەر چاوم/ ئیتر نەمبینی لە جەرگی باوکما سەری بڕاوم/ چۆن بوو بڕینی؟/ یان دایکی دڵسۆزم وێرای بە بێ‌شەرم بۆ جوانەمەرگی/ وەك دایك شیوەنێك بگێڕێ بە گەرم رەش کا بۆی بەرگی؟

گۆران خەباتکەرێکی ئازاو بەجەرگ بوو لە ژیان‌و شیعری خۆیدا هەرگیز سەری بۆ زۆرداران دانەنواند، چەند ساڵ لە بەندیخانەدا مایەوە. بەلاّم بە بیرو باوەڕی خۆی بەگەل‌و نیشتمانەکەی وەفادار ما. وەك هێندێ شاعیری‌تر تا رادەیەك گورچکبڕ، تەماع هەڵی‌نەفریوان، شیعر بفرۆشێ بۆ نان. زۆر جاران گوتراوە، گۆران شاعیرێك بوو بۆ شیعری دڵداری داندرابوو، لەم جۆرە شیعرەدا گۆیا شیعرەکانی بەڕاستی بەرزن. بەلاّم کە دەگاتە شیعری نیشتمانی، شیعرێك کە بیروباوەڕی سیاسی تێدایە پایەی شیعرەکانی نزم دەبێتەوە. ئەم قسەیە راست نیە، مومکینە ئەم یان ئەو هەڵبەستی گۆران بە رێکەوت وەك شیعرەکانی‌تری جوان نەبن، بەلاّم هەڵبەستی نیشتمانیی گۆران نموونەی کەموێنەی جوانیی ماناو وشەیە. شیعری ئەژدەهاك بەسە بۆ نموونەی ئەم جۆرە شیعرانەی. دوا سەرنج (بۆ قژزەردی بەر دەرگا لە سەر رێی بەندیخانەما لە مووسڵەوە بۆ هەولێر) شاکارێکی بەرزی ئەدەبی کوردییە. ئەی قژ زەرد! / بە بەژنی ناو دەرگا گرتووت/ هەر وەکوو پەیکەری شۆخی خەمخواری/ مەلێ بووم لە باخچەی هونەرا بێ‌جووت/ بۆ جوانیم رێك ئەخست شیعری دڵداری/ بەلاّم ئەهریمەنی گەلاّی باخ سیس‌کەر بێزارە لە جووکەی دەنووکی کوردی/ راوکەری دارستان لە باڵدار پیس‌کەر/ جێی چینەی لێ تەنیم بە داوی وردی/ هەر ئەوەم لە دەست دێ هەتا ئەتوانم/ ئا لەم هەڵوێستەدا هەل بە کار بێنم/ وەك تینووی چاو لە ئاو بەکوڵ بڕوانم/ ئەو چاوەی تێم بڕیت نەی‌تروکێنم/ بۆ ئەوەی بتوانم لە پەردەی بیرم/ نیگاریێ هەڵکەنم شیوەی لێت بچێ!/ تا هەر چەند گازی گرت لە لەش زنجیرم/ ئازارم سووکتر کا خەیاڵی کچێ/ کە شۆخەو قژزەردو بالاّ رێك‌و بەرز/ خەمخواری نەناسە وەك فریشتەی ئەرز/

گۆرانی خەباتکەر کە لە ساڵی ١٩٥٨ پاش شۆڕشی چواردەی ژووئیە لە بەندیخانە ئـازاد بــوو و لەگــەڵ نیشــتمانپەروەرە ئازادکراوەکـانیتر هاتنــەوە ســلێمانی، خـەڵکی ســلێمانی پێشوازییەکی گەورەیان لێ کردن. بەڵام گۆران خووی بە زۆر نەدەگرت، لــەم بـارەوە دەڵــێ: من بەش بە حاڵی خۆم ئەم ئەندازە ستایشـــە بــە هــی خــۆم نـازانم، مــن تــەنیا رەمزێکـی بێڕواڵەتی خەباتو نەبەزینی گەل بووم. ئەمەش خۆی هۆیەکی گــەورەیی‌و بـەرزیی گـۆران بوو. گۆران شاعیرێکی نەتەوەیی بوو، گەلو نیشتمانەکەی خۆی خۆش دەویستو شێعری بۆ گەلەکەی، بۆ نیشتمانەکەی دەگوت. هەرچەند لە هەڵبەستێ لە بەندیخانــەدا دەڵــێ: نـا بــۆ کوردێك کفرە، ئێستا کوردستان گوتن، بەڵام لــە هەڵبەســتی کوردســتاندا بــە شــانازییەوە هاوار دەکا: کوردستان! جێگامی جێی هەزار ساڵەم، پــەروەردەی ئــەم دۆڵو ســەر لوتکــەو یاڵەم.

یادی گۆران لە لای هەموو کوردێکی هونەرپەروەر، لە لای هەموو ئــەو هاونیشــتمانانە کە زمانو ئەدەبی خۆیان خــۆش دەوێ، خۆشەویســتە. شــێعرەکانی گـۆران بــە زۆر زمانــان وەرگێڕدراونو ناوی کوردو شێعری کوردییــان بــەرز کردۆتــەوە. گــەلی کــورد، شــانازی بــە گۆرانەوە دەکــاو شــێعرەکانی بــە یــەکێك لــە نیشــانەکانی هــەرە بـەرچاوی زیندووبوونــی زمانەکەمانو نەتەوەکەمان دەزانێ. ژیانی گۆران پڕ بوو لە تــاڵیو کەساســیو کوێــرەوەری. بەداخەوە تەنانەت ١٠ ساڵ پاش مردنیشی، گۆران ئەوەندە کە پێویستە قەدری نــەزانراوە. بەڵام ئێستا کە لە نیشتمانی گۆراندا، گەلی کورد خەریکە ئۆتۆنۆمی خۆی دەست دەکەوێ. حەق ئەوەیە وەك شاعیری هەرە گەورەی چەرخی بیســـتەمی کــورد تەماشـا بکـرێو یــادی زیندوو بکرێتەوە. ئەمە ئەرکێکی نەتەوایەتیو نیشــتمانیی هــەموو رووناکبــیرانی کــوردە. هەرچەند شێعرەکانی گۆران وەك هەموو نووسراوەیەك کــە خزمــەتی گــەل دەکـا لــە ئــێران قەدەغەیە. بەڵام گەلی کورد لە کوردستانی ئێران، گۆران باش دەناسێو یادی دەکاو شانازی پێوە دەکا. گومانی تێدا نیە کە رۆژی خۆی جێگــای پێویســتو تایبەتیشــی لــە مێــژوو و ئەدەبی گەلەکەماندا بۆ دیاری دەکا.

**ژێدەر:**

* وتارێك بە قەڵەمی دوکتور عەبدولڕەحمانی قاسملوو کە لە ژمارەی ٢١ی رۆژنامــەی "کوردســتان" خـەزەڵوەری ١٣٥١ بەبۆنــەی ١٠ساڵەی مەرگی گۆران چاپ کراوە.

# شاعیری گەل "هێمن"

ئەورۆکە هەر کەس لە ئەدەبی کوردی شارەزابێ ناوی هێمنی بیستووە. شێعرەکانی خوێندۆتەوەو بێگومان دەزانێ کە هێمن یەکێك لە شاعیرە هەرە بەرزەکانی کوردی سەردەمی ئێمەیە. بەڵام شێعری هێمن هەر لە سەرەتاوە لە چوارچێوەی ئەدیبو نووسەران دەرچووە، لە ناو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا بڵاوبۆتەوەو هەر لە سەرەتاشەوە لە دڵی هەموو کوردێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر کاریگەر بووەو ئەوانی بەرەو خەبات لە پێناوی رزگاریی گەلی کورددا هان داوە. هێمن لە سەرەتاوە شاعیری گەلەو هەر بە شاعیری گەلیش ماوەتەوە. سی ساڵ زیاترە هەزاران خەباتکەری کورد پێکەوە لەگەڵ هێمنی شاعیر هاوار دەکەن:

**گەرچی تووشی رەنجەڕۆیی‌و حەسرەت‌و دەردم ئەمن**
**قەت لە دەس ئەو چەرخە سپڵە نابەزم مەردم ئەمن**
**من لە زنجیرو تەنافو دارو بەند باکم نیە**
**لەت‌لەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن**

هێمن عاشقی کێوو تەلان‌و بەندەن‌و بەردی کوردستانە، نیشتمانی، تەبیعەتی وڵاتەکەی باش دەناسی‌و لەگەڵی پەروەردە بووە. لە "بەهاری لادێ"، "بەهاری کوردستان"، "شەنگەبێری"،"فریشتەی پەڕیوە"و زۆر شێعری‌تریشدا نیشان دەدا کە لە ناسین‌و ناساندنی تەبیعەتی کوردستان‌و جوانییەکانی‌دا چەندە شارەزاو مامۆستایە. جێگای سەرسووڕمانیش نیە، هێمن لەگەڵ تەبیعەت گەورە بووەو لە تەبیعەت

ئیلهامی وەرگرتووە. کەسێك تەبیعەتی کوردستانی دیتبیَو نەك هەر دیتبیَ بەڵکوو لەگەڵی تێکەڵاو بووبیَ، هێمن بە ناهەق نازانیَ کە دەڵیَ:

**بەهەشتە کوردەواری من بەهەشتە.**

هێمن لە شێعری خۆیدا زۆر جار باسی زۆرلێکراویی نەتەوەی کورد دەکا، لە مافی خوراوی گەل دیفاع دەکا، ئارەزووی ئەوەیە کورد هەرچی زووتر لە ستەمی نەتەوایەتی رزگاری ببیَ، بوونی ئەو ستەمە بە سەرچاوەی زۆر بەدبەختیو کوێرەوەریو بێبەشی دەزانیَ. لە "دوارۆژی رووناك"دا دەڵیَ:

**لەمێژ بوو هەققی کورد دەخورا بە فیڕۆ**
**لەمێژ بوو کورد بوو دەیکرد شینو رۆڕۆ**
**لە مەیدانی شەقێنی دوژمنی دا**
**سەری سەرداری کوردی بوو وەکوو گۆ**

هێمن بەتایبەتی زۆر پەرۆشی ئەوەیە کە لە کوردستانی ئێران زمانەکەی ئازادیی پەرەسەندنی نیە، ئەدەبەکەی بڵاوناکرێتەوە، فەرهەنگەکەی پێشێل دەکریَ. لە "رۆژگاری رەش"دا دەڵیَ:

**داخرا دەرکی رۆژنامە　　　شکاون نووکی خامە**
**کوردی نووسین حەرامە　　　دوژمن دەڵیَ بیَتامە**

* * *

**دڕان کاغەزو دەفتەر　　　گیران شاعیرو نووسەر**

هێمن نەتەوەکەی خۆی خۆش دەویَ، لەوەش زیاتر نەتەوەی خۆی دەپەرستیَ. بەڵام رقیشی لە هیچ نەتەوەیەکیتر نیە. لە هەموو دیوانی هێمندا شێعرێك کە باسی نەتەوەیەکی دیکە بە خراپە بکا، یا کورد لە نەتەوەیەکیتر بە بەرزتر دابنیَ بەدی ناکریَ، دیاردەیەك کە بەداخەوە لە دیوانی زۆر شاعیری کورددا بەرچاو دەکەویَ. نەك هەر ئەوە، بەڵکو بەشەردۆستی یەکێك لە سروشتە تایبەتییەکانی شێعری هێمنە.

هێمن زۆرجار باسی پێشەوا قازی دەکا، لە شێعرەکانیڕا دیارە کە چەند ئەو رۆڵە بەنرخو هەڵکەوتوەی گەلی کوردی خۆشویستوە. پێشەوای خۆش دەویَ چونکە:

**زانا بوو، کوردپەروەر بـــوو پێشەوا بـــوو، رابـــەر بـــوو**

بەڵام بۆیەش پێشەوا بە مەزن دەزانێ چونکە:

**هەر کورد نەبوو بەشەر بوو خەمی خەڵکـی لەبەر بـــوو**

هێمن گەلانی‌تری ئێران بە دۆستی گەلی کورد دەزانێ‌و لە خەبات‌و تێکۆشان‌دا بە براو هاوالّیان دادەنێ لە "کوردو ئازەربایجانی"دا دەڵێ:

**کــوردو ئازەربایجانی هــەر دوو داوایان رەوایە**

**هەر بژین‌و پایەداربێ یەکـیەتیی ئەم دوو برایە**

هێمن دیسان هەر لەسەرەتاوە لە ناو نەتەوەی خۆشی‌دا هەموو چین‌و توێژێکی بە یەك چاو تەماشا نەکردوەو ناکا. لە شێعری بەناوبانگی خۆی‌دا "دەیلێم‌و بێ‌باکم" دەڵێ:

**ئـــەوی ئاغا بێ بێکـــــارە جەبـــــوون‌و قـــەڵس‌و لاسارە**

**دزی‌و رێگرتـــنی کــــارە ئـــەمن دەیلێـــم‌و بێ باکم**

**لە شـــــەرم‌و شوورەیی مـردم بە خۆم مـن چۆن بڵێم کوردم**

**کە ئاغا ئابـڕووی بــــردم ئـــەمن دەیلێـــم‌و بێ باکم**

لە "ئارەق‌و تین"دا زۆربەجوانی‌و بەزمانی سادەی جووتیاران باســی نرخـی کـاری جووتیار بـۆ کۆمـەڵ دەکـاو چەوسـانەوەی جووتیـار نیشـان دەداو دەری دەبـڕێ کـە ئینسانی زەحمەتکێش لە لای زۆر خۆشەویستە:

**من جووتیـــارم، من جووتیـــارم من لەگەڵ هەتـــاو هاوکـارم**

**من بە ئـارەق‌و ئـــەو بە تیــــن دامـــان رشتوە بناخـــەی ژیــــن**

**باسکی من‌و تیشکی ئـــەوی بژیـــــو دەستێنـــین لە زەوی**

**گەر جووتیـــــار ئارەق نەڕێــژێ گـــەر هەتاو تیشک ناوێـــژێ**

**دانیشتووی ناو کـۆشکو قەلا دەخــــۆن نـــانی گەلاگەلا؟**

لە شێعرەکانی ڕا بە هاسانی دەردەکــەوێ کــە هێمــن لــە ژیــانی زەحمەتکێشــانی کوردستان بە تایبەتی جووتیاران لە نزیکەوە شارەزایە. لەوەش زیاتر خۆی تا رادەیەك

لەم ژیانەدا بەشدارە. خۆی دەڵێ: "چاك خەریكی كاسبی بووم‌و زوو فێری كشت‌و كاڵ بووم".

فەلسەفەی ژیانی هێمن ئەوەنیە كە دانیشی‌و لە دوورەوە تەماشای ژیان‌و خەباتی گەل بكاو بۆخۆی‌و یان بۆ گەل شێعر بڵێ. هێمن ئەو ئەسڵەی قەبووڵ كردوە كە ئەركی شێعری شاعیری گەلێكی زۆرلێكراو تەنیا لێكدانەوەو خستنە ناو هۆنراوەی تەبیعەت‌و جوانی نیە. شاعیر لە پێش دا ئینسانە، ئینسانێكە كە هەستی ناسكەو زوو دەجوولێتەوە. چۆن شاعیر بە مانای راستی ئەم وشەیە دەتوانێ بەرامبەر بە هەژاری‌و كوێرەوەری‌و بێبەشی گەلەكەی بێ لایەن بی؟

لە نێوان راستی‌و درۆدا، لە نێوان ئاهورامووزداو ئەهریمەن دا، لە نێوان هەق‌و ناهەق دا راستی هەڵنەبژێرێ، بەگژ ئەهریمەن دا نەچێ‌و دیفاع لە هەق نەكا؟

بۆیە هێمن تەماشاچی نیەو ناتوانێ تەماشاچی بمێنێتەوە. بە هەموو هێزی خۆیەوە، بە شێعرو بە نووسین هەنگاوی ناوەتە ناو مەیدانی خەبات تاسەر بەرەوئاسۆی روون، تا ترۆپكی رزگاربوون یاریدەی گەلی خۆی دەدا، هێمنی شاعیر لە هێمنی خەباتكار جیاناكرێتەوە.

رۆڵەی كوردم فێری هەورازو لێژم
تا زۆر بڕۆم، زیاتر ئارەق بڕێژم
كورت‌تر دەبێ رێگای دوورو درێژم
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی روون
دەڕۆم دەڕۆم، تا ترۆپكی رزگاربوون

تاقیكردنەوەی سالأنی درێژی خەبات بە هێمنی سەلماندووە كە خەبات دوورو درێژە، هەورازو نشێوی هەیە، سەركەوتن‌و شكستی تێدایە. بەلاّم هێمن كۆڵنەدەرە.

من پەروەردەی بن سێبەری ئەشكەوتم
گەلێك جاران لە چاڵاوی رەش كەوتم
هاتمە دەرێ، هەدام نەدا، نەسرەوتم
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی روون
دەڕۆم دەڕۆم، تا ترۆپكی رزگاربوون

هەورازو نشێوی ژیانو خەباتی گەل لــە شـێعرەکانی هێمـندا زۆر جـوان دیـارە. لەوکاتەوە کە دەستی بە شێعرگوتن کــردوە هــەتا ئـەمڕۆ، شـێعری هێمـن ئاوێنـەی قوناخەکانی گەلی کوردە. لە ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥)ڕا هێمن بە پێشوازی پێکـهاتنی حیزبی دێموکراتی کوردستانەوە دەچێو دەڵێ:

**لە سایەی حیـزبی دێموکراتی خۆمـان**
**لە باڵداری تێپەڕی ئەوڕۆکە پێڕۆ**
**ئەما داغو پـــەژارەو ماتــەمو خــەم**
**زەمـانی هەڵپــەڕینو بەزمە ئیـمڕۆ**

لە ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٤دا کە کۆماری مەهاباد دامەزرا هێمن گوتی: "ئەوساڵ بەهارە بۆ ئێمە زستان" یا لە "ڕۆژی خۆشی"دا دەڵێ:

**گەرچی زستانە بەفر دای‌پۆشی ئەوڕۆ گشت وڵات**
**خاکی پاکی ئێمە خەملێـوە وەکـوو باخی ئیـرەم**

بەڵام کۆماری مەهاباد تەمەنی کەمتر لە ساڵێك بوو. جووڵانەوەی گەلی کورد لە ئێران هــەروەك جووڵانــەوەی سەرانســەری ئـێران تووشـی شکسـت بـوو. هێمـن لــە "ڕۆژگاری ڕەش"دا تووشی نائومیدی دەبێ، وەك کۆمەڵانی خــەڵکی کوردسـتان کـە تووشی نائومیدی ببوون:

**بە فیـــڕۆ چوو خەباتمــان** **داگیر کـراوە وڵاتمـان**
**تێپــەڕی ڕۆژی هــاتمــان** **ڕووخا کۆشکی ئاواتمان**

* * *

**لە پیاوی ئازاو سەرکەش** **لە زەحمەتکێشی بێبەش**
**ئاخنـــــــراوە کونەڕەش** **نابینی کەسی ڕووگەش**

بە تایبەتی شەهیدبوونی پێشــەوا قــازی هێمنــی داخـدار کـردوە. هــەم دۆسـتو مامۆستای لەدەست داوەو هەم پێشەواو سەرکۆمار.

**لە چـــوارچـــرای مـەهاباد** **لە کانگـــای بیری ئازاد**
**دەستـی ڕەشی ئیستیبداد** **چەقـــاندی داری بێـــداد**
**لە کـــاتی نیـوەشــەودا** **لە جـەنگەی شیرن خـەودا**

**کـــــرا کـــــاری ناڕەوا لــــــە داردرا پێـــــشەوا**

هەر لەو ساڵەدا هێمن لە بەر خەباتی رابردووی خۆی تووشی دەردیسەری دەبێ بۆ ماوەیەك ولاّت بەجێ دێڵێ. دیارە وەزعی سیاســی تەئسـیری کردۆتــە ســەر شـێعری هێمن. لە "بابردەڵە"دا دەڵێ:

**بـزانە تۆ ئەوی ئەهلی هونـــەر بێ**
**دەبێ یا دەسبەسەر، یــا دەربــــەدەر بێ**
**هونـەرمەندو ژیـــانی خۆش مەحــاڵە**
**هونـــەرمــەند رەنجـــەڕۆیە، ژینی تـــاڵە**
**منیش بابردەڵەی بەر گێژەڵووکەم**
**دەمێک لەو قووڵکە تاوێک لەو چڵووکەم**
**منیش زۆرداری پـرزەی لێ بـــــڕیوم**
**منیش بەدکـــــاری بـــواری لێ تەنیــــوم**

یا لە "فرمێسکی گەش"دا کە بە قسەی خۆی لەوپــەڕی تەنگانــەو لێقــەوماندا گوتوویە، دەڵێ:

**کوشتمیو شەش خانی ئوممێدی لە من گرتن حەریف**
**مۆرە هەڵداویمو بێهـوودە بە هیــــوای دوو شەشم**

هێندێ شێعریتریش وەك "گریانی نیوەشەو"و "ئارەزووی فڕین" هـــەر نیشــانەی نائومێدیی شاعیرو راکردنی لەڕاست ژیانی تاڵــە. لــە ساڵی ١٣٢٥وە هــەتا ساڵی ١٣٣٠ سەردەمی پاشەکشەی جوولاّنەوەی گەلی کوردو هەموو گــەلانی ئێرانــە. لــە ساڵی ١٣٣٢دا کە ئاسۆی خەبات روونتر بۆوە، هێمن لە "ئاواتی بەرز"دا جــارێکیتر دێتەوە مەیدانی خەبات. هیوای بە خەباتی گەل زیاتر دەبێو دەیەوێ بە شێعری خۆی لەم خەباتەدا بەشدار بێ:

**فێری زۆر دەرسی بەکەڵکو باشی کردین تێ شکان**
**جــا ببینە راپـــــــەڕینو شۆڕشی ئەمجاری کــــورد**
**وا گــــزینگی دا بەیانی جـــــوانی ئازادی بەشەر**
**رۆژی رووناکـــە نەماوە زوڵمەتی شەوگاری کــــورد**

**ئەو زەمـــــــانە شیرنـــەی ئێمە پـەرەی دەگـــــرێتەوە**
**نادڕێ چیدی کــــتێب و دەفتـەری ئەشعاری کـــورد**

قوناخێکی نوێ لە ژیانی گەل و شاعیردا دەست پێ دەکاتـەوە. مـاوەی پاشەکشـە دوایی دێ و گەلی کـورد خـۆی بـۆ خـەباتی دوارۆژ ئامـادە دەکـا. نفـووزی حـیزبی دێموکراتی کوردستان کە بە نهێنی تێدەکۆشێ، رۆژبەرۆژ لـە ناوکۆمـەڵانی خـەڵکی کوردستاندا زیاتر دەبێ. بەرەو هەوراز رۆیشتنی جووڵانەوە هەتا رۆژەکانی گـەلاوێژی ١٣٣٢ درێـژەی هەیـە. لـە ٢٥ی گـەلاوێژەوە هـەتا رۆژی شـوومی کودیتـای ٢٨ی گەلاوێژ خەڵك لە شاری مەهاباد حوکمداری دەکا. لە رۆژی ٢٥ی گەلاوێژدا خـەڵکی مەهاباد بە درشت و وردەوە هەموو دەگەڵ هێمن کە بۆ یەکەمجار پاش چەند ساڵ لـە کۆبوونەوەیەکی چەندهەزار کەسیدا شێعر دەخوێنێتەوە، هاوار دەکەن:

**بڕۆ ئەی شاهی خایین بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ**

ئەو سەردەمە، سەردەمی نیوە دێموکراسیش زۆر ناخایەنێ. دەورانی رەشی پـاش کودیتا دەست پێدەکا و هێمنـی شـاعیر جـارێکیتر تووشـی نـائومێدی دەبـێ و لـە "تووڕەیی"دا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **لەو وڵاتە کەسێک لە خەو رابێ** | **بەشی چارەڕەشی و خەم و شینـــە** |
| **تێگەیشتنم عیلاجی دەردی من** | **مەستی و شێتی و نــــەزانینـــە** |

یا لە "چارەنووسی شاعیر"دا:

**دەزانی بۆچی من هێنــــدە پەرێشان و خـــەفەتبـــــارم**
**لـــە بازاڕی ژیان غــــەیـــــری هـــونەر نیمە چ سەرمایە**
**لەگەڵ چارەڕەشی و دوورەبەشی و نەگبەت دەبێ هەڵکەم**
**لـــە مێژە چارەنـــــووسی شاعیرانی کـــــورد هەروایە**

ئەو تووڕەیی‌یەو رەشیی چارەنووسی شاعیر لە شێعرەکانی تریشیدا هـەر بـەرچاو دەکەوێ و هەتا ساڵی ١٣٤٠ (١٩٥٩) هەر بەردەوامە. لە "گلێنەی شاعیر"دا دەڵێ:

**ئەگــــەر خەرمانی عومرم ئێستەکانە پاکی با بیبا**
**بە مەرگـــی تۆ موچورکــــیشم بەدڵدانایە، بابیبا**

**هەموو عومری ئەبەد تێیدا نیە خۆشی دەمێک مەستی**

**خـــدر ئاوی حـــــەیاتی بۆ چبــــــوو؟ فێری شەرابی با**

لە "ناسۆری تەشەنا"دا راکردن لە ژیانی واقیعی، لەو حەقیقەتە تاڵەی کە شاعیر تووشی بووەو نایەوێ قبووڵی بکا، بە تەواوی دیارە. هێزی ئەوەی نیە ژیــان بگــۆڕێ، رێگای نیە خۆی دوور بخاتەوە، دەیەوێ رابکاو بە یارمەتی مــــەی روو لــە دنیایــەکی خەیاڵی دەکا:

**چـــــۆن نەبەم بۆ مـــــەیو مـــــەیخانە پەنا، تێگەیوم**

**لەو ولاتە هــــــەمــــــووشت زۆرە بـــــــەنیئادەم کەم**

**شەڕەبــــــــــایە لە چیاکـــــانو هەوا تـــــــووشە دەنا**

**وەکوو شێتان دەمەویست روو لە چیای ئەستەم کەم**

ساڵەکانی ١٣٤٧ـ ١٣٤٦ کە راپەڕینی چەکدارانە لــە کوردســتانی ئــێران بــەرپا دەبێ، هێمن هەرچەند خۆی تێدا بەشدار نیە، بەڵام لەگەڵ ئەو راپەڕینە دەژی. هیوای بە خەباتی گەل زۆرە، باوەڕی بەهێزترە. بۆ شەهیدانی ئــەو راپەڕینــە دەگــری، بــەڵام شێعرەکانی پڕە لــە هیــواو ئــاوات بــۆ ســەرکەوتنو نیشــتمانپەروەران بــۆ تێکۆشــان هاندەدا. هێمن بیەوێو نەیەوێ، دیسانو ئەوجارە بۆ هەمیشە لە ناو مەیدانی خەبات دایە:

**بۆ شەهیدێکی کــە گــەوزیوە لە نێو خوێن دەگــریم**

**بۆ هەڤاڵێکی کـــــە چوو بێسەرو بێشوێن دەگــریم**

***

**تا بە دەستی پــــــەری ئازادی لە سەر گــــــۆڕی شەهید**

**گوڵە شلێرە لە گشت لایەکی نەڕۆێن دەگــریم**

شێعرەکانی هێمن ئیتر بۆنی نــاهومێدی لێنایــە. چــەند ســاڵە قۆنــاخێکیتر لــە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دەستی پێکردوە، قۆناخێك کە جێی هیــوای گەلی کوردە. هێمنیش شاعیری وەفاداری گەلی کورد، هەم لــە پێکــهێنانی هــەم لــە دەربڕینی ئەو هیوایەدا بەشدارە. لە "مەتەرێزی شەرەف"، "شــەنگەبێری"، ئــامێزی ژن"، "ترۆپکی رزگاری"، "شەپۆلی تۆڵــە"، شــەوو شــەیتان"، "گــاوو گــەردوون"،

"کاروانی خەبات"و لە "دەسکەوتی خەبات"دا شێعری کۆمەلاّیەتیو شۆڕشگێڕی چ لە باری ناوەرۆكو چ لە باری شێوەوە، گەیاندۆتە پلەیەکی بەرزی ئەوتۆ کە کەمتر شاعیری کورد گەیشتویەتێ. هێمن ئامادەیە بۆ بەجێگەیاندنی ئەم هیوایە خۆشی بەخت بکا:

**خۆم دەسووتێنم هەتا بەزمی خەڵک ڕۆشن بکەم**

**کێ لە ڕێی خەڵکا وەکوو شاعیر دەسووتێ، شەم نەبێ؟**

لە سەرەتادا شێعرەکانی هێمن لە ژێر تەئسیری دوو ڕەوتی ئەدەبی دایە. وەك هەموو شێعری شاعیرانی کوردی سەردەمی سی چل ساڵ لەمەوبەر، تەئسیری ئەدەبی فارسی لەم شێعرانەدا دیارە. زۆربەی شێعرەکانی شێعری عەرووزین، وەزنو قافیەیان لەگەڵ دەستووری شێعری فارسی ڕێكدەکەوێ. لە لایەکیتریشەوە شێعری شاعیرە کوردەکانی بەناوبانگ وەك "نالی" کە خۆی لە ژێر تەئسیری شێعری کلاسیکی فارسیدا بووە، تەئسیری کردۆتە سەر شێعرەکانی هێمن. بۆیە لە سەرەتادا هێمن شێعرەکانی شێوەی غەزەلو قەسیدەو جارجاریش مەسنەوی دووبەیتیو هیتریان هەیە. هێمن ئێستاش هەر جارجار دەگەڕێتەوە سەر ئەو شێوە کلاسیکیەو هێندێ لە شێعرە تازەکانیشی هەر بەمچەشنە گوتراون. وەك "ئاواتی بەرز"، "گلێنەی شاعیر"، "دەسکەوتی خەبات"و هتد. لەم شێوە شێعر گوتانەدا هێمن دەستێکی بالاّی هەیە. شێعرەکانی ڕەوانن، بە زمان جوانو بە مانا دەوڵەمەندن.

پاش ماوەیەکی سەرەتایی شێعرگوتن هێمن بەرەبەرە دەگەڕێتەوە سەر شێوەی ئەدەبی ئەسیلی کوردی، خۆی لە قافیەو وەزنی شێعری کلاسیکی رزگار دەکاو شێعرەکانی لە بەستەی کوردی دەچن، لەو بەستەیەی کە شاعیر هەموو رۆژێ لە لادێ دەیبیسێ، بەستەیەك کە چوارچێوەی بۆ دارشتنی شێعری کوردی لەبارترەو زمانی کوردی لە تەنگوچەڵەمە رزگار دەکاو وەك چۆمێکی خرۆشانی لێدەکا کە بۆ لای دەریای بێسنوور دەڕوا. جارجار کە ئینسان شێعری هێمن دەخوێنێتەوە، گۆرانی وەبیر دێتەوە. وادیارە کە لە هەڵبژاردنی ئەم شێوە شێعرگوتنەدا گۆران لە سەر هێمن بێتەئسیر نەبووە. لەم شێعرانەدایە کە هێمن دەگاتە ترۆپکی ئەدەبی کوردی بەڕاستی ئەدەبی کوردی پێشدەخا.

هێمن شاعیرێکی ریئالیستە، ریئالیزمی رەخنەگرانــە لــە نــاوەرۆکی شــێعرەکانی هێمندا بە تەواوی بــەرچاو دەکــەوێ. هێمــن بــارە هــەرە گرینــگو ئەساســییەکانی تەبیعەتو ژیانو ئادەمیزاد بە چاوێکی رەخنەگرانەی شاعیرانە باس دەکاو کۆمەڵ بۆ بەرەوپێشچوون هان دەدا. هێمن زۆرجار لە هێندێ شێعری خۆیدا لە ناتورالیزم نزیــك دەبێتەوە، ئەوەی کە دەیبینێ باسی دەکاو بە چــاوی رەخنــە ســەیری تەبیعــەت یــان کۆمەڵ ناکا. هەروا بزانە دەیەوێ تابلۆیەکی تەبیعەت بکێشێو بیخاتــە بــەرچاومان. بەلاّم شێعری وای کەمە، وادیارە خۆشی ئاگای لێیە کە لە ریئــالیزم دوور کــەوتووە، زوو ناتورالیزم بەردەداو دەگەڕێتەوە سەر ریئالیزم کــە ســەبکی بنــەڕەتیی نــاوەرۆکی شێعرەکانیەتی. ئەو ناتورالیزمــە بــە تایبــەتی لــە "بــەهاری کوردســتان"و "لــەبیرم مەکە"و چەند شێعریتردا خۆی دەنوێنێ.

ژن لە شێعری هێمـــندا رۆڵێکــی زۆر گرینگــی هەیــە. جوانیــی ژن ئیلــهامدەری شاعیرە. سەرانسەری دیوانی ئەو راستییە دەردەخا وێڕای تەبیعەتو ژیــانو خــەباتی گەل، ژنە کە هێمن بۆ شێعرگوتن هان دەدا. شێعرەکانی هێمن لـــە ســەر ژن نموونــەی شێعری بەرزی کوردین. لە "کیژی لادێ"دا بە کچی کورد هەڵ دەڵێ:

**لاجانگــــت وەکـــــوو گــزینگــی تاوێ   هەربۆ خۆی جـــــوانە تیف تیفەی ناوێ**

**کولمەکەت وەکوو گوڵاڵەی گەشە   بێ سوورمەش چاوە مەستەکەت رەشە**

**وەکوو فرمێسکـــی عاشق رووناکـــی   وەکـــــوو ئاونگـــی بەیانی پاکـــی**

ئەو تابلۆیەی کە لە "لەبیرم مەکە"دا لە ژن دەکێشێ، بەڕاســتی جــوانو نایابــە. هەروەها لە "پەری شێعر"و لە "شەنگەبێری"و زۆر شێعریتردا هێمـــن مامۆســتایی خۆی لە هۆنراوەدانان بۆ ژندا دەسەلمێنێ.

بەلاّم ژن بۆ هێمن تەنیا سەرچاوەی ئیلهام نیە. هێمن بـــۆ رزگــاریی ژنــی کــوردی خەبات دەکا. لە "یادگاری شیرن"دا دەڵێ:

**لادە چارشێوی رەشت با دەرکەوێ کولمەی گەشت**

**چـــون لە قەرنی بیستەما زۆر عەیبە ئەو روو گــرتنە**

هێمن دەیەوێ ژن بەر لە هەمووشتێك خاوەنی مافی ئینسانیی خۆی بێو زۆرجــار دژی زۆرداریو بێحورمەتی نیسبەت بە ژن دەنگی خۆی هەڵدێنێ. هێمن ژنی خــۆش

دەوێ، دەپیەرستێو نرخی هەموو جوانییەکانی ئەو دەستکردە نایابەی تەبیعەت دەزانێ، بەلاّم لە لای هێمن خەبات بۆ رزگاریی گەل، بۆ ئازادیی کۆمەلاّنی خەلّك لە ژن خۆشەویستترە. لە "ئامیزی ژن"دا دەلّێ:

**بەلّێ سەختە، یەکجار سەختە — دووری لە ژن، نامـــــــرادی**

**بەلاّم لە ژن خـــــۆشەویستتر — لە لای من ئەتـــــۆی ئازادی**

زمانی هێمن زمانی کوردی پەتیو جوانە. نە پڕە لە وشەی بێگانەو نە وشەی دەستکردی تێدایە. زمانەکەی زمانی کۆمەلاّنی خەلّکی کوردستانە، بەلاّم هێمن کە خۆی خەلّکی موکریانە، تەعەسوبی بەکار نەهێناوە، بە زاراوەی موکریانی شێعر نالّێ. بە تایبەتی لەم چەند سالّەی دواییدا زمانی هێمن نموونەی بەرزی زمانی ئەدەبی کوردییەو بێگومان لە پێکهێنانی زمانی پەسندکراو (استاندارد)ی کوردیدا تەئسیری هەبووە.

زمانی هێمن سادەو پەتیو رەوانە، هەم ئەدیبو نووسەری کورد پێی خۆشەو هەم نەخوێندەواری کورد لێی حالّی دەبێ.

**هەزار خۆزگەم بە خۆت شوانە — کـە بەو مانگــەشەوە جوانە**

**دانیشتووی لە رژدو هــەلّدێر — پـەنجـــــە، دەبزێوی لـە بلوێر**

**دەگـــەلّ تەبیعەت هاودەمی — شادی، بەکـەیفی، بێخەمی**

"بەهاری کوردستان" فەرهەنگێکی بچووکی زمانی کوردییە. بەتایبەت بۆ ئەوانەی هەر لە شار ژیاونو لە زۆر باری ژیانی لادێ ئاگادار نین، تابلۆیەکی راستەقینە بە زمانێکی دەولّەمەندو بێ هاوتا دەخاتە پێشچاو. ئەو شێعرەو چەند شێعریتر کە باسی تەبیعەتو ژیانی لادێ دەکەن، بۆ شارستانی ئەوندە وشەی نەبیستراویان تێدایە کە زۆرجار خوێنەر سەری سووڕ دەمێنێو ناچار دەلّێ زمانی کوردی چەند دەولّەمەندە بەداخەوە خزمەتی نەکراوە. دیوانی هێمن شێعری وەك "بەهاری کوردستان"ی بەڕاستی فەرهەنگێکی دەولّەمەندی کوردییە.

شێعری هێمن لە تەشبیهی جوان ئاخنراوە.

**خۆشەویستی گۆشەکەی تەنیایی هەر ئەژنۆکەمە**

**بۆیە رۆژو شــــەو وەها گـــرتوومەتە نێو باوەشم**

لە "شەنگەبێری"دا ئەنجامی شێعرەکەی ئەمەیە:

**زۆری نـــــەماوە بێتەبەر، نـــــەمامی هەوڵو خەباتم**
**لە داگـــــیرکـــەر پاک بێتەوە خاکـــی پیرۆزی وڵاتم**
**چەک دادەنێم، گۆچانەکەی جارانم هەڵ دەگرمەوە**
**تۆ هەر بێرییە من هەر شوان، فـــریشتەی تاسەو ئاواتم**

هێندێ شێعری هێمن گەیشتۆتە پلەی هەرەبـــەرزی ئـــەدەبی کوردیـــەوە. یـــەکێك لەوانە "کاروانی خەبات"ە. بڕوانە چۆن باسی شەهیدبوونی رووناکبـــیرێکی خـــەباتکار دەکا:

**هەرچوار تەنیشتی گیرابوو**     **لە سەنگـەرێک دا بەتەنێ**
**ئەولاوەی بەڵێنی دابـــــوو**     **هەتا مـــردن چەک دانەنێ**

* * *

**رووناکــــــبیرێکی تا ئەمڕۆ**     **دەچـوو بەرەو ئاسۆگی روون**
**ئێستا هیوای بەبوولێڵ بـــوو**     **بۆ لە گـــــــەمارۆ دەربازبوون**

بەڕاستی ئەوەی هێمن لە سەر گۆران دەیڵێ لە سەر خۆشی راستە: تاکی لە جوانی پەرستی‌دا کەمەو وشە لە دەستی‌دا وەك مێوە، دڵتەڕەو خۆشخەیاڵەو ناسکبینە، بـە هونەرەو شارەزاو وشەڕەنگینە.

هیوام ئەوەیە هێمن سالأنی درێژ لە ناو گەلی کـورددا، لـە ریـزی خەباتکـەرانی رێگای ئازادیی گەلی کورددا، تێکۆشانی خۆی لە پێناوی رزگـاریی گەلەکـەمان، لـە پێناوی پێشخستنی زمانو ئەدەبی کوردی، هەر درێژە پێبدا. دڵنیام کە لە دوارۆژدا هێمن زۆرجار پەری شێعر دێنێتە ژوانی خۆیو دیوانێکی‌ترمان پێشـــکەش دەکـا کـە شێعری کوردی جوانی تێدا بێ.

**شێعرێک وەک خونـــــاوەی باران**     **شێعرێک وەک سرتـەی دڵداران**
**شێعرێک وەکـوو دەریای بێ بن**     **گــــەرمتر لـــە بـــــاوەشی ژن**
**شێعرێک سروودی شــــادی بێ**     **شێعرێک دەنگــــی ئازادی بێ**

***

